# فەرمودەکانی

# ئەحکـــام

**ڕونکردنەوەی (٨٨٨) فەرمودەی پێغەمبەر**

**عبدالقادر تەوحیدی**



| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | فەرموودەکانی ئەحکام |
| نوسەر: | عبدالقادر تەوحیدی |
| بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| نەخشەسازی ناوەوە: | شنۆ حمدامین |
| خەت: | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ: | ئەمین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٣١ك – ٢٠١٠ز |
| تیراژ: | (١٥٠٠) دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٠٧) ی ساڵی ٢٠٠٦ی دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا – ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

# پێشەكی

الحمد لله الذي علم الانسان مالم يعلم، والصلاة والسلام على خير خلقه محمد الذي قال (من يرد الله به خيراً يفقهه في الدين) وعلى آله واصحابه اجمعين.

براو خوشكه مسولّمانو خواناسه كورد زمانەكانم.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

ئاشكرایە خۆشبەختیو سەرفرازی مرۆڤ، لە پەیڕەوی كردنی یاسا بەرزو بەنرخەكەی ئیسلام دایەو ئەویش نایەتەدی، مەگەر مرۆڤ ئەو یاسایانە بناسێت، ناسینی ئەو یاسایانەش تەنها بە قورئانو فەرمودە بەنرخەكانی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ ئەبێ. سوپاس بۆ خوا لەم سەردەمەدا هەرچەن ئایین غەریبەو پەیڕەوانی ڕاستەقینەی كەمو نامۆن، بەڵام جێگەی نائومێدی نیەو لەو كەمە، بەرهەمێكی زۆری زانستی ئایینی لە هەمو بوارەكاندا هەیەو، خەڵكی مسولّمان ئەتوانن بەماوەیەكی كەم، هەر بەزمانەكەی خۆیان شارەزایی ئایینەكەیان ببنو خۆیان بگەیەننە قافڵەی خۆش بەختانو، سەرفرازی هەردوو دونیا بەدەست بهێنن. منیشوەكو منالێكی ناو ئەو كاروانە دوورو درێژە دەستم كردوە بەگڕوگاڵو، ئەمەوێ بەئەندازەی بەرەی خۆم پێ ڕابكێشمو سودێك بەبەشێكی ئەو كاروانە درێژو نەپساوە بگەیەنمو، لەدوعای خێری ئەوان بێبەش نەبم، بەڵكو خوای میهرەبان بیكات بە مایەی خۆشبەختیو سەرفەرازی ئەوانو، لە كێشانەی چاكەدا بۆ

ئه‌م به‌نده لاوازه‌ی دا بنێت ﴿...هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ﴾(المدثر- ٥٦).

له‌به‌رئـــه‌وه لێـــره‌دا هه‌ســـتام بـــه‌ده‌رهێنانی((٨٨٨)) فـــه‌رموده‌ی پێغه‌مبـــه‌ری ئازیزمانﷺ، كـه هـیچ كامیـان لـه پلـه‌ی (حـسن لغـیره) خـوارتر نـین، واتـه: هـه‌مو فه‌رموده‌كان جێگای باوه‌ڕن‌و، زانین‌و ئیش پێكردن‌و فه‌توا پێ‌دانیان بێ‌ترسه، ئه‌میش لـه (منتقى الاخبار) له (نیل الاوطـار)دا كه بریتیـه لـه (٣٩٤٦) فـه‌رموده ده‌رم هێنـاون. ئه‌وه‌ی لێره ئێمه كردومانه، ئه‌وه‌یه ئه‌گه‌ر چه‌ند فه‌رموده لـه‌باره‌ی یـه‌ك شـت هـه‌بووه، ئێمه یه‌كێكیانمان هێناوه‌وه ئه‌گه‌ر فه‌رموده‌یه‌كی (صـحیح) بـووه لـه‌باره‌ی حوكمێكـه‌وه به‌لاّم فه‌رموده‌یه‌كی (حسن، یان حسن لغیره) بووه، هه‌ر له‌وباره‌یه‌وه زیاده‌یه‌كی تێدابووه، یان كورت تر بووه ئێمه (حسن، یان حسن لغیره)یه‌كمان هێناوه له‌به‌ر ســودی زیـاتر یـان له‌به‌ر ئاسان له‌به‌ر كردن، هه‌وڵمان داوه هه‌مو فه‌رموده‌كان به ژماره‌یانـه‌وه بنوسـین، تـا ئه‌گه‌ر برایه‌ك یان خوشكێك له شتێكا گومـانی په‌یـدا كـرد، بتوانـێ بـه ئاسـانی ئـه‌و فه‌رموده‌یه بدۆزێته‌وه‌و ته‌ماشای خـۆی‌و ڕاڤـه‌كانیان بكـات. پێـشه‌كی ئێمـه ژمـاره‌ی خۆمان ئه‌نووسین، پاشان ژماره‌ی هـه‌مان فـه‌رموده لـه (نیـل الاوطـار)دا بـه‌م شـێوه‌یه ئه‌نوسین (ن/١)، ئینجا فه‌رموده‌كه ئه‌نوسین پاشان ئه‌گه‌ر ته‌نها ئیمامی بوخاری‌و مـسلم ئه‌و فه‌رموده‌یان هێنا بوو، ئه‌نوسین (أَخْرَجاه/ ئه‌و دوانه ده‌ریانهێناوه)وه ئه‌گه‌ر ئیمـامی ئه‌حمه‌دیان له‌گه‌ڵدا بوو، ئه‌نووسین (متفق علیه/ له‌سه‌ری هاوده‌نگن)، وه ئه‌گـه‌ر ئه‌مانـه خاوه‌نی {سونه‌نه‌كانیان، واته: (أبو داود —الترمذي- النسائي- وابن ماجه) یان له‌گه‌ڵـدا بـوون، ئه‌نووسـین (رواه الجماعـة)}، ئه‌گـه‌ر ئیمـامی ئه‌حمـه‌دو خـاوه‌نی سـونه‌نه‌كان ده‌رهێنابو، ئه‌وه بۆیان ئه‌نوسین (رواه الخمسة)، له‌پاش ئه‌وه یه‌ك به‌یه‌ك خۆیان‌و ژمـاره‌ی فه‌رموده‌كان ئه‌نوسین، هه‌ندێ جاریش بێجگه له‌وانیش كه‌سانی تریش ئه‌نوسین، به‌لاّم زۆر به‌كه‌می‌و، یـه‌ك دوو فـه‌رموده‌شمان هێنـاوه له‌غـه‌یری (منتقـی)و، لـه شـوێنی خۆیـدا ڕاویه‌كه‌مان نوسیوه، له‌پاشدا (ن/ش)م نوسیوه، واته: له شـه‌رحه‌كه‌یدا هـاتووه، گـرنگ

ئه‌وه‌یه‌، هیچ فه‌رموده‌یه‌كمان نه‌نوسیوه‌، كـه‌ ئیـشی پـێ نـه‌كرێت‌و مانایـه‌كی كورتمـان كردوه‌،وه‌ ده‌رهێنانی فرمانه‌كانمان داوه‌ته‌ ده‌ست ژیری‌و تێگه‌یشتن .

زۆر به‌ی ئه‌مه‌ش شـــتێكی زۆر گران نیه‌، چونكه‌ به‌ش به‌شه‌و هه‌ر به‌شـه‌ی لـه‌باره‌ی كۆمه‌ڵه‌ فرمانێكه‌وه‌یه‌، هه‌ر له‌ به‌شه‌كانه‌وه‌ حوكمی ئه‌و به‌شه‌ زۆر بـه‌زویی هه‌سـتی پـێ ئه‌كرێت، به‌ڵام ئه‌وه‌نـده‌ هه‌یـه‌، فـه‌رموده‌كانی پێغه‌مبـه‌رمانﷺ كـورت‌و پـڕ مانایـه‌، زۆرجار واده‌بێ كه‌ وه‌ڵامده‌ره‌وه‌ی پرسیاره‌كه‌، ڕوكاره‌كـانی ده‌ورو پـشتیه‌تی، له‌به‌رئـه‌وه‌ ئه‌بینی له‌ فه‌رموده‌یه‌كدا چه‌ند فه‌رمان هاتوه‌. ئه‌و بابه‌ته‌ی، كـه‌ ئـه‌و فـه‌رموده‌مان بـۆ نوسیوه‌ كه‌مه‌و ئه‌و فه‌رموده‌ بۆ چـه‌ند جێگـا ئه‌شـێت، بـه‌ڕای ئێمـه‌ هـه‌وڵمان داوه‌ لـه‌ دووباره‌ كردنه‌وه‌ی فه‌رموده‌كان خۆمان بپارێزین، له‌به‌رئه‌وه‌ براو خوشكانمان پێویسته‌ بـه‌ چاكی سه‌رنجی فه‌رموده‌كان‌و، فرمانه‌كانی ناوی فه‌رموده‌كان بده‌ن‌و، ته‌نها بۆ یه‌ك جێگـا نه‌بێ‌و له‌بیر بچێته‌وه‌، هه‌ر له‌به‌رئه‌وه‌ ده‌بینی زۆر باسی فیقهی هه‌یه‌، ئێمه‌ هێمامـان بـۆ نه‌كردوه‌، چونكه‌، یان فه‌رموده‌ی باوه‌ڕ پێكراومان ده‌ست نه‌كه‌وتوه‌، یـان ئـه‌و باسـه‌ لـه‌ فه‌رموده‌یه‌كدا هاتوه‌، كه‌ له‌سه‌ر باسـێكی تـر نوسـیومانه‌، له‌بـه‌ر دوبـاره‌ نه‌كردنـه‌وه‌ی باسێكی سه‌ربه‌خۆمان بۆ ئه‌و باسه‌ فیقهیه‌ نه‌نوسیوه‌، واتـه‌ فـه‌رموده‌كانی پێغه‌مبـه‌ری ئازیزمانﷺ، هه‌ر یه‌كه‌ بۆ خۆی ده‌ریایه‌كه‌و جۆره‌ها فرمـان‌و سـودی لـێ‌وه‌رئه‌گیرێ و، عه‌قڵ‌و ژیری مرۆڤیش‌وه‌كو یه‌ك نیه‌، مه‌رج نیه‌ فه‌رموده‌یه‌ك، كه‌ زانایه‌ك چه‌ند فرمـانی لـێ ده‌رهێنابێ، ئیتر شتی تری لێ‌وه‌رنه‌گیرێ، زۆر بیسه‌ر بوون‌و ئه‌بن، كه‌ لـه‌ هـه‌ڵگری فه‌رموده‌كان زیاتر ئه‌توانن سود له‌و فه‌رمودانه‌ وه‌ربگرن، كه‌واته‌ قۆڵی مه‌ردانـه‌ی لـێ هه‌ڵكـه‌ن‌و، لـه‌و ده‌ریایـه‌ش به‌شـی خۆتـان نۆشـی گیانكـه‌ن، ئه‌مـه‌ سـێهه‌م پـه‌ڕاوی فه‌رموده‌یه‌[1] جا ئه‌گه‌ر خوا یارمه‌تی داین زیـاتر ئـه‌م كاروانـه‌ كۆمـه‌ك ئه‌كـه‌ین، پـێم

(١) په‌راوی یه‌كه‌م چل فه‌رموده‌ی قودسیه‌، وه‌ په‌رواوی دوهه‌م (١٧٥) فه‌رموده‌یه‌ له‌ هه‌مو بابه‌ته‌و بـه‌ گـوڵزاری چاكان، ناسراوه‌ به‌ڵام به‌داخه‌وه‌، تا ئێستا یه‌كـه‌میان چـاپی به‌خۆیـه‌وه‌ نـه‌دیوه‌و، دوهـه‌میان سـوپاس بۆخـوا هـه‌ر نوسینگه‌ی ته‌فسیر ه‌چاپ كراوبلاو كرایه‌وه‌.

خۆشە بەر لــەوەی بــچمە ســەر فــەرمودەكان ڕونكردنەوەیــەك لــە بــارەی فــەرمودەكانی پێغەمبەرمانەوەﷺ بكەین بۆ ئەوەی سودی زیاتروەبەر براو خوشكانمان بكەوێت، وەكــو كورتەیەكی زۆر كورت لەبارەی (علوم الحدیث)ەوە ئەنوسین. ومــا تــوفیقی الا بــالله علیــه توكلت والیه انیب.

عبد القادر تەوحیدی
١٧/رجب/١٤٢٤ ك هەولێر

# زانستی فەرمودە

فــەرمودە ئەگــەر لــە ڕێگایەکــەوە هــات، کــە جێگــای دڵنیــایی بــو لــە هــەمو سەردەمەکاندا، تا ئەوکاتەی، کە نوسراوەتەوە، ئــەوە پێــی دەوترێــت (متــواتر)و لــەلای هەموان پەسەند کراوە، ئەگەر عەیبێك کەوتە ڕێگای هێنانی، یان وشــەکانی ئــەوە لــەو پلەیە دێتە خوار، لە ڕاســتیدا ئــەم بەشــەی دوهەمیانــە، کــە لــق و پــۆی لێئەبێتــەوەو، هەندێکی بەڕای هەموان ئیشی پێ ئەکرێتو، هەندێکی تر وەلا ئەنرێتو بەشــێکی تــری کێشەی لەسەرە. ئەگەر خوا یاربێ ئێمە بەکورتی ئەو بەشــانە ئەخەینــە بــەردەم ئێــوەی ئازیزو خۆشەویست، بەڵکو ببێ بەمایەی خەیر بۆ ئێوەو، لە کێشانەی چاکەشــدا، (خــوا) بۆ منیشی دابنێت.

١ـ ئەو فەرمودەی، کە لە پێغەمبەرەوەﷺ، هەتا نوسەری ڕیوایەتەکە، پچڕانی تێــدا نەبێو، دەست بەدەست لە ڕیوایەتکەرێکی دادپەروەری هۆش چاكو، ڕیزپەڕیو هۆیــەکی تێدا نەبێ، ئەوە پێی ئەوترێ (صحیح، ڕاستە) (اتصالُ السَّند مِنْ عَدْلٍ ضـابِطٍ خـال عــن العِلة والشذوذ).

٢- ئەگەر لەمبارەوە کەوترا، بۆ یەکــەم لــە دادپــەروەریو هــۆش چــاکیدا، کزییــەك هەبوو، ئەو فەرمودەیە بە (حسن، باش) ناو ئەبرێت.

٣- ئەگەر لەپارچەیەك لــەو پارچــانەی یەکــەم کزیــەکی زیــاتر بــوو، وەك نــەزانینی دادپەروەری کابرای، ڕاوی یان شت تێکەڵاوکردنی هۆشی، یان ڕیزپەڕیەکی تێدا بوو، یــان هۆیەکی تری هەبوو، ئەو فەرمودەیە ئەکەن بە (ضعیف، لاواز) بەو مەرجە درۆزن لــەناو ڕیوایەتکەرەکاندا نەبێ، چــونکە ئەگــەر درۆزن بــوو، ئــەوە بــە (موضــوع، هەڵبــستراو) ئەژمێردرێت، ئەگەر بناسرێت نابێ ڕیوایــەتیش بکرێــت ، مەگــەر بــۆ باســکردنی درۆو

هەڵبەستراویەکەی بێت.

جا ئەگەر بەشی سێهەم لە چەند ڕێگایەکەوە هاتبێو هیچیان درۆزنیان تێدا نەبێ ئەوە ئەبێ بە (حسن لغيره، باشە لەغـەيرى خـۆى)و، دوهـەميش هـەروا، ئەگـەر لـە چـەند ڕێگايەکەوە هاتبێ، ئەبێ بە (صحيح لغيره، ڕاستە غەيرى خۆى)واتـە خۆيـان (حـسن)، يان (صحيح) نين، بەڵام لەبەر چەند ڕيوايەتى تر بە ( حسنو بە صحيح) ناونراون.

ئەم چوار بەشە بەهۆى ژمارەى ڕيوايەتکەرەکانيانەوە ئەکرێن بە سێ بەشەوە:

١- ئەگەر يەك نەفەر لە پێغەمبەرەوە، تـا گەيـشتۆتە پلـەى خـوار (تـابع، تـابعين) هێناويەتى - يەك نەفەر لە يەك نەفـەر- پێـى ئـەوترێ (غريـب)، واتـە فەرمودەيـەکى غەريبەو، ئەگونجێ (صحيح يان صحيح لغيره، يان حسن، يان حـسن لغـيره)، يـان لاواز بێ.

٢- ئەگەر ڕيوايەتکەرەکان لەسەرەوە، تا خوارێ (تـابع تـابعين) دوکـەس بـوون، نـاو ئەبرێ بە عەزيز (العزيز)، واتە شتێکى کەمو نايابە.

٣- ئەگەر زياتر لەو ژمارە ريوايەتيان کرد بوو، لەپاش يارەکانى پێغەمبەر ﷺ،ئەوە پێى ئەوترێت بەناوبانگ (مشهور).

دوبارە بەگوێرەى پچڕانى ڕاويەکانو نەپچڕانى، سێ بەشى سەرەکيى هەيە:

١- ئەگەر نەپچڕاو بوو لە نوسەرى فەرمودەکە، تا پێغەمبەرﷺ، ئەوە پێى ئـەوترێ (مرفوع ـوـ متصل).

٢- ئەگەر لە يارەکانەوە هاتبوو، مـەجالى ڕەئـىو ئيجتهـادى تێـدابوو، ئـەوە پێـى ئەوترێ وەستێنراو(الموقوف)، بەڵام ئەگەر لەبارەى شتانێکى پەنامەکيەوە بوو بە غــەيرى پێغەمبەران ئەو شتە نەئەزانرا، يان بە وشەى (أُمِرنا ـ نُهينا)، يـان (پێغەمبـەرﷺ لـە ژياندا بوو، وامان ئەکرد، ئەمانە هەمويان هەر بە (متصلو مرفوع) حيساب ئـەکرێنو، نابێ بە خاڵێکى لاواز لە ڕيوايەتکەرەکاندا.

٣- ئه‌گـه‌ر تابیعیـه‌ك فه‌رموده‌كـه‌ی لـه‌ پێغه‌مبـه‌ره‌وه‌ﷺ بـاس ئـه‌كردو، نـاوی ئه‌صحابه‌ی نه‌ده‌برد، ئه‌وه‌ به‌ره‌ڵایه‌ (المرسل). ئه‌م به‌شه‌ی دووهه‌مو سێهه‌م وه‌بـه‌ر به‌شـی لاواز (الضعیف) ئه‌كه‌وێت.

هه‌مو ئه‌مانه‌یش ڕیوایه‌تكه‌ره‌كان، یان به‌یه‌ك شێوه‌ چۆن له‌ پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ وه‌رگـیراوه‌و پێغه‌مبه‌رﷺ چۆنی كردووه‌، ئه‌وانیش وایان كردووه‌ له‌پێكه‌نینی‌و هه‌ستانی، ئـه‌وه‌ پێـی ئه‌وترێ (المسلسل) ئه‌گه‌ر به‌وشه‌ی (عن)، (عن فلان)و (عن فلان) هاتبێ، پێـی ئـه‌وترێ (مُعَنْعَن).

## چـه‌ند تێبـینیه‌ك:

١- ئه‌م به‌شه‌ی فه‌رموده‌ -واته‌ (خبر الاحاد) ئه‌كرێ بـه‌ به‌ڵگـه‌ له‌سـه‌ر عیبـاده‌ت و مامه‌ڵه‌دا، به‌ڵام كۆڕی زانایانی ئوصولی ئه‌ڵێن نابێ به‌ به‌ڵگه‌ له‌باره‌ی ئه‌و شتانه‌ی، كـه‌ په‌یوه‌ندی به‌ بیروباوه‌ڕ (العقیدة) هه‌یه‌ مادام زۆر نه‌بن، چونكه‌ ئه‌وه‌ی به‌ناوبانگـه‌و زۆره‌، ئه‌بێ به‌هۆی ئارام گرتنی دڵ، هه‌روه‌كو زۆری ڕیوایه‌تكه‌ره‌، زۆری به‌ڵگه‌و قه‌رینـه‌كانیش، به‌ڵام ئه‌وه‌ی، كه‌ تاكه‌ لـه‌ هـه‌مو ڕوویه‌كـه‌وه‌ نابـێ بـه‌ به‌ڵگـه‌، له‌سـه‌ر هـیچ شـتێكی بیروباوه‌ڕو عه‌قیده‌یی، هه‌ركه‌سێك دژایه‌تی فه‌رموده‌یه‌كی‌وا بكات، كافر نابێ، ته‌نها بـه‌ فه‌رموده‌ی (متواتر)، یان ئه‌وانه‌ی، كه‌ به‌ قه‌تعی له‌ ئاییندا زانراون وه‌كو نوێژو زه‌كـات‌و حه‌ج‌و ڕۆژو جیهادو ئه‌مر به‌ چاكه‌و به‌رگری له‌ خراپه‌و به‌هه‌شت‌و جه‌هه‌نه‌م، كافر ئـه‌بێ، به‌ڵام تاوانێكی زۆر گه‌وره‌یه‌.

٢- زۆر فه‌رموده‌ی (آحاد) هه‌یه‌، به‌ڵام له‌ ڕاستیدا حوكمی (متواتر)ی هه‌یـه‌، وه‌كـو ئه‌و شتو ڕووداوانه‌ی، كه‌ له‌ناو كۆمه‌ڵێكی زۆردا ڕوویداوه‌، له‌ پاشا یـه‌كێ، یـان دوو لـه‌ یاره‌كانی پێغه‌مبه‌رﷺ باسیان كردوه‌و كه‌س نه‌یووته‌وه‌ وانه‌بووه‌، وه‌كو ده‌سـت خـستنه‌

ناو ئاوێكی كەم لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺو سوود وەرگرتنی زیاتر لە هەزار كەس لەو ئاوەو، سەدان فەرمودەی تری ئاوەها، كە باسكراوە كەس دژایەتی نەكردووە.

٣- مەرج نیە فەرمودەیەك لە ڕیوایەتێكدا- لاواز یان هەڵبەستراوە دابنرێ- هەمان فەرمودە لە ڕیوایەتێكی تردا هەروابێ یان كە بەرچاوت كەوت لەلایەك ئەو تانەیەی لێبدرێت، ئیتر هەمان فەرمودە پشتگوێ بخرێت، بەڵكو پێویستە تەماشای هەمو ڕیوایەتەكانی بكرێت، جا ئەگەر لە هەمویاندا هەر كەسێكی درۆزنی تێدا بوو، ئەوە لایەو هیچ حیسابێكی بۆ مەكە لەبارەی حەرام یان حەڵاڵ كردنەوەوە ، ئەگەر لە هەمویاندا درۆزنی تێدا نەبوو ، یان لە زۆربەیانداوە ڕیوایەتەكانی زۆربوون، بەكۆی هەمویان دەگاتە (حسن لغیره)و دروستە ئیشی پێ بكرێت، بەو مەرجەی دژایەتی بۆ ئایەت، یان فەرمودەیەكی لەخۆی بەهێزتر، ئەم جۆرە باسانە لەو كتێبانەدا زۆرە، كە شەرحی فەرمودەیان كردوە، وەكو (فتح الباري و نیل الاوطار).

٤- مەرج نیە كە وترا- ئەم فەرمودەیە- ئیسنادەكەی - ((صحیحه)) فەرمودەكەش (صحیح) بێ، چونكە مەرجی تر پێویستە بۆ (صحیح) بوون، كە ئەبێ زیادەیەكی تێدا نەبێ، كە لەگەڵ ڕیوایەتی (صحیح) تری ئەو فەرمودەدا دژایەتی بكات، یان هۆیەكی تری وای نەبێ، كە زیان بەو فەرمودە، بگەیەنێ، كە ئەوە تەنها كۆمەڵێكی كەم لە هەمو سەردەمێكدا بەو شتە نادیارە ئەزانن، سوپاس بۆ خوا ئێستا فەرمودەكانی پێغەمبەرمان ﷺ بەپاكو پوختەیی لەبەردەست ئێمەدانو، لە هەمو سەردەمێك زیاتر ناسینی فەرمودەكانی ئاسان تر بووە ، خوای گەورە جەزای خێری پێشەواكانی پێشومان بداتەوەو بە بەهەشتی بەرینیان شاد بكات، ئەگەر ئەركی ئێمە لەم سەردەمەدا تەنها ئەوە بێت، كە بخوێنینەوەو مانای دروستیان بزانینو، ئەوەی پێویست بێت، بەگوێرەی توانا لەبەركرێتو دڵسۆزانە بە خەڵكی ڕاگەیەنین، زۆر باشەو هیوادارم وەبەر شەفاعەتی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بكەوین. بەكورتی فەرمودە چوار بەشە:

یەك ـ یان مەتن‌و سەنەد هەردو (حسن) یان (صحیح)ن.

دوو ـ یان هەردوو بە پێچەوانەوەی یەكەمین.

سێ ـ یان مەتن (حسن یان صحیح)ەو سەنەدەكەی لاواز یان هەڵبەستراو (موضوع)ە.

چوارـ یان سەنەدەكەی(حسن) یان (صحیح)ە، بەڵام (مەتنە)كەی وەرناگیرێ لەبەر {شذوذ، یان علة، یان سەقامگیر نەبوە (مُضْطروب)}ە، كە ئەمەی ئاخر، هۆیەكی ترە بۆ لاوازكردنی سەنەدەكەیش، واتە ئەگەر لە سەنەدەكەیشدا بە چەند شێوە هاتبێ جارێكی تر ناوی نەفەرێ گۆڕابێ‌و جارێ نەفەرێ زیاد، یان كەم كرابێ، ئەوەش كار ئەكاتە سەر سەنەدو لاوازی، یان لە پلەی (صحیح)ەوە دایئەبەزێنێ بۆ (حسن).

**٥ـ** هەر زانایەك بەناوبانگ بوو بۆ (گۆڕین (تدلیس)) هەرچەند پلەی بەرزیش بێ، مادام بەوشەی (عن) لەژور خۆیەوە فەرمودەی هێنایەوە، لێی‌وەرناگیرێ‌و پێی ئەوترێ (مودەلیس)، جاریوا هەیە لە سەنەدەكەدا ئەوە ئەكات‌و، هەندێ جاریش لە (مەتنەكە)دا ڕوو ئەدات.

# لاسایی کــردنەوە ( التقــليد )

تەقلید لە ڕوانگەی ئاییینەوە، زانایان بەم شێوەیە مانایان کردوە: (قبول قول الغير من غير معرفة بدليله: وەرگرتنی قسەی خەڵك بەبێ ئەوەی بەڵگەی بناسێت) کەوابوو وەکــو وتمان، ئیش بە قورئانو فەرمودەی پێغەمبەرﷺو ئیجماع، ئەگەر بزانرێت وەبەر تەقلید ناکەوێت.

زانایان لەبارەی تەقلیدەوە سێ بۆچوونیان هەیە:

١- هەندێکی دەڵێن حەرامە.

٢- هەندێکی دەڵێن پێویستە (واجب).

٣- هەندێکی تریان ئەڵێن، ئەگەر بۆی بکرێت، پێویستە (اجتهاد) بکاتو، ماوە بــە تەقلید ئەدەن کاتێ، کە توانای (اجتهاد) نەبێ، یان زۆر سەخت بێ.

ئەوەی کە عەوامەو توانای ئیجتیهادی نیە، پێویستە تەقلید بکات.

ئەو کەسەی شتێکی لە زانین وەرگرتبێو مەرجەکانی ئیجتیهــادی تێــدا نــەبێ ئــەبێ تەقلید بکات. بۆی هەیە لەبارەی بەڵگەکانو چۆنیەتی گەیاندنی ماناکانیانــەوە تەقلیــد بکات.

ئەو کەسەیش کە ئەهلیەتی ئیجتیهادی پەیــدا کردبــێو مەرجــەکانی تێــدا هــەبێو، بەڵام وەختەکەی تەنگ بێو نەگات بە ئیجتیهــاد لــەبارەی هــەر فرمانێکــەوە، ئــەویش دروستە تەقلید بکات.

ئەو کەسەی هەندێ مەرجی ئیجتیهادی تێدابێو هەندێکی تێدا نەبێ، وەکو ئەوەی، کە فەهمو دەرکی باش بێو لەو بوارەدا پێگەیشتبێ، بەڵام ناسینی ڕێگای سابت بــوونی فەرمودەی بۆ پەیدا نەبووبێ، ئەوە پێویستە لەبارەی ســابت بــوونی فــەرمودەوە تەقلیــد بکات، بەڵام بۆ وەرگرتنی ماناکانیان ئیجتیهاد بکات.

شەوكانی یەكێكە لەو زانایانەی، كە تەقلیدی بەلاوە حەرامە، بەڵام ئەو لە نێوان تەقلیدو ئیجتیهادا پلەیەكی تری داناوە بەناوی (الإتباع)، پێش ئەویش كۆمەڵێك لە لێكۆڵەرەوەكان (المحققين) ئەم شتەیان وتوە، وەكو لە (إعلام الموقعين لابن القيم) داهاتووە ٢٦٠/٤. ئەویش بریتیە لە پرسیاری نەزان لە زانا لەو شتەی، كە بۆی هاتوەتە پێش، نەك پرسیار لە رەئی خۆی بكات، بەڵكو پرسیار لە ڕەئی شەرع ئەكات لەو زانایە، واتە ئەڵێ: ئایە ئەمە قسەو بۆچوونی خۆتە، یان شەرع، جا ئەگەر وەڵامی دووهەم بو بە گوێی ئەكات. هەرچەندە ئەمە بەڵگەی دڵسۆزییە، تا خەڵك خواو پێغەمبەری پێ بناسرێتو قسەی ئەوان بە فەرزو پێویست لەسەر خۆی بزانێ، نەك وابزانێ، كە قسەی زانایەك پێش قسەی ئەوانەو، لەباتی پەرستنی خواو پەیڕەوكردنی پێغەمبەرﷺ بە نەزانیو، دوچاری نەفس پەرستنو مەزهەب پەرستن بێ؟!

هەرچەند ئەم مەبەستە شتێكی پیرۆزو ڕاستو دروستە، بەڵام ماوە نەدان بە تەقلید شتێكی نەگونجاوەو زیادە ڕەوییەو نكوڵییە لە شتە ئاشكراكان، چونكە نە هەمو كەس ئەتوانن بگەنە ئەو فەهمە لە هەمو شتێكدا لە بەڵگەو شێوەی ماناكەی تێبگەن، نەهەمو زانایەكیش ئەتوانێ هەركەسێ پرسیاری لێكردن ئەو شتەی بۆ ڕۆشن بكاتەوە. كەوابو تەقلید هەر دەبێ هەبێ، بەڵام تێگەیاندنو پێگەیاندنی خەڵك ئەركێكی گەورەو گرنگی سەرشانی زانایانە، كە بە هەمو هۆیەك بۆی بچێت بەتایبەت، ئەگەر ئەمڕۆ ئیسلام یاسا بێتو ئەو هەمو هۆی ڕاگەیاندنانەی، كە دەیان كاتژمێر ڕۆژان دژی ئیسلامو ئایین ئەنووسنو ئەدوێنو پیشان ئەدەن، یان بە ئیشی بێ هودە خەڵكی سەر گەرم ئەكەن، یان بە قومارێكی وەكو گۆڵێن سێ چوار سەعات ڕۆژانە پیشان ئەدرێت، خەڵكێكی زۆری پێوە خەریك ئەكەنو لاوانێكی زۆری بۆ هەڵ ئەنێن، بەڵام بەداخەوە ئامادەنین ڕۆژانە سێ كاتژمێر تەرخان بكەن بۆ ڕۆشنكردنەوەی ڕاستیو تێگەیاندنو پێگەیاندنی نەوەی ئاییندە فإلى الله أشتكي.

بەڕاستی ئەگەر ئەوانە دڵسۆزانە بۆ ئیسلام ئیش بكەن بە ماوەیەكی كەم خەڵكێكی زۆر بەو پلە ئەگات، كە پرسیاری بەڵگە بكات،، یان خۆی بەڵگەی هەبێو لەسەر كارو پێشهاتەكانی خۆیو خەڵكی دەوروبەری، كەوابوو باشترین بۆچوون لەمبارەوە، قسەی

بەشی سێیەمە، ئەوەی توانای ئیجتیهادی هەبێ و بۆی بلوێت ئەبێ تەقلید نەکات، وە ئەوی تری ئەبێ تەقلید بکات.

هەر بەم مانای سەرەوە مانای ئەو قسە پیرۆزەی زانایانی پێشین ئەکەین، کە گوتویانە: (لا تُقَلِّدْنی وَلا تقلد مالِكاً وَالشافعی وَخُذْ من حیث أخذوا) نە تەقلیدی مـن بکەو نە تەقلیدی مالك نە شافعیو بکەو، تۆش بۆ خۆت لەو جێگەوە وەری بگرە، کە ئەوان وەریانگرتوە، ئەم جۆرە قسانەیان بەو قوتابیانەی خۆیان وتوە، کە توانای ئیجتیهادیان بووەو هەڵیان ناون لەسەر شتێك، کە لە توانایان دابووە، وە ئەم قسەی ئەوانە ڕوو بە نەخوێندەواران نیە، بەڵام لە شێوەی قسەکانیانەوە ئەوە وەرئەگیرێ، کە با نەخوێندەوارانیش بزانن ئایین کامەیەو، ئەبێ بەقسەی کێ بکەنو قسەی کێ میزانی ڕاستیو ناڕاستی مرۆڤەو کەم کەموەکووتمان بەرەو تێگەیشتنو پێگەیشتن هەنگاو هەڵگرن، بۆچی لە هەمو کاروبارێکی دونیاییدا هەمو بەحری بێ پەین، بەڵام لەبارەی ئایینەوە جۆگەلەیش نین؟! بەمەرجێك هاتنی ئێمە بۆ دونیا بۆ بەهەشت یان دۆزەخە، چونکە لەسەر ئەم ئایینە ئەو دوو جێگە ئەدرێ بە مرۆڤ، یان ئایینی ناسیوەو بەگوێرەی توانای هەوڵی بۆ داوە، یان یەکەم بۆ بەهەشتەو دووهەم بۆ دۆزەخو ماڵێکی تری ناوەڕاست نیە (اَلكَیِّسُ من دان نفسه وعمل لما بعد الموت: ژیر ئەو کەسەیە، کە نەفسی ڕام ئەکاتو ئیش ئەکات بۆ پاش مەرگ) بەڵێ بەڕاستی ئەو بەهەشتەو ئەو جێگا خۆشو هەمیشەییە بۆ کارو تەلاش ئەشێت ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾، پەلە بکە بۆ لێبووردنی پەروەردگارتانو بەهەشتێك کە پانایییەکەی بەئەندازەی ئاسمانانو زەوییە، کە ئامادەکراوە بۆلە خواترسان). [(١)]

**عبدالقادر تەوحیدی**

**١٧/ رجب/ ١٤٢٤هـ.ق هەولێر**

---

(١) (آل عمران ـ ١٣٣).

# بەشـی پـاك و خاوێنـی

١- ن/١ ((عن أبي هريرةؓ قال سأل رجلٌ رسول اللهﷺ فقال: يارَسُولَ الله إنَّا نركبُ البَحْرَ ونَحملُ مَعَنَا القليل مِنَ الماء فان تَوضَئأنا به عَطِشْنَا اَفَتَوضَّأُ بماء البَحْر؟ فقال رسولُ اللهﷺ: هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الحِلُّ مَيْتَتُهُ)). رواه الخمسة، وقال الترمذي. (هذا حديث حسنٌ صحيح).

له ئەبو هورەیرەوەؓ ئەگێڕنەوە، کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خواﷺ کردووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لەناو دەریادا هاتووچۆ ئەکەین‌و، ئاوی کەم لەگەڵ خۆماندا هەڵ ئەگرین، جا ئەگەر بەو ئاوە دەستنوێژ بگرین تینو ئەبین، ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟

پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: دەریا ئاوەکەی پاکژکەرەوەیە مرداربووەکانیشی حەڵاڵە، واتە دروستە دەستنوێژ پێ‌گرتنی، هەر زیندەوەرێکی ناو دەریایش بمرێت، تا بۆگەن نەکات حەڵاڵە خواردنی...

٢- ن/٢ ((عن أنس بن مالكؓ قال، رأيتُ رسول الله وحانت صَلاةُ العَصْرِ فَالْتَمس الناسُ الَوضُوءَ فلم يجدوا فَأُتي رسول اللهﷺ بوَضُوءٍ فَوَضَعَ رسول اللهﷺ في ذلك الاناءِ يَدَهُ وَاَمَرَ النَاسَ اَن يَتَوَضَّأوا منْهُ فَرَأَيْتُ الماءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ اَصَابِعِهِ حَتى تَوَضَّأوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ. مِتَّفَقُ عَلَيْهِ ومِتَّفَقُ على مثل مَعْنَاهُ مِنْ حديث جابر بن عبدالله)).

له ئەنەسی کوڕی مالیکەوەؓ ئەگێڕنەوە، کە ئەڵێ پێغەمبەری خوام دی، کە کاتی نوێژی عەسر بوو، خەڵکی بەشوێن ئاوی دەستنوێژدا ئەگەڕان‌و دەستیان نەکەوت، جالەو کاتەدا هەندێ ئاوییان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەرخواﷺ،ئینجا پێغەمبەریشﷺ دەستی خستە ناو ئەو کاسە ئاوەوەو فەرموی، با خەڵك بێن دەستنوێژی لێبگرن، ئەمدی

ئەو ئاوە لەژێر پەنجەکانیدا هەڵ ئەقولا، هەتا هــەمویان دەســتنوێژیان لــێ شــۆری. لــە ڕیوایەتی جابیردا ئەڵێ (١٥٠٠) هەزارو پێنج ســەد بــووین، وە ئەگــەر ســەد هــەزاریش بوینایە بەشی ئەکردین.

لەم فەرمودەدا زۆرشت وەرئەگیرێ، لەوانە:

أ- شتێکی چاکە مرۆڤـ لەکاتی پێویستی دا ئاوی لەخۆی زیاد ببەخشێ.

ب- دروستە بە هەردوو دەست لە ئــاوی کــەم دەربهێنرێــتو ئاوەکــە پێــی ناوترێــت بەکارهێنراو، لەبەرئەوەیە ئیمامی شافیعی دەست شــۆرینی پــێش خــستنە نــاو کاســەی ئاوی بەلاوە چاکە نەك پێویست، بەو مەرجەی دەستی پیس نەبێ، ئەوە ئــەبێ پێــشەکی دەستی بشوات تائاوە کە پیس نەکات.

ج- دروستە بە ئاوی پیرۆزی وەکو زەمزەم دەستنوێژ بگیرێت. ئاشکرایشە، کە ئەمــە یەکێکە لە موعجیزە گەورەکانی پێغەمبەری خواﷺ.

٣- ن/٣ ((عن جابرؓ قال: جاء رسول اللهﷺ يَعُودُني وَأنا مَريضٌ لا اَعْقِلَ فَتَوضَّأَ وَصَبَّ وَضَوَهُ عَلَيَّ. متفق عليه)).

لە جابیرەوەؓ ئەگێڕنەوە، کەوتوویەتی پێغەمبەری خواﷺ هاتە سەردانم، کــە مــن نەخۆش بوومو هۆشم لای خۆم نەبوو، جــا پێغەمبــەرﷺ دەســتنوێژێکی شــۆریو ئــاوی دەستنوێژەکەی کرد بەســەرما، لێــرەدا ئــەوە وەرئــەگرین، کــە ئــاوی دەســتنوێژ پاکــە، هەروەها سەردان لە نەخۆش سوننەتێکی پێغەمبەری ئازیزمانــە، وەکــو لــە فــەرمودەی تردا ئەم باسەی بۆ کردووین، (صلى الله عليه وعلى آله وسلّم تسليماً كثيرا).

٤- ن/ش/٥ ((عن أبي هريــرة ؓ قــال: ان النبّــي الله ﷺ فقــال لَــهُ: سُــبْحانَ اللهِ اِنَّ المُؤمِنَ لا ينجس)).

لە ئەبوو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو: پاكو بێعــەیبی بــۆ خوا، بەڕاستی باوەڕدار پیس نابــێ. ئــەڵێن ئــەبو هــورەیرە لــە یــەکێك لــە کۆڵانــەکانی

مەدینەدا توشی پێغەمبەرﷺ هات، لەشی پیس بوو، لەبەرئەوە خۆی دزییەوەو خۆی شۆرد، ئینجا هاتەوە خزمەتی پێغەمبەرو، پێی فەرموو ئەبو هورەیرە لەکوێ بویت؟ ئەویش وتی لەشم پیس بوو پێم خۆش نەبوو بە پیسی لەگەڵتا دانیشم، ئینجا پێغەمبەرﷺ ئەوەی فەرموو. واتە: مسوڵمان دروستە بە لەشی پیس لەگەڵ مرۆڤی زاناو چاکدا دابنیشێو بە لەش پیسی بمێنێتەوە، بەو مەرجەی فەرزەکانی نەفەوتێت، ئەگەر چی خۆشۆردنەکەی چاکترە، وەکو لە فەرمودەی تردا هاتووە.

٥- ن/١٠ ((عن إبن عباسرضي الله عنه قال ان رسول اللهﷺ كان يَغْتَسِلُ بفَضْل مَيْمُونَةَ)) رواه احمد ومسلم.

لە عەبدولای کوری عەباسەوە ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پاشماوەی ئاوی مەیمونەی خێزانی خۆی شۆردووە. ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی، کە ئەو قەدەغەیەی، کە هاتووە، ئەگەر سابت بێت بۆ پاكو خاوێنیەو هیچی تر، واتە فەرمودەی شەشەم، کە ئەڵێت:

٦- ن/٩ ((عن الحَكم بنِ عمرو الغفاري أَن رسول الله ﷺ نَهَى ان يَتَوَضَّأُ الرَجُلَ بفَضْل المرأة)). رواه احمد والترمذي وأبو داود وقال الترمذي هذا حديث حَسَنٌ .

لە حەکەمی کوری عەمری غەفارییەوە رضي الله عنه ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرگری کردوە لەوەی، کە پیاو بە پاشماوەی ئاوی خۆشۆردنی ئافرەت خۆی بشۆرێت.

٧- ن/١٣((عن ابي سعيد الخدري قال: قيل يارسول الله انتَوَضَأُ مِن بِئْرِ بُضاعَةَ وهي بِئْرٌ يُلْقى الحِيَضُ ولُحُومُ الكِلابِ والنَتْنُ؟! فقال رسول اللهﷺ الْماءُ طَهُورٌ لا يُنَجِسهُ شَيءٌ)) رواه أحمد وابو داود والترمذي وقال حديث حسنٌ.

لە ئەبوو سەعیدی خیدریەوە ئەگێڕنەوە، کەوتوویەتی : بە پێغەمبەری خواﷺ بێژرا، ئایا تۆ دەستنوێژ ئەگریت بەئاوی بیری بوزاعە، کە ئەوە بیرێکە ئافرەتان پەڕۆی بێنوێژی

خۆیانی تێ فڕێ ئەدەنو گۆشتی سەگی تێ ئەکرێتو بۆگەنە؟!

پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ئاو پاکۆکەرەو هیچ شتێك پیسی ناکات. واتە ئاو یەکێکە لەو نیعمەتە گەورەو بەنرخانەی خوا، کە بە هیچ شتێك پیس نابێ، بەڵکو پیسەکانی پێ پاك ئەکرێتەوە، بەو مەرجەی خۆی یەکێك لەو سێ شتانەی تێدا نەبێت، تامو ڕەنگو بۆنی بەشتی دەرەکی نەگۆڕابێ، واتە ئەگەر گۆڕانەکە بەهۆی زۆر مانەوەی بوو لەو شوێنەدا، یان تامو بۆنی ئەو خاکەوابوو، کە ئاوەکەی تێدایە زیانی نیەو لە پاکیەتیو پاکۆکەرەوەی ناکەوێت.

٨- ن/١٥((عَنْ أبي هريرة ﷺ ان النبّيّ ﷺ قال: (لا يَبُولَنّ اَحَدُ كُم في الْماءِ الدائِم الذّي لاَيجَرْي ثُمّ يَغْسِلَ فيه) رواه الجماعة وهذا لفظ البخاري ولفظ الترمذي (ثم يتوضَأُ مِنْهُ))).

لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هیچ کام لە ئێوە میز نەکاتە ئاوێکی وەستاوەو لەپاشدا خۆی لێ بشۆرێت، بەم شێوەیە ئیسلام داوا لە پەیڕەوانی ئەکات، کە پاكو خاوێنی ئاوە وەستاوەکان بپارێزنو پیسیان نەکەن، نە بە میز تێکردن، نە بە خۆشۆردن لەناویاندا. لەوشەی تورمزیدا (پاشان دەستنوێژی لێ بگرێت).

٩- ن/ ١٦ ((وعنه قال: قال رسول الله ﷺ: (اِذَا وَلَغَ اْلكَلْبُ في اِناءِ اَحَدِكُمْ فَلْيرُقْهُ ثُمْ لِيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرَاتٍ) رواه مسلم والنسائي.

هەر لەوەوە ئەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ئەگەر سەگ دەمی خستە دەفری یەکێکتانەوە، با هەرچی تێیدایە، مادام تەڕ بێت بیڕێژێتو، لەپاشدا حەوت جار بیشۆرێت، ئەو شۆردنە دەبێ جارێکیان خۆڵی لەگەڵ بێ، وەکو لە ڕیوایەتی تردا هاتووە.

١٠- ن/١٧ ((عَنْ كَبْشَة بنتِ كعب بن مالك – وكانت تحت ابن ابي قتادة – اَنّ اَبَا

قَتَادَة دَخَلَ عَليها فَسَكَبَتْ لَهُ وَضُوءً فَجَاءَتْ هِرَّة تَشْرَبُ مِنْهُ فأَصغى لَهَا الإنَاءَ حَتى شَرِبَتْ مِنْهُ قالَتْ كَبْشَةُ: فَرَآني اَنْظُرُ فَقالَ: اَتَعْجَبِينَ يَاْبنَةَ اَخي؟ فَقُلْتُ: نَعمْ! فَقالَ: اِنّ رَسُولَ اللهﷺ قال: (اِنَّها لَيْسَتْ بَنجِسٍ اِنَّها مِنْ الطَّوَّافينَ والطَّوَّافَاتِ) رواه الخمسة وقال الترمذي: حَديثَ حُسن صحيح)).

له كەبشەی كچی كەعبی كوڕی مالیك- كە خێزانی كوری ئەبوو قەتادە بوو- ئەگێڕنەوە، كە ئەبوو قەتادە هاتوەتە ماڵی‌و بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن ئاوی كردووە بە دەستیا لەوكاتەدا پشیلەیەك هاتووەو لە ئاوەكەی خواردۆتەوە، ئەویش كاسەكەی بۆ ڕاگرتووە، تا تێری خواردووە لە ئاوەكە، كەبشە ئەڵێ منی بینی، دی كە من تەماشای ئەكەم، وتی: ئەی كچی برام بەلاتەوە سەیرە ؟! وتم: بەڵێ!

وتی پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ئەوە پیس نیە، چونكە شتێكە زۆر زۆر هاتوچۆتان ئەكەن‌و تێكەڵاوتان ئەبن. واتە: خۆپاراستن لێیان سەختە، لەبەرئەوە بەپیس دانەنراوە.

لەم فەرمودەوە دەرئەكەوێت، كە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەمیشە هەوڵی ئاسانكاری ئەدات لەناو مرۆڤدا، ئەگەر مرۆڤ لەخۆی تێك نەدات‌و دژایەتی فەرمانەكانی خواو پێغەمبەر نەكات، دیسان ئەوەمان تێ ئەگەیەنێ، كە ئیسلام نەك تەنها مشورخۆری مرۆڤە، بەڵكو خاوەنی سۆزو بەزەییە بۆ ئاژەڵانیش، ئەوەتە ئەو یارە بەڕێزەی پێغەمبەرﷺ چۆن لەسەر دەستنوێژەكەی خۆی‌وەستاو، بەو شێوە جوانە پشیلەكەی ئاودا، جا سەدان فەرمودەی تر لەمبارەوە هەیەو، ئەمە نموونەیەكی بچووكی بوو.

١١- ن/٢١((عن أسْماءِ بنْت ابي بكر قالَتْ: جاءَتْ امرَءَةٌ الى النبّيﷺ فقالَتْ احدانا يُصيبُ ثَوْبَهَا مِنْ دَمِ الحَيضَة كَيْفَ تصْنَعُ بِهِ؟ فَقالْ: تَحُتُّهُ ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالَماءِ ثُمَّ تَنْضَحُهُ ثُمَّ تُصَلِّي فيهِ)). متفق عليه.

له ئەسمای كچی ئەبو بەكرەوە (خوا لەخۆی‌و باوكی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە، كە وتویەتی ئافرەتێك هاتوەتە خزمەتی پێغەمبەرەﷺ وتوویەتی: ئەگەر یەكێك لە ئێمە پۆشاكەكەی خوێنی بێ نوێژی پێوە بو، چی لێ بكات؟

فەرمویەتی: با پێشەكی بی پروێنێت –گەر وشـك بـو- ئینجـا بـە ئاویـشەوە چـاك لەنێوان پەنجەكانیدا بی پڕوێنێتو لەپاشدا بەچاكی بە ئاو بیشۆرێت، ئینجا نوێـژی پێـوە بكات، واتە بەو شێوە شۆردنە، پۆشاكەكەی پاك ئەبێتەوەو مانی ڕەنگەكەی زیانی نیــە، ئەگەر بەوجۆرە شۆردنە لانەچوو، لە لایەكی ترەوە ئەوەمان بۆ دەرئەكەوێت، تەنها بــەو خوێنە، یاخود شتێكی پیــسی تــر پۆشـاكەكەی پـیس ئـەبێ، ئـەگینا ئەگـەر خـوێنی بەرنەكەوت پێویست ناكات پاش پاكبونەوەو خۆشـۆردن پۆشـاكەكەی بـشۆرێت، چـونكە ئارەقی كاتی بێ نوێژیی، زیانی بێنوێژ كردنی نیە.

١٢- ن/٢٦((عن ابي هريرةرضي الله عنه قال: قَامَ اَعرابٌّي فَبَالَ في الْمَـسْجدِ، فَقَـامَ اِلَيـهِ النّـاسُ لِيَقَعُوا بِهِ فَقالَ النبّيﷺ (دَعُوهُ وَاَريقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِـنْ مَـاءٍ (او ذَنُوبـاً مِـنْ مَـاءٍ) فَإِنَّماَ بُعِثْتُمْ مُيُسَرِّينَ وَلَمْ تُبْعَثوُا مُعَسِّرِينَ).)) رواه الجماعة الاّ مُسلماً.

لە ئەبوو هورەیرەوەرضي الله عنه ئەگێڕنــەوە، كـە وتوویــەتی عــەرەبێكی دەشــتەكی هەســتاو میزی كردە مزگەوتەوە، خەڵكەكەش هەستان بۆی، بۆ ئەوەی لێی بدەن، جا پێغەمبــەری خواﷺ فەرموی وازی لێبهێننو سەتڵێك ئاو بكەن بەسەر میزەكەیـدا، بەڕاسـتی ئێـوە بـۆ ئاسـانكاری ڕەوانـەكراونو ڕەوانـە نـەكراون، كـە زەحمــەتكار بــن، لــەم فــەرمودەوە ئەمانەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە:

أ- زەوی پیس بوو بە میزو شتی تەڕ، گەر ئاو بەسەریدا بكەیت پاك ئەبێتەوە.

ب- ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینێكە، بۆ ئاسوودەی ژیانو ئـیش ئاسـان كـردنو دژی زەحمەتییە، واتە بڕیارەكانی هەموی ئاسانەو ئاسـانكارییەو شـتی زەحمــەتی تێدا نیــە، ئەگەر بەچاكی شارەزای ببینو سـودو حیكمەتــەكانی بـزانین، نــەك بــەو مانایــە واز لــە دەقەكان بهێنینو وابزانین ئەوە ئاسانكارییە، نەخێر ئەوە لادانو سەر لــێشێواوییە.

ج- بە هێواشیو بەنەرمی جوولانەوە لەگـەڵ نەزانانـدا، ئەگــەر چـی ئیشەكەیـشیان شتێكی ناڕەواو نادروستو ناشیرین بێ، واتە هەر كەسێك بە گـوێرەی دەركو شـارەزایی

لە ئايين مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت، چەندە شارەزا بێت تاوانەكەی زیاتر ئەبێ، پێچەوانەكەیشی هەروەها.

١٣- ن/٢٩ ((عن ابي سعيد أنّ النبّيﷺ قال: اذا جَاءَ اَحَدُكُمُ الْمَسْجدَ فَلْيَقْلِبْ نَعْلَيْهِ وِلْيَنْظُرْ فيهما فَاِنَ رَأَى خَبَثاً فَلْيَمْسَحْهُ بِالأَرْضِ ثُمَّ لِيُصَلِّ فيهمَا)). رواه احمد وابو داود .

لە ئەبوو سەعیدەوە ئەگێڕنەوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەركام لە ئێوە هەركاتێ هات بۆ مزگەوت، با تەماشای ژێری پێڵاوەكەی بكات، ئەگەر پیسییەكی پێوە دی، با بیسڕێت بەزەویداو لەپاشدا نوێژیان پێوە بكات. واتە دروستە بە پێڵاوەوە نوێژكردن بەو مەرجەی پیس نەبێ، ئەگەر پیس بوو بە سڕین بە زەوی پاك ئەبێتەوەو پێویست بە شۆردن ناكات، چونكە بەو خاكە پاك ئەبێتەوە. دیارە ئەمە لەو مزگەوتانەدا پێڵاو بردن چاكە كە فەرشی تێدا نەبێ، وەكو مزگەوتەكانی سەردەمی پێغەمبەرمانﷺ، نەك ئەو مزگەوتە نەخشو نیگاركراوانەی ئاخر زەمان، سیمای جوانو چاك، بەڵام خاڵی لە باوەرداری ڕاستو پاك. ئیسلام دژی پاكو خاوێنیو جوانی نیە، بەڵام دژی زیادە ڕەویو زیادو بێكەڵكە، بە مەلایین باوەڕداری ڕاستو پاك بێ ماڵەو منارەیەكی هەندێ لە مزگەوتەكان بەشی چەند ماڵە؟!

١٤- ن/٣١ ((عن علي بن أبي طالبرضي الله عنه اَنَّ رسولَ اللهﷺ قال (بَوْلُ الرَّضيع يُنْضَحُ وَبَوْلُ الْجارِيَةِ يُغْسَلُ).)) رواه احمد والترمذي وقال: حديث حسن.

لە عەلی كوڕی ئەبو تالبەوەرضي الله عنه ئەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: میزی كوڕی شیر خۆر ـ ئەگەر بە پۆشاك بكەوێت ـ ئاوی پێدا ئەكرێتو پێویستی بە شۆردن نیەو، میزی كچ ئەشۆرێت.

١٥- ن/٣٧((عن اَنَس بن مالك اَنَّ رهطاً مِنْ عُكْلٍ ـ أَو قَالَ عُرَيْنَة ـ قَدِموا فاجْتَوُا المَدينَةَ فَأَمَرَ لَهُمْ رَسُولُ الله بِلقاحٍ واَمَرَهُمْ اَن يَخْرُجُوا فَيَشْرَبُوا مِنْ اَبْوَالِهَا وَاَلْبانِها ـ متفق عليه)) . لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە رضي الله عنه ئەگێڕنەوە، كە كۆمەڵە خەڵكێكی عُوكل،

یانوتی عورەینە هاتنە مەدینەو لە پاشدا دانیشتنی مەدینەیان بەلاوە ناخۆش بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فرمانی بردنە دەرەوەی چەند وشترێکی شیردەری داو، بەوانی فەرمو بچنە دەرەوەو لە میزو شیری ئەو وشترانە بخۆن، جا ئەمە ئەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوە، کە وەکو شیر پاکە باقی شتەکانی تری حەیوانی گۆشت خوراو پاکەو، بەڵگەشیان بەهێزە[1].

١٦- ن/٣٨ ((عن سَهْلِ بن حُنَيف قال كُنْتُ اَلْقَى مِنَ المَذْي شِدَّةً وَعَنَاءَ وكُنْتُ اُكْثِرُ مِنْهَ الاغْتِسَالَ فَذَكَرْتُ ذلِك لِرَسُولِ اللهِ ﷺ وسَأَلْتُهُ عَنْهُ؟ فقال: (اِنَّما يُجزيكَ من ذلك الوُضُوءُ) فَقُلتُ: يا رسُولَ اللهِ كَيْفَ بِما يُصيبُ ثَوْبي مِنْهُ؟ قال: (يَكفيكَ اَنْ تأخُذَ كَفاً مِنْ مَاءٍ فَتَنْضَحُ بِهِ ثَوْبَكَ حَيْثُ تَرَى اَنَّهُ قَدْ اَصَاب مِنْهُ) رواه ابو داود وابن ماجه والترمذي وقال حديث حسنٌ صحيح)).

لە سەهلی کوڕی حونەیفەوە ئەگێڕنەوە، کە وتوویەتی من لەبارەی (مەزییەوە) ـ ئاوێکی سپی و ڕوونو لینجە بەهۆی زۆری ئارەزووەوە دێتو هەستی پێ ناکرێت ـ توشی سەختیو ناخۆشیەکی زۆر هاتبوومو لەبەر ئەو مەزییە، زۆر خۆمم ئەشۆریو باسم کرد بۆ پێغەمبەری خواﷺو پرسیاری ئەو شتەم لێکرد؟

فەرموی: ئەوە بەسە بۆت، کە دەست نوێژ بگریت، واتە خۆ شۆردنی ناوێت.

لەپاشدا وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەی ئەگەر بەر پۆشاکەکەم کەوت چۆنە؟

فەرموی: بەسە گولمە ئاوێك هەڵگریتو بەو شوێنە دابکەیت، کە دەزانی بەری کەوتووە.

١٧- ن/٤١ ((عن عائشةَ رضي الله عنها قالت: كُنْتُ اَفْرُكُ المَنِيَّ مِنْ ثَوبِ رسُولِ اللهِﷺ ثُمَّ يَذْهَبُ فيُصَلِّ فيه. رواه الجماعة الا البخاريَّ)).

لە خاتوو عائیشەوە رضي الله عنها ئەگێڕنەوە، کە وتویەتی من مەنیم -کە ئاوی پیاوە-

---

(١) تەماشای شەرحی هەمان فەرموودە بکە لە ( نیل الاوطار)دا بەسودە.

ئەپرواند، کە بە پۆشاکی پێغەمبەری خواوەﷺ بوو، ئینجا ئەچوو نوێژی پێوە ئەکرد، واتە پاکەو پێویستی بە شۆردن نیە، وە ئەگەر بشۆرێت چاکترە، لەبەر ئەو فەرمودەیەی، کە دەفەرمووێ : ئەم شۆردەوە، لە فەرمودەی تردا هاتووە، کە ئەگەر وشك بوایە ئەم کراندەوە لە لیباسەکەو ئەگەر تەڕبوایە ئەم شۆرد.

١٨- ن/٤٣ ((عن أبي هريرةﷺ انّ رسولَ اللهﷺ قال: (اِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ في شَرَابِ اَحَدِكُمْ فَلْيُغْمِسْهُ كُلَّهُ ثُمَّ لْيَطْرُحْهُ فَأِنَّ في اَحَدِ جناحيه شفاءً وفي الآخَرِ داءً. رواه أحمد والبخاري وغيرهما)).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێ مێشێك کەوتە ناو خواردنەوەی یەکێك لە ئێوە، تەواو نقومی بکەن لەو شتە دا، پاشان فڕێی بدەن، چونکە بە یەکێك لە باڵەکانیەوە شیفا هەیەو، بەوی تریان نەخۆشی. واتە ئەو شتانەی خوێنیان لێ ناڕوات بە مردنیان لەناو ئاوی کەمدا، ئاوەکە پیس ناکات، هەروەها نابێ شتی قێزەون بخورێت، ئەوەتە فرمانی دا بە فڕێدانی مێشەکە.

١٩- ن/٤٤ ((عن انس بن مالك ان النبّيﷺ لمّاَ رمى الجمرة وَنَحَر نُسُكَهُ وَحَلَقَ نَاوَلَ الحَلاَّقَ شِقَّهُ اْلأَ يْمَنَ فَحَلَقَهُ ثُمَّ دعا اباطلحة الانصاري فأعْطاهُ اياهُ ثُمَّ نَاوَلَ الشّقّ اْلأَ يْسَرَ فَقَال: (اِحْلِقْهُ) فَحَلَقَهُ فَاَعْطَاهُ اباطلحة وقال (اِقْسِمْهُ بَيْنَ النّاسِ) متفق عليه)).

لە ئەنەسی کوری مالیکەوە ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەرﷺ کاتێ ڕەجمی شەیتانی کردو حەیوانی سەربڕیو سەری تاشی، لای ڕاستی خستە بەردەستی سەرتاشو سەری تاشی، لەپاشان ئەبو تەلحەی یاریدەدەری بانگ کردو هەمو مووەکەی پێدا، لەپاشان لای چەپی خستە بەردەست سەرتاشو، فەرموی: بیتاشە ئەویش تاشیو مووەکەی دایە دەست ئەبو تەلحەو فەرموی: ((لەنێوان خەڵکدا دابەشی بکە)).

لێرەدا ئەوەوەرئەگرین پارچەکانی لەشی مرۆڤ پاکە، با لە لەشەکەیش جیاببنەوە هەروەها مووەکانی پێغەمبەری ئازیزمان پیرۆزە، بەڵام ئەمە تەنها بۆ ئەوە، چونکە

پێغەمبەری خوایەو، پاش ئەویش كەس ئەو وەسفەی نابێ، تا ئەو پیرۆزییەی پێ ببڕێت.

٢٠- ن/٥٥ ((عن ابن عباس قال تُصُدِّقَ عَلىَ مَوْلاةٍ لَمِيْمونَةَ بِشاةٍ فَمَاتَتْ فَمَرَّ بها رسولُ اللهﷺ فقال: هَلاَ اَخَذْتُمْ اِهابها فَدَ بَغْتُموهُ فَاْنْتَفَعْتُمْ بِهِ؟ فقالوا: اِنَّهَا مَيْتَةٌ! فَقَال (اِنَّما حَرُمَ اَكْلُهَا) رواه الجماعة الا ابن ماجة)).

له عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوەﷺ ئەگێڕنەوە، كە حەیوانێك كرا بە خێرو درا بە كەنیزەیەكی خاتو مەیمونەو مرداربویەوە، پێغەمبەری خواﷺ دای بەلای داو فەرموی: بۆ پێستەكەتان لێ نەكردوەتەوەو، پێستەكەتان خۆنەكردوە، تا سودی لێوەرگرن؟

وتیان مرداربووەتەوە!

فەرموی ((تەنیا خواردنی قەدەغە كراوە))، واتە پێستی حەیوانی مرداڕ بوو بە دەباخ كردن پاك ئەبێتەوەو، ئەكرێ بەكونەو مەشكەو هەمانەو شتی تر.

دەواخ كردن بەهەمو شتێكی تاڵ ئەبێت، وەكو جەوتو مازو تێكەڵاو بە ئاو بكرێت بە هەڕاوەیو پێستەكەی بۆ ماوەیەك تێ بنرێت، پاشان بە ئاو بشۆرێت.

٢١- ن/٦٢ ((عن انس قال اَصَبْنَا مِنْ لَحْمٍ ـ يعني يَوْمَ خَيْبَرـ فَنَادى مُنَادي رَسُولِ اللهﷺ: اِنَّ الله وَرَسولَهُ يَنْهَيانِكُمْ عَنْ لُحُوم الحُمُرِ فإِنَّهَا رِجْسٌ اَوْ (نَجَسٌ) متفق عليه)).

له ئەنەسەوەﷺ ئەگێڕنەوە، كەوتویەتی هەندێ گۆشتی كەری ماڵیمان دەستكەوت ـ مەبەستی لە كاتی خەیبەرە ـ وەكو لە ڕیوایەتی تردا هاتووە دێزەو قابلەمەیان لێنایە سەر ئاگرو خەریك و پێ ئەگەیشت ـ لەوكاتەدا بانگدەری پێغەمبەری خواﷺ بانگی كردووتی: خواو پێغەمبەرەكەی گۆشتی كەری لێ قەدەغە كردوون، بەڕاستی ئەوە گۆشتێكی پیسە، واتە گۆشتی حەیوانێك كە قەدەغە بێ خواردنی ، ئەگەر سەر بڕا هەر پیسەو نابێ بخورێت، كەریش یەكێكە لەو حەیوانە قەدەغەكراوانە، بەڵام كەری كێوی گۆشتی ئەخورێت، جا پێویستە ئەو دەفرەیەش گۆشتی تێبكرێت بشۆرێت، وەكو لە

فەرمودەی تردا هاتووە. مەبەستی لێرەدا بەو پیسییە گۆشتی ئەو حەیوانانەیە، كە گۆشتیان ناخورێت.

٢٢- ن/٦٣ ((عن حُذَيفة قال سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: (لا تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ ولاالدِّيباجَ وَلاتَشْرَبُوا في آنيةِ الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ وَلاتأكلوا في صِحافِها فَاِنّها لَهُمْ في الدُّنيا وَلَكُم في الآخِرَةِ)). متفق عليه.

لە حوزەیفەوە ئەگێڕنەوە، كەوتویەتی لە پێغەمبەری خواﷺ بیستوومە كە ئەیفەرمو: ئاوریشم نەپۆشن ـ دیباجیش هەر ئاورێشمە بەتانو پۆوە ـ لە كاسەی زێڕو زیودا نەخۆنەوەو لە دەفرەكانی زێڕوزیودا شت مەخۆن، بەڕاستی ئەوە بۆ ئەوانە ـ كافران ـ لە دونیاداو لە پاشەڕۆژدا بۆ ئێوەیە واتە قەدەغەیە پۆشاكی ئاوریشمو بەكارهێنانی دەفری زێڕو زیو.

٢٣- ن/٧١ ((عن جابر بن عبدالله في حديث لە ان النبّيﷺ قال: (اَوْك سِقاءَك واذْكرُ سْمَ الله وخَمِرِّ انَاءَك وَاذْكُرِ سْمَ اللهِ وَلَوْ اَنْ تَعْرِضَ عَلَيْهِ عُوداً (متفق عليه) وَلِمُسلمِ: اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قال: غَطُّوا الانَاءَ وَاَوكُوا السِّقاءَ فَأَنَّ في السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فيها وَبَاءٌ وَلايَمُرُّ بِأِناءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غِطاءٌ او سقاءٍ لَيْسَ عليه وِكاءٌ الاّ نَزَلَ فيه من ذَلِكَ الْوَبَاءِ))).

لە جابیری كوڕی عەبدوڵلاوە ئەگێڕنەوە لە قسەیەكیدا، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: دەمی كوندەی ئاوتان ببەستنو (بسم الله)ی لەسەر بكەنو سەری دەفرەكانتان، كە شتی تێدایە داپۆشنو (بسم الله)ی لەسەر بكەن، ئەگەرـ هیچتان دەست نەكەوت، با دارێك رادەن بەسەریا، واتە چەندت بۆ كرا ئەبێ ئەوەندە داپۆشیت. بوخاریو موسلم هەردووكیان ئەم فەرمودەیان باس كردوەو، مسلم ئەڵێ: بەڕاستی پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: سەری دەفرەكانتان داپۆشنو دەمی كوندەكان ببەستن، بەڕاستی لە ساڵێكدا شەوێك هەیە نەخۆشی سەختو كوشندە بڵاوئەبێتەوەو، بەلای هەر دەفرێك و مەنجەڵێك دلبڕوات، كە دانەپۆشرابێ یان كوندەیەك كە دەمی نەبەسترابێ، مەگەر هەندێك لەو نەخۆشیە دەچێتە ناویەوە.

بەم شێوەیە ئەو پێغەمبەرە ئازیزەﷺ هەوڵی رزگـار كردنـی گەلەكـەی ئـەدات، لـە هەمو دەردو بەڵایەكو، پەنجە بۆ هەمو شتە مەترسـیدارەكان رائەكێـشێ، تـا گەلەكـەی خۆیانی لـێ بپارێزنو ساغو سەلامەتو كەم دەردبن، وصلی الله علیه وعلـی آلـه وسـلم تسلیما كثیرا.

٢٤-ن/٧٣ (( وعن اَبي ثَعلَبَةَ قال: قُلْتُ: یارَسُولَ اللهﷺ انّا بـأَرْضِ قَّـوْم اَهْـل كِتـابٍ اَفَنَأْكُلُ في آنِیتَهِمْ؟ قال (اِنْ وَجَدْتُمْ غَیْرَها فَلا تَأْكُلُوا فیها وَاِنْ لَمْ تَجِدُوا فآغْـسِلُوها وَكُلـوا فیها)). متفق علیه.

لە باوكی سەعلەبەوە ئەگێڕنەوە، كە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خـــواﷺ ئێمە لەناو خەڵكێكی ئەهلی كیتابداین، ئایا لەناو دەفرەكانیاندا شت بخۆین، واتە دەفرەكانیان بەكاربهێنین؟

فەرموی! ((ئەگەر بێجگە لە دەفرەكانی ئەوانتان دەست ئەكەوێت مەیخۆنو بـەكاریان مەهێنن، ئەگەر دەستتان ناكەوێت ئەوە بیشۆرنو شتی تێدا بخـۆن، واتـە بـەبێ شـۆردن بەكاریان مەهێنن، چونكە پیسە.

٢٥- ن/٧٥ ((عن اَنَس بن مالِكٍ رضي الله عنه قال: كانَ رَسُـول اللهﷺ اِذَا دَخَـلَ الخَلاَءَ قَـالَ: (اَللَّهُمَّ اِني اَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبثِ وَالخَبائِثِ))) رواه الجماعة.

لە ئەنەسی كوری مالیكەوە رضي الله عنه ئەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ كاتـێ بیویستایە بچێتە سەر ئاو، ئەیفـەرمو: ((خوایـە پـەنا ئـەگرم بـەتۆ لـە شـەیتانە نێـرو مێیەكان. لە هەندێ ریوایەتی تردا هاتووە، كە پێشەكی ئەیفـەرمو بـەناوی خـوا (بـسم الله[1])، كاتێ كە دەرئەچوو ئەیفەرمو: لێم ببورە (غُفْرانَكَ)[2]. واتـە چـونكە مرۆڤــ بـۆ یادی خوا دروستكراوەو لەو شوێنەیشدا نابێ یادی خوا بكات، كە ئەهاتـە دەرەوە داوای لێبوردنی لەخوا ئەكرد، كە ئەو چەند كاتەی بێ یادی خوا بردوەتـە سـەر. لـە ریوایـەتی

(١) فەرمودەی بسم الله ژمارە ٧٥ لە (نیل الاوطار رواه سعید بن منصور)دا، هاتوە.

(٢) فەرمودەی ژمارە ٧٦، نیل الاوطار رواه الخمسة الا النسائيَّ.

تردا هاتووە كە كاتێ ئەهاتەدەر سوپاسی خوای ئەكرد كە ئەو ئـازارەی لـە كـۆڵكردەوەو رزگاری كرد (اَلَحَمْدُ للهِ الَّذي اَذْهَبَ عَنِّي الاَذى و عافاني)[1](*).

٢٦- ن/٧٨ ((وعنه قال: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ اِذا دَخَلَ الخَـلاَءَ نَـزَعَ خاتَمَـهُ))[2]. رواه الخمسة الا احمد وَصَحَّهُ الترمذي.

هەر لەوەوە ئەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەركاتێ بیویستایە دەست بەئاو بگەیەنێت ئەنگوستیلەكەی لەدەستی دەكردەوە، چونكە لەسەری نووسرابوو (محمـد رسول الله) لێرەش ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت، كە نابێ ناوی خواو پێغەمبـەران هـەڵگرین بۆسەر ئاودەست، ئاشكرایە، كە هەڵگرتنی قورئان، یان ئایەتێك لە قورئـانو بردنـی بـۆ ئەو شوێنە ناڕەواترە، پێویستە ئەوە بزانی كە بارودۆخی ناچاری بڕیارێكی تایبەتی خـۆی هەیە لە یاسا ئاساییەكان دەرئەچێت, جا بۆخۆت لەمە وورد بەرەوە.

٢٧- ن/٧٩ ((عن ابن عمرﷺ أَنَّ رَجُلاً مَرَّ وَ رسولُ اللهِﷺ يَبُولُ فَسَـلَّم عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ)). رواه الجماعة الا البخاري.

لە كوڕی عومەرەوەﷺ ئەگێڕنەوە، كە پیاوێك داوێتی بەلای پێغەمبـەری خـواداﷺ كاتێ، كە میزی ئەكردو سەلامی لـێ كردوە، بەڵام پێغەمبەرﷺ وەڵامـی نەداوەتـەوە، واتە لەكاتی دەست گەیاندن بە ئاو قسەكردن باش نیەو نابێ سەلامی لـێبكرێت، ئەگەر سەلامی لێكرا هەرچـەند وەڵامدانـەوەی سـەلام فـەرزە، ئـەتوانێ لەوكاتـەدا، وەڵامـی

---

(١) فەرمودەی ژمارە ٧٧، نیل الاوطار رواه ابن ماجة.

(*) رواه ابن السني في اعمال اليـوم والليلـة (ص١٨) الحـديث رقـم (٢٢)، وابـن ماجـه، كتـاب الطهارة ، باب مايقول اذا خرج من الخلاء (١/١١٠) حديث رقم (٣٠١)، والحديث ضـعيف، ضـعفه الشيخ الالباني، في رواء الخليل (٥٣)، ضعيف ابـن ماجـه(٣٠١)، فقـه الـسنة – طبعـة مـصححة مخرجة الاحاديث وموافقه لاحكام الشيخ محمد ناصر اتلدين الالباني، ص٤٢.

(٢) ضعيف ، ضعف الـشيخ الالبـاني في ضـعيف ابـي داود (٤) وضـعيف ابـن مـاجي (٦١). نوسينطةى تةفسير.

نەداتەوە، بەڵكو پاش لێبوونەوە وەڵامی بداتەوە، ئەگەر كابرا نەدەچوو، یان زویر نەدەبوو، ئەگینا هیچ نەبێ بە(وَعَلَيْكَ)وەڵامی بداتەوە، تا دڵ گران نەبێت.

٢٨- ن/٨٠ ((عن ابي سعيد قال: سَمِعْتُ النَّبِيﷺ يَقُولُ: (لا يَخْرجُ الرَّجُلانِ يَضْرِبَان الغَائِطَ كَاشِفَيْنِ عَنْ عَوْرَتِهِمَا يتحدّثان فَاِنّ اللّهَ يَمْقُتُ عَلى ذلِكَ))) رواه احمد وابو داود وابن ماجه[1].

لە ئەبو سەعیدەوە ئەگێڕنەوە، كە وتوویەتی بیستم پێغەمبەرﷺ ئەیفەرمو: هیچ كام لە ئێوە دو كەس نەچنە ئاو دەست بەدیار چاوی یەكترەوە شەرمگای (عورة) خۆتان ڕوتكەنو قسە لەگەڵ یەكتردا بكەن، بەڕاستی خوا ڕقی هەڵدەستێت لەسەر ئەو ڕەفتارە. واتە: ڕوتكردنی شەرمگا لەبەر چاوی خەڵكی، هەروەها قسەكردن ئاو دەست قەدەغەیە، بەڵكو پێویستە لە كاتی دەست بەئاودا خۆی لەبەر چاوی خەڵك وون بكاتو قسە نەكات، وەكو لە فەرمودەی سەلام كردنیشدا باسكراوو چەند فەرمودەی تر هەیە لەمبارەوە.[2]

٢٩- ن/٨٤ ((عن ابي هريرة ﷺ قال: (اِذَا جَلَسَ اَحَدُكُمْ لِحاجَتِهِ فلا يَسْتَقْبِلِ القِبْلَةَ وَلا يَسْتَدْبِرْها))). رواه احمد مسلم وفي روايةٍ (وَلا يَسْتَطِبْ بِيَمِنِهِ) .

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەگێڕنەوە، كە فەرمویەتی: هەركاتێ هەركام لە ئێوە دەستی گەیاند بەئاو، با نە ڕوو لە قیبلە بكاتو، نە پشتی تێ بكا، لە ڕیوایەتی تر دا هاتوە، كە بەدەستی ڕاستی خۆی پاك نەكاتەوە، ئەم ڕوو تێنەكردنو پشت تێنەكردنە بەلای زۆرێك لە زانایانەوە وەختێكە كە هیچ داپۆشەرێكی نەبێ، ئەگەر داپۆشەری بوو قەیناكە[3], هەر خوایش زانایە.

---

(١)الحديث، ضعف الشيخ الالباني في: ضعيفابي داود(٣)، وضعيف ابن ماجه(٧٦) وضعيف(فقهالسنة موافقة لاحكام الالباني ص٣٥-٣٦) نوسینگەی تەفسیر

(٢) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٨١، ٨٢، ٨٣)، نيل الاوطار بكە.

(٢) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٨٥، ٨٦، ٨٧، ٨٨، ٨٩)، نيل الاوطار بكە.

٣٠- ن/٩٢ ((وعنهﷺ قال: (اتَّقُـوا اَللاَّعِنَـيْن) قـالوا: ومـا اللاّعِـنَـــانِ يـا رَسُـول اللهﷺ؟ قال (اَلّذي يَتَخَـلّى في طَرِيـقِ النّــاسِ اَوْ في ظِلِّهِـمْ).)) رواه احمـد ومـسلم وابـو داود.

هەر لە ئەبو هورەیرەوەﷺ ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: خۆتان لـە دوو نەفرین کەرەکان بپارێزن ((وتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ: کامانەن ئەو لەعنەت کەرانە فەرموی: ئەو کەسەیە، کە پیسی ئەکاتە سەر ڕێگای خەڵك، یان لەژێر سێبەرییان، واتـە ئەمانە ئەبنە هۆی ئەوە، کە خەڵکی نەفرینو لەعنەتیان لـێ بکەن، وەکـو ئـەوە وایـە، کە خۆیان لەعنەتەکە لە خۆیان بکەن، بۆیە فەرموی (لاعن، نەیفەرموو: ملعـون). والله أعلم.

٣١- ن/٩٨ ((عَـن عائِـشَةَﷺ قَالـتْ مَـنْ حَـدَّثَكُمْ اَنَّ رَسُـولَ اللهﷺ بَـالَ قائِمـاً فَـلا تُصَدِّقُوهُ، مَاكَان يَبُولُ الاّجالِـساً)) رواه الخمسة إلا ابـا داود وقـال: الترمـذي: هـو احـسن شيءٍ في هذا الباب، واَصَحُّ.

لـە خـاتو عائیـشەوەﷺ ئەگێڕنـەوە کـە وتوویـەتی هـەر کـەس پێـی ووتـن کـە پێغەمبەرﷺ بە پێوە میزی کردووە باوەڕی پـێ مەکـەن، هـیچ کـات میـزی نـەکردوە مەگەر دانیشتبێت، واتە میز بە پێوەکردن خراپەو، ئەو فەرمودەیەش، کە ئەڵێ بە پێـوە میزی کردوە[1] چەند قسەیەك لەبارەیەوە کراوە، هەندێك ئەڵێن: برینێك بە ژێر کەوچـەی پێغەمبەرەوە بوەو نەیتوانیوە دانیشێ، هەندێکی تر ئەڵێن بۆ بەیان کردن بووە، واتە بـە پێوە میزکردن حەرام نیە، بەڵکو باش نیە، ئەگەر میزەکە لەخۆی نەداتەوە، بەڵام ئەگـەر لـەخۆی بداتـەوە ئـەوە حەرامـە، وەکـو لـە فـەرموده بەناوبانگەکـەی دوو قەبرەکانـدا هاتووە[2].

(١) فەرمودەی ژمارە ١٠٠، نیل الاوطار، تەماشا بکە.

(٢) فەرمودەی ژمارە ١٠٢، نیل الاوطار، تەماشا بکە.

٣٢- ن/١٠١ ((وعنهماﷺ اَنَّ رَسُولَ اللهﷺ قال: (اِذا ذَهَبَ اَحَدُكُم اِلى الغائِطِ فَلْيَسْتَطِبْ بِثَلاَثَةِ اَحْجارٍ فَإنَّها تجزيءُ عَنْه))). رواه احمد والنسائي وابوداود والدارقطني وقال اسناده صحيحٌ حسنٌ.

هەر لە خاتوو عائیشەوە ﷺ هاتووە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەرکام لە ئێوە دەستی بە ئاو گەیاند ـ پیسایی کرد ـ با بە سێ بەرد خۆی پاك بکاتەوە، بەڕاستی ئەوە بەسیەتی، واتە ئیتر پێویست بە شۆردنی ناکات، بەڵام پێویستە ئەوەی، کە خۆی پێ پاك ئەکاتەوە شتی بەڕێز نەبێو ئێسقانو ڕیخو قشپلی حەیوانات نەبێ [1].

٣٣- ن/١١٤ ((عن اَنَس بن مالكﷺ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللهﷺ يَدْخُلُ الخَلاءَ فَأَحْمِلُ اَنَا وَغُلامٌ نَحْوِي اِدَاوَةً من مَاءٍ وعَنَزَةً فَيَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ- متفق عليه))

لە ئەنەسی کوری مالیکەوەﷺ ئەگێڕنەوە، کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەرکاتێ دەستی بەئاو ئەگەیاند منو منالێکی تریوەك خۆم مەسینەی ئاوو نێزەکەمان بۆ هەڵئەگرتو، بە ئاو خۆی پاك ئەکردەوە.

٣٤- ن/١١٨ ((عن عائِشَةَﷺ ان النبّيﷺ قَالَ: (السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرضَاةٌ لِلَّربِّ) رواه احمد والنسائي.

لە خاتو عائیشەوەﷺ هاتو کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: سیواك بۆ پاککردنەوەی دەمەو هۆی خۆشنودی خوایە.

٣٥- ن/١١٩) ((عن زيد بن خالدٍ قال: قال رَسُولُ اللهﷺ (لَوْلا اَنْ اَشقَّ عَلَى أُمَّتي لأَخَّرْتُ صَلاة العشاءِ اِلى ثُلُثِ اللَّيْلِ وَلأَمَرْتُهُمْ بِالسِّواك عنْ كُلَّ صلاة))). رواه احمد والترمذي وصَحَّحَهُ.

لە زەییدی کوری خالیدەوە ئەگێڕنەو، کەوتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ئەگەر نارەحەت نەبوایە بۆ ئۆممەتەکەم، نوێژی عیشام دوا ئەخست بۆ سێ بەشی شەوو فرمانم پێ ئەکردن، کە هەمو نوێژێك سیواك بکەن.

---

(١) فەرمودەی ژمارە ١٠٧ تا ١١٣، نیل الاطار، تەماشا بکە.

٣٦- ن/١٢٨ ((عن ابي هُريرةﷺ قال رَسُولُ اللهﷺ (خَمْسٌ مِنَ الفِطْرَةِ، اَلأسْتِحْدادُ، والْخِتانُ، وقَصُّ الشّارِبِ، وَنَتْفُ اْلإبْطِ وتَقْلِيمُ اْلأَظْفَارِ). رواه الجماعة))

له ئەبو هورەیرەوەﷺ ئەگێڕنەوە،کە وتوویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: پێنج شت هەیە، کە داب‌و نەریتی مرۆڤی پاك‌و خاوێنەو، بە ئەنجامدانیان سیمای مرۆڤ جوانتر ئەبێ: یەکەم: تاشینی مووی شەرمگە. دووهەم: سونەتکردن. سێهەم: کورتکردنەوەی سمێڵ. چوارەم: هەڵکێشانی موی بن هەنگڵ (باڵ). پێنجەم: نینۆك کردن.

٣٧- ن/١٣٦ ((عن ابن عمرﷺ عن النبّيﷺ: (خالِفُوا الُمشْرِكِينَ: وَفّرُوا اَللِّحى وَاَحْفُوا الشَّوارِبَ). متفق عليه)).

له عەبدوڵڵای کوری عومەرەوەﷺ ئەگێڕنەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە فەرمویەتی: ((پێچەوانەی هاوبەش پەیداکردن بجولێنەوە، ڕیشتان بهێڵنەوە بکەن‌و سمێڵتان بکەن))، واتە ڕیش بەردان‌و سمێڵ کردن شتێکی پێویستە لەسەر خاوەن باوەڕان، بەداخەوە ئەمرۆ بە پێچەوانەی ئیسلام ڕەفتار ئەکەن‌و پەیڕەوی لە بت پەرستان ئەکەن‌و مەیمون ئاس، چۆن بکەن لاساییان ئەکەنەوەو گوێ بە فەرمانی پێغەمبەر نادەن؟!

٣٨- ن/١٣٧ ((عن عَمْرِو بنِ شُعَيْبٍ عن ابيه عن جدّه ان النبّيﷺ قال: (لاتَنْتفوُا الشّيبَ فَاِنَّهُ نُورُ الُمسْلِمِ مَامِنْ مُسْلِمَ يَشيبُ شَيْبَةً في الأسْلامِ الاّ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِهَا حَسَنَةً وَرَفَعَهُ بِهَا دَرَجَةً وَحَطَّ عَنْهُ بِها خَطيئَةً). رواه احمد وابو داود وغيرهما)).

له عەمری کوری شوعەیب، ئەویش لە باوکیەوەو ئەویش لە باوەکیەوە ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: موی سپی هەڵمەکێشن، بەڕاستی ئەوە ڕوناکی مسوڵمانە ـ لە ڕۆژی قیامەتا[1] ـ هەر مسوڵمانێك مویەکی لێ سپی بێ لەناو ئیسلام دا، مەگەر بەو تاڵە مووە خوا چاکەیەکی بۆ دەنوسێت‌و پلەیەکی بۆ بەرز دەکاتەوەو، تاوانێکی

(١) لە ڕیوایەتی تردا هاتووە، کە ئەفەرموێ (( مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي الأِسْلامِ كَانَتْ لَهُ نُوراً يَوْمَ اْلقِيامَةِ )) تەماشای شەرحی هەمان فەرمودە بکە لە (نيل الاوطار)دا .

لەسەر لادەبات. ئیمامی نەوەوی ئەڵێ: ئەگەر بوترێت موهەڵکێشان قەدەغەو حەرامــە، لەبەر ئەو فەرمودانە دوور نیە.

٣٩- ن/١٣٨ ((عن جابر بن عبدالله قـال: جِـيءَ بِـأَبِي قُحافَـة يَـوْمَ الْفَـتحْ اِلى رَسُـولِ اللهﷺ وَكَأَنَّ رَأْسَهُ ثَغامَةٌ فقال رَسُولِ اللهﷺ: (اِذْهَبوُا بِهِ اِلى بَعْضِ نِساءِهِ فَلْتُغَيّرْهُ بِشَيْءٍ وَجَنّبوُهُ السَّوَاد). رواه الجماعة الا البخاري والترمذي)).

له جابیری کــوڕی عەبــدوڵڵاوە ئەگێڕنــەوە، کــە وتوویــەتی: ئــەبو قوحافــەی بــاوکی ئەبوبکریان لە ڕۆژی رزگارکردنی مەکەدا، هێنایــە خزمــەتی پێغەمبــەری خــواﷺ، کــە سەری وەکو سەغامە (کە گیایەکە گوڵەکەیشی هــەر سـپیە) وابــو، بۆیــە پێغەمبــەری خواﷺ فەرموی: بیبەن بۆ لای هەندێ لە ئافرەتــانی ـ مــەحرەمی ـ خــۆی، بــا ڕەنگــی سەری بگۆڕێتو دوری بخەنەوە لە ڕەنگی ڕەش، واتە گۆڕاندنی موی سپی سوننەتە، بــەو مەرجەی ڕەنگەکە ڕەش نەبێت، بە ڕەش دروست نیە.

٤٠- ن/١٤٦ ((عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَت: (كَانَ شَـعْرُ رَسُـولِ الله ﷺ فَـوْقَ اْلـوَفْرَةِ وَدُونَ الجُمَّةِ) رواه الخمسة الا النسائي وصَحَّهُ الترمذي)).

له خاتوون عائیشەوە رضي الله عنها هاتووە، کە وتویەتی: ((موی سەری پێغەمبەری خواﷺ لە نەرمەی گوێی زیاتر بووەو، نەگەیشتۆتە سەر شانی. (وَفْرَه) بەو مــوەی ســەر ئــەڵێن، کە بگاتە نەرمە گوێو لەوێ زیاتری کرد، کە (لِمّە)ی پێ ئەڵێنو، کە گەیشتە سەر شــان (جُمَّــە)ی پێ ئەڵێن، ئەم دوو وشەی دوایی بە پێچەوانەوە مانــا کــراون، واتــە هــەروەکو کورتکردنەوەو تاشین دروستە هەروەها درێژبوونیش، تا سەر شان بۆ پیاو دروستە، وەکــو لە ڕیوایەتی تردا هاتووە (لَهُ شَعْرٌ يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ... ئــەو مویــەکی وای بــوو ئەیــدا لــە شانی))[1].

٤١- ن/١٤٩ ((عَنْ عَبدِ اللهِ بنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: (نَهَى رَسُولُ اللهﷺ عَنِ التَّرجُلِ اِلاّ غِبّاً)

(١) شەرحی هەمان فەرموده ١٤٧، لە نیل الاوطاردا.

رواه الخمسة الا ابنَ ماجة وصَححهُ الترمذي)).

له عەبدوڵڵای كوڕی موغەفەلەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی كردووە لەسەر شانەكردن مەگەر ڕۆژێ نا ڕۆژێ، بەڵێ هەروەكو فەرمویەتی (من كان له شعر فليكرمه... هەر كەسێك كە مووی هەیە با ڕێزی بگرێت). هەروەها داینـاوە ئـەو ڕێـزە بەو شێوە ئەبێ، كە ڕۆژێ نا ڕۆژێ شانەی بكات، نەك هەر نەیكات، یان بەكـەمی، یـان بە هەمیشەیی، ئایا ئەگونجێ ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەیﷺ، كە باسی مـووی بـەو شـێوە كردووە، هەندێ لە پێویستیەكانی ئایینی واز لێهێنابێ‌و، باسی نەكردبێ‌و ئێمـە ئـەمڕۆ بیزانین‌و بە شتێكی چاكی دابنێین بۆ خەڵك؟! كـورد واتـەنی ((لـە عـاقڵان ئیـشارەتێك بەسە))وە ((ئەو كەس كەسە ئەلفێكی بەسە)).

٤٢- ن/١٦٦ ((عن ابی هريرةرضي الله عنه اَنَّ رَسُولَ اللهﷺقـال: (اِذَا اسْـتَيقَظَ اَحَـدُكُم مِـنْ نَوْمِهِ فَلا يَغْمِس يَدَهُ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاثـاً فإنَّـهُ لايَـدْرِي اَيْـنَ بَاتَـتْ يَـدُهُ). رواه الجماعـة الا البخـاريّ لم يـذكر العـدد وفي لفـظ الترمـذي وابـن ماجـه: (اِذَا اسْـتَيقَظَ اَحَـدُكُم مِـنْ الليل...))).

له ئەبو هورەیرەوەرضي الله عنه هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی هەركاتێ هەر كام لە ئێوە لەخەو هەستا، با دەستی نەكات بەناو ئاودا، هەتا دەستی سێ جار ئەشـۆرێت، چونكە نازانێ شەو دەستی لە كوێدا بووە.

٤٣- ن/١٦٨ ((عن عثمانَ بنِ عفَّانرضي الله عنه أنَّه دَعَا باناءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلاثَ مَـرَّات فَغَسَلَهُمَا ثُمَّ اَدخَلَ يَمينهُ في الأناء فمضمضَ واسْتَنْثَرَ ثم غَسَلَ وَجَهَـهُ ثَلاثـاً وَيَـدَ يْـهِ الَـى الْمرفَقَيْنِ ثَلاثاً ثُمَّ مَسَحَ برأْسه ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ الىَ الْكَعْبَين ثُمَّ قَـالَ: رَأَيْـتُ رَسُـولَ اللهﷺ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئي هذا. ثُمَّ قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئي هذا ثُمَّ صَـلَّى رَكْعَتَـيْنِ لايُحـدَّثُ فيهِما نَفْسَهُ غَفَرَ الله لَهُ مَا تَقَدَّم من ذَنْبِهِ)). متفق عليه.

له عوسمانی كوری عەفانەوەرضي الله عنه ئەگێڕنەوە، كە داوای كاسەیەك ئاوی كرد، كـە بـۆی هێنرا، هەردوو دەستی سێجار شۆرد، ئینجا دەستی كرد بەناو كاسـەكەداو ئـاوی گێـڕا

بەدەمیاو ئاوی کردە لوتیو مشی کردەوە، لەپاشا دەمو چاوی سێ جار شۆردوە هەردوو دەستی، هەتا گەیشتە هەردوو ئەنیشکەکانی، لەپاشا دەستی تەڕی بەسەریدا هێنا، لەپاشا هەردوو پێی هەتا قولە پێی سێ جار شۆرد، لەپاش ئەوە وتی: چاوم بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوت، کە دەستنوێژی وەکو ئەم دەستنوێژەی من گرت، ئینجا فەرموی: هەرکەسێك وەکو ئەم دەستنوێژەی من دەستنوێژ بگرێت، پاشان دوو رکات نوێژی پێ بکات، لەو دوو ڕکاتەدا خەریکی دالغە لێدان نەبێ، خوا لە تاوانەکانی پێشوی خۆش ئەبێ. ئەم فەرمودەیە ڕۆشنکەرەوەی ئایەتی(٥)ی سورەتی (المائدة)یە، کە ئاو بەدەمو لووت ژمارەی شۆردنەکانی بۆ باس کردووین، ئەو شێوە دەستنوێژ گرتنەو بەو جۆرە نوێژکردنە، ئەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکانی مرۆڤ، نەك کەم تەرخەمی لە دەستنوێژدا، یان هەر چوینە سەر نوێژ خەریکی مامەڵەو کڕینو فرۆشتن بین، تا لێ ئەبینەوە، نازانین چیمان کردوەو چیمان وتوەو نازانین لەخزمەت کێداوەستاوینو، لەگەڵ کێدا ڕازو نیاز ئەکەین؟! لێرەدا بەم فەرمودەیە واز لە باقی فەرمودەکانی تری دەستنوێژ ئەهێنین، چونکە ئەم فەرمودەیە زۆربەی سوننەتەکانی دەستنوێژو هەمو فەرزەکانیو تەرتیبەکەی باسکردوە، ئەوەی نەووتراوە بە پیشتیوانی خوای گەورە دەینوسین.

٤٤- ن/١٧٤ ((عن لَقيطِ بنِ صَبَرةَ قال: قُلْتُ: يا رَسُولَ الله اَخبِرْني عَن الوضوءِ؟ قال (اسْبِغ الوضوءَ وَخَلِّلْ بَيْنَ الأَصابِعِ وَبالِغْ في الاسْتِنْشَاقِ اِلاّ اَنْ تكونَ صائِماً) رواه الخمسة وصَححهُ الترمذي)) .

لە لەقیتی کوڕی سەبەرەوە ئەگێڕنەوە، کەوتویەتی:وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دەستنوێژم بۆ بکە؟

فەرموی: جوان دەستنوێژ بگرەو دەست بخەرە نێوان پەنجەکانتەوەو، زۆر چاك ئاو بدە بە لوتداو چاکی هەڵمژە مەگەر بەڕۆژو بیت. واتە: ئەگەر بەڕۆژو بیت، زۆر هەڵی مەمژە نەوەك بچێتە قورگتەوەو ڕۆژوەکەت بەتاڵ بکاتەوە.و الله أعلم.

٤٥- ن/١٧٨ ((عن عثمانَ بنِ عفَّان رضي الله عنه اَنَّ النبّي ﷺ (كانَ يُخَلِّلُ لِحيَتَهُ) رواه ابنَ ماجه والترمذي وصححه)). لە عوسمانەوە رضي الله عنه ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر ﷺ (لەکاتی

دەستنوێژدا دەستی ئەخستە ناو ڕیشیەوە))، واتە سوننەتە دەست تێخستنی ڕیشی پڕ، بەڵام ئەگەر تەنك بوو، ژێر ڕیشی ئەبینی، پێویستە دەستی تێبخەیتو ژێری تەڕ ببێ لە دەستنوێژدا، بەڵام ژێر تەڕبوونی هەمو جۆرە ڕیشێك لە خۆشۆردندا پێویستە.

٤٦- ن/١٨٠ ((عن ابي أُمامَة اَنَّهُ وَصَفَ وُضُوءَ رَسُولِ اللهِﷺ فَذَكَرَ ثَلاَثاً قال: وَكَان يَتَعَاهَدُ الْماقَيْن)) رواه أحمد.

لە باوکی ئومامەوە ئەگێڕنەوە، کە باسی دەستنوێژی پێغەمبەری خوایﷺ کردوەو، وتویەتی هەمویان سێ جار سێ جار بوون، وتویەتی: کە هەمیشە دەستی ئەخستە ناو هەردوو گۆشەی چاوەکانیەوە لەلای لوتیەوە. واتە: شۆردنی هەردوو گۆشەی چاوەکان لەلای لوتەوە پێویستە، چونکە زۆر جار شتێکی کرێم ئاسای پێوەیە، بەتایبەت ئەگەر چاوەکان نەخۆش بن، یان کابرا بەتەمەن بێت.

٤٧- ن/١٨٣ ((عن ابي هريرةﷺ قال: قال رَسُولُ اللهِﷺ: (اَنْتُمْ الْغُرُّ الْمُحَجَّلُونَ يَومَ الْقِيامَةِ مِنْ اِسْباغِ الوُضُوءِ فَمَنْ اسْتَطَاع مِنْكُمْ فَلْيُطِلُ غُرتَهُ وتَحْجيلَهُ))) . رواه مسلم.

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەگێڕنەوە، کە وتویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ئێوە لە ڕۆژی قیامەتا ناو چاوو چاری دەستو پێ سپین بەهۆی جوان دەستنوێژ گرتنتانەوە، جا هەر کام لە ئێوە ئەتوانێ، با سپیەتی ناو چاوو دەستو قاچەکانی زیاتر بکات، واتە: با زۆرتریان لێ بشۆرێتو لە سنوری فەرز دەرچێت.

٤٨- ن/١٩٦ ((عن ابن عباسﷺ اَنّ النَّبّيﷺ مَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ ظاهِرِهِمَا وَباطِنِهِمَا)). رواه الترمذي وصحّحه ولِلنَّسائيِّ: باطِنِهِمَا بالْمُسَبَحتَيْنِ وَظَاهِرِهِمَا بِأبْهامَيْهِ.

لە عەبدوڵلای کوری عەباسەوەﷺ ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەرﷺ دەستی تەڕی بەسەریداو بەدەرو ناوی گوێیدا هێناوە. نەسائی ئەڵێ: پەنجەی شایەتومانی ئەخستە ناو گوێیەوەو پەنجە گەورەی لە دەری گوێیەوە دائەناو ئەیسوڕاند.

٤٩- ن/١٩٩ ((عَنْ عَمْروبن اُمَيَّة الضَّمري قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ يَمْسَحُ عَلَى عَمَامَتِهِ

وَخُفَّيْهِ)). رواه احمد والبخاري وابن ماجه.

لە عەمری کوڕی ئومەیەی زەمەریەوە ئەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوامﷺ دی، کە لەسەرمێزەرو لەسەر خوف دا مەسحی کردوە، واتە لەکاتی دەستنوێژدا لەباتی مەسحی سەر، مێزەرەکەی تەڕکردوەو لەباتی شۆردنی پێ دەستی تەڕی بەسەر خوف دا -پێڵاوێکی ناسکە لە چەرم دروست ئەکرێت- هێناوە، لە بارەی خوفەوە ماوەکەی بۆ سەفەری سێ شەو سێ ڕۆژە، بەو مەرجەی لەسەر دەستنوێژ لە پێی کردبێ‌و ئەو کەسەی نیشتەجێیە ماوەی شەوو ڕۆژێکە لە نەمانی دەستنوێژی پێشوەوە. بۆ مێزەرەیش لەسەر سەر بەتەنهاو لەسەر مێزەر بەتەنها، لەسەر بەشێکی دیاری سەرو باقی مێزەرە مەسحی کردوە، جا ئەگەر بەم شێوەیەی سێهەمیانە بێت زۆر چاکترە[١]. والله أعلم.

٥٠- ن/٢٠٦ ((عَنْ عبدالله بن عَمْرو قال تَخلَّفَ عَنَّا رَسُولُ اللهِ في سَفْرَةٍ فَأَدْرَكَنَا وَقَدْ أَرْهَقْنا العَصْرَ فجعلنا نَتَوَضَأُ وَنَمْسَحُ عَلى اَرْجُلِنَا. وقال: فَنَادىَ بِاَعْلى صَوْتِهِ (وَيْلٌ لِلأَعْقاب مِنَ النَّارِ!) مَرَّتَيْنِ اَوْ ثَلاَثاً)). متفق عليه.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ئەگێڕنەوە، کە وتویەتی لە سەفەرێکدا -لە مەککەوە بۆ مەدینە- پێغەمبەری خوا ﷺ دواکەوت، کاتێ پێمان گەیشت، نوێژی عەسرمان دواکەوت‌و بەپەلە خەریکی دەستنوێژ گرتن بووین‌و پێمان مەسح کرد، لەبەرئەوە هەتا توانای بوو دەنگی هەڵبڕی‌و فەرموی: ((هاوار بۆ پاژنەکان لەناو ئاگردا)) دووجار، یان سێ جار، واتە پێویستە پێکانتان بەچاکی بە پاژنەوە بشۆرن، نەك تەنها تەڕی بکەن، ئەمە بەڵگەیەکی ترە لەسەر پێویستی شۆردنی پێ، مەگەر خوفی پۆ شیبێ، وەکو لە فەرمودەی پێشوودا دەرکەوت.

٥١- ن/٢١٢ ((عن أَبي هُريرةَ رضي الله عنه أَنَّ النَبِّيَّﷺ قال: (اِذا لَبِسْتُمْ وَاِذَا تَوَضَّأْتُمْ

---

(١٣) لەبەر فەرمودەی (أَنّ النَّبيَّ صَلّى الله عليه وسلم تَوَضَّأَ فَمَسَحَ بِنَاصِيَتِهِ وَعَلى الْعَمَامَةِ وَالْخُفَّيْنِ) (متفق عليه) سەرچاوەی پێشوو ژمارە ٢٠٥. هەروەها تەماشای فەرمودەی ژمارە ٢٢٨ لە هەمان سەرچاوە بکە بۆ ماوەی خوف و چۆنیەتیەکەی .

فَابْدَءُوا بِاَيَامِنِكُمْ). رواه احمد وابوداود)) .

له‌ ئه‌بو هوره‌یره‌وه‌ﷺ ئه‌گێڕنه‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمویه‌تی: هه‌ركاتێ جلتان پۆشی‌و، هه‌ركاتێ ده‌ستنوێژتان گرت، له‌ ڕاسته‌وه‌ ده‌ست پێ بكه‌ن. واته‌: لای ڕاست پێش خستن له‌و دوو حاڵه‌دا پێویسته‌.

٥٢- ٢١٧ ((عَنْ عُمَرَ بْنَ الخطَّابﷺ قال: قَالَ رَسُولُﷺ الله: (ما مِنْكُمْ مِنْ اَحَدٍ يَتَوَضَّأَ فَيُسْبِغُ الوضوءَ ثُمَ يَقولُ: اَشْهَد اَنْ لا الـهَ الاّ اللهَ وَحْدَهُ لاشريك لَهُ وَاَشْهَد اَنْ مُحَمَدَّاً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ, الاّ فُتِحَتْ لَهُ اَبْوابُ اْلجَنَّةِ الثمانِيةِ يَدْخُلُ مِنْ اَيِّها شَاءَ) رواه احمد وابو داود)).

له‌ عومه‌ری كوری خه‌تابه‌وه‌ﷺ ئه‌گێڕنه‌وه‌، كه‌ وتویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رمویه‌تی: له‌ناو ئێوه‌دا هه‌ر كه‌سێك له‌ئێوه‌، كه‌ ده‌ستنوێژ بگرێ‌و ده‌ستنوێژه‌كه‌ی جوان بگرێت‌و له‌پاشان بڵێت: من شایه‌دی ئه‌ده‌م كه‌ هیچ په‌رستراوێكی ڕاسته‌قینه‌ نیه‌ بێجگه‌ له‌ خواو ته‌نیایه‌و هاوه‌ڵی نیه‌و، شایه‌دی ئه‌ده‌م، كه‌ (محمدﷺ) به‌نده‌ی خوایه‌و پێغه‌مبه‌ریه‌تی، ئه‌وا هه‌ر هه‌شت ده‌رگای به‌هه‌شتی بۆ ده‌كرێته‌وه‌ له‌ هه‌ر كامیانه‌وه‌ بیه‌وێ ده‌چێته‌ ناویه‌وه‌ كه‌ خۆی ئاره‌زوی لێبێت. واته‌: سوننه‌ته‌ پاش ده‌ستنوێژ سه‌ر به‌رزبكه‌یته‌وه‌ بۆ ئاسمان‌و، ئه‌و وشانه‌ی پێشوو بڵێیت‌و، پاشان بڵێیت خوایه‌ له‌ ڕیزی ته‌وبه‌كاراندا دام بنێ‌و له‌ناو پیاوانی پاك‌و خاوێندا حیسابم بكه‌، پاك‌و خاوێنیت ئه‌ی خوایه‌ له‌گه‌ڵ سوپاس‌و ستایشدا، شایه‌تیت بۆ ئه‌ده‌م، كه‌ هیچ په‌رستراوێكی ڕاسته‌قینه‌ نیه‌، جگه‌ له‌ تۆ داوای لێخۆشبونت لێ ئه‌كه‌م‌و ئه‌گه‌ڕێمه‌وه‌ بۆ لات.

زانایانی فه‌رموده‌ناس ئه‌ڵێن: ته‌نها - بسم الله- له‌ ئه‌وه‌ڵه‌وه‌و ئه‌م دوعایه‌ی، كه‌ له‌ كۆتایی ده‌ستنوێژ دایه‌ به‌ ته‌واوی دامه‌زراوه‌و، باقی دوعاكانی شوێنه‌كانی تری ده‌ستنوێژ، جێگای متمانه‌ نین‌و به‌ڕاستیان نه‌زانیون. والله أعلم.

٥٣- ن/ ٢٢٠ ((عن الْمُغَيْرة بِن شُعَبةَ اَنَّهُ كان مَعَ رَسُولِ اللهﷺ في سَفَر وَاَنَّهُ ذَهَبَ لِحاجَةٍ لَهُ وَاَنَّ مُغَيْرَةَ جَعَلَ يَصُبُّ اْلمَاءَ عَلَيْهِ وَهُوَ يُتَوَضَّأُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ

وَمَسَحَ عَلَى الْخُفيَّنِ)). رواه البخاری وَمُسْلِمٌ .

له موغەیرەی کوڕی شوعبەوە ئەگێڕنەوە، کە لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ بووە لە سەفەرێکداو دەستی بەئاو گەیاند ــ لەپاشا ــ موغەیرە ئاوی ئەکرد بە دەستیا لە کاتێکدا، کە دەستنوێژی ئەشۆری، جا دەمو چاوو دەستی شۆریو دەستی تەڕی سەری داهێنا، دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو خوفەکەیدا. واتە دروستە لە دەستنوێژ گرتندا یارمەتی بدرێت، ئەو حەدیسانەی بەرگری لەوە ئەکەن، هیچیان متمانەیان پێ نەکراوە، سابت نەبوون، هەروەها دروستە مەسحکردنی خوف لە پێدا[1].

٥٤- ن/٢٣٣ ((وَ رَوَى شُرَيْحُ بنُ هانيءٍ قَالَ سَأَلْتُ عائِشَةَ رضي الله عنها عن المسح عَلَى الخفين؟ فقالَتْ سَلْ عَلِيّاً فَأَنَّهُ اَعْلَمُ بهذا منيِّ، كَانَ يُسافرُ مَعَ رَسُولِ اللهِﷺ فَسَأَلْتُهُ فَقال: قالَ رَسُولِ اللهِﷺ: (لِلْمُسافِرِ ثَلاثَةُ اَيّامٍ ولَيَاليهنَّ وَلِلْمُقيمِ يَومٌ وَلَيْلَةٌ))). رواه احمد ومسلم والنسائي وغيرهم.

شورەیحی کوڕی هانی ئەڵێت: پرسیارم لە خاتوو عائیشە رضي الله عنها سەبارەت بە مەسحی خوف کرد، وتی: لە عەلی بپرسە، ئەو لەمن لەوبارەوە شارەزاترە چونکە ئەو سەفەری لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ کردوە منیش پرسیارم لێکرد.

وتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (کابرای سەفەری ئەتوانێ سێ ڕۆژ بەشەوەکانیەوە مەسحی خوف بکاتو لەپێیدا نەکەنێت، بۆ ئەو کەسەش لەشاری خۆیدایە ڕۆژو شەوێکە)).

٥٥- ن/٢٣٥ ((عن علي رضي الله عنه قال: لَوكَان الدِّينُ بالرَّأْي لَكَان اَسْفَلُ الخُفِّ اَوْلى بالْمَسْح مِنْ اَعْلاهُ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَمْسَحُ عَلَى ظَاهِرِ خُفَّيْهِ)). رواه ابوداود والدار قطني وقال الْحافظُ في (بلوغ المرام) اسناده حسن.

لە عەلیەوە رضي الله عنه ئەگێڕنەوە، کە وتوویەتی: ئەگەر ئایین بەرەئیو بۆچوون بوایە ئەوا

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٢٣٢، لە سەرچاوەی پێشو بکە.

ژێری خوف شایستەتر بو بۆ مەسح تا سەرەكەی ـ بەڵام ـ من پێغەمبەری خوامﷺ دی، كە ئەوەی دەرئەكەوت لـە خوفەكـەی ـ سـەرەكەی ـ مەسـح ئـەكرد، واتـە ئـایین نابـێ بەرەئیو بۆچوون بێت، چونكە بۆچوونو ڕەئیەكان ئەگونجێ هەڵە دەربـچن، هـەروەها لـە مەسحی خوفدا سەرەكەی پێویستە، بەڵام ئەگەر ژێرەكەیشی مەسح بكرێت چاكترە لەبەر فەرمودەی تر(١)، دیارە عەلیرضي الله عنه هەر بەو شێوەی دیوە، تا كاتێ ئەم قسەی گێڕاوەتەوە، ئەگەر فەرمودەكەی تر ڕاست بێ. والله أعلم.

٥٦- ن/٢٣٨((عَن ابي هريرةرضي الله عنه قال: قال رَسُولُ اللّهِﷺ: (لا يَقْبَلُ اللهُ صَـلاةَ اَحَـدِكُمْ اذَا اَحْدَثَ حَتَّى يتَوَضَّأَ) فقال رجلٌ مِنْ اَهْلِ حَضْرَمَوْتَ مَـا الْحَـدَثُ يـا اَبـا هُرَيْـرَةَ؟ قـال فُساءٌ اَوْ ضُراطٌ))، متفق عليه.

له ئەبو هورەیرەوەرضي الله عنه ئەگێڕنەوە، كە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی: ((خوا نوێژی هیچ كام لە ئێوە بێ دەستنوێژ وەرناگرێت ، هەتا دەست نوێژ ئەگرێتـەوە)) پیاوێكی حەزرەمەوتی وتی: چ شتێك ئەبێ بەهۆی بێ دەستنوێژی ئەی ئەبوو هورەیرە؟

وتی بەهۆی فسو تڕەوە، بێ دەستنوێژی پەیدا ئەبێ. لە ڕیوایەتی تردا هـاتووە، كـە بێ دەستنوێژی بەهۆی میزو پیسی كردنەوەو، بەهۆی خەوی درێژەوەو، بەهۆی دەستدانی لە شەرمگەی خۆی، یان كەسێكی تر لەبەر ئەم فەرمودەیەی، كە ئێستا ئەینوسین.

٥٧- ن/٢٥٥ ((عن عَمْرو بن شعيب عن ابيه عن جَدّه عن النبّيﷺ قال: (اَيُّما رَجُلٍ مَسَّ فَرجَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ، و اَيُّما امْـرَأةٍ مَـسَّتْ فَرجَهـا فَلْتَتَوَضَّـأْ))) رواه احمـد وقـال البخـاريُّ عندي صحيح.

له عەمری كوڕی شوعەیبەوە لە باوكیەوە، لە باپیریەوە ئەگێڕنەوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەر پیاوێك دەستی لە عەورەتی خۆی بـدات دەسـتنوێژی ئەشـكێت، هـەر ژنێكیش دەست لە عەورەتی خۆی بدات دەستنوێژی ئەشكێت. هـەروەها دەسـتنوێژ بـە

---

(١) (اَنَّ النَّبِيَّ ﷺمَسَحَ اَعْلَى الخُفِّ واَسْفَلَهُ) ژمارە ٢٣٧ نیل الاوطـار، بـەڵام لـە ڕاسـتی ئـەم فەرمودەدا قسە هەیە.

جیماعیش ئەشکێتو بە خواردنی گۆشتی حوشتریش لەبەر ئەم فەرمودەیە، کە ئەفەرموێت:

٥٨- ن/٢٥٦ ((عن جابر بن سَمُرَةَ انّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِﷺ اَنَتَوَضَّأ مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ؟ قالَ: (اِن شِئْتَ تَوَضَّأْ وَان شِئْتُ فَلاَ تَوَضَّأْ) قال: اَنَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الأَبِلِ قال (نَعَمْ، تَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الأَبِلِ) قَالَ أصلِّي في مرابِضِ الْغَنَمِ ؟ قال (نَعَم) قال: اُصَلِّي في مرابِضِ الأبِلِ؟ قال: (لا))) رواه احمد ومسلم.

له جابیری کوری سەمەرەوە ئەگێڕنەوە، کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خواﷺ کردووە، کە ئایا ئەگەر گۆشتی مەڕمان خوارد دەستنوێژ بگرینەوە ؟

فەرموی: ((ئەگەر ئارەزووت لێبوو بیگرەوەوە ئەگەر ئارەزووت لێبوو مەیگرەوە)).

وتی: ئەدی ئەگەر گۆشتی وشترمان خوارد دەستنوێژ بگرینەوە ؟

فەرموی: ((بەڵێ دەستنوێژ بگرەوە بەهۆی خواردنی گۆشتی وشترەوە)).

وتی نوێژ بکەم لە مۆڵی مەڕدا؟

فەرموی ((بەڵێ)).

وتی نوێژ بکەم لە مۆڵی وشتردا؟

فەرموی ((نەخێر)).

بەم شێوەیە دەرئەکەوێت، کە خواردنی گۆشتی وشتر دەستنوێژ ئەشکێنێ، هەروەها مۆڵ -شوێنی خەوتن-ی مەڕ پاکەو بێنوێژ نیە، بەڵام مۆڵیوشتر پیسە)) ئیمامی شافیعی گوتویەتی، کە ئەگەر حەدیسی جابیری کوری سەمورە (صحیح) بێت، منیش هەروا ئەڵێم، ئیمامی بەیهقی شافیعی مەزهەبەو ئەڵێ دوو حەدیس لەبارەی گۆشتی وشترەوە (صحیحن) حەدیسی جابیری کوری سەمورەو حەدیسی بەراء، واتە: دەستنوێژ ئەشکێنێ بە مەزهەبی شافیعیش، والله أعلم.

٥٩- ن/٢٥٩ ((عن عَبَّادِ بِنْ تَميمِ عَنْ عَمِّهِ قَالَ: شُكِيَ اِلَى النَّبِيِّﷺ الرَّجُلُ يُخَيَّلُ

اِلَيْهِ اَنَّهُ يَجِدُ الشَّيَء في الصَّلاةِ؟ فَقالَ: (لا يَنْصَرِفُ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً اَو يَجِدَ ريحاً) رواه الجماعة اِلاّ الترمذي.

لە عەبادی كوری تەمیم لە مامیەوە ئەگێرنەوە، كە وتویەتی: سكالآیەك عەرزی پێغەمبەرﷺ كرا، كە پیاو جاریوا هەیە لەناو نوێژدا وائەزانیٚ شتیٚ لە ناو لەشیا دەرچووە، ئەبیٚ چی بكات؟

فەرموی: ((لەسەر نوێژەكەی لا نەچێت هەتا دەنگێك دەبیستیٚ، یان بۆنێك بكات ترِو فس)). واتە شتی تەواو دامەزراو بەگومان هەڵناوەشێتەوە،وە ئەمە بناغەیەكی گرنگی فیقهیە، (اليقين لا يزول بالشك)، هەروەها ئەوە دەگەیەنێت، كە هەرشتێك چۆن بووبێت لە پێشەوە، هەروا ئەمێنێتەوە، تا بەڵگەی دروست نەبێت لەسەر گۆرانی. (الاصل بقاء الشيء على ما كان) ئەمانەیش دو یاسای شارەزایی بونن چاكیان بزانن بەسودە.

٦٠- ن/٢٨٠ ((عن عائشة ﵂ قالت: كانَ رسولُ ﷺ الله اِذا اَرادَ اَنْ يَنامَ وهو جُنُبٌ غَسَلَ فَرْجَهُ وَتَوَضَّأَ وضَوءَهُ لِلصَّلاةِ)) رواه الجماعة .

لە خاتوو عائیشەوە ﵂ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەركاتیٚ بیویستایەبەلەش پیسی بنوێت، شەرمگەی خۆی ئەشۆردو دەستنوێژێكی ئەگرت، وەكو دەستنوێژی نوێژ، ئینجا ئەخەوت. واتە سوننەتە كەسیٚ لەشی پیس بوو، ویستی بخەوێت، دەستنوێژ بگرێت، ئینجا بخەوێت، هەروەها سوننەتە لەش پیس، دەستنوێژ بگرێت بۆ خواردنو خواردنەوە، یان دەستی بشۆرێت.[1]

٦١- ن/٢٨٣ ((عن ابى سعيد عن النَّبيﷺ قال: (اِذَا اَتَى اَحَدُكُمْ اَهْلَهُ ثُمَّ اَرادَ اَنْ يَعودَ فَلْيَتَوَضَّأْ) رواه الجماعة اِلا البخاريَّ)). وزاد ابن خزيمة وابن حبان والحاكم (فَاَنَّهُ اَنْشَطُ لِلْعَوْدِ). لە ئەبو سەعیدەوە﵁هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((هەر كام لە ئێوە چوە لای خێزانی خۆی ـ جماعی كرد ـ ویستی جارێكی تر بگەرێتەوە سەری، با

(١) فەرمودەی ٢٨٢، لە (نيل الاوطار) و حديث عائيشة لە (صحيحين).

دەستنوێژ بگرێت... چونکە ئەوە چالاك تری دەکات بۆ دوبارە جوتبون،و ئەم دەستنوێژەش سوننەتە.

٦٢ - ن/٢٨٧ ((عن أُمِّ سَلَمَةَ ان أُمَّ سُلَيْم قَالَتْ: يا رَسَولَ الله ﷺ انَّ الله لا يَستَحْي مِنَ الْحقّ فَهَلْ عَلَى الْمَرأَة الغُسْلُ اذا احْتَلَمَتْ؟ قال: (نَعَمْ اذا رَأتِ الماءَ) فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: وَتَحْتلمُ الْمَرأَةُ؟! فَقَالَتْ: تَرِبَتْ يَدَاكِ! فَبِما يُشْبِهُهَا وَلَدُها؟!)) متفق عليه.

له ئومه سەلەمەوه رضي الله عنها ئەگێڕنەوه، کە ئومو سولەیم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! خوا لە ڕاستی وتن شەرم ناکات، ئایا ئافرەت وەختێ ئیحتیلامی بوو -واتە لە خەودا ئاوی هاتەوە چ بزانێ، یان نەزانێ پاش خەبەربوونەوە- ئەبێ خۆی بشۆرێت؟

فەرموی: ((بەڵێ، ئەگەر ئاوی بەخۆیەوە دی)).

خاتو ئوموسەلەمە وتی: بۆ ئافرەتیش ئیحتلامی ئەبێ؟!

فەرموی: ((دەستت لەخاك بدات - دوعایەکی شەڕە بەڵام لە زمانی عەرەبیدا بەزۆری بەکار ئەهێنرێتو مەبەستی قسە پێ وتن نیە، هەر بۆ خۆشی ئەوترێت لێرە بۆ خۆشیە - ئەی بەچی منالەکەی بە دایکی ئەچێت؟ واتە: بەڵێ ئەویش ئیحتلام ئەبێ وەکو پیاو، وەکو لە فەرمودەی تردا ئەفەرموێت (انما النساء شقائق الرجال) ئافرەتان بێجگە لە خوشکانی پیاوان شتێ تر نین)[1] .

٦٣- ن/ ٢٨٨((عَنْ ابي هريرةَ رضي الله عنه عن النَّبّيِ ﷺ قال: (اذا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ، جَهَدَهَا فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ). متفق عليه ولمسلم واحمد (وَاِن لَمْ يُنْزِلْ))).

لەئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه ئەویش لەپێغەمبەرەوە ﷺ،کە فەرمویەتی:(هەرکاتێ پیاو لەناو لینگی ئافرەت دا دانیشت بۆجماعو زۆری لێکرد،واتە ئالەتی چووە ناو لەشیەوە ئیتر خۆ شۆردنی لەسەر پێویست ئەبێ..ئەگەر چی ئاویشی نەیەتەوەو خۆشیشی پێ نەگات، فەرمودەی(الْمَاءُ مِنَ الَماءِ)،یان مەنسوخە،یان بۆئیحتلام بوونە[2]،والله أعلم.

---

(١) فەرمودەی ٢٩٤، رواه الخمسة الا النسائي، سەرچاوەی پێشوو.

(١) فەرمودەی ٢٩٠ـ٢٩١، تەماشا بکە لە سەرچاوەی پێشوو.

٦٤- ن/٢٩٥ ((عَـنْ قَـيْس بـن عاصِم اَنَّـهُ اَسْـلَمَ فَـاَمَرَهُ النَّبِـيُّ ﷺ اَنْ يَغْتَـسِلَ بِمَـاءٍ وَسِدْرٍ)) رواه الخمسة الاّ ابْنَ مَاجة.

لە قەیسی کوڕی عاسمەوە هـاتووە، کـە مـسوڵمان بـووە، لەوکاتـەدا پێغەمبـەر ﷺ فەرمانی پێداوە، کە خۆی بشۆرێت بە ئاوو مـۆرد - درەختێکـی بـۆن خۆشـە-، واتـە: سونەتە هەر کافرێك مسوڵمان بوو خۆی بشۆرێت.

٦٥- ن/٢٩٧ ((عَنْ عائشة رضي الله عنها أَنَّ فاطِمَةَ بِنْتَ أَبي حُبَيْشٍ كَانَتْ تُـسْتَحاضُ فَـسَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ؟ فقال: ذَلِكَ عِرْقٌ، ولَيسَتْ بالْحَيْضَةَ، فَإِذا اَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَـدَعى الـصَلاةَ، واذا اَدْبَرَتْ فَاغْتَسِلي وَصَلِّي. رواه البخاري. متفق عليه بلفظ (فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي))).

لە خاتون عائیشەوە رضي الله عنها ئەگێڕنەوە، کە فـاطمـەی کـچی ئـەبو حوبـەیش هەمیـشە خوێنی هەبوو و پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرموی ئـەوە دەمارێکـە - نەخۆشـەو هۆی ئەو خوێنەیە- هەرکاتێ کاتی عوزری شەرعیت هات، واز لە نوێژ بهێنـەو وەختـێ کاتەکەی تەواو بوو، خۆت بـشۆرەو نوێـژت بکـە، ئەمـە بـۆ ئافرەتێکـە، کـە زەمـانو چۆنیەتی عوزرەکەی بزانێت، پێش ئەوەی، کـە دوچـاری ئـەو نەخۆشـیە بوبێـت، بـاقی شێوەکانی تر لە پەڕاوە فیقهیەکاندا باسکراوەو لێـرە باسـی ناکـەین، تـا لـە مەبەسـتی خۆمان دەرنەچین، کە حوکمەکانە بەگوێرەی فەرمودەکان.

لە ڕیوایەتی ئیتیفاقیدا لـە ئـاخردا ئەفـەرمویت: ((ئـەو خوێنـە لـە خـۆت بـشۆرەو نوێژەکەت بکە)). مەبەست لە ((متفق علیه)) ئیمامی (أحمدو بخاریو موسـلیمە) خـوا لێیان خۆش بێ.

٦٦- ن/٢٩٨ ((عن علي ـ كَرَّمَ الله وجهه ـ قال: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقْضِى حَاجَتَـهُ ثُـمَّ يَخْرُجُ فَيْقرَأُ القُرْآنَ ويأكُـلُ مَعَنَا اللَّحْـمَ وَلا يَحْجُبُـهُ (وَرُبَمَّـا قـال: لايَحْـجُزُهُ) مِـنَ القُـرْآنِ شَيْءٌ لَيْسَ الجنابة)). رواه الخمسة.

لە عەلییەوە ئەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ئەگەیاند بە ئـاو، لەپاشـا ئەهاتـەدەر قورئـانی ئەخوێنـدەوە وگۆشـتی لەگـەڵ ئێمـەدا ئەخوارد،ـــواتە دەستنوێژی نەبووە هیچ بەرگری نەئەکرد (یان زۆرجار ئەیوت: هیچ شتێك بەرگری ئـەوی

نەدەکرد لە قورئان خوێندن بێجگە لەش پیسی، واتە تەنها لە کاتی دەست بە ئاوگە یاندن و لەش پیس ناتوانێ قورئان بخوێنێ.

٦٧- ن/٣٠٩ ((عَنْ ابن عمر قال: قال رَسُولُ اللهﷺ (اِذَا جَاءَ اَحَدُكُمْ اِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ))). رواه الجماعة.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە- خوا لە خۆی و باوکیشی ڕازی بێت- ئەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((هەرکاتێ هەرکام لەئێوە چو بۆ جومعە، با خۆی بشۆڕێت، واتە سوننەتە خۆشۆردنی ڕۆژی جومعە[1] بەلای هەندێك زانایانەوە واجبەو، بەڵگەیشیان بەهێزە.

٦٨- ن/٣٢٩ ((عن عائشةرضي الله عنها اَنَّ النَّبِيَّﷺ كَانَ اذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنابَةِ: يَبْدَأُ فَيَغْسِلُ يَدَيْهِ ثُمَ يُفْرَغُ بِيَمِينِهِ عَلَى شَمالِهِ فَيَغْسِلُ فَرْجَهُ ثُمَّ يَتَوَضَّىءُ وُضُوءَهُ لِلصَّلاةِ ثُمَّ يَأْخُذُ اَلْمَاءَ وَيُدْخِلُ اَصابَعَهُ فِي اُصُولِ الشَّعرْ حَتَّى اِذا رَأَى اَنْ قَدْ اسْتَبْرَأَ حَفَنَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثَ حَثَيَاتٍ ثُمَّ اَفَاضَ عَلَى سائِرِ جَسَدِهِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ. اَخْرَجَاهُ وَفِي رِوايَةِ لَهُمَا: ثُمَّ يُخَلِّلُ بِيَدَيْهِ شَعْرَهُ حَتَّى اِذَا ظَنَّ اَنَّهُ قَدْ اَرْوى بَشَرَتَهُ اَفَاضَ عَلَيْهِ الْماءَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ)).

لە خاتوو عائیشەوەرضي الله عنها ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەرﷺ هەرکاتێ بەهۆی لەش پیسیەوە خۆی بشۆردایە ، پێشەکی هەردوو دەستی ئەشۆرد، لەپاشا بەدەستی ڕاستی ئاوی ئەکرد بە دەستی چەپیاو شەرمگەی خۆی ئەشۆرد، لەپاشا دەستنوێژی ئەگرت، وەکو دەستنوێژی نوێژ، ئینجا هەندێ ئاوی هەڵئەگرتو پەنجەی ئەخستە ناوبنی مووی سەریەوە، هەتا بەتەواوی ئەیزانی، کە بە تەواوی مووی سەری تەڕ بووە، ئینجا سێ مشت ئاوی بەسەریا ئەکرد، ئینجا ئاوی ئەکرد بەسەرخۆیدا پاشان هەردوو پێی ئەشۆرد. ((بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە. هەر لە ڕیوایەتێکی تری ئەواندا هاتووە، کە: ((لەپاشا دەستی ئەخستە ناو مووی سەریەوە هەتا ئەیزانی، کە بەتەواوی پێستی سەری

---

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٢١٢- ٢١٣، لە سەرچاوەی پێشو بکە.

تەڕبووە، ئینجا سێ جار ئاوی بەسەریا ئـەکرد))، واتـە لـە خۆشـۆردنی لـەش پیـسیدا پێویستە بەچاکی سەر تەڕ ببێو وشکی نەمێنێ، بۆ پیاوو بـۆ ژن، وەکـو یەکـە، بـەڵام ئەگەر ئافرەت بۆ لەش پیـسی بـوو کـەزی هـەبوو ئـەتوانێ شـی نەکاتـەوە، بـەڵام بـۆ خۆشۆردنی عوزرە شەرعیەکانی تر، ئـەبێ کەزیـەکانی بکاتـەوەو بەچـاکی سـەری تـەڕ بکات، وەکو لەم فەرمودەدا هاتووە کە ئەفەرموێت:

٦٩- ن/٣٣٥ ((عَن امِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها قالَتْ: قُلْتُ: يَارَسولَ اللهِ ﷺ انِّـي امْـرَأَةٌ اَشَـدُّ ضَـفْرَ رَأْسِي اَفَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ الْجَنابَةِ؟ قال: (لا انَّمْا يَكْفيكِ اَنْ تَحثي عَلَى رَأْسِـكِ ثَـلاَث حَثَيَـاتٍ ثُمَّ تُفيضينَ عَلَيْـكِ الْمـاءَ فَتَطْهُـرين))). رواه الجماعـة الا البخـاري وقـال الترمـذيُّ حسنٌ صحيح.

لە خاتو ئومـو سـەلەمەوە رضي الله عنها ئەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خوا ﷺ من کەزی زۆر پتەوە، ئایا بۆ کاتی خۆشۆردنی لەش پیسی هەڵیوەشێنمەوە ؟

فەرموی: نەخەیر، سێ چنگ ئاوی پێدا بکەو، ئینجا ئاو بکـە بـەخۆتاو خـۆت پـاك بکەرەوە، واتە پێویست بە هەڵوەشاندنەوە ناکات، بەڵام بۆ شـۆردنەکانـــــی تری هەڵیوەشێنەوە وەکو لە فەرمودەی تردا هاتووە [1].

٧٠- ن/٣٣٧) ((عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عائشة، اَنَّ النَبِّـيَّ ﷺ قـال لَهـا - وكانـت حائِـضاً-: (أُنْقُضِي شَعْرَكِ واغْتَسِلي))). رواه ابن ماجة باسناد صحيح .

لە عوروەوە ئەویش لە خاتو عائیشەوە هاتو کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە - کاتێ لە حەیزا، ـ مانگانەی ئافرەت ـ بووە: کەزیەکانت هەڵوەشێنەوەو خـۆت بـشۆرە، ئەمـە ئەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی، کە بۆ شۆردنی غەیری لەش پیـسی، ئافرەتـان پێویـستە کەزیەکانیان هەڵوەشێننەوەو بە چاکی لەشیان بشۆر، کە هیچ وشکی تێدا نەمێنێ.

٧١- ن/٣٤٠ (( عَنْ اَنَس قال: (كَانَ النَّبـيُّ ﷺ يَغْتَسِلُ بالـصَّاعِ اِلَـى خَمْـسَةَ اَمْـدادٍ

---

(١) شەرحی فەرمودەی ٣٣٥، لە سەرچاوەی پێشو تەماشا بکە.

وَيَتَوَضَّأُ بالْمُدِّ))) متفق عليه .

له‌ ئه‌نه‌سه‌وه‌ﷺ ئه‌گێڕنه‌وه‌، كه‌ وتويه‌تی: ((پێغه‌مبه‌رﷺ به‌ صاعێك، كه‌ تا پێنج مود بووه‌ خۆی شۆردوه‌، وه‌ به‌ مودێكیش ده‌ستنوێژی گرتوه‌، مود: دوو مشتی چاك ئاو ئه‌گرێت به‌لای كه‌مه‌وه‌، به‌چاوی خۆم مودی پێغه‌مبه‌رمﷺ دیوه‌. گرنگ ته‌ڕبوونی له‌شه‌، ئه‌گه‌ر به‌ كه‌متریش له‌وه‌ بێ دروسته‌، وه‌كو له‌ فه‌رموده‌ی تردا هاتووه‌[1].

٧٢- ن/٣٤٨ ((عَنْ يَعْلي بن اُمَيَّةَ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ رأى رَجُلاً يَغْتَسِلُ بالْبَرَاَزِ بِلا اِزَار، فَصَعِدَ المنبر فَحَمدَ اللهَ وَاَثْنَى عَلَيْه ثُمَّ قَالَ: (اِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ حَيٌّ سِتِّيرٌ يُحِبُّ الحَياءَ والسِّتْرَ، فَأذَا اغْتَسَلَ اَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ))). رواه ابو داود واللفظ له، والنَّسائيُّ.

له‌ یه‌علای كوڕی ئومه‌یه‌وه‌ ئه‌گێڕنه‌وه‌، كه‌ پێغه‌مبه‌ری خواﷺ پیاوێكی دی له‌ ده‌شتێكا بێ په‌رده‌ خۆی ئه‌شۆرد، له‌به‌ر ئه‌وه‌ چووه‌ سه‌ر جێگای وتاردانو سوپاسو ستایشی خوای كردو، له‌پاشا فه‌رموی: ((به‌ڕاستی خوای بالاْده‌ستو گه‌وره‌ زۆر به‌ شه‌رمو داپۆشه‌ره‌ شه‌رمو داپۆشینیشی پێخۆشه‌، هه‌ر كاتێ یه‌كێك له‌ ئێوه‌ خۆی شۆری با خۆی داپۆشێت. واته‌ پێویسته‌ مرۆڤ له‌كاتی خۆشۆریندا خۆی ده‌رنه‌خات، كه‌ خه‌ڵك ببینێت، به‌ڵام ئه‌گه‌ر شوێنێكی چۆڵ بوو ئه‌وه‌ قه‌یناكه‌. داستانی كولله‌ بارین به‌سه‌ر ئه‌یوبدا كاتێ خۆی ئه‌شۆریو، ڕاكردنی به‌ردی لیباسه‌كه‌ی موسا به‌ناوبانگن كه‌ ڕوت بوون[2].

٧٣- ن/٣٥٤ ((عَنْ عِمْرَانَ بِنْ حُصَيْنِ قال: (كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ في سَفَر فَصَلَّى بِالنّاسِ فَإذَا هُوَ بِرَجُلٍ مُعْتَزِلٍ فقال: (ما مَنَعَكَ اَنْ تُصَلِّيَ؟) قال: اَصابَتْني جَنَابَةٌ وَلا مَاءَ، قال (عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ فَأنَّهُ يَكْفيكَ))). متفق عليه.

له‌ عیمرانی كوڕی حوسه‌ینه‌وه‌ ئه‌گێڕنه‌وه‌، كه‌ وتوویه‌تی: ((ئێمه‌ له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری

---

(١)ته‌ماشای فه‌رموده‌ی ٣٤٤-٣٤٧، له‌ سه‌رچاوه‌ی پێشو بكه‌.

(١) ته‌ماشای فه‌رموده‌ی ٣٤٩-٣٥٠، له‌ سه‌رچاوه‌ی پێشو بكه‌.

خواداﷺ بووین لە سەفەرێکدا جەماعەتی کرد، لەوکاتەدا دی پیاوێك خۆی کەنار داوە، فەرموی: (چ شتێك بۆتەڕێگر ، کە تۆش نوێژ بـە جەماعـەت نەکـەیت؟) وتـی: لەشـم پیسەو ئاویش نیە، فەرموی: ((خاك بەکاربهێنە، واتە تەیەموم بکە بەسە بۆت)).

٧٤- ن/٣٥٨ ((عَنْ عمرو بن شُعَيْبٍ عن ابيه عن جَدِّه قَالَ: قال رَسُولُ اللهِﷺ (جُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسجِداً وَطَهُوراً، اَيْنَمَا اَدْرَكَتْني الصَّلاةُ تَمَسَّحْتُ وَصَلَّيْتُ)، رواه احمد اصـله في الصحيحين)).

لە عەمری کوری شوعەیب لە باوکیـەوە لـە باپیریـەوە ئەگێڕنـەوە، کـە وتوویـەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((زەوی بۆم کراوە بە مزگەوتو پاکۆکەر بۆم لـە هـەر کوێدا نوێـژم پێگەیـشت، مەسـح ئەکـەمو نوێـژ ئەکـەم، واتـە هـەر ئـاو نـەبوو خـاك بەکارئەهێنم، والله أعلم، بەڵێ بەڕاستی خاك پاکۆکەرە، ئەگینا ئێستا لەبەر ئەو هـەمو پیسیە ئەکرێتە سەر زەوی کەس نەدەژیا.

٧٥- ن/ ٣٦٠ ((عن ابي هُرَيرةؓ أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قال: (اِذا اَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فأْتوا مِنه ما اسْتَطَعْتُمْ)). متفق عليه.

لە ئەبو هورەیرەوەؓ ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی هـەرکاتێ فەرمانێکم بەسەرتاندا دا، چەند دەتوانن ئەوەندە لەو شتە ئەنجام بدەن. بەڕاسـتی ئەمـە دەرگایەکی گەورەی زانینەو زۆر شت بەم فەرمودە بەنرخە ڕێكوپێك ئەکرێت، جا هـەمو فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەبەرچاو بگرەو، لە هەرکام چەندت توانی، ئەوەنـدە ئـەنجام بدەو کۆتایی مەکە، ئەوەیش کە نەتوانی لێپرسراو نیت.

٧٦- ن/٣٦٤ ((عن عَمَّـارٍ انـه قـال أَجْنَبْـتُ فَلَـمْ اُصِـبِ الْمـاءَ فَتَمَعَّكْتُ في الـصَّعيدِ وَصَلَّيْتُ فَذَكَرْتُ ذلِكَ للنبّيﷺ؟ فقـال: (اِنَّمـا يَكْفيـك هكـذا) وَضَـرَبَ النبّـيﷺ بكَفَّيْـهِ الأَرْضَ وَنَفَخَ فيهما ثُمَّ مَسَحَ بِهِما وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ)) متفق عليه.

لە عەمارەوە، کە وتویەتی لەشم پیس بوو، ئاو دەست نەکـەوت، لەبـەر ئـەوە خـۆم

تلاند بەناو خۆڵداو نوێژم کرد، جا ئەمەم بۆ پێغەمبەرﷺ باسکرد، فەرموی: ((هەر ئەمەت بەس بووە)) پێغەمبەرﷺ هەردوو لەپی خۆیدا بە زەویداو فوی لێکردن، ئینجا هێنانی بەدەمو چاوو ناو لە پیدا، واتە لە تەیەمومدا تەنها مەسحکردنی دەمو چاوەو هەردوو دەستی تا موچی[1]. جا ئەوەی، کە ئەڵێ دوو جار، ئەوەی تر کە ئەڵێ، تا ئەنیشکی بەڵگەی بەهێزیان نیە[2]، هەروەها سوننەتە پاش دەستدان لە خاك فوی پێدا بکات، با زۆر تۆزاویش نەبێ.

٧٧- ن/٣٦٧ ((عن عائشة أنَّها اسْتعارَتْ مِنْ اسْماءَ قَلادَةً فَهَلَكَتْ فَبعَثَ رَسُولُ اللهﷺ رِجالاً في طَلَبِها فَوَجَدوها فَأَدْرَكَتْهُمُ الصَّلاةُ وَلَيْسَ مَعَهُم ماءٌ فَصَلُّوا بَغَيْرِ وُضوءٍ فَلَماَّ اَتَوا شَكَوا ذلِكَ اِلَيْهِ, فأنْزَلَ الله عَزَّ وجَلَّ ـ آية التَّيمُم)). رواه الجماعة الاَّ الترمذيَّ

لە خاتو عائیشەوە ﵂ ئەگێڕنەوە، کە گەردەن بەنێکی لە ئەسمائی خوشکی بە ئەمانەت وەرگرت، جا ئەو گەردەن بەنە وون بوو، پێغەمبەری خواﷺ چەند پیاوێکی نارد بۆ دۆزینەوەی ـ ئەوانیش هاتن‌و ـ دۆزیانەوە لەوکاتەدا نوێژیان پێ گەیشت ـ نوێژ بوو ـ هیچ ئاویان پێ نەبوو، بە ناچار بێ دەست نوێژ نوێژیان کرد، کاتێ هاتنەوە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ سکاڵای ئەو ئیشەی خۆیانیان لەلا کرد، جا خوای بەدەسەڵات و گەورە ئایەتی تەیەمومی نارده خوارەوە، لێرەدا ئەمە ئەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوە، کە مرۆڤی خاوەن باوەڕ، کاتی نوێژی هات، نە ئاوی دەستکەوت، نە خۆڵ، واتە زەوی هەموی تەڕبوو، ئەتوانێ بێ دەستنوێژ نوێژەکەی بکات، هەندێکیش ئەڵێن گێڕاندنەوەشی ناوێت، چونکە پێغەمبەرﷺ هیچ کامیانی بەوانی نەفەرمووە، ڕۆشنکردنەوەیش کاتی ڕووداو پێویستە، مادام هیچی نەفەرمووە بەسە.

---

(١) موچ: ئەو جومگەیە، کە لەش ئەگەیەنێت بە دەست.

(٢) تەماشای ڕاڤەی ئەم فەرمودەیە بکە لە (نیل الأوطاردا) بەسودە.

# باسی بێ نوێژی ئافرەت (الحيض)

٧٨- ن/٣٧٤ ((عن أمّ عَطِية قالت: (كُنّا لا نَعُدُّ الصُّفْرةُ والكُدْرَة بَعْدَ الطُّهْرِ شَيْئاً) رواه ابو داود والبخاري ولم يذكر (بعد الطُّهْرِ))).

له دایکی عەتیەوە ئەگێڕنەوە، کە وتوویەتی: ((ئێمە کاتی خۆی، -واتە لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ زەردیو لێڵی پاش پاك بوونەوەمان لە خوێنی حەیز، بەهیچ دانەئەنا. لە لای بوخاری: باسی دوای پاکیەتی نەکراوە، واتە نە لەپاشو نە لەپێش، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕیوایەتی تر هاتووە ئەوەی پاش پاکبوونەوە بە حەیز دانەنرێت پاکەو ئەوەی پێش بە حەیز دابنرێت، والله أعلم.

٧٩- ن/٣٧٨ ((عن اَنس بن مالكٍ اِنَّ اليَهودَ كانوا اِذا حاضَت المَرْأَةُ منهم لَمْ يؤاكِلوها ولَمْ يُجامِعوها في البيوت، فَسَأَلَ اَصْحابُ النَبيَّﷺ فأنزل اللهُ عزّوَجَلَّ (وَيَسئلونَكَ عن المحيض ...) الى آخر الآية (البقرة-٢٢٢) فقال رَسُولُ اللهِﷺ (اِصْنَعوا كُلَّ شَئٍ اِلاَّ النِكاحَ) وفي لفظٍ: (اِلاّ الجِماعَ). رواه الجماعة اِلا البخاري)).

لە ئەنەسی کوری مالیکەوە ئەگێڕنەوە، کە جولەکە هەر کاتێ ئافرەتێکیان بکەوتایە بێ نوێژیەوە، نە لەگەڵیان ئەخوارد، نە لەیەك ماڵیشدا لەگەڵی کۆ دەبوونەوە، هەر بۆیە یارەکانی پێغەمبەرمانﷺ پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کرد، لەبەر ئەوە خوای بە دەسەڵاتو گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد:

((پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی حەیزەوە، بڵێ: ئازارێکەو لەوکاتەدا نزیك ئەو ژنانە مەکەونەوە ـ بۆ جیماع ـ نزیکیان نەکەونەوە، تا پاك ئەبنەوە، جا ئەو کاتەی خۆیان پاك کردەوە بچنە لایان ـ بۆ جیماع ـ لەو جێگایەوە، کە فرمانتان پێ دراوە، بە ڕاستی خوا تۆبەکارانی زۆر خۆش ئەوێتو، پاكو خاوێنانیشی زۆر خۆش ئەوێ))، ئینجا پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ((هەمو شتێکیان لەگەڵ ئەنجام بدەن بێجگە لە جیماع))، وشەی

نیکاحیش لێرەدا مانای جیماعە، واتە تەنها جیماعیان لەگەڵدا دروست نیە، ئیتر تێکەڵاوی‌و یاری ژن‌و مێردو بەیەکەوە خەوتن بە ڕوتی هیچ قەیناکات..

٨٠- ن/٣٨٥ ((عَن معاذة قالت: سألتُ عائشة ما بالُ الْحائضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلا تَقْضِي الصَّلاة؟ قالت: (كانَ يُصِيبُنا ذلِكَ مَعَ رَسُولِ الله صلى الله عليه وسلم فَنُؤمَرُ بِقَضاءِ الصَّوْمَ وَلانؤْمَرُ بِقَضاءِ الصَّلاة)). رواه الجماعة.

لە موعازەوە ئەگێڕنەوە، کە وتوویەتی پرسیارم لە خاتو عائیشە ﵂ کرد، وتم: ئەوە چیە ئافرەت پاش حەیز - خوێنی باوی ئافرەت- ڕۆژو قەزا ئەکاتەوەو، نوێژ قەزا ناکاتەوە؟

وتی: ((ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بوین توشی ئەو خوێنە ئەهاتین، فرمانمان پێ ئەکرا، کە ڕۆژو قەزا بکەینەوە، بەڵام فرمانمان پێ نەئەکرا، کە نوێژ قەزا بکەینەوە.

لە ڕاستیدا ئیسلام ئاینێکی ئاسانە بۆ ئەو کەسەی خوا بۆی بکاتو مسوڵمان بێ، قەزای ڕۆژو ئاسانە، چونکە ساڵی جارێکە، بەڵام قەزای نوێژ سەختە، بۆیە خوا ئەو بارە سەختەی لەسەر ئافرەتان لابردووە، والله أعلم.

٨١- ن/٣٨٨ ((عن عِكْرِمةَ، عن حَمْنَتَةَ بِنْتِ جَحْشٍ: انَّها كانت تُسْتحاضُ وَكانَ زوجُها يُجامعهُا). رواه ابو داود، وقال النووي: اسناده حسنٌ)).

لە عیکریمەوە، لە حەمنەی کچی جەحشەوە هاتووە، کە: ئەو خوێنی هەمیشەیی بووەو مێردەکەی جیماعی لەگەڵدا ئەکرد، واتە ئافرەتی ئاوا کابرای مێردی ئەتوانێ جیماعی لەگەڵ بکاتو بەو ئافرەتە ئەوترێت (مُسْتحاضة).

٨٢- ن/٣٩١ ((عن امِّ سَلَمَة ﵂ قالت: (كَانَت الْمَرْأةُ من نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ تَقْعُدُ في النِّفَاسِ اَرْبَعينَ لَيْلَةً لا يَأْمُرُهَا النَّبِيُّ ﷺ بِقَضاءِ صَلاَةِ النِّفَاسِ) رواه ابو داود

لە دایکی سەلەمەوە ﵂ ئەگێڕنەوە، کە وتوویەتی: (لە ژنانی پێغەمبەردا ﷺ بووە کە بەهۆی خوێنی منداڵ بوونەوەوە چل ڕۆژ ئەمایەوەو نوێژی نەئەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ نەئەکرد، کە نوێژی ئەو سەردەمەی (نفاس) بگێڕێتەوە. نفاس خوێنی پاش منداڵبوونە.

# بەشـــی نوێژ

٨٣- ن/٣٩٣ ((عن انس بن مالك قـال! ((فُـرِضَتْ علـى النَبِّـيِّﷺ الـصَّلَوَاتُ لَيْلَـةَ اُسْرِيَ بِهِ خَمْسِـينَ ثُمَّ نَقَصَتْ حَتى جُعِلَتْ خَمْساً, ثُمَّ نودِي يـا مُحَمَــدُ اِنَّــهُ لايُبَـدَّلُ القَـوْلُ لَدَيَّ وَاِنَّ لَكَ بِهذا الخَمسِ خَمْسِينَ) رواه احمد والنسائي والترمذي وصحَّحَّهُ)).

له ئەنەسی كـوری مـالیكەوەﷺ ئەگێڕنەوە، كە وتوویـەتی: نوێـژ فـەرز كـرا لەسـەر پێغەمبەرﷺ ئەو شەوەی كە شەوڕەوی پێكرا، پەنجا نوێژ بوو لە پاشا كەم كرایـەوە، تـا كرا بە پێنج، لە پاشا بانگ كرا ئەی ((محمد)) بەڕاستی ئـەو بڕیـارە لای مـن ناگۆڕێـت، واتە بە پێنج نوێژ ئەمێنێتەوە، بۆ تۆ ئەو پێنج نوێژە بـە پـەنجا دائـەنرێت، واتـە: یـەك بەدەیە.

٨٤- ن/٤٠١ ((عن بريدة: سَمِعْتُ رَسُولُ اللهِﷺ يقـول: (اَلْعَهْـدُ الـذي بيننـا وبيـنهم الصَّلاةُ فَمَنْ تَرَكَها فَقَدْ كَفَرَ)، رواه الخمسة)).

له بریدەوەﷺ ئەگێڕنـەوە، كـە وتویـەتی: بیـستم لـە پێغەمبـەری خـواوەﷺ، كـە ئەیفەرمو: ئەو بڕیارو جیاكەرەوەی، كە لە نێوان ئێمەو ئەواندا — كافران- هەیـە نوێـژە، لەبـەر ئـەوە هەركەسـێك وازی لێـــبهێنێ، بەڕاسـتی كـافر بـووە. هـەروەها چـەندین فەرمودەی تر بەهــەمان مانـاو مەبەسـت هـاتوەو ڕاسـتن، بۆیـە زۆربـەی زۆری زانایـان نوێژنەكەریان بەلاوە كافرەو، هەموشیان یـەك دەنگـن لەسـەر ئـەوەی، كـە هەركەسـێك ئینكاری فەرزبوونی نوێژ بكات كافرە.[1]

٨٥- ن/٤٠٥ ((عن ابي هريرة: سَمِعْتُ رَسُولُ اللهِﷺ يقول: ((اِن اَوَّل مـا يُحاسَـبُ بِـهِ الْعَبْدُ يَوْمَ القِيامةِ الصَّلاةُ الْمكتوبَةُ فَإِنْ اَتَمَّهَا، وَاِلاَّ قِيلَ : آنْظُرُوا هَلْ لَهُ مِنْ تَطَـوُّعٍ ؟ فَـاِنْ

(١) تەماشای فەرمودەی ٤٠٠ و ٤٠٣ و شەرحی یەكەمیان بكە، لە سەرچاوەی پێشوو.

كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ أُكْمِلَتِ الفريضَةُ مِنْ تَطَوُّعِهِ ثُمَّ يُفْعَلُ بِسائِرِ الأَعْمالِ المفْروضَةِ مِثْلُ ذلِكَ))، رواه الخمسة)).

له ئەبو هورەیرەوە ﷺ ئەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوابوومﷺ، کە ئەیفەرمو: لە ڕۆژی قیامەتدا یەکەم شت، کە بەندە حسابی لەسەر دەکرێ نوێژە فەرزەکانە، ئەگەر تەواوی کرد بوو - ئەوە باشە- ئەگینا ئەوترێت: تەماشا بکەن بزانن نوێژی سوننەتی هەیە، جا ئەگەر نوێژی سوننەتی هەبوو، فەرزەکانی پێ تەواو ئەکرێت، لەپاشا باقی کردەوە فەرزەکانی تریش هەر بەو شێوەیە، واتە پێویستە مسولمان زۆر ئاگاداری ئەنجامدانی فەرزەکانی بێت بەتایبەت نوێژو لە هەموویاندا بازیادەیشی هەبێ، نەوەك فەرزێکی کەم بێت لە ڕۆژی قیامەتا, هەروەها لێرەوە دەرئەکەوێت کە قەرزار ئەتوانێ سوننەت بکاتو نابێ لە بژاردنەوەی فەرزەکەیشی کەمتەر خەم بێت.

٨٦- ن/٤١٥ ((عن عمرو بن شُعَيبٍ عن ابيه, عن جَدِّه قالَ: قالَ رسُولُ الله ﷺ: (مُروا صِبيانَكُمْ بالصَّلاةِ لِسَبْعِ سِنينَ وِاضْرِبوهُمْ عَلَيْها لِعَشرِ سِنينَ وَفَرِّقوا بَيْنَهُمْ في المَضَاجِعِ) رواه احمد وابوداود)) .

له عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە با ئەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی فەرمان بدەن بەسەر منالەکانتاندا لە حەوت سالێدا نوێژ بکەنو، لە دە سالێداو لێیان بدەن لەسەر ـ نەکردنی نوێژـ لەو تەمەنەدا خوشكو برا جێگایان بۆ جیا بکرێتەوە.

٨٧- ن/٤١٧ ((عن عمرو بن العاص أَنَّ النَبّيَّ ﷺ قال: (الأِسْلامُ يَجُبُّ ما قَبْلَهُ) رواه احمد)).

له عەمری کوڕی عاسەوەﷺ ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: بە باوەڕهێنان بە ئیسلام چاو پۆشی ئەکرێت، لە هەرچی ئیشێکی خراپ کە لە پێش مسولمان بووندا کرابێ، بەو مەرجەی لە ئیسلامەکەدا ڕاست بکاتو بەجوانی

بجولێتەوە، وەکو لە فەرمودەی تردا کە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە ڕۆشن کراوەتەوە[١].

٨٨- ن/٤١٨ ((عن جابر بن عبدالله انَّ النَّبّيَّ ﷺ جاءَهُ جبريل — عليه السلام — فقال له: (قُمْ فَصَلَّهْ) فَصَلَّى الظُهْرَ حينَ زالَتِ الشَّمْس، ثُمَّ جاءَهُ العَصْرَ فقال: (قُمْ فَصَلَّهْ) فَصَلَّى العَصْرَ حينَ صارَ ظِلُّ كُلّ شَئٍ مِثْلَهُ، ثُمَّ جاءَهُ المَغْرِبْ فقال: (قُمْ فَصَلَّهْ) فَصَلَّى المَغْرِبَ حينَ وَجَبَتِ الشَّمْس، ثُمَّ جاءَهُ العشاءُ فقال: (قُمْ فَصَلَّهْ) فَصَلَّى العِشاءَ حينَ غابَ الشَّفَقُ. ثُمَّ جاءَهُ الفَجْر فقال: (قُمْ فَصَلَّهْ) فَصَلَّى الفَجْرَ حينَ بَرَقَ الفَجْرُ اَوْ قال: سَطَعَ الفَجْرُ- ثُمَّ جاءَهُ مِنَ الْغَدِ لِلظُّهرِ فقالَ: (قُمْ فَصَلَّهْ) فَصَلَّى الظُّهْرَ حينَ صارَ ظِلُّ كُلّ شَئٍ مِثْلَهُ, ثُمَّ جاءَهُ العَصْرَ فقال: (قُمْ فَصَلَّهْ) فَصَلَّى العَصْرَ حينَ صارَ ظِلُّ كُلّ شَئٍ مِثْلَيْهِ، ثُمَّ جاءَهُ المَغْرِبَ وَقْتاً واحداً لم يَزُلْ عَنْهُ، ثُمَّ جاءَهُ العِشاءَ حين ذَهَبَ نِصْفُ اللَّيْلِ — اوقال: ثُلُثُ اللَّيْلِ - فَصَلَّى العِشاءَ ثُمَّ جاءَهُ حِينَ اَسْفَرَ جِدًّا فقال: (قُمْ فَصَلَّهْ) فَصَلَّى الفَجْرَ، ثُمَّ قال: (مابَيْنَ هذَيْنِ الوَقْتَيْنِ وَقْتٌ) رواه احمد والنسائي، والترمذي بنحوه ))(وقال البخاريُّ هوَ اَصَحَّ شئٍ في المواقيت).

لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە هاتوە، کە جوبرەئیل - علیە السلام- هاتوەتە لای پێغەمبەرﷺو پێی فەرموە، کە ((هەستەو نوێژ بکە)) نوێژی نیوەڕۆی کرد کاتێ، کە ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسماندا لایدا، لەپاشا عەسر هاتەوە لایو گوتی: ((هەستەو نوێژ بکە)) نوێژی عەسری کرد، وەختێ سێبەری هەمو شتێك بە ئەندازەی خۆی لێهات ـ بێجگە لە سێبەری نیوەڕۆـ لەپاشا مەغریب هاتەوە لایو گوتی: ((هەستەو نوێژ بکە)) نوێژی مەغریبی کرد، وەختێ ڕۆژئاوا بوو. لەپاشا عیشا هاتەوە لایو گوتی: ((هەستەو نوێژ بکە)) نوێژی عیشای کرد، وەختێ سورایی کەناری ڕۆژئاواوون بو، لەپاشا بەیانی هاتەوە لای و گوتی: ((هەستە نوێژبکە جا نوێژی بەیانی کردکاتێ، کە بەیانی دەرکەوت، ـ یان وتی: کاتێ بەیانی ڕۆشن بوویەوە. لەپاشا ڕۆژی دوایی هاتەوە لای

(١)تەماشای شەرحی فەرمودەی ژمارە٤١٧ کە فەرمودەی(٨٧) خۆمانە لە (نیل للاوطار) بکە.

لەکاتی نیوەڕۆداو فەرموی ((هەستە نوێژ بکە)) جا نوێژی نیوەڕۆی کرد کاتێ سێبەری هەمو شتێك، وەکو خۆی لێهات ـ بێجگە لە سێبەری نیوەڕۆـ لە پاشا عەسر هاتەوە لای‌و فەرموی ((هەستەو نێژ بکە)) جا نوێژی عەسری بۆ کرد، کاتێ کە سێبەری هەمو شتێك دوو بەرامبەر خۆی لێهات - بێجگە لە سێبەری نیوەڕۆـ لەپاشا مەغریب هاتەوە لای هەر لە یەك کاتداو لای نەدابوو لێی. لەپاشا عیشا هاتەوە، کە نیوەی شەو بوو، یان وتی بەشی سێهەمی کۆتایی شەو بووـ جا لەوکاتەدا نوێژی عیشای کرد، لە پاشا کاتێ کە ئاسمان بەتەواوی زەرد ببووـ نزیك بە هەتاو دەرکەوتن ـ بوو، فەرموی ((هەستە نوێژ بکە)) جا نوێژی بەیانی کرد، لەپاشا فەرموی: ((نێوان ئەو دوو کاتانەدا کاتن ـ بۆ ئەنجامدانی ئەو پێنج فەرزەـ)). ئیمامی بوخاری فەرمویەتی ئەمە ڕاستترین شتە لەبارەی کاتی نوێژەکانەوە، بۆیە منیش لەناو دەیان فەرمودەی ڕاست ئەم فەرمودەیەم هەڵبژارد بە هیوای سوود لێوەرگرتن، جیاوازی کەمێ لە وەختی مەغریب‌و عیشاو بەیانی‌و عەسردا لە ئاخیری کاتیانەوە هەیەو بەو شێوەیە کە ئێستا باوە ڕاستەو جێگای دوو دڵی نیە، عیشا هەتا نوێژی بەیانی ئەمێنێ‌و بەیانی تا ڕۆژ دەرئەکەوێ‌و عەسر تا ڕۆژئاوا ئەبێ‌و مەغریب تا نزیکی کاتی عیشا ئەمێنێ [(١)]، والله أعلم.

٨٩- ن/٤٢٤ ((عن ابي ذرّ قال: كُنّا مَعَ النَّبــيِّﷺ في سَفَرٍ, فَأَرَادَ الْمؤذِّنُ اَنْ يُؤَذِّنَ لِلظهْر فقال النبّيﷺ: (اَبْرِدْ)، ثُمَّ ارادَ ان يُؤَذِّنَ، فَقَالَ لَهُ (اَبْرِدْ) حَتَّى رَأَيْنا فَيْءَ التُّلُولِ، فقال النَّبّيﷺ (اِنَّ شدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اِشْتَدَ الْحُر فَاَبْرِدُوا بِالصَّلاةِ). متفق عليهِ)).

لە ئەبو زەڕەوە ئەگێڕنەوە، کەوتویەتی: ((لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەرداﷺ بووین، بانگ‌وێژ ویستی بانگی نیوەڕۆ بڵێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموی (ساردی کەرەوە)، دیسان ویستی بانگ بڵێت پێی فەرموو: (ساردی کەرەوە) هەتا سێبەری تەپۆڵکەکانمان دی — ئینجا بانگدراو نوێژی نیوەڕۆ کرا جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((بەڕاستی

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٤٧٤-٤٧٥، لە سەرچاوەی پێشوو بکە.

گەرمای توند هەناسەی دۆزەخە، هەركاتێ گەرما زۆر توند بوو بـە نوێـژەكانتان سـاردی بكەنەوە))، واتە: نیوەڕۆ دوا بخەن، تا هەوا كەمێ فێنێك ئەبێ‌و نزیـك ئەكەوێتـەوە لـە عـەسر.

٩٠- ن/٤٢٦ ((عَنْ اَنَس قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِﷺ يَقُولُ: (تِلْكَ صَلاةُ الْمُنافِقِ: يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَمْسَ حَتّـى اِذَا كَانَـتْ بَـيْنَ قَرْنـي الـشَّيْطانِ، قَـامَ فَنقَرهَـا اَرْبَعـاً لا يَـذْكرُ اللّهَ اِلاّ قَليلاً))). رواه الجماعة اِلاّ البخاري وابن ماجه.

لە ئەنەسەوەﷺ هاتووە، كە وتویـەتی گوێبیـستی پێغەمبـەری خـوا بـومﷺ، كـە ئەیفەرمو: ((ئەوە نوێژی مونافیقەكانە: دائەنیشێ‌و تەماشای ڕۆژ ئەكات، هەتا ئەچـێتە نێوان دوو شاخەكەی شەیتانەوە، هەڵئەسێ‌و چوار دەنووك بەزەویدا ئەدات، كەمێك یادی خودا دەكات)). بەم شێوەیە پێغەمبەرمانﷺ سەركۆنەی ئەو كەسانە ئەكات، كە بـەبێ بەهانەیەكی شەرعی نوێژی عەسر دوا ئەخەن‌و ئەیخەنە كاتی ڕۆژ پەرستان، ئەوانـەی كـە لەكاتی ڕۆژهەڵهاتن‌و ڕۆژئاوابووندا سوجدە بۆ ڕۆژ ئەبەن‌و شەیتان لە ڕێگـای ڕاسـت لای داون‌و سەرلێشێواو گومڕای كردوون، ئەگونجێ دوو شاخی شەیتان حەقیقەت بێ، یان بـەو مەبەستە بێت، كە پەنجەمان بۆ كێشا، والله أعلم.

٩١-ن/٤٣٠((عَنْ رَافِعِ بنِ خَديجٍ قال:كُنَّا نُصَلِّي الْعَـصْرَ مَـعَ رَسُـولِ اللّهِﷺ ثُـمَّ نَنْحَـرُ الْجُزُورَ فَتُقْسَمُ عَشْرَ قِسْمٍ،ثُمَّ تُطْبَخُ فَنَأْكُلُ لَحْمَهُ نَضيجاًقَبْلَ مَغيبِ الشَمْسِ))متفق عليه.

لە رافیعی كوڕی خەدیجەوە هاتووە، كە وتویەتی: ئێمە نوێژی عەسرمان لە خزمـەتی پێغەمبەری خواداﷺ كردوەو، پاشان وشترمان سەربڕیوەو كراوە بە دە بەشەوەو، پاشـان كوڵاندومانەوەو لە گۆشتەكەمان خواردووە پێش ئەوەی ڕۆژ ئاوا بووبێت، واتـە ئەوەنـدە زوو نوێژی عەسر كراوە، لەوە دەچێت ئەوە كاتی بەهارو هاوین پـایز بـوو بێـت، چـونكە زستان ڕۆژگاری كورتەو، ئەو ئیشە لەپاش عەسری زستان بەو شـێوەیە ئـەنجام نادرێـت، والله أعلم.

٩٢- ن/٤٣١ ((عَنْ بَرَيْدَةَ الأَسْلَمِيَّ قال: كُنّا مَعَ رَسُولِ اللّهِﷺ في غَزْوَةٍ، فَقال: (بَكِّرُوا

بِالصَّلاةِ فِي الْيَوْمِ الْغَيْمِ فَإِنَّهُ مَنْ فاتَهُ صَلاَةُ العَصْرِ خبِطَ عَمَلُهُ))) رواه احمد وابنُ ماجه.

له‌ بوره‌یده‌ی ئه‌سله‌میه‌وه‌ هاتووه‌، كه‌ وتویه‌تی: له‌ غه‌زایه‌كدا ئێمه‌ له‌ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ری خواﷺ بووین، فه‌رموی: ((په‌له‌ بكه‌ن له‌ ئه‌نجامدانی نوێژه‌كانتان له‌ ڕۆژی هه‌وردا، هه‌ركه‌سێ نوێژی عه‌سر بفه‌وتێنێ، كرده‌وه‌كانی هه‌ڵده‌وه‌شێته‌وه‌. واته‌ پێویسته‌ زۆر گرنگی بدرێت به‌ ئه‌وه‌ڵی وه‌ختی نوێژه‌كان به‌تایبه‌ت نوێژی عه‌سرو ئه‌بێ ئاگاداربین نه‌فه‌وتێت، چونكه‌ ئه‌بێ به‌هۆی به‌تاڵ بوونه‌وه‌ی كرده‌وه‌كانی تری باوه‌ڕدار، ته‌ماشای ئه‌م فه‌رموده‌ی تر بكه‌ن.

٩٣- ن/٤٣٢ ((عَنْ عَلي كَرَمَ الله وجهه اَنَّ النَّبِيﷺ قَالَ يَوْمَ الأَحْزَاب: (مَلأَ اللهُ قُبُورَهُمْ وَبيوتَهُمْ ناراً، كما شَغَلُونَا عَنِ الصَّلاة الْوُسْطى حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ. متفق عليه). ولمسلم واحمد وابي داود: (شَغَلُونا عَنِ الصَّلاةِ الْوُسْطى صَلاةِ العَصرْ))).

له‌ عه‌لیه‌وه‌ رضي الله عنه هاتووه‌، كه‌ پێغه‌مبه‌رﷺ له‌ ڕۆژی حیزبه‌كاندا ـ ڕۆژی خه‌نده‌ق ـ فه‌رموی: ((خوا گۆڕو ماڵه‌كانیان پڕ بكات له‌ ئاگر، هه‌ر وه‌ك چۆن ئێمه‌یان سه‌ر قاڵ كرد له‌ نوێژی ناوه‌ڕاست تا ڕۆژئاوا بوو، له‌ ریوایه‌تی موسلیمو ئه‌حمه‌دو ئه‌بو داوددا فه‌رمویه‌تی: ((سه‌رقاڵیان كردین له‌ نوێژی ناوه‌ڕاست، نوێژی عه‌سر)). له‌م فه‌رموده‌وه‌ ئه‌مانه‌ وه‌رئه‌گیرێن:

١- فه‌وتانی نوێژ به‌ به‌هانه‌ی شه‌رعی تاوانی نیه‌و پاشان قه‌زا ئه‌كرێته‌وه‌.[1]
٢- دروسته‌ دوعای شه‌ڕ له‌ بێباوه‌ڕان بكرێت.
٣- كۆتای كاتی عه‌سر ڕۆژئاوا بوونه‌.
٤- (صلاة الوسطى) نوێژی عه‌سره‌و ئه‌مه‌ ڕاستترین بۆچوونه‌، والله أعلم.

---

(١) ته‌ماشای فه‌رموده‌ی ژماره‌٤٨٣، له‌ سه‌ر چاوه‌ی پێشوو بكه‌، ئه‌مانه‌ بۆیه‌ ئه‌ڵێم، تا بزانن ئه‌گه‌ر له‌ مانای فه‌رموده‌یه‌كه‌دا شتێكم وت، كه‌ له‌و فه‌رموده‌دا نه‌بوو، له‌ فه‌رموده‌ی تردا هه‌یه‌و قسه‌ی خۆم نیه‌.

٥- لەكاتی پێویستدا، جیهاد پێش هەمو عیبادەتێكی تر ئەخرێت.

٩٤- ن/٤٤٦ ((عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اذَا وُضِعَ عَشَاءُ اَحَدِكُمْ وَاُقِيمَتِ الصَّلاةُ فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ وَلايَعْجَلْ حَتَّى يَفْرُغُ مِنْهُ)) متفق عليه.

له عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە رضي الله عنه هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: هەركاتێ خواردن دانرا بۆ یەكێكتان وقامەتی نوێژكرا، پێشەكی خواردنەكە بخواتو پەلە نەكات، هەتا لەو خواردنە لێدەبێتەوە. واتە پێشەكی ئارەزوی نەفسی بشكێنێت، تا بە خەیاڵێكی ئاسوودەوە نوێژەكەی ئەنجام بدات، بەتایبەت ئەگەر بە ڕۆژوو بوو بۆ نوێژی مەغریب، ئەگەرچی كاتیشی كەمە ئەمە بەهانەیەكی شەرعییە بۆ دواخستنو، هیچ تاوانی نیە، بەڵكو سوننەتە.

٩٥- ن/٤٦١ ((عَن أبي بَرْزَةَ الْأَسَلَمِيِّ، اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَسْتَحِبُّ اَنّ يُؤَخَّرَ الْعِشاءَ الَّتي تَدْعُونَهَا الْعَتَمَةَ وَكَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا وَالْحَديثَ بَعْدَها)). رواه الجماعة.

له ئەبو بەرزەی ئەسلەمیەوە هاتووە، كە پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش بووە، كە نوێژی عیشا دوابخرێت ئەو عیشایەی ئێوە پێی ئەڵێن ((خەوتنان))، پێی ناخۆش بووە خەوی پێشیو قسەی پاشی بكرێ، واتە: هەموو نوێژەكان كاتی ئەوەڵیان چاكترەو دواكەوتنیان بۆ كاتی ئاخر لە خێرەكەی كەم ئەكاتەوە، بێجگە لە نوێژی عیشا، كە ئەگەر لە ئەوەڵی كاتدا بۆت ئەنجام نەدرا، تا دوای خەیت بۆ شەو خێری زۆرترە، هەروەها چاك نیە لە پێش عیشا بخەویت، یان پاش عیشا دانیشی بۆ قسەكردن، مەگەر شتێكی پێویست بێ.[1]

٩٦- ن/٤٦٥ ((عَنْ مالِكٍ سُمَيّ عن ابي صالِحٍ، عن ابي هُرَيْرَة، اَنّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قال: (لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ ما في النِدَّاءِ والصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجدواُ الا اَنْ يَستَهِمُوا عليه - لا سْتَهَمُوا عَلَيْهِ- وَلَو يَعْلَمُونَ مَا في التَّهْجيرِ، لا سْتَبَقُوا اِلَيْهِ، وَلَو يَعْلَمُونَ مَا في الْعَتَمَةِ

(١) تەماشای ڕاڤەی فەرمودەی ژمارە ٤٦٢- ٤٦٣و هەمان فەرمودەكە ژمارە ی٤٦١ لە (نیل الاوطار) دابكە.

وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْواً). متفق عليه. زاد احمد في روايته عن عبدالرَّزاق فَقُلْتُ لِمالكٍ اَمَا تَكْرَهُ اَنْ تَقُولَ: الْعَتَمَةَ؟ قال: هَكَذَا، قَالَ الَّذي حَدَّثَني)).

له مالیكه‌وه له سومه‌ییه‌وه، له باوكی صالحه‌وه، له ئه‌بو هوره‌یره‌وه‌ﷺ هاتووه، كه پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رمویه‌تی: ئه‌گه‌ر خه‌ڵك بزانێ چه‌ند چاكه‌و خه‌یرێكی زۆر هه‌یه له بانگ‌و ڕیزی یه‌كه‌می جه‌ماعه‌تداو له‌پاشا ده‌ستیان نه‌كه‌وێت مه‌گه‌ر به تیرو پشك - تیرو پشكی له‌سه‌ر ئه‌كه‌ن-، وه ئه‌گه‌ر بزانن له زوو چوون بۆ مزگه‌وت - به‌تایبه‌ت ڕۆژانی جومعه- چه‌ند چاكه‌ی زۆری تێدایه، كێبه‌ركێیان بۆ ئه‌كرد وه ئه‌گه‌ر بزانن چ خه‌یرێكی زۆر هه‌یه له نوێژی عیشاو به‌یانیدا، بۆیان ئه‌هاتن، ئه‌گه‌ر به گاگۆڵكه‌یش بوایه ( له‌سه‌ر سمت یان چۆك ڕۆیشتن).

٩٧- ن/٤٦٩ ((عن اَنَس، عَنْ زَيْد بن ثابتٍ قال: تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِﷺ ثُمَّ قُمْنا اِلَى الصَّلاةِ قُلْتُ: كَمْ كَانَ قَدْرُ ما بَيْنَهُما؟ قال: قَدْرَ خَمْسَين اَيَةً)). متفق عليه.

له ئه‌نه‌سه‌وه، له زه‌یدی كوڕی سابیته‌وه هاتووه، كه وتویه‌تی له خزمه‌ت پێغه‌مبه‌رداﷺ پارشێومان خوارد، پاشان هه‌ستاین بۆ نوێژ.

وتم: به‌ینی ئه‌و دوانه ـ پارشێوو نوێژی به‌یانی ـ چه‌ند بوو؟

وتی: به ئه‌ندازه‌ی خوێندنی په‌نجا ئایه‌ت بوو، به خوێندنێكی مام ناوه‌ندی.

٩٨- ن/٤٧٧ ((عَنْ عبادة بن الصّامِتِ عن النَّبّيِّﷺ قال: (سَتَكُونُ عَلَيْكُمْ بَعْدي اُمَرَاءُ تَشْغَلُهُمْ اَشْياءُ عَن الصَّلاةِ لِوَقْتَها حَتَّى يَذْهَبَ وَقْتُها فَصَلُّوا الصَّلاةَ لِوَقْتَها) فقال رَجُلٌ: يا رَسُولَ اللهِ اُصَلِّى مَعَهُمْ؟ فقال (نَعَمْ اِنْ شِئْتَ) رواه ابوداود واحمد بِنَحوِهِ وفي لَفْظٍ (وَاجْعَلوا صَلاَتَكُمْ مَعَهُمْ تَطَوُّعاً))).

له عوباده‌ی كوڕی سامیته‌وه‌ﷺ هاتووه، كه پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمویه‌تی: ((دوای من ئه‌میرانێكتان ئه‌بن، كه چه‌ند شتانێك ئه‌بێته هۆی ئه‌وه، كه نوێژ دوابخه‌ن، تا كاته‌كه‌ی ئه‌ڕوات، جا ئێوه نوێژه‌كان له‌كاتی خۆیاندا بكه‌ن)).

پیاوێك وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خواﷺ نوێژیان له‌گه‌ڵدا بكه‌مه‌وه؟

فەرموی: ((بەڵێ، ئەگەر مەیلت لێبوو،وە بەبێژەیەكی تردا هاتووە، كە ((ئەو نوێژەی لەگەڵ ئەواندا ئەیكەین بە سوننەتی دابنێن)). دیارە ئەگەر ترسـی تۆڵـەی ئـەمیری بـوو ئەگەر نوێژەكەیان لەگەڵدا نەكات، پێویسـتە لەم كاتەدا نوێژەكەی لەگەڵیاندا بكاتـەوە، تا لەو ئەمیرانەوە دوچاری زیان نەبێت)).

٩٩- ن/٤٧٨((عن انس بن مالكٍ اَنَّ النَّبـيَّﷺ قال: (مَنْ نَسِيَ صَـلاةً، فَلْيُـصَلِّها اِذَا ذَكَرَهَا لاكَفَّارَةَ لَهَا الاَّ ذلِكَ))). متفق عليه.

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوەﷺ هاتووە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویـەتی: هەركەسـێك نوێژێكی لەبیـرچوو ، هەركاتێ كەوتـەوە بـیری بـا بیكاتـەوە ، بێجگـە لـەوەیش هـیچ تۆڵەیەكی تری نیە. لە ڕیوایەتی تردا، بۆ خەویش هەروا، با هەركاتێ خەبەری بویەوە، با نوێژەكەی بكاتو تاوانی تری نیە[1]. واتە ئەگەر نوێژ فەوتان بە ودوشێوە نـەبو، تـاوانی تری لەسەرە.

١٠٠- ن/٤٨٦ ((عن مالكٍ بـن الْحُـوَيْرِثِ اَنَّ النَّبـّـيﷺ قـال: (اِذا حَـضَرَتِ الـصَّلاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ اَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ اَكْبَرُكُمْ))). متفق عليه.

لە مالیكی كوڕی حوەیریسەوە هاتووە، كە پێغەمبــەرﷺ فەرمویــەتی: ((هــەركات نوێژ بوو، با یەكێكتـــان بانگ بداتو بە تەمەنتـرتان ببێت بە پێشەوا ـ ئیمـام ـ تـان. واتە بانگ بۆ نوێژە فەرزەكان پێویستەو، هەركەسێك بانگ بدات خێرو چاكە، بـەڵام بـۆ ئیمامەت ئەبێ زاناترو بەتەمەنتر بێت، وەكو لەم فەرمودەدا هاتووە لەبەرچاو بگیرێت.

١٠١- ن/٤٨٩ ((عن عقبةَ بن عامرٍ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهﷺ يَقُولُ: (يَعْجَبُ رَبُّكَ - عَزَّ وَجَلَّ- مِنَ رَاعِي غَنَم فِي رأسي شَظِّيَةٍ بِجَبَلٍ، يُؤَذِّنَ بِالصَّلاة وَيُصَلِّي فَيَقُـولُ اللهُ - عَـزَّ وَجَلَّ- اُنْظُرُوا اِلى عَبْدِي هذا يُؤَذِّنُ وَيقوم لِلصَّلاةِ يَخافُ مِنّي، فَقَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي وَاَدْخَلْتُـهُ الْجَنَّةَ))). رواه احمد وابو داود والنسائي.

---

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٤٨٠-٤٨١، لە سەرچاوەی پێشوو بكە.

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە هاتووە، کە وتویەتی بیستوومە کە پێغەمبەری خواﷺ ئەیفەرمو: ((پەروەردگاری ـ بەدەسەڵاتو گەورەـ ت پێ‌خۆشحاڵە لە شوانێك، کە لەسەر بەرزایی چیایەك بانگ ئەدا بۆ نوێژو، نوێژ ئەکات، جا خوای بە دەسەڵاتو گەورە ئەفەرموێت: تەماشای ئەم بەندەی من بکەن، بانگ ئەداتو قامەت ئەکات بۆ نوێژ، لەمن ئەترسێت لەبەرئەوە وا من لەو بەندەم خۆش بووم و خستمە بەهەشتمەوە، واتە سوننەتە ئەگەر ئینسان خۆیشی بەتەنیا بێت کاتی نوێژ هات بانگ بداتو قامەت بکات، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بانگدان ئەبێ بەهۆی لێخۆشبوونی خواو چوونە بەهەشتەوە شێوەی بانگیش ئەو ووشانەیە کە ئێستە ئەوترێن بەم شێوەیە:- بانگدان

(الله أكبر ٤ جار، أشهد أن لااله الا الله ٢ جار، اشهد ان محمد رسول الله ٢ جار، حيَّ على الصلاة ٢جار، حيَّ على الفلاح ٢ جار، الله أكبر ٢ جار، لااله الا الله ١ جار، وە ئەگەر بانگی بەیانی بوو پاش حي على الفلاح سوننەتە بووترێت - الصَّلاةُ خير من النوم ٢ جار) هەرچەند، کە ئەمە لە بانگی یەکەمی بەیانیدایە کە بەداخەوە ئەمڕۆ پشتگوێ خراوە، وەکو زۆربەی سوننەتەکانی تری پێغەمبەرمانﷺ وهێنراوەتە بانگی دوهەمەوە، داواکارم لە خوا، کە هەمومان بکات بە پەیڕەوانی ڕاستەقینەی ئەم ئایینە بەرێزە.

قامەت کردنیش بەم شێوەیە (الله أكبر ٢ جار، اشهد أن لاّاله الا الله ١ جار، اشهد ان محمد رسول الله ١ جار، حي على الصلاة ١جار، حيَّ على الفلاح ١ جار، (قدْ قامِت الصَّلاةُ) ٢ جار، الله أكبر ٢ جار، لااله الا الله ١ جار. لە قامەتا ئەگەر بێجگە لە (لااله الاّ الله) تاکەکان دووجار بووترێن قەیناکە[1]. وە بانگ دان بۆ نوێژی فەوتاویش سوننەتە هەروەها قامەتیش[2].

---

(١)تەماشای فەرمودەی ژمارە ٤٩٣-٤٩٤، لە سەرچاوەی پێشو بکە.

(٢) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٥١٢-٥١٣، لە سەرچاوەی پێشوو بکە.

١٠٢- ن/٥٠٣ ((عن عمر بن الخطَّاب‏ﷺ قال: قال رَسُولُ اللهﷺ: (اذا قَالَ الْمُؤَذِّنُ اللّهُ اَكْبَرْ اللّهُ اَكْبَرْ فَقَالَ اَحَدُكُمْ اللهُ اَكْبَرْ اللّهُ اَكْبَرْ، ثُمَ قال: اَشْهَدُ اَن لا الَهَ الاّ الله، قَالَ: اَشْهَدُ اَن لا الَهَ الاّ اللّهُ، ثُمَّ قال: اَشْهَدُ اَنَّ محمداً رَسُولُ الله قالَ اَشْهَدُ اَنَّ محمداً رَسُولُ الله، ثُمَ قال: حَيَّ عَلى الصَّلاةِ قَالَ: لاحَوْلَ وَلا قُوَّةَ الاّ باللهِ، ثُمَّ قَالَ حَيَّ عَلى الفَلاح، قَالَ: لاحَوْلَ وَلا قُوَّةَ الا بالله، ثُمَّ قَالَ: الله اكبر الله اكبر، قَالَ: الله اكبر الله اكبر، ثُمَّ قَالَ: لا اله الاّ الله قَالَ: لا اله الاّ الله مِنْ قَلْبِهِ ـ دَخَلَ الجَنَةَ ـ)). رواه مُسْلِمٌ وابوداود .

لە عومەری کوڕی خەتابەوەﷺ هاتووە کەوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێ بانگوێژ وتی: الله اكبر الله اكبر، گوێگر وتی: الله اكبر الله اكبر لەپاشا بانگوێژ وتی: اشهد أن لاّالە الا الله، گوێگر وتی: اشهد أن لاّ الە الاّ الله، لەپاشان وتی: اشهد ان محمد رسول الله، گوێگر وتی: اشهد ان محمد رسول الله، لەپاشا وتی: حَي على الصلاة، گوێگر وتی: لاحول ولا قوة الاّ بالله ــ واتە: نە جموجۆڵو، نەتوانای هەیە، مەگەر بە مەیلی خوا یان ناتوانرێ هیچ خراپەیەك لابرێتو هیچ چاکەیەك ئەنجام بدرێت، مەگەر بەخوا ـ لەپاشا وتی: حي على الفلاح وتی: لاحول ولا قوة الاّ بالله. لەپاشاوتی: الله اكبر الله اكبر، گوێگر گوتی: الله اكبر الله اكبر، لە پاشا وتی: لا اله الاّ الله گوێگر وتی: لا الە الاّ الله ـ هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لەخوا بەدڵ ئەمەی وت ئەچێتە بەهەشتەوە. واتە وەڵام دانەوەی بانگ سوننەتەو خەیرێکی ئاوا گەورەی هەیە ، بەڵام زۆر جێگای داخە زۆربەی مسوڵمان خۆیان لەوخەیرە گەورە بێ بەش ئەکەو ئەو سوننە تە گرنگە ئەنجام نادەن، کەچی کاتێ وترا فاتیحە، کەهیچ بە ڵگەیەکی راستی لەسەر نیە، هەمو دەست ئەکەن بەفاتیحە خوێندن؟!

١٠٣- ن/٥٠٥ ((عن جابر، اَنّ رَسُولَ اللهﷺ قَال: (مَنْ قَالَ حينَ يَسْمَعُ النِّداءَ: اللّهُمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوَةِ التّامَّةِ والصَّلاةِ الْقائمَةِ آتِ مُحَمَداً الْوَسيلَةَ والْفَضيلَة، وَابْعَثْهُ مَقاماً مَحْمُوداً الَّذي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفاعَتي يَوْمَ الْقِيامَةِ))) رواه الجماعة الا مسلماً.

له جابیرەوەﷺ هاتووه، که پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((هەر کەسێك کاتێ بانگی بیست ـ پاش وەڵامدانەوەو تەواوبوونی بڵێ: ئەی خوایە، پەروەردگاری ئەم بانگە تەواوە ـ بانگی تەوحیدو یەکتاپەرستی، کە تێرو تەواوو بێ کەمو کوڕیە، هەرگیز ناگۆڕێ ـ ئەم نوێژەی، کە هەمیشە ئەنجام ئەدرێت پلەی بەرزو پلەی زیادە ببەخشە بە محمدﷺ لە هەمو کەسێکی ترو زیندوی بکەرەوە بۆ ئەو پلەو جێگا سوپاسکراوەی، کە بەڵێنت پێداوە، کە شەفاعەتی گەورەی وەختی کۆبوونەوەی خەڵکە ـ بەڵێ ئەو کەسەی ئەمەی وت پێغەمبەرﷺ فەرموی: تکا کاری من بۆ ئەو لە ڕۆژی قیامەتا حەڵاڵ ئەبێت، واتە: شەفاعەتی ئەکەم.

لەبارەی بانگەوەو ڕێزو نرخی، چەندین فەرمودەی تر هەیە ئێمە بەو سێ فەرمودەیە لەم باسە ئەچینە سەر باسی قەدەغە بوونی کرێوەرگرتن لەسەر بانگ. وەکو لەم فەرمودەدا هاتووە.

١٠٤- ن/٥١١ ((عَنْ عثمان بن العاصِ قَالَ: آخِرُ مَاعَهِدَ اِلَيَّ رَسُولُ اللهﷺ اَنْ اَتَّخِذَ مُؤَذِناً لا يأخُذُ عَلى ألاذانِ اَجْراً)). رواه الخمسة.

له عوسمانی کوڕی عاسەوە هاتووه، کەوتویەتی: دواترین شتێ، کە پێغەمبەری خواﷺ بەمنی وتوە ـ ئەوە بوو، کە فەرموی ـ بانگوێژێك رابگرە، کە لەسەر بانگەکەی کرێ وەرنەگرێت، واتە: کرێی بانگووتن چاك نیە، ئەگەر لازم بێت چاكوایە لە پێنج یەکی پێنج یەك، کە بەشی پێغەمبەرەﷺ لەوێوە بانگوێژ کرێی پێ بدرێت، نەك لە (بەیتولمالّ) ماڵی گشتی.

١٠٥- ن/٥١٤ ((عن ابي سعيد الخدري: اَنّ رَسُولُ اللهﷺ قالَ: لا يَنْظُرُ الرَّجُلَ الى عَوْرَةِ الرَّجلُ وَلا المَرْأَةُ الى عَوْرَةِ المَرْأَة، وَلايُفضي الرَّجُلُ الى الرَّجُلِ في الثوب الواحد وَلايُفضي المَرْأَةُ الى المَرْأَةِ في الثوب الواحد) رواه مسلم وابوداود والترمذي)).

له ئەبوو سەعیدی خودریەوە هاتووه، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: با هیچ پیاوێك تەماشای شەرمگەی(عەورەتی) پیاوێکی تر نەکات ـ ئافرەت خراپتر ـ با هیچ

ئافرەتێك تەماشای عەورەتی هیچ ئافرەتێك نەكات ـ بێجگە لە ژنو مێرد، یان ئەوەی كە بەپارە كڕی بێتی[١] ـ یا هیچ پیاوێك لەگەڵ پیاوێكی تردا بەیەكەوە یەك پۆشاك نەكەنەبەر ـ بەڕوتی لەشیان لەیەكتر بكەوێت، هەروەها ئافرەتیش ـ یا هیچ ئافرەتێك لەگەڵ ئافرەتێكی تردا بەیەكەوە یەك پۆشاك نەكەنەبەرـ كە لەشیان بە ڕوتی لەیەك بكەوێت-.

زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن ئەژنۆ، تا ناوك عەورەتە پیاو بۆ پیاو ژن بۆ ژن.[٢]

١٠٦- ن/٥٣٠ ((عن جابر بن عبدالله اَنَّ النبـيّ اللهﷺ قـالَ: (اِذا صَـلَّيْتَ في الثـوب الواحد فَاِنْ كانَ واسِعاً فالْتَحِفْ بِهِ, وان كانَ ضَيِّقاً فَاتَّزِرْ بِهِ) متفق عليه))

لە جابیری كوڕی عەبدوڵڵاوە هاتووە كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ئەگەر لەیەك پۆشاكدا نوێژت كرد، ئەگەر گەورە بوو باش لەخۆتی بپێچەوە، ئەگەر كەمیش بوو لە ـ سەر ناوكت ـ بیبەستە بۆ نوێژەكەت، واتە: دروستە مرۆڤ یەك پۆشاكی لەبەر دابێت نوێژ بكات بەو مەرجە تەنك نەبێت[٣] كە عەورەتی دەركەوێت، جا ئەگەر زۆر بوو، ئەبێ هەندێكی بكەوێتە سەرشانی، تا لەكاتی هەڵسوكەوتی نوێژەكەدا لێی نەبێتەوە، بەڵام ئەگەر كەم بوو ئەبێ لە پشتوێنگەی دا بیبەستێت، وەكو وترا، والله أعلم.

١٠٧- ن/٥٣٧ ((عن ابي هريرةﷺ قالَ: نَهَى رَسُولُ الله اَنْ يَحْتَبِـيَ الرَّجُـلُ في الثَّـوبِ الواحِدِ لَيْسَ على فَرْجِهِ منه شيء، وان يَشْتَمِلَ الصَّمَّاءَ بِالثَّوْبَ الواحِد ليس على اَحَدِ شِقَّيْهِ منه، يعني: شيء) متفق عليه)).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ بەرگری كردوە لەوەی، كە پیاوێن پۆشاكی لەبەر دابێتو هیچ شتێك لەسەر عەورەتی نەبێتو، لەسەر

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٥١٤، لە سەرچاوەی پێشوو بكە.
(٢) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٥١٥ تا ٥٢٤، لە سەرچاوەی پێشوو بكە.
(٣) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٥٣٤، بكە لە هەمان سەرچاوە.

کڵۆکی دانیشێ و قاچی بەرزبکاتەوە ـ چونکە عەورەتی دەرئەکەوێت ـ هەروەها قەدەغەی کردووە کەیەك پۆشاکی لەبەر دابێ و هیچی بەسەر شانیەوە نەبێت، چونکەوەکو لەمانای فەرمودەی پێشووداوتمان، نزیکە لە کاتی هەڵس و کەوتیا ئەو لیباسە دابەزێت و عەورەتی دەرکەوێت.

١٠٨- ن/٥٤١ (( عن عائشة رضي الله عنها اَنَّ النبّيّ اللهﷺ قالَ: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيَسَ عَلَيْهِ اَمْرُنا فَهوَ رَدٌ) متفق عليه، ولا حمد: (مَنْ صَنَعَ اَمْراً عَلَى غَيْرِ اَمْرِنا فَهوِ مَرْدُودٌ))).

له خاتوو، عائیشەوە رضي الله عنها هاتووە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((هەر کەسێك هەر ئیشێك بکات، ئەمری ئێمەی لەسەر نەبێ، ئەوە ئەو ئیشە وەرناگرێت و لە ریوایەتی ئیمامی ئەحمەددا ئەفەرموێ: ((هەر کەسێك هەر شتێك دروست بکات بە فەرمانی ئێمە نەبێ ئەوە ئەو شتە وەرناگیرێت، واتە: بەندایەتی و ناسینی خواو قەبرو قیامەت و فریشتەو باقی شتە پەنهانیەکان ئەبێ بەو شێوە بێ، کە لە پێغەمبەری خواوەﷺ هاتوەو نابێ زیادی و کەمی بکرێت، بەوانە ئەوترێت داهێنان ــ البدعة ـ هەمو بیدعەیەکیش لە ئاگر دایە، چونکە هەموی گومڕاییە ((کُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ)) بەڕاستی ئەم فەرمودەیە یەکێکە لە بناغەکانی ئەم ئایینە، چونکە بڕیارو حوکمانێکی بێ سنوور ئەگرێتەوەوە ئەم فەرمودەیە ڕاستەوخۆترین و گەورەترین بەڵگەیە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی قسەی ئەو زانایانە کە (بیدعە) ئەکەن بەچەند بەشێکەوە.[1]

١٠٩- ن/٥٩٧ ((عن ابي قتادة، اَنّ رَسُول الله ﷺ کان يُصَلّي وَهوَ حامِلٌ اُمامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ, فاِذا رَكَعَ وَضَعَها وَاِذا قامَ حَمَلَها)). متفق عليه.

له باوکی قەتادەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خواﷺ نوێژی ئەکردو، لەهەمان کاتدا ئومامەی کچی زەینەبی هەڵگرتبوو، جا هەر کاتێ ئەچوو بۆ چەمینەوە (الرکوع)

---

(١) ئەوەی زیاتر ئەیەوێ لەم باسە بزانێ، با تەماشای شەرحی هەمان فەرمودە بە ژمارەی ٥٤١، لە (نیل الاوطار)دا بکات.

دایدەناو، هەر كاتێ هەڵئەسایەوە هەڵی ئەگرت. واتە: ئیشی كەم نوێژ بەتاڵ ناكاتەوەو، بەگومان شت بەپیس دانانرێت، ئاشكرایە ئەوە منداڵ بووەو نەیتوانیوە خۆی لەپیسی بپارێزێت، بەڵام مادام ئاشكراو ڕوون نەبێت، نابێ بەگومان بڕیار بدرێت، هەروەها پیسی ناوەوە كاریگەر نیە لەسەر بەتاڵكردنەوەی نوێژ، چ ئەو شتە بەكۆڵی نوێژكەرەوە بێت، وەكو ئەم فەرمودەیە، یان نوێژكەر لەسەر شتێ بێ، كە پیسی لەناو دابێت، وەكو ئەم فەرمودەیە، كە ئێستا ئەینوسین.

١١٠- ن/٦٠١ ((عن ابن عمرﷺ قالَ: رأَيْتُ النبّيّ اللهﷺ يُصَلّي على حِمارٍ وَهوَ مُتَوَجّهٌ اِلى خَيْبَرَ)). رواه احمد ومسلم والنسائي وابو داود.

لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە (خوا لەهەردووكیان ڕازی بێت) هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەرمﷺ دی، كە لەسەر گوێدرێژ ـ كەرـ كە بەرەو خەیبەر ئەچوو، نوێژی ئەكرد. جا كەر بێ وەكو ئەم ڕیوایەتە، یان وشتر بێت، وەكو ریوایەتی زۆربەی ریوایەتكەرانی تری ئەم فەرمودەیە، فەرقی نیە، كە هەڵگری ئەو هەمو پیسیەی ناو خۆیەتی، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوە، كە ئارەقی ئەو ولاخە سواریانە چاوپۆشی لێكراوەو بەپیس دانانرێت، چونكە ئەگەر بەپیس دابنرایە، گومانی تێدا نیە، ئەگەر قاچی سوار كەتەڕ نەبێ بەو عارەقە كورتانەكەی هەر تەڕ ئەبێ، كە لە ژێر كابرای سواردایە، بەتایبەت بۆ سەفەرێكی ئاوا دوور ڕۆیشتن، بەڵام لە ڕیوایەتی تردا هاتووە، كە ئەمە تایبەت ئەكات بە نوێژی سوننەتەوە، واتە: فەڕز بەسواری ناكرێت، مەگەر هیچ مەجالێك نەبێ[1]، واللە أعلم.

١١١- ن/٦٠٥ ((عن ابى سعيد، اَنَّهُ دَخَلَ على رَسُولِ اللهﷺ فَوَجَدَهُ يُصَلّي على حَصيرٍ يَسْجُدُ عليه)) رواه مسلم.

لە باوكی سەعیدەوە هاتووە، كە چووەتە لای پێغەمبەری خواﷺ، بینی وا لەسەر حەسیرێكدا نوێژ ئەكاتو، لە سوجدەدا سەری ئەختە سەری.

---

(١)تەماشای فەرمودەی ژمارە ٦٢٢ لەسەرچاوەی پێشوو بكە.

١١٢- ن/٦٠٩ ((عن شَدّادِ بنِ اوس قالَ: قالَ رَسُولُ اللهﷺ: (خالِفوا اليَهودَ, فَاَنَّهُمْ لا يُصَلُّون في نِعالِهِمْ ولا خِفافِهِمْ)) رواه ابو داود.

لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە ئەگێڕنەوە کەوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((بە پێچەوانەی جولەکەوە بجوڵێنەوە، چونکە ئەوان بە نەعلو خوفەکانیانەوە نوێژ ناکەن، واتە: ئێوە نوێژ بکەن)).

١١٣- ن/٦١٣ ((عن ابي مَرْثَدِ الغَنَوِيِّ قالَ: قالَ رَسُولُ اللهﷺ: (لاتُصَلُّوا اِلى القُبورِ ولاتَجْلِسوا عليها)) رواه الجماعة الا البخاريَّ وابن ماجة .

لە باوکی مەرسەدی غەنەوییەوە هاتووە، کەوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((بەرەو گۆڕ نوێژ نەکەنو لەسەری دانەنیشن)).

١١٤- ن/٦١٤ ((عن ابن عُمَرَ رضي الله عنه قالَ: قالَ رَسُولُ اللهﷺ: (اِجْعَلوا من صلاتِكُمْ في بيوتِكُمْ ولا تَتَّخِذوها قُبوراً)) رواه الجماعة الا ابنَ ماجة.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە رضي الله عنه هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەندێ لە نوێژەکانتان لەماڵەوە بکەنو، ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان. بەڵێ فەرزەکان هەتا بکرێت باش ئەوەیە لە مزگەوتا ئەنجام بدرێت، بەڵام سوننەتەکان لە ماڵەوە بێ باشترە. هەم دوورترە لە ریا، هەم منداڵیش لە ماڵەوە چاوی بەو هەڵسو کەوتە ئەکەوێتو، کەم کەم فێرئەبێت، ئەمەیە بڕیاری پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بەکورتی چەند جوان ڕێنماییمان ئەکات.

١١٥- ن/ ٦١٥ ((عن جُنْدُبِ بن عبدالله البجليّ, قالَ: سَمِعْتُ رَسُول الله ﷺ قَبْلَ اَنْ يَموتَ بِخَمْسٍ وهو يَقولَ: (اِنَّ مَنْ كانَ قَبْلَكُمْ كانوا يَتَّخِذونَ قُبُورَ اَنْبيائِهِمْ وَصالِحيهِمْ مَساجِدَ، اَلاَ فَلاَ تَتَّخِذوا القُبُورَ مَساجَد، اِنّي اَنْهاكُم عن ذلِكَ)) رواه مسلم.

لە جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلییەوە هاتووە، کە وتویەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بومﷺ پێنج ڕۆژ پێش لە دونیا دەرچوونی ئەیفەرمو: بەڕاستی کەسانێ

بوون لە پێش ئێوەوە، کە گۆڕەکانی پێغەمبەرانیانو پیاو چاکانیان ئەکرد بە مزگەوت، با باش بزانن، کە من بەرێگری ئێوە ئەکەم لەوشتە، واتە دروست نیە شوێنی پێغەمبەرانو پیاوچاکانو گۆڕەکانیان بکرێت بە جێگای نوێژو خواپەرستی.

١١٦- ن/٦١٨ (( عن اِبْنُ عُمَرﷺ قال: دَخَلَ رَسُولُ اللهﷺ الْبَيْتَ هُوَ وَأُسامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَبِلالٌ وَعُثمانُ بْنُ طلحة فَأَغْلَقوُا عَلَيهم الْبابَ فَلَمَّا فَتحوُا كُنْتُ اَوَّل مَنْ وَلَجَ فَلَقَيْتُ بِلالاً فَسَأَلْتُهُ: هَلْ صَلَّى فيه رَسُولُ الله؟ قال: نَعَمْ بَيْنَ الْعَمودَيْنِ الْيَمَانِيينِ)). متفق عليه.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوەﷺ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ چووە ناو بەیتەوە، ئەوو ئوسامەی کوڕی زەیدو بیلالو عوسمانی کوڕی تەلحە، جا دەرگاکەیان لەسەر داخستن - تا کەسی تر نەچێتە ژوورەوە، ئینجا کاتێ کردیانەوە من یەکەم کەس بووم کە چوومە ناوەوە، بە بیلال گەیشتمو پرسیارم لێکرد: ئایا پێغەمبەری خوا لەناویا نوێژی کرد؟

وتی: بەڵێ لە نێوان دوو دینگە یەمانیەکاندا، واتە سوننەتە لەناو کەعبەدا نوێژکردن.

١١٧- ن/٦٢٠ ((وعنه قال: سُئِلَ النَّبِيُّﷺ كَيْفُ أُصُلِيّ في السَّفينَةِ؟ قَالَ: (صَلِّ فيها قائِمَاً اِلاّ اَنْ تَخَافَ اَلْغَرَقَ))) رواه الدارقطني، والحاكم وقال صحيح الاسناد ولم يخرجاهُ.

هەر لەوەوەﷺ هاتووە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەرﷺ پرسیار کرا، کە چۆن نوێژ لە کەشتیدا بکەن؟ فەرموی: بەراوەستان نوێژ بکە ئەگەر ترسی نقوم بوونت نەبوو، واتە ئەگەر ترسای کەشتیەکە بنیشێت، نابێ هەستی، بەڵکو بەدانیشتنەوە نوێژ ئەکەیت، ئەگەر ئەو ترسە نەبوو، ئەبێ هەستیت.

١١٨- ن/٦٢٦ ((عَنْ عُثمان بن عَفَّانَﷺ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهﷺ يَقُولُ: (مَنْ بَنَى لِلّهِ مَسْجِداً بَنَىَ اللهُ لَهُ مِثلَهُ فِي الْجَنَّةِ))). متفق عليه.

لە عوسمانی کوڕی عەفانەوە ﷺ هاتووە، کە وتویەتی گوێبیستی پێغەمبەری خوا بوومﷺ، کە ئەیفەرمو: ((هەر کەسێك مزگەوتێك بۆ خوا دروست بکات، خوا

ماڵێکی وەکو ئەو مزگەوتە ـ لەناودا نەك لە گەورەو جوانیدا ـ بۆ ئەو کەسە دروست ئەکات لە بەهەشت دا)).

١١٩- ن/٦٢٩ ((عن انَس انّ النَبّيّﷺ قَالَ: (لا تَقوُمَ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَباهَى النَّاسُ في الْمَسَاجِدِ)). رواه الخمسة الاّ الترمذي.

لە ئەنەسەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە فەرمویەتی: ((قیامەت نایەت تا خەڵکی خۆی بە مزگەوت دروستکردنەوەو ڕازاندنەوەی هەڵنەکێشێت. بەڕاستی ئەم دیاردەیە ئەمڕۆ زۆر زەقەو هەرکەسێ هەوڵ ئەدات مزگەوتەکەی خۆی لە مزگەوتانی تر جوانترو ڕازاوەتر بکاتو، زۆر فەرزیان واز لێهێناوە، بەڵام خۆیان بە دروستکردنی مزگەوت، بەگەورەو بە نرخ دەزانن، وەکو خوا لە سورەتی تەوبەدا سەرزەنشتی قورەیشەکان ئەکات کاتێ، کە خۆیان لە مسوڵمانە کۆچەرییەکان بەچاکتر دائەنا، چونکە ئەیانوت ئێمە ئاوی حاجیان ئەدەینو خزمەتی ماڵی خوا ئەکەین، فەرمویەتی: ((أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَاجِ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلأَخِرِ وَجَاهد فِي سَبِيلِ ٱللهِ لاَ يَستَوُنَ عِندَ اللهِ وَاللهُ لاَ يَهدِي ٱلْقَوْمَ الظَّلِمِينَ)). واتة: ئایا وا دائەنێن، کە ئاودان بە حاجیەکانو ئاوەدان کردنەوەی ماڵی خواوەکو ئەو کەسەوایە، کە باوەڕی بەخواوبەڕۆژی دوایی هێناوەو جیهاد ئەکات لەڕێگای خوادا؟ وەك یەك نین ـ ئەم دوو دەستەیە ـ لە لای خواو خوا ڕێنمایی ستەمکاران ناکات[1].

بەڕاستی ڕازاندنەوەی مزگەوت بەو شێوەیە، کە ئەمڕۆ هەیە لە سنووری شەرع دەرچووەو، مەسرەفێکی بێ کەڵکەو لەباتی چاکە، لەوانەیە تاوانی بگات، چونکە ئەو ماڵەی، کە لە دەستت دایە هی خوایەو ئەمانەتە، ئەبێ بە گوێرەی فەرمانی ئەو خەرجی بکەیتو ئیسرافو زیادەڕەوی تیادا نەکەیت، ڕاست ئەوەیە، کە بەگوێی خواو پێغەمبەرﷺ بکەیت نەك بە مەیلی خۆت.

---

(١) بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم باسە تەماشای شەرحی فەرمودەی ژمارە٦٢٨، لە سەرچاوەی پێشوو بکە.

١٢٠- ن/٦٣١ ((عن عائشة رضي الله عنها قالَتْ اَمَرَ رَسُولَ اللهِ ﷺ بِبِناءِ الْمَسَاجِدِ في الدُّورِ وَاَنْ تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ)) رواه الخمسة الا النسائيَّ)) .

له خاتوو عائیشەوە رضي الله عنها هاتووە، کە وتویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فرمانی داوە بە دروستکردنی مزگەوت لەناو ماڵەکاندا بۆ ئەوەی هەمو کەس بتوانێ بگات پێی‌و پاك بکرێتەوەو بۆن خۆش بکرێت. واتە پاك‌و خاوێنی‌و بۆنی خۆش بۆ مزگەوت پێویستەو بەر ڕازاندنەوەکەی پێشوو ناکەوێت.

١٢١- ن/٦٣٣ ((عَنْ جابر: اَنّ النَبّيَّ ﷺ قَالَ: (مَنْ اَكَلَ البَصَلَ والثُّومَ والكُرَّاثَ فَلاَ يَقُرَبَنَّ مَسْجِدَنا فَإِنَّ المَلائِكَةَ تَتَأَذَّى مِماَّ يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنو آدَم)) متفق عليه.

لە جابیرەوەهاتووە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((هەر کەسێك پیازو سیرو کەوەر بخوات ـ چونکە بۆنیان ناخۆشەو خەڵکی ئازار ئەدات، با نزیکی مزگەوتەکانمان نەکەوێتەوە، بەڕاستی فریشتەکانیش ئازاریان پێ ئەگات بەو شتانەی، کە ئازار ئەگەیەنێت بە ئادەمیزاد.

١٢٢- ن/٦٣٤ ((عَنْ اَبى حُمَيْد واَبى اُسَيْدٍ قالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: (اِذا دَخَلَ اَحَدُكُمْ المَسْجِدَ فَلْيَقُلْ: اَللّهُمَّ افْتَحْ لَنا اَبْوابِ رَحْمَتِكَ، واِذا خَرَجَ فَلْيَقُلْ: اَللّهُمَّ اِنيِّ اَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)) رواه احمد والنسائي ومسلم وابوداود.

لە ئەبو حومەیدەو ئەبو ئوسەیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێ هەرکام لەئێوە چووە مزگەوتەوە با بڵێت: ئەی خوایە دەرگای ڕەحمەتی خۆتمان لێ بکەرەوەـ لە ڕیوایەتانی تردا هاتووە، کە بڵێ بسم الله اللّهم صلّى على محمد، سەلام بکات‌و ئینجا ئەم دوعایە بکات ـ هەرکاتێ دەرچوو، با بڵێت: ئەی خوایە داوای لوتف‌و بەرەکەت لەتۆ ئەکەین ـ هەروەها لە ڕیوایەتی تردا هاتووە، کە پێشەکی بڵێ (بسم الله/ بەناوی خوا)و داوا بکات لە خوا، کە سەلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات‌و ئینجا ئەو دوعایەش بکات، والله أعلم.

فەرمودەی (دروست نیە لەمزگەوتا) هەواڵ پرسینی ونبوو لە گوڵزاری چاکان ژمارە ١٤٨ باسکراوە.

١٢٣- ن/٦٤٦ ((عَنْ عبدالله بن عمرﷺ(اَنَّهُ كانَ يَنامُ وَهوَ شابٌ عَزِبٌ لا اَهْلَ لَـهُ في مَسْجِدِ رَسولِ اللهﷺ)) رواه احمد والنسائي ومسلم وابوداود.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوەﷺ هاتووە کە: کاتێ گەنجو بێ ژنو ماڵ بوو، لە مزگەوتی پێغەمبەری خواداﷺ ئەخەوت. واتە: خەوتن لە مزگەوتا دروستە، هەروەها خواردنو خواردنەوەیش، وەکو لە فەرمودەی ژمارە (٦٤٩)دا لە نەیلول (نيل الأوطار) هاتووە، بەڵام نەکرێت بە چایخانەو چێشتخانەو ئوتێل.

١٢٤- ن/٦٥٠ ((عَنْ اَنَس قالَ: كانَ قِرَامٌ لِعائِشَةَ قَدْ سَتَرَتْ بِهِ جانِبَ بَيْتِها، فَقالَ لِها النبّيُّ (اَميطِي عَنيِّ قِرامَكِ هذا فإِنَّهُ لاتَزالُ تَصاويرهُ تَعْرِضُ لِي في صَلاتي)) رواه احمد والبخاريّ.

لە ئەنەسەوەﷺ هاتووە، کە وتویەتی: خاتوون عائیشەﷺ پەردەیەکی هەبوو، کە گۆشەیەك لە ماڵەکەی پێدا ئەپۆشی، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ((ئەم پەردەیەت لە بەرامبەری منەوە لایبە چونکە وێنەکانی هەمیشە دێنە بەر چاوم لە نوێژەکەدا. واتە: نابێ لەبەردەم نوێژکەردا شتی نەخشو نیگاردار هەبێ، کە وێنەیش یەکێکە لەوانە،چونکە لە نوێژەکەی بێئاگای ئەکات،هەر بۆیەش ڕازاندنەوەی مزگەوت چاك نیە،ئەگەر خوا یاربێ باسی وێنەیش لە بەشی پۆشاکدا ئەنوسین،بۆ زیاتر شارەزابوون لەبارەی وێنەوە،تەماشای فەرمودەی قودسی لەبارەی وێنەوە(لەچل فەرمودە قودسیەکان بکە بەسە بۆ خاوەن باوەڕی راست)،بەڵام زمانی ئارەزووکارانو تەئویلکردنی فەرمودەکان ناگیرێ.خوا بمانپارێزێ لەو نەخۆشیانەو لە ئارەزووپەرستان دوورمان خاتەوە.

١٢٥- ن/٦٥٢ ((عَنْ ابي هريرة قالَ: اَمَرَنا رَسولُ اللهﷺ (اِذا كُنْتُمْ في المَسْجِدِ فَنُودِيَ بِالصَّلاةِ فَلا يَخْرُج اَحَدُكُمْ حَتىَّ يُصَليَّ))رواه احمد.

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێداوین کە ((هەر کاتێ لە مزگەوت بوونو بانگی نوێژ وترا، ەو مزگەوت دەرمەچن،هەتا نوێژ

ئەکەن. واتە: بەبێ بەهانەیەکی شەرعی بۆ کەسێ لە مزگەوتا بێت لە کاتی بانگ، نابێ دەرچێت، تا نوێژەکەی نەکات.

١٢٦- ن/٦٥٥ ((عَنْ ابن عمر ﷺ قالَ: بَيْنَما النّاسُ بقُباءَ في صَلاةِ الصُّبْحِ اذْ جاءَهُم آتٍ فَقالَ: انَّ النبّيَّ ﷺ قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللّيْلَةَ قُرآنٌ، وَقَدْ أُمِرَ انْ يِسْتَقْبِلَ الْكَعْبَةَ. فاسْتَقْبَلوها وَكانَتْ وُجوهُهُمْ اِلىَ الشّامِ فَاسْتَدَارُوا الى الْكَعْبَةِ)) متفق عليه.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت) هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ خەڵك لە قوباء لە نوێژی بەیانیدا بوون، لەو کاتەدا یەکێك هات ووتی: بەڕاستی ئەمشەو هەندێ لە قورئان هاتووە بۆ پێغەمبەرو ﷺ فەرمانی پێکراوە، کە ڕوو بکاتە (کەعبە) ئەوانیش ڕوویان تێکرد، پێشەکی ڕوویان بەرەو شام بوو سوڕان تا ڕوویان کردە کەعبەوە، واتە ڕووکردنە قیبلە مەرجێکی دروستبوونی نوێژە، مەگەر لە کاتی گەرمایی شەڕ، یان ترسێکی زۆر، یان ئەنجام دانی نوێژی سوننەت لە سەفەر، کە هەرکام لە شوێنی خۆی باسکراوە، ئەمەش یەکێکیانە، کە ئەفەرموێت:

١٢٧- ن/٦٥٩ ((وعَنْه قالَ: كانَ النبّيَّ ﷺ يُسَبحُ عَلىَ راحِلَتِهِ قِبَلَ اَيِّ وِجْهَةٍ تَوَجَّهَ ويوتِرُ عَلَيْها غَيْرَ اَنَّهُ لايُصَليِّ عَلَيْها المَكْتوبَةَ)) متفق عليه.

هەر لەوەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەسەر وڵاخەکەیەوە بەرەو هەرکوێ بڕۆیشتبایە، نوێژی بەسەرەوە ئەکردو، نوێژە تاقەکەیشی بەسەرەوە ئەکرد، بەڵام فەرزەکانی بەسەر وڵاخەوە ئەنجام نەدەدا.

# دەروازەكانی سیفەتی نوێژ

١٢٨- ن/٦٦٢ ((عَنْ علي بن ابي طالبﷺ عـن النبــيّﷺ قـالَ: (مِفْتـاحُ الـصَّلاةِ الطُّهورُ وتَحْرِيمُها التَّكْبيرُ وتَحْلِيلُهَا التَّسْليمُ)) رواه الخمسة الا النسائي وقال الترمذي هـذا اَصَحُّ شيء في هذا الباب واَحْسَنُ.

له عەلی كوڕی ئەبو تاڵبەوە ﷺ هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: كلیلی نوێژ- پاكو خاوێنیو دەستنوێژە- چوونە ناوەیەوە (الله أكبر)ەو، لێدەرچوونی بە سەلام دانەوەیە.

١٢٩- ن/٦٦٣ ((عَنْ مالك بن الحُويرِث، اَنَّ النبيَّ ﷺ قالَ: (صَلُّوا كَما رأَيْتُمـوني اُصَلّي)) رواه احمد والبخاري.

له مالیكی كوڕی حورەیسەوە هاتوە، كە پێغەمبەری ﷺ فەرمویەتی: نوێژ بكەن، وەكو چۆن مـن ئـەبینن نوێـژ ئەكـەم، واتـە: پێویـستە لەسـەر مـسوڵمانان تەماشـای نوێـژەكانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بكـەنو، هەرچـی ئـەو كردبێتـی پێویـستە لەسـەر ئوممەتەكەیشی، مەگەر بەڵگەی سونەتیی هەبێ.

١٣٠- ن/٦٦٤ ((عن النُّعْمان بن بَشير قَال: كَانَ رَسُولُ اللهﷺ يُسَوّينا في الصُّفُوفِ كَما يُقَوِّمُ الْقَدَحُ حَتَّى اِذَا ظَنَّ اَنْ قَدْ اَخَذْنا ذَلِكَ عَنْهُ، وفَقِهْنَـا، اَقْبَـلَ ذَاتَ يَـوْمٍ بَوَجْهِـهِ اِذَا رَجُلٌ مُنْتَبِذٌ بِصَدْرِ، فَقالَ: (لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ اَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَـيْنِ وَجُـوهِكم)). رواه مـسلم وابوداود والنسائي وابن ماجه والترمذي وصَحَّحَهُ.

له نوعمانی كوڕی بەشیرەوە هاتوە، كە: پێغەمبەری خـواﷺ ڕیزەكـانی ـ لـە كـاتی نوێژدا ـ بۆ ڕێك ئەكردین، وەكو چۆن پەرداخ ڕیز بكرێت، تـاوای زانـی، كـە ئـیتر ئێمـە لەوەوە فێربووینو شارەزایین ـوازی لێهێنایینو خۆمان ڕێـز دەبـووین، بـەڵام ـ ڕۆژێكیـان لای كردەوەو دی پیاوێك سنگی خـۆی زۆر دەرپەڕانـدوە، لـە ڕیزەكـەی فـەرموی: ((یـا

ڕیزەكانتان ڕێكوپێك بكەن، یان خوا ناكۆكی بخاتە نێوانتانەوە)).

ئایا ئەو هەمو ناكۆكیەی ئەمڕۆی مسولْمانان بەلْگە نیە لەسەرئەوەی، كە ئەو نزایەی پێغەمبەرە دژی ئێمە گیرا بووە، یەك ڕیزی جەماعەتمان نیە، ڕێك بێتو هیچ كەس لەوبارەوە خۆی بەرپرسیار نازانێت، بەلْكو بەداخەوە ئەگەر بەكەسێكیش بووترێت بۆ خۆت ڕاست ناكەیتەوەو پالْ بەبرا ئاینیەكەتەوە بدەیت؟ زۆر تورە ئەبیٚو هەندیٚ جاریش لەوانەیە مزگەوتو جەماعەتیش واز لیٚ بێنێت؟! ئەوەتە ئیسلامیەتەكەی ئەمڕۆمان، تەنانەت لە ئەنجامدانی نوێژیشدا بە گوێی پێغەمبەری خوا ﷺ ناكەینو ئارەزو كاریو نەفس بووەتە خوامانو ئەو دەپەرستین، ڕاستە خوای گەورە ئەفەرمویت: ((وَمَا يُؤمِنُ أَكْثَرُهُم بِآللهِ إلاَّ وَهُمْ مُشْرِكُونَ)). زۆربەی ئەوانە باوەڕ ناهێنن بەخوا، مەگەر ئەوانیش موشریك بن) (يوسف- ١٠٦).

١٣١- ن/٦٧٣ ((عَنْ وَائِلِ بِن حُجْرٍ، أَنَّهُ رأى النَّبِيَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ دَخَلَ فِي الصَّلاةِ وَكَبَّرَ ثُمَّ الْتَحَفَ بِثَوْبِهِ ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمنى عَلَى الْيُسْرى، فَلَمَّا اَرَادَ اَنْ يَرْكَعَ اَخْرَجَ يَدَيْهِ مِنَ الثَّوْب. ثُمَّ رَفَعَهُما فَكَبَّرَ فَرَكَعَ، فَلَمَّا قَالَ: (سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ) رَفَعَ يَدَيْهِ فَلَمَّا سَجَدَ سَجَدَ بَيْنَ كَفَّيْهِ. رواه احمد ومسلم وفي رِوَايَةٍ لأحمد وابي داود: (ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمنى عَلَى ظَهْرِ كَفِّهِ الْيُسْرى والرُّسْغِ وَالسّاعِدِ)).

لە وائیلی كوڕی حوجرەوە هاتوە كە چاوی بە پێغەمبەرﷺ كەوتووە، كە دەستی بەرز كردوەتەوە لەوكاتەی كە نوێژی دائەبەستیٚو (الله اكبر)ی ئەكرد، لەپاشا پۆشاكی خۆی ئەپێچا بەخۆیەوەو دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دائەنا، هەركاتیٚ بیویستایە بچەمێتەوە (الركوع) دەستی دەرئەهێنا لە پۆشاكەكەیەوەو، پاشا بەرزی ئەكردەوەو (الله أكبر)ی ئەكردو ئەچووە ركوعەوە. هەركاتیٚ ئەیفەرمو ((سَمِعَ الله لِمن حمده/ خوا نزای ئەو كەسەی وەرگرت، كە سوپاسی كرد)) دەستی بەرز ئەكردەوە، هەركاتیٚ، كە سوجدەی ئەبرد سەری لە نێوان هەردو لەپیدا دائەنا.. لە ریوایەتێكی تری ئیمام ئەحمەدو ئەبو داوددا هاتوە، كە كاتیٚ دەستی ئەگرت بەم شێوە بووە ((دەستی ڕاستی لەسەر لەپی

دەستی چەپیو مەچەكو قۆڵی دائەنا)). واتە دەستگرتن بەم شێوە سوننەتەو هەروەها دەست بەرزكردنەوە لەو شوێنانەدا كە باسی كردوە، بەرز كردنەوەكە بەرامبەری نەرمەی گوێ بێت باشە، چونكە لە ڕیوایەتی تردا هاتوە[1]، تا سەرشانو تا گوێی باسكردووە.

١٣٢- ن/٦٧٩ ((عن انس عَن النَّبـيِّ ﷺ قَال: (مَا بَالُ اَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ اَبْصَارَهُمْ اِلَـى السَّماءِ فِي صَلاتِهِمْ؟) فَاشْتَدَّ قَوْلُهُ فِي ذلِكَ حَتى قَالَ: (لَيَنْتَهُنَّ اُوْ لَتُخْطَفَنَّ اَبْصارُهُمْ))). رواه الجماعة الا مسلماً والترمذيَّ.

لە ئەنەسەوە رضي الله عنه ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرمویەتی: ((ئەوە چییە هەندێ كەس چاویان لە كاتی نوێژدا بۆ ئاسمان بەرز ئەكەنەوە؟)) فەرمودەكانی لەو بارەوە زۆر توند بوو، تا ئەو جێگایەی كە فەرموی ((یا باواز بهێنن، یا با چاوییان دەربێت)). واتە: چاو بەرزكردنەوەو ڕوانین بۆ ئاسمان لەكاتی نوێژدا خراپەو قەدەغەیە، ئەمە بەندایەتیەو ئەگەر هیچ سوودیشی نەزانین، ئەبێ گوێڕایەڵی بكەینو، بەدوای بۆچیو لەبەر چییدا نەگەڕێین.

١٣٣- ن/٦٨١ ((عَن ابي هريرة قَال: (كَانَ رَسُولُ الله ﷺ اِذَا كَبَّرَ فِي الصَّلاةِ سَكَتَ هُنَيْهَةً قَبْلَ القِرَاءَةِ، فَقُلْتُ يا رَسُولُ الله ﷺ بِاَبِي اَنْتَ وَاُمِّي! اَرَأَيْتَ سُكُوتَكَ بَيْنَ التَّكْبِير وَالْقِراءَةِ ماتقُولُ؟ قَالَ: اَقُولُ: اللّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنَـي وَبَيْنَ خَطَايايَ كَما باعَدْتَ بَيْنَ المَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللّهُمَّ نَقِّني مِنْ خَطَايايَ كَما يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللّهُمَّ اغْسِلْني مِنْ خَطَايايَ بِالثَّلْجِ وِالْماءِ واْلبَرَدِ))) رواه الجماعة الا الترمذيَّ)).

لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی ((پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ نوێژی دائەبەستو (الله اكبر)ی ئەكرد ئەبوو پێش ئەوەی دەست بكات بە خوێندنی - فاتیحە كەمێ بێ دەنگ -

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٦٧١- ٦٧٢، لە سەرچاوەی پێشوو بكە.

وتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خواﷺ باوكو دایكم به‌ قوربانت بێ ئایا پێم نالێیت ئه‌و بێ ده‌نگیه‌ی خۆت له‌ نێوان (الله أكبر)و له‌ نێوان قورئان خوێندنتدا چی ئه‌فه‌رمویت؟

فه‌رموی: ئه‌لێم: ئه‌ی خوایه‌ منو تاوانه‌كانم وا له‌یه‌ك دوور بخه‌ره‌وه‌، وه‌كو چۆن رۆژهه‌لاَتو رۆژئاوات له‌یه‌ك دوور كرده‌وه‌، ئه‌ی خوایه‌ پاكم كه‌ره‌وه‌ له‌ تاوانه‌كانم وه‌كو چۆن پۆشاكی سپی پاك ئه‌كرێته‌وه‌ له‌ چڵكو پیسی، ئه‌ی خوایه‌ بمشۆره‌ له‌ تاوانه‌كانم، به‌ به‌فرو به‌ ئاوو به‌ ته‌زره‌. واته‌ سوننه‌ته‌ له‌ نێوان (الله أكبر)ی ئه‌وه‌ڵو خوێندنی فاتیحه‌دا دوعا بكرێتو ئه‌وه‌ی سه‌ره‌وه‌یش یه‌كێكه‌ له‌و دوعایانه‌[1].

١٣٤- ن/٦٩٣ ((عن عُبادَةَ بن الصّامت اَنَّ النَّبيَّﷺ قَال: (لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتابِ))) رواه الجماعة.

له‌ عوباده‌ی كوڕی سامیته‌وه‌ هاتوه‌، كه‌ پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمویه‌تی: ((ئه‌وكه‌سه‌ی له‌ نوێژدا سوره‌تی فاتیحه‌ نه‌خوێنێ ، ئه‌و نوێژه‌ی به‌نوێژ بۆ دانانرێت)). واته‌: نوێژه‌كه‌ی دروست نیه‌و چه‌ندین فه‌رموده‌ی تر له‌مباره‌وه‌ هه‌یه‌، كه‌ دابه‌شكردنی سوره‌تی حه‌مد یه‌كێكه‌ له‌وانه‌و، له‌ فه‌رموده‌ قودسیه‌كاندا باسكراوه‌و ته‌ماشاكردنی به‌سوده‌.

١٣٥- ن/٦٩٦ ((عَن ابي هريرة اَنَّ رَسُول اللهِﷺ قَال: (انّمَا جُعِلَ الأمامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَأِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرَوا واِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا)) رواه الخمسة الاّ الترمذي وَ قَال: مسلم هُوَ صَحيحٌ.

له‌ ئه‌بو هوره‌یره‌وه‌ رضي الله عنه هاتوه‌، كه‌ پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رمویه‌تی: ((پێش نوێژی كه‌ر (إمام) بۆیه‌ دانراوه‌ تا په‌یره‌وی بكرێت، جا هه‌ركاتێ وتی (الله اكبر)و نوێژی دابه‌ست، ئێوه‌ش بڵێن (الله اكبر)و، هه‌ركاتێ قورئانی خوێند بێده‌نگ بن، واته‌، ئه‌بێ چاو له‌ ئیمام بكرێت له‌كاتی جه‌ماعه‌تداو، نابێ پاشو پێشی لێبكرێتو، شتێ ئه‌نجام بدرێت، كه‌ ئیمام ئه‌نجامی نه‌داوه‌و، ئه‌بێ كاتێ قورئان ئه‌خوێنێت گوێی لێ بگیرێتو،

---

(١) ته‌ماشای فه‌رموده‌ی ژماره‌٦٨٢-٦٨٣، له‌ سه‌رچاوه‌ی پێشوو بكه‌ كۆمه‌ڵێكی تر دوعایان تێدایه‌.

مه‌ئموم خۆی مه‌شغولْ نه‌كات به‌ قورئان خوێندنه‌وه‌، بێجگه‌ له‌ خوێندنی سوره‌تی فاتیحه‌، والله اعلم.

١٣٦- ن/٦٩٩ ((عن عُبادَةَ اَنَّ النَّبيَّ ﷺ قَال: (لا يَقْرَأَنَّ اَحَدٌ مِنْكُمْ شَيْئاً مِنَ الْقُرْآنِ اِذَا جَهَرْتُ بِالقراءَةِ الاّ بِأُمِّ الْقُرْآنِ))). رواه الدار قطني وقال: رجالُهُ كُلُّهُمْ ثِقَاتٌ. وصححه البخاري في (جزء القراءة).

له‌ عوباده‌وه‌ ؓ هاتوه‌، كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمویه‌تی: ((با هیچكام له‌ ئێوه‌، هیچ شتێك له‌ قورئان نه‌خوێنێ، هه‌ركاتێ من به‌ده‌نگی به‌رز له‌ نوێژدا قورئانم خوێند بێجگه‌ له‌ سوره‌تی فاتیحه‌، كه‌ (دایكی قورئان/ أم القرآن) ناوێكی تری سوره‌تی فاتیحه‌یه‌، واته‌ له‌كاتی ده‌نگ به‌رزكردنه‌وه‌ی ئیمامدا ته‌نها ئه‌م سوره‌ته‌ مافی خوێندنی هه‌یه‌ له‌لایه‌ن مه‌ئمومه‌كانه‌وه‌، پاش ئه‌وه‌ ئه‌بێ بێده‌نگ بن، وه‌كو له‌ فه‌رموده‌ی پێشوودا فه‌رموی.[1]

١٣٧- ن/٧٠٤ ((عَنْ وائِل بن حُجْرِ قَالَ سَمِعْتُ النَّبيَّ ﷺ قَرَأَ (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عليهم وَلا الضَّالِّين) فقال: (آمين) يَمُدُّ بِهَا صَوْتَهُ. رواه احمد والترمذيّ وابوداود وزاد (رَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ))).

له‌وائیلی كوڕی حوجره‌وه‌ هاتوه‌، كه‌ وتویه‌تی گوێبیستی پێغه‌مبه‌ر بوم، كه‌ وه‌ختێ (غير المغضوب عليهم ولا الضّالين)ی ئه‌خوێند ئه‌یفه‌رمو (آمین/ خوایه‌ لێم‌وه‌رگره‌)و درێژی ئه‌كرده‌وه‌.

له‌ ڕیوایه‌تی ئه‌بو ده‌ردا ئه‌مه‌یشی زیاد كردوه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ ((ده‌نگی به‌ وشه‌ی ـ آمين ـ به‌رز كردوه‌ته‌وه‌، واته‌ پاش (ولا الضّالين). وتنی ئامین‌و درێژكردنه‌وه‌ی‌و به‌ده‌نگی به‌رز بۆ پێشه‌وا (ئیمام) سوننه‌ته‌و، چاك وایه‌ مه‌ئمومه‌كانیش به‌یه‌ك ده‌نگ له‌گه‌ڵ ئیمامدا ـ پاش‌و پێش نه‌كه‌ون وه‌بڵێن ئامین ـ وه‌كو له‌ فه‌رموده‌ی تردا هاتوه‌.

---

١) ته‌ماشای فه‌رموده‌ی ژماره‌ ٧٠١ ، له‌ سه‌رچاوه‌ی پێشو بكه‌.

١٣٨- ن/٧٠٥ ((عن رفاعة بن رَافِعٍ اَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَّمَ رَجُلاً الصَّلاة فَقَالَ: (اِنْ كَانَ مَعَكَ قُرْآنٌ فَاقْرأْ وَاِلاّ فَاحْمَدِ اللهَ وكَبِّرْهُ وَهَلِّلْهُ، ثَمَّ ارْكَعْ))) رواه ابوداود والترمذي وقال: حسنٌ.

له ریفاعەی کوڕی رافیعەوە هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کابرایەکی فێری نوێژ کردو فەرموی: ((ئەگەر قورئانت ئەزانی قورئان بخوێنە ئەگینا - (الحمد لله، الله اكبر)و (لا إله الاّ الله) بڵێ، پاشان بچەمێوە (الركوع). واتە ئەگەر کەسێ قورئانی نەئەزانیو فێر نەئەبوو، با ئەم سێ وشانە بڵێتو نوێژەکەی بکات.

١٣٩- ن/٧٠٧ ((عن ابي قَتَادَةَ اَنَّ النَّبيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ في الظُّهْرِ في الأُولَيَيْنِ بِأُمِّ الْكتابِ وَ سُورَتَيْنِ وفي الرَّكْعَتَيْنِ الأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكتابِ ويُسْمِعُنَا الآيَةَ اَحْيَاناً وَيُطَوِّلُ في الرَّكْعَةِ الأُولى مَا لايُطِيلُ في الثَّانِيَةِ وَهَكَذا في الْعَصْرِ وَهَكَذا في الصُّبْحِ)). متفق عليه.

له باوکی قەتادەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ لە دوو رکاتی ئەوەڵی نوێژی نیوەڕۆدا سوڕەتی فاتیحەو دوو سورەتی ئەخوێند، لە دوو ڕکاتی دواییدا تەنها سورەتی فاتیحەی ئەخوێندەوە، جاریوابوو ئایەتێکی بەرز ئەخوێندەوە وە رکاتی یەکەمی درێژتر ئەکردەوە لە رکاتی دوهەم، جا هەر بەوشێوەیە لە نوێژی عەسرو لە نوێژی بەیانیدا، باشوایە درێژکردنەوەی ئیمام، بەگوێرەی توانایو کاتی مەئمومەکانی بێتو ریعایەتیان بکات.

١٤٠- ن/٧١١ ((عَنْ حُذَيفة، قال: (صَلَّيْتُ مَعَ النَّبيِّ ﷺ ذاتَ لَيْلَةٍ فافْتَتَحَ البَقَرَةَ) فَقُلْتُ يَرْكَعُ عِنْدَ المِائَةِ ثُمَّ مَضَى، فَقُلْتُ: يُصَلِّي بِها في رَكْعَةٍ فَمَضَى فَقُلْتُ يَرْكَعُ بِها فَمَضَى ثُمَّ افْتَتَحَ (النِّساءَ) فَقَرأَها، ثُمَّ افْتَتَحَ (آل عمران) فَقَرأَها مُتَرَسِلاً، اذا مَرَّ بِآيَةٍ فيها تَسْبيحٌ سَبَّحَ، وَاذا مَرَّ بِسؤالٍ سَأَلَ واَذا مَرَّ بِتَعَوُّذٍ تَعَوَّذَ ثُمَّ رَكَعَ فَجَعَلَ يَقولُ: (سُبْحانَ رَبيَّ الْعَظيم) وَكانَ رُكوعُهُ نَحْواً مِنْ قِيامِهِ ثُمَّ قالَ: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ) ثُمَّ قامَ قِياماً طويلاً قَريباً مِمّا رَكَعَ ثُمَّ سَجَدَ فَقالَ: (سُبْحانَ رَبيَّ الأَعْلى) فَكانَ سُجُودُهُ قَريباً مِنْ قِيامِهِ)) رواه احمد ومسلم والنسائي.

لە حوزەیفەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: ((شەوێك لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ نوێـژم کرد، ئەو دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی ((بەقەرە))، وتم لـە ئایـەتی سـەدیا ئەچـێتە روکوعەوە، لە پاشا لەوە تێپەڕی، وتم: لەیەك رکات نوێژدا سورەتەکە تەواو ئەکات، دەی هەر ڕۆیی، وتم: لەگەڵ تەواوبوونیدا ئەچێتە رکوعەوە، هەر لەسەر خوێندن بەردەوام بوو، لەپاشا دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی ((نـساء))و تەواوی کردو لەپاشـا دەسـتی کـرد بەخوێنـدنی سـوڕەتی ((آل عمـران)) بەهێواشـی و تـەواوی کـرد، هـەرکاتێ ئایـەتێکی بخوێندایەو باسی پـاکو بـێ عـەیبی خـوای بکردایـە ((تەسـبیحاتی)) خـوای دەکـرد،و ئایەتێکی داواکـاری بخوێندایـە داوای ـ شـتی لـە خوا ئـەکرد، وە ئەگـەر ئایـەتێکی پەناگرتن بەخوای بخوێندایە، پەنای بە خوا دەگرت لەپاشدا چـووە رکوعـەوەو ئەیفـەرمو ((سُبْحانَ رَبِّی الْعَظیم/ پاكو بێ عەیبە بۆ پەروەردگاری گەورەم)) وە رکوعەکەی نزیکی وەستانەکەی بوو. لەپاشا سەری بەرز کردەوەو فەرموی: ((سَمِعَ اللّٰه لمن حمدهُ/ خـوا وەری گرت داوای ئەو کەسەی کە سوپاسی کرد، ئـەی پـەروەردگارم تـەنها بۆتۆیـە سـوپاس)) لەپاشاوەستانێکی درێژی کرد نزیك بوو لەو وەسـتانەی کـە چـەمایەوە (الرکـوع) تێیـدا لەپاشا سوجدەی بردو فەرموی: ((سبحان ربِّی الاعلـی/ پاكو بێ عەیبە بۆ پەروەردگاری بڵند مەقام)) سوجدەکەیشی نزیك بوو لە وەستانەکەی، بـەڵێ، ئـەم فـەرمودە چـەندین فرمانو حوکمی لـێوەردەگیرێ لەوانە:

١- دروستە شەونوێژ بە جەماعەت بکرێت.

٢- پاشو پێش کردنی سورەتەکانی قورئان لە نوێژدا دروستە.

٣- ئەو سێ زیکرانە لەو سێ شوێنەدا سوننەتە بخوێنرێن (سُـبْحانَ رَبِّـی الْعَظـیم) لـە رکوع داو (سبحان ربِّی الاعلی) لە سوجدەداو (سَمِعَ اللّٰه لمن حمدهُ) لە سەر بەرزکردنـەوەی پاش رکوع دا.

٤- دروستە ئەو روکنانە درێژ بکرێنەوە بە ئەندازەی نزیکەی وەستانی نوێژەکە.

٥- ریزکردنی روکنەکان بەو شێوەیە پێویستەو نابێ پاشو پێش بخرێن، واتە: (قیـام،

ركوع، رفع اعتدال، سجدە/وەستانو چەمینەوەو بەرزبوونەوەو راست وەستانو کورنوش).

٦- دوعاو پاڕانەوەو پەنا گرتن بەخوا لە کاتی خوێندنەوەی ئایەتانێکدا، کە ئەو مانایە بگەیەنن سوننەتە لە نوێژدا.

١٤١- ن/٧٢٥ ((عن ابنِ مَسعودٍ، قالَ: (رَأَيْتُ اَنَّ النَّبيَّ ﷺ يُكَبِّرُ في كُلِّ رَفْعٍ وخَفْضٍ وَقيامٍ وَقُعُودٍ)) رواه احمد والنسائي والترمذي وصَحَّحه)).

لە کوڕی مەسعودەوە (عبد الله) هاتوە، کەوتویەتی: ((چاوم بە پێغەمبەرﷺ کەوت کە (الله أكبر)ی ئەکرد، لە هەمو بەرزبوونەوەیەكو نزم بوونەوەیەكو هەستانو دانیشتنیا.

١٤٢-ن/٧٢٩ ((عن جابر، قال: اشْتكى رَسولُ اللهِﷺ فَصَلَّيْنا وَرَاءَهُ وَهوَ قاعِدٌ، وَابو بَكرٍ يُسْمِعُ النَّاسَ تَكْبيرَهُ) رواه احمد ومسلم والنسائي وابن ماجة))

لە جابیرەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ نەخۆش بوو، ئێمە نوێژمان لە پشتیەوە، کرد، کە ئەو تەشریفی دانیشتبوو، ئەبوبەکررضي الله عنه (الله أكبر)ەکانی ئەدا بەگوێی خەڵکا، واتە دروستە کەسانێك بە پێوەبن پەیڕەوی بکەن لە ئیمامی دانیشتوو، هەروەها دروستە کاتێ، کە دەنگی ئیمام نە دەگەیشتە خەڵك، کەسێك، یان کەسانێك بە گوێرەی پێویست دەنگ بەرزبکەنەوەو، (الله أكبر)ەکانی ئیمام بە خەڵك ڕاگەیەنن.

١٤٣- ن/٧٣٢ ((عن مصعب بنِ سَعْدٍ قال: (صَلَّيْتُ الى جَنْبِ اَبي، فَطَبَّقْتُ بَيْنَ كَفَّيَّ ثُمَّ وَضعتُهُما بَيْنَ فَخِذَيَّ فَنَهانِي عَنْ ذلِكَ وَقالَ: كُنَّا نَفْعَلُ هذا، وَأُمِرْنا اَنْ نَضَعَ اَيْدِينا عَلىَ الرُّكَبِ)) رواه الجماعة.

لە مەسعەبی کوڕی سەعدەوە هاتوە، کەوتویەتی: ((لە تەنیشتی باوکم نوێژم کرد، هەردو ناولەپم لکاند بەیەکەوە، خستمە نێوان هەردو ئەژنۆم دا - لە کاتی رکوع دا - باوکم بەرگری ئەوەی لێکردم ووتی: ئێمەیش لە پێشەوە وامان دەکرد - بەڵام - فرمانمان پێدرا، کە دەستەکانمان لەسەر ئەژنۆکانمان دابنێین.

١٤٤- ن/٧٣٥ ((عن عائشةؓ انَّ رَسولُ اللهﷺ كان يَقـولُ في رُكُوعِـهِ وَسُـجُودِهِ: (سُبُّوحٌ قُدّوس رَبُّ المَلائِكةِ والرُّوحِ)) رواه احمد ومسلم وابوداود والنسائي.

له خاتو عائیشەوەؓ هـاتوه، كـه پێغەمبـەری خـواﷺ لـه ركـوعو سـوجدەيدا ئەيفەرمو: ((پاكو بێ عەيبەوخـــاوەن خێری زۆره ـ خوا ـ پـەروەردگاری فريـشتەكانو جبرەئيله))، واته سوننەته ئەم دوعايەش لـەو دوو شـوێنەدا بخوێنرێـت، جـا چ بەتـەنها خۆيان، يـان لەگـەڵ ئـەوەی فـەرمودەی (١٤٠) هـەروەها چـەندين دوعـاو نـزای تـری پێغەمبەرمان هاتوه، لەم دوو شوێنەداو هەمويان سـوننەتن چ بەيەكـەوە چ بـەتاكی[١]، والله أعلم.

١٤٥- ن/٧٣٩ ((عن ابن عباسؓ قـال: كَـشَفَ رَسـولُ اللهﷺ الـسّتارَةَ، والنَّـاسُ صُـفوفٌ خَلْـفَ اَبـي بَكْـر، فَقـالَ: يأَيُّهـا النَّـاسُ لَـمْ يَبْـقَ مِـنْ مُبَـشْرَاتِ النُّبـوَّة الا الرُّؤْيـا الصّالِحَة، يَراها الْمُسْلِمُ اَوْ تُرى لَهُ، اَلا وانيّ نُهيت اَنْ اَقْرَأَ القـُرآنَ رَاكِعـاً اَوْ سـاجِداً اَمَّـا الرُّكوعُ فَعَظِّموا فيه الرَّبَّ وَاَمَّا السُّجودُ فَاجْتَهِدوا في الدُّعاءِ فَقَمِنٌ اَنْ يَسْتَجابَ لَكُمْ) رواه احمد ومسلم وابوداود والنسائي)).

له عەبدوڵڵای كـوڕی عەباسـەوەؓ هـاتوه، كەوتويـەتی پێغەمبـەری خـواﷺ - لەوكاتەی، كە نەخۆش بوو لەماڵەوە- پـەردەی لاداو تەماشـای كـرد خـەڵك لـه پـشتی ئەبوبـەكرەوە ڕیزیـان بەسـتووه ـ بـۆ نوێژـ فـەرموی: ئـەی خەڵكينـه مـژدەدەرانی پێغەمبەرايەتی نەماون - ئەمە ئیشارەیە به كۆچی خۆی ـ بێجگە له خەوی چـاك، كـه مسوڵمان خۆی ئەيبينێ، يان خەڵكی تر پێوەی ئەبينن، ئاگادار بن من ڕێگـريم لێكـراوه لەوەی، كە قورئان له ركوعو سجوودا بخوێنم ـواته قورئان خوێندن له ركـوعو سـوجوددا دروست نيه، جا نوێژ بەتاڵ ئەكاتەوه، يان نەء، ئەوه ناكۆكی تێدا هەيه، جا له ركوعـدا خوا بەگەوره دابنێن، واته ئەو وشـانه بـەكاربهێنن، كـه بەڵگـەی دەسـەڵاتو گـەورەی

---

١) تەماشای فەرمودەی ژماره ( ٧٣٦ ) و شەرحەكەی بكەن له سەرچاوەی پێشودا.

خوایە، وەكو ئەو وشانەی لە پێشەوە باسكران، لە سوجودا زۆر بپاڕێنەوە ـ چـونكە لـەو جێگادا شایستەیە، كە دوعاو نزاكانتان لیٚوەرگیرێت، واتە پاڕانەوەو دوعای زۆركردن لە سوجدەدا شتێكی چاكو شەرعییە.

١٤٦- ن/٧٤٠ ((عن ابي هريرةؓ قال: كَانَ رَسولُ اللهﷺ اذا قامَ الى الصَّلاة يُكَبِّـرُ حينَ يَقومُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقولُ: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) حينَ يَرْفَعُ صُـلْبَهُ مِـنَ الرَّكْعَـة ثُمَّ يَقولُ وَهوَ قائمٌ: (رَبَنا وَلَكَ الحَمْدُ) ثُمَّ يُكَبِّرُ حينَ يَهْوي ساجداً، ثُمَّ يُكَبِّرُ حينَ يَرْفَـعَ رأْسُـهُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حينَ يَهْوي ساجداً، ثُمَّ يُكَبِّرُ حينَ يَرْفَعَ رأْسُهُ، ثُـمَّ يَفْعَـلُ ذلِـكَ في الـصَّلاة كُلِّهـا، وَ يُكبِّرُ حينَ يَقومُ مِنَ الثِّنْتَيْنِ بَعْدَ الجُلُوسِ) متفق عليه وفي رواية لهم: (رَبَنا لَكَ الحَمْدُ)).

لـە ئـەبو هـورەیرەوەؓ هـاتوە، كـە وتویـەتی: ((پێغەمبـەری خـواﷺ هـەركاتێ هەڵسابێ بۆ نوێژ، بە (الله أكبر) دەستی پێ ئەكرد لەو كاتـەدا، كـە ڕائەوەسـتا لەپاشـا (الله أكبر)ی ئەكرد ئەوكاتەی، كە ئەچووە ركوعەوە، لەپاشا ئەیفـەرمو: ((سَـمِعَ الله لمـن حمـدە)) كاتێ پشتی بەرز ئەكردەوە لە ركوع، لەپاشا ئەیفەرمو: ئەوكاتـەی، كـە بـەپێوە وەستا ((رَبَّنا ولك الحمد -و لە هەندێ ریوایـەتی فـەرموده كـەدا (واوەكـەی) نیـە بـەم شێوەیە (رَبَّنا لك الحمـد) واتە: هەردو شێوە دروستە. لەپاشا (الله أكبر)ی ئەكرد، وەختێ دادەنەوییەوە بۆ سوجدە لەپاشا (الله أكبر)ی ئەكرد ئەو كاتەی، كە ئەچـووە سـوجدەی ـ دوهەمەوەـ لەپاشان (الله أكبر)ی ئەكرد كاتێ، كـە لـە سـوجدەی دووهـەم سـەری بـەرز ئەكردەوە، لەپاشا ئا لەهەمو نوێژەكەیدا بەو شێوەیەی ئەكرد (الله أكبر)ی ئەكرد كاتـێ، كە لـە دووهـەم ركـات پـاش دانیـشتن هەڵئەسـایەوە. لـەم فەرمودەیـەدا شـوێنی (الله أكبر)ەكان دیاریكراوە، هەروەها شـوێنی- سَـمِعَ الله لمـن حمـدەو، شـوێنی - رَبَّنـا ولـك الحمد.

**تێبینی:** (الله أكبر)ی ئەوەڵ واجبەو ئەگەر نەكرا نوێژەكە هەڵدەوەشـێتەوەو دروسـت نیە. بەڵام باقی (الله أكبر)ەكانی تر سوننەتن بۆ ئیمامو بۆ مەئموم.

١٤٧- ن/٧٤٥ ((عَنْ اَبی مَسْعودِ الْأَنْصارِيِّ رضي الله عنه قال: كَانَ رَسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: (لا تُجْزِئُ صَلاةٌ لايُقيم فيها صُلْبَهُ في الركوع والسجود)) رواه الخمسة وصَحَّحه الترمذي.

له ئەبو مەسعودی ئەنسارییەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: دروست نیە نوێژی ئەو کەسەی، کە لە رکوعو سوجوددا پشت بەرز نەکاتەوە، واتە پێویستە لە رکوعو سوجوددا بەچاکی پشتی بەرز بکاتەوەو، ئەوەندە بوەستێت، تا پشتی ئارام ئەگرێت، ئەگینا نوێژەکەی خۆماندو کردنەو هیچی تر.

١٤٨- ن/٧٤٨ (((عَنْ عبْدِاللهِ بنِ بُحَينَة قال: (كَانَ رَسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم اِذا سَجَدَ يُجَنِّحُ في سُجُودِهِ حَتى يُرىَ وَضْحُ اِبْطَيْهِ)) متفق عليه.

له عەبدوڵڵای کوڕی بوحەینەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەرکاتێ سوجدەی ببردایە قۆڵەکانی لەتەنیشتی دور ئەخستەوە بە شێوەیەك، کە سپیایی بن هەنگڵیمان ئەبینی.

١٤٩- ن/٧٤٩ ((عَنْ اَنس رضي الله عنه عن النبيِّ صلى الله عليه وسلم قال: (اِعْتَدِلوا في السُجُودِ وَلا يَبْسُطْ اَحَدُكُمْ ذَراعيهِ اِنْبِساط الْكَلْبِ)) رواه الجماعة.

له ئەنەسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی لە سوجدەکاندا ڕێکو راست بنو قۆڵەکانتان رانەخەن، وەکو ڕاخستنی سەگ. پێویستە هێز بدەنە سەر دەستەکانتانو، لەپی دەست لەزەوی بتەو بکرێتو قۆڵەکان بەرزبکرێنەوەو لە تەنیشت دور بخرێنەوە، مەگەر کابرا توانای نەبێت، یان زۆر سەخت بێ بۆی، ئالەم کاتەدا ئەتوانێ زیاتر زۆر لە ئەژنۆکانی بکات، وەکو لە فەرمودەی (اسْتَعينوا بِالرُّكب ـ بە ئەژنۆکان یارمەتی وەرگرن)[1] داهاتوە.

---

(١) ئه بو داود (٩٠٢) و ترمزی(٢٨٦) و حاكم (١/ ٢٩٩) وئینبوحبان(٥٠٧- مەواريد)و بەیهەقی(٢/٢٩-٣٠) و شەوکانی لە راقەی فەرمودەی(٧٤٨) ی خۆی لە(نیل الاوطار)دا هێناویانە.

١٥٠- ن/٧٥٣ ((عن ابن عباسﷺ قال: قالَ النبيّﷺ: (اُمِرْتُ اَنْ اَسْجُدَ عَلى سَبْعَةِ اَعْظُمٍ عَلى الْجَبْهَةِ وَاَشَارَ بيَدِهِ عَلَى اَنْفِه، والْيَدَيْنِ، والرُكْبَتَيْنِ , والْقَدَمَيْنِ)) متفق عليه.

له عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوەﷺ هاتوە كەوتویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: فرمانم پێ دراوە ـ لە لایەن خواوەـ كە لەسەر حەوت ئێسقانم سوجدە ببەم: لەسەر ناوچەوانم‌و ئیشارەی كرد بەدەستی بۆ لوتیشی، واتە ناوچەوان‌و لوت بەیەكەوە سەر زەوی بخرێن، هەردوو دەست‌و هەردوو ئەژنۆو هەردوو پێ،لە وحەوتانە تەنها ناوچاوان پێویستە ڕوت بێ.

١٥١- ن/٧٥٤ ((عَنْ اَنسﷺ قال: (كُناَّ نُصَلّي مَعَ رَسولُ اللهﷺ في شِدَّةِ الحَرِّ فاذا لَمْ يَسْتَطِعْ اَحَدُنا اَنْ يَمْكِّنَ جَبْهَتَهُ مِنْ الأَرْضِ بَسَطَ ثَوْبَهُ فَسَجَدَ عليه)) رواه الجماعة.

له ئەنەسەوەﷺ هاتوە، كەوتویەتی: ((ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ لەكاتی زۆر گەرمادا نوێژمان ئەكرد ، جا ئەگەر هەركاتێ هیچ كام لە ئێمە لەبەر زۆر گەرمی نەیتوانیایە ناوچەوانی بەچاكی لەسەر زەوی دانێت، پۆشاكێكی خۆی ڕائەخست‌و سەری ئەنایە سەری، واتە دروستە سوجدە لەسەر زەوی نەبێ، بەڵام ئەگەر بەهانە نەبوو چاك‌وایە لەسەر زەوی بێت. چونكە لێرە ئەبینین لەبەر زۆر گەرمی بووەو ریوایەتی بێ بەهانەی سەر لەسەر شت دانان زۆرن، بەڵام زۆربەیان تەواو نین، والله أعلم.

١٥٢- ن/٧٥٧ (((وعنه قال: كانَ رَسولُ الله ﷺ قال: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) قامَ حتى نَقولَ: قَدْ اَوْهَمَ ثَمَّ يَسْجُدُ وَيَقْعُدُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ حَتى نَقولَ قَدْ اَوْهم)) رواه مسلم.

هەر لەوەوە هاتوە، كە وتویەتی: ((پێغەمبەری خواﷺ هەركاتێ لە نوێژدا ئەیفەرمو (سَمِعَ الله لمن حمده)) ئەوەندە ئەوەستا، تا ئێمەوامان گومان دەبرد، كە بێ ئاگا بووەو سەهوی كردووە، لەپاشان سوجدەی ئەبرد، ئەوەندە دائەنیشت لەنێوان سوجدەكاندا تاوامان گومان ئەكرد، كە بێ ئاگا بووە، واتە درێژە دان بەو دوو شوێنە سوننەتە، هەروەكو درێژكردنەوەی ركوع‌و سوجودەكان، بەڵام كەمتر.

١٥٣- ن/٧٥٩ ((عن ابن عباس‌رضي الله عنه اَنَّ النبّـيّ‌صلى الله عليه وسلم: كانَ يَقولَ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: (اَلّلـهُم اغْفِرلي وَارْحَمْني وَاجْبرْني وَاهدِني وَارْزقني) رواه الترمـذي وابـن ماجـه وابـوداود، الا انـه قال فيه: (وَعافِني مَكَانَ وَاجْبِرْني))).

له عەبدوڵڵای کوڕی عەباسـەوەرضي الله عنه هـاتوه، کـە پێغەمبـەرصلى الله عليه وسلم لـە نێـوان هـەردوو سوجدەکاندا ئەیفەرمو: ((ئەی خوایە لێم ببورەو بەزەییت هەبێ بۆمو کەمو کوڕیەکانم بـۆ ساغ کەرەوەو ڕێنمایم بکەو ڕۆزیم پێ بدە... بەڵام لە ڕیوایەتی ئەبو داوددا ـ چاوپۆشـیم لێبکە/ عافنی لە باتی ((واجبرنی)) هاتوه ـ ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە کـە لـەو شـوێنەدا دوعاکردن بەو وشانە سوننەتەو وشەی تریش هاتوە وەکو (رب اغفرلـي، رب اغفرلـي[1]) پەروە ردگارم لێم خۆ شبە، پەروەردگارم لێم خۆشبە.

١٥٤-ن/ ٧٦٢ ((عن أبي قتادة قال: قالَ رَسُـول اللهصلى الله عليه وسلم: (( شَـرُّ النَّـاسِ سـرقَةً الـذي يسرقُ منْ صلاته، فقالوا: يارسول الله وكيف يـسرقُ مـنْ صـلاته؟ قـال: ((لايـتم ركوعَهـا ولاســجودَها)) أوقــال: ((ولايُقِــيمُ صُــلبهُ في الرُّكــوعِ والــسجودِ)) رواه أحمــد(٣٧٥)، والطبراني))ن(٧٦٢).

لەباوکی قەتادەوەرحمه الله هـاتوه، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـواصلى الله عليه وسلم فەرمویـەتی: ( خراپترین خەڵکی دز ئەوکەسەیە، کـە لەنوێژەکـەی خـۆی دزی ئـەکات))، وتیـان: ئـەی پێغەمبەری خواصلى الله عليه وسلم چۆن لەنوێژی خۆی دزی ئەکات ؟ فەرموی: ((روکـوع و سـوجدەکان تەواو ناکات، یان فەرموی: (( پشتی ڕاست ناکاتەوە لەرکوع و سوجدەکانیدا)).

١٥٥-ن/ ٧٦٤ ((عن مالك بن الحويرث ((أَنَهُ رَأى النَّبي‌صلى الله عليه وسلم يُصَلي فَإذا كَـانَ في وتـر منْ صلاتِهِ لم ينهض حتى يستوى قاعِداً))، رواه الجماعة الامسلما وابن ماجه .

لەمالیکی کوڕی حوریسەوە هاتوە، کە (چاوی بەپێغەمبەرصلى الله عليه وسلم کەوتوە، کاتێ نوێـژی ئەکرد لەکاتی تاکەکاندا بەرز نەئەبوەوە، تا دائەنیشت، ئینجا هەڵئەستا، واتە دانیشتن و

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە ٧٥٨، لە سەرچاوەی پێشوو بکە.

وچـان دان ـ جلسة الاستراحة ـــ ســوننەتە. ((أحمد ٥/ ٥٣(( خ ))٨٢٣((، وأبو داود))٨٤٤(( والترمذي))٢٨٦(( والنسائي))٢/ ٢٣٤)).

١٥٦-ن/ ٧٦٥(( عن أبي هريرة، قال: (( كانَ رسول اللهﷺ اذا نَهَضَ فِي الركعة الثانية، إفْتَتَحَ الْقِرَاءَةَ بـــ (الحمد لله رب العالمين) وَلَم يَسْكُتْ))، رواه مسلم، م))١٤٨/٥٩٩)).

لەئەبو هورەیرەوە ﵁ هاتوە، کە وتویەتی: ( پێغەمبەری خواﷺ هەرکاتێ لەرکاتی یەکەمەوە بۆ دوهەم رکات هەڵبستایە، بەخوێندنی (الحمد لله رب العالمين) دەستی پێ ئەکرد هیچ بێ دەنگ نەدەبو. واتە: سوننەت نی یە خوێندنی ( أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)بێجگە لە رکاتی یەکەم پێویستە پاش هەستانەوە دەست بکرێ بەخوێندنی سورەتی فاتیحە ـ والله أعلم ـ.

١٥٧- ت/ ٧٦٦(( عنء ابن مسعود﵁ قال: (( إنَّ محمداًﷺ قال: (( إذا قَعَدْ تُمْ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، فُقُولوا: (( التحيات لله الصلوات الطيبات، السلام عليكَ أيُهّا النَّبِي ورحمة الله وبركاته، السلام عَلَيْنَا وعلى عبادِ اللهِ الصَّالحين، أشهد انْ لا اله إلاّ الله، وَ أشهد أنَّ محمداَ عبدهُ وَرَسولُه ثُمّ ليتخيَّرْ أحدُكم منَ الدعاءِ أعجبهُ اليه فليدعُ بِهِ ربَّهُ عز وجل))، رواه أحمد(١/ ٤٣٧) ، والنسائي(٢/ ٢٣٨).

لەکوڕی مەسعودەوە وە (عبدالله) ﵁ هاتوە، کە وتویەتی: (( بەڕاستی محمدﷺ فەرمویەتی: (هەرکاتێ لە هەمو دوورکاتێکا دانیشتن، بڵێن: (التحيات... هتد)، واتە: هەمو جۆرە ڕێز و گەورەیی بۆ خوایەو، هەمو بەندایەتیەکان و هەمو کردارە چاکەکان هەر شایستەی مەقامی ئەون ـ لەمانای﴿إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي ﴾ی دایە و چەندین مانای تر کراون. ئەوەی وتمان: بەلامەوە جوانترین مانایە ئەو سەلامەی، کەشایستە بێت لە تۆ ئەی پێغەمبەری خواﷺ و بەزەیی خواو زیادەی بەرەکەتی ئەو بەسەرتا بڕژێت، سەلامی خوایش لەئێمەو لەهەمو بەندە چاکەکانی خوا بێت، لەناخی

دڵمەوە باوەڕم هەیە و بەزمانیش ئەڵێم: کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نی بێجگە لەخوا ـ الله ـ هەروەها شایەتی ئەدەم، کە محمد بەندەی ئەوەو نێراوی یەتی، لەپاشان هەرکام لە ئێوە کام دوعای بەلاوە جوانە و بەو دوعایە لەپەروەردگاری خاوەن دەسەلاَت و گەورە بپاڕێتەوە، واتە: سوننەتە لەباشی خوێندنی تەحیات دوعا بکرێت پێش سەلام دانەوە.

١٥٨-ن/٧٦٨( عن عبدالله بن بحينة: (( أَنَّ النَّبِيَﷺ قَامَ فِي الصَّلاةِ الظُّهْرِ وَعَلَيْهِ جُلُوسٌ فَلَمَّا أَتَّمَ صَلاتَهُ سَجَدَ سَجْدتين يُكبِّرو في كلِّ سَجَدَةٍ وهو جالسٌ قبل ان يُسلِّم وَسجَدَها النَّاس مَعَهُ مكان مأنسي مِنَ الجلوس)). رواه الجماعة إلا أحمد خ (١٢٢٤) م (٨٥/ ٥٧٠).

لە عبداللەی کوڕی بوحەینەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ لە دورکاتی نوێژی نیوە ڕۆ، کە دەبو دانیشتایە، هەستاوە کاتێ نوێژەکەی تەواو کردوو سوجدەی بردو بۆ هەمو سوجدەیەکیش الله أکبری ئەفەرمو، ئەمەش ـ بەدانیشتنەوە ـ پێش ئەوەی سەلام بداتەوە خەڵکیش لەگەڵ ئەودا سوجدەیان برد، لەباتی ئەو لەبیرچونەوەی دانیشتنە. واتە: هەر سوننەتێکی گرنگی نوێژ تەرك کرا، سوننەتە پاش تەحیات و پێش سەلام دانەوە دوسوجدە ببرێت، ئینجا سەلام بدرێتەوە وە سوننەتە بۆ هەمو سوجدەیەکیش ( الله أكبر) بکرێت. وأبو داود (١٠٣٤) و الترمذي (٣٨٩) و النسائي (٣/ ١٩) وابن ماجة(١٢٠٦،١٢٠٧).

١٥٩-ن/ ٧٧٢ ((عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَفتَتِحُ الصلاةَّ بِالتَّكْبِيرِ، وَالقِراءَةِ بـ(الحمد لله رب العالمين)وكانَ اذا ركع لم يرفع راسه ولم يُصَوِبْهُ وكان بين ذلك، وَكَانَ إذا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُجُودِ لَمْ يَسجدْ حَتَّى يَسْتوِيَ جَالِساً، وَكَانَ يَقُولُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ التَّحْيَةَ، وَكَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ اليُسْرَى وَيَنْصِبُ رِجَلَهُ اليُمْنَى وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عَقبَ الشّيْطَانِ، وَكَانَ يَنْهَى أنْ يَفْتَرِشَ الرَّجلُ ذِرَاعَيْهِ إفْتِرَاشَ السُبُعِ، وَكَانَ يَخْتِمُ الصَّلاةَ بِالتَّسْلِيمِ)) رواه

أحمد (٦/ ٣١، ١٧١، ١٩٤، ٢٨١)، ومسلم( ٢٤، ٤٩٨) ، وأبو داود( ٧٨٣)، و ابن ماجه (٨٦٩).

له خاتوعائیشەوە ﵂ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە (الله اكبر) دەست پێ ئەکردو قورئان خوێندیشی بە ( الحمد لله رب العالمين)و کاتێ، کە ئەچوە رکوعەوە، نەسەری بەرز ئەکردەوەو نەسەریشی شۆڕئەکردەوە، بەڵکو سەری ڕاستی پیشتی ئەگرت بۆ ڕاست گرتنی سەر، باتەماشای ئەژنۆی بکات، ئەگەر ئەژنۆی نەئەدی ئەوە سەری بەرزەو، ئەگەر پشتی ئەژنۆیی بەئاسانی ئەدی ئەوە سەری زۆر نزمە ، بەڵکو ئەگەر تەنها ئەژنۆ، کەبەدەستی گرتویەتی ئەبینی، ئەوە چاك وەستاوە ـ ئینجا خاتو عائیشە ﵂ ئەڵێ: پێغەمبەر لەنێوان بەرزونزمی دا بۆ سەری وەکو لەپێشەوە بۆمان باس کردن، هەرکاتێ سەری لەرکوع بەرز بکردایە نەئەچو بۆ سوجدە، تا بەتەواوی ڕاست نەوەستایایە، هەرکاتێ سەری لەسوجدە بەرز بکردایەوە، نەئەچو بۆ سوجدەی دەهەم، هەتا بەچاکی دانەنیشتبایە وەلەپاش هەمو دورکاتێك ـ تەحیاتی ئەخوێند وەلەو کاتەدا پێی چەپی ئەخستە ژێرخۆی و پێیی ڕاستی بەرزئەکردەوە سەر پەنجەکانی لەسەر زەوی دەچەسپاند ـ دانیشتنی شەیتانی قەدەغەکردوە ـ بەم شێوەیە، کە لەسەرهەردوو سمتی دانەنیشێ و ئەژنۆکانی بەرزبکاتەوە ـ بەرگری کردوە لەوەی، کە مرۆڤ ـ لەکاتی سوجدەکانیان ـ دەستی ڕاکێشێت وەکو دەست ڕاکێشانی دڕندەکان. لەوانە سەگ و لەفەرمودەی پێشوتر باسکراو کە پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی بەسەلام دانەوە دوا دەهێنا.

١٦٠-ن / ٧٨١((عن كعب بن عُجْرَةَ قال: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ قَد عَلِمْنَا أَوْ عَرَفنا ـ كَيْفَ السَّلامُ عَلَيكَ، فَكَيْفَ الصّلاةُ؟ قَالَ: قُولُوا اللّهُمَ صَلِّ على مُحَمد وَ علَى آلِ محمد كَمَا صَلَّيتَ على آل إبراهيمَ أنّك حميدٌ مَجِيد، اللَهُمّ بَارِكْ عَلَى مُحمد وَعَلَى آل محمد كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إبراهيمَ إنّك حَميدٌ مَجِيد)) رواه الجماعة إلا أنّ الترمذي قالَ فيهِ: ((عَلَى إبراهيمَ في الموضعين، ولم يذكر آله)).

له کەعبی کوڕی عوجرەوە هاتوە، کە وتویەتی: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی زانیمان، یان تێگەیشتین، کە چۆن سەلامت لێ بکەین، ئەدی سەڵاوەت لێدان

چـۆنە؟ فـەرموی: بڵـێ: ((اللـهم)) ئـەی خوایـە بەرەکـەت و ڕەحمـەتی خـۆت بڕژێنـە بەسەر(محمد) و ئالی(محمد)دا، وەکو چۆن ڕژاندوتە بەسەر ئالی ئیبراهیم دا، بەڕاسـتی تـۆ سوپاس کراوو گەورەیت، ئەی خوایە خەیر و بەرەکەتت بۆ سـەر (محمـد) و ئـالی (محمـد) زیاد بکە وەکو چۆنت کردوە بۆ ئال ئیبڕاهیم، بەڕاستی تۆ سوپاس کـراو و گـەورەیت ... ترمزی لە هەردوو شوێنەکەدا ــ ئیراهیم و ئالی ئیبراهیمی وتوە. وە ئـالی نـەوتوە، جـا بۆ کۆکردنەوەی هەردو ڕیوایەتەکەــ ئیبراهیم و ئـالی ئیـبراهیم لـە هـەردو شـوێنەکەدا بوترێت چاکترەــ والله أعلم.

لەم فەرمودەوە دەرئەکەوێت، کـە سـەڵاوات لێـدان لـە تـەحیات دا پێویـستە و لـە ڕیوایەتی تر دا هاتوە، کە وتراوە لە نوێژدا چۆن سەڵاوات لێ بـدەین فـەرموی: (قولواــ بڵێن) قولوا فرمانەو فرمانیش بۆ (وجوبە) پێویستە، واتە: سەڵاوات لێـدان بەوشـێوەیان شێوەی تر، کە لە ڕیوایەتی تر هاتوە پێویستە، والله أعلم.

خ (٤٧٩٧)م(٦٦/٥ ٤٠) وأحمـــــــد(٢٤١/٤، ٢٤٣)، وأبــــــو داود(٩٧٦)، والترمذی(٤٨٣)، والنسائي (٤٧/٣/ ٤٨)، وإبن ماجة(٩٠٤).

١٦١- ن/ ٧٨٥(( عن أبـی هريـرة قـال: ((قـال رسـول اللهﷺ: إذا فـرغ أحـدكم مـن التشهد فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْ أَرْبَعِ: من عَذَاب جهنم، ومـن عـذاب القـبر، ومـن فتنـة المحيـا والممات، ومن شَرّ المسيح الدجال))رواه الجماعة إلا البخاري والترمذي م(١٣/ ٢٨٨)

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەرکام لە ئێوە هەرکاتێ لەتەحیات بوەیەوە باپەنا بگرێ بە خوا لە چوار شت، لەسـزای دۆزەخ و لە سزای گۆڕ، لە بەڵاو تاقیکردنـەوەکانی ژیـان و مـردن و خراپـی و شـەڕی دەجـال)). دەکرێ ئەم چەندە وشەیەش زیاد بکات، چونکە لە ڕیوایەتی خاتو عائیشە هاتون((اَللّـهُم إنّي أعُوذُ بِكَ مِنَ المَغْرِمِ والمَـأثَمِ)) واتە: ئەی خوایە پەنا ئەگرم بە تـۆ لـە قـەرزاری و لـە تاوان.(٢/ ٢٣٧) ابو داود (٩٨٣)، والنسائی(٣/ ٥٨)، وإبن ماجة(٩٩)

١٦٢- ن / ٧٨٧((عن أبي بكر الصديقﷺ أنه قال لِرَسَـوُلُ اللهﷺ: علمـني دوعـاءً أَدْعُو بِهِ فِي صلاتي، قال: قل: (اللهم إني ظلمت نفسي ظُلْماً كثيراً، وَلا يَغْفِرُ الـذُّنُوبَ إلا أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إنَّك أَنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيم) رواه الجماعـة إلا أبـا داود

له ئەبو بەكری صدیقەوەﷺ هاتوه، كه وتویەتی به پێغەمبەری خوم گوتوه ﷺ، كه دوعایەكم فێر بكه، كه من له نوێژدا ئەو دوعایه بكەم.

فەرموی: بڵێ: خوا یەكیان به ڕاستی من ستەمم له خۆم كـردوه، سـتەمێكی زۆر ـ له هەندێ ریوایەتدا (كبيراً) گەوره هاتوه ــ وەكەس چاو پۆشی له تاوان ناكات، بێجگـه له تۆ، دەی لێم ببـوره بـه ڕەحمـی خـۆت وه بـه زەییـت بـەمن دابێتـەوه، لـه ركـوع و سجودەكان و پاش لێبونەوه له تەحیات و پێش سەلام دانەوه سونەته، والله أعلم. أحمـد (١/ ٣/ ٤،٧) خ (٨٣٤)، (٦٣٢٦)، (٧٣٨٨)م( ٤٨/ ٢٧٠٥) والترمـــــذي (٣٥٣١) والنسائی (٣/ ٥٣) وابن ماجه (٣٨٣٥).

١٦٣-ن/ ٧٩٥ ((عن ابن مسعود ان النَّبِيﷺ كان يُسلمُ عـن يمينـه وعـن يـسارِه: ( السَّلام عليكم و رحمة الله، السلام عليكم ورحمة الله، حَّتى يُرى بياض خَـدِّهِ. رواه الجماعـة البخاري، وصححَّه الترمذي.

لەكوڕی مەسعودەوه هاتوه، كه پێغەمبەرﷺ سەلامی بـەلای ڕاسـت و چـەپدا بـەم وشانه ئەدایەوه (السلام عليكم ورحمة الله) ئەوەنه لای ئـەكردەوه، كـه سـپیایی كـوڵمی دەبینـرا. وشـەی (وبَركاتُـهُ)یـش بۆترێـت چـاكتره.[1] رواه احمـد(١/ ١٤٤) م )١١٧) وأبوداود(٩٩٦) والترمذي (٢٩٥) والنسائي(٣/ ٦٣) وابن ماجه (٩١٤).

١٦٤ -ن/ ٨٠٣ ((عن ثوبان قال: كان رسول اللهﷺ اذا انصَرفَ مِـنْ صَـلاتِهِ اسـتغفَر ثَلاثاً، وقالَ: (( اللهم انتَ الـسّلام ومِنْـكَ الـسَّلام، تباركْتَ يـاذا الجـلال والإكـرام)). رواه

---

(١) ـ تەماشای شەرحی هەمان فەرموده بەژماری ٧٩٥، لەسەرچاوەی پێشو بكه.

الجماعـــــة إلا البخــــاري م/ (١٣٥/ ٥١٩) أحمـــــد (٥/٢٧٥)، ٢٧٩، ٢٨٠)، وابوداود(١٥١٣) والترمذي(٣٠٠) والنسائي(١٨/٣) وابن ماجه (٩٢٨).

له سەوبانەوەﷺ هاتوه، كه وتويەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەركاتێ سەلامی نوێـژی ئەدايەوە، سـێ جـار ئەيفـەرمو (اسـتغفر الله) خوايـە داوای لێ خۆشـبونت لێ ئەكـەم، ئەيفەرمو (اللهم انت السلام ومنـك الـسلام ئـەی خوايـە تـۆ هێـور كـەرەوەو ئاسـايش كەرەوەی هەمو گيانلەبەرێكی و هەربەهۆی تۆوە هێوری و ئاسايشی پەيدا ئەبێ، خاوەنی خێری زۆری ئەی خاوەن دەسەڵاتی خاوەن ڕێز. چەندين زكری تر هاتون لەحەديسی تـردا، كە پێويست بەنوسين ناكات، چونكە لەشوێنی تر هەنـدێكيان نوسـراون و لـەناو خـەڵكا ئەكرێن وەكو ٣٣ جار (سبحان الله و الحمد لله و الله اكبر و) دەجـار ( لا الـه الا الله) و زكری تريش ڕاست و دروستن چاكە ئەنجامدانيان، لەڕيوايەتی خاتون عائيشەدا هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ پاش نوێژ هەرئەوەندە، تا ئەو زكرەی سـەرەوەی بكردايـە لـەجێگای نوێـژ دائەنيشت.

١٦٥- ن/٨١٧((عَنْ قُصَةَ بن هلَب عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهﷺ يَؤُمُّنَـا فَيَنـصَرِفُ عَــنْ جَانِبيــهِ جَمِيعــاً عَلَــى يَمِنيــهِ، وَعلَــى شِــمالِهِ)) رواه أبــو داود(١٠٤١)، وإبــن ماجة(٩٢٩)، والترمذي(٣٠١)، وقال: صَحَّ الأمرانِ عَنِ النَّبِيﷺ.

له قوبەيسەی كوڕی هيلبەوە لە باوكيەوە هاتوە، كە وتويەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ ئيمامەتی بۆ ئەكردين، پاشان گەڕايەوە بە هەر دو لای دا ــ لای ڕاست و لای چەپی ــــ واتــە: پــاش لێ بونــەوە لــە نوێــژ گەڕانــەوە بــە هــەردو لادا ســونئەتە، چــونكە پێغەمبەرمانﷺ بەهەردو لادا گەڕاوەتەوە.[1]

١٦٦-ن /٨٢١((عن صَفيةَ، قالت، دَخَلَ عليَّ رسول اللهﷺ وبين يديَّ اربعُ آلاف نـواة أُسَبحُ بها فقال: (( لقد سبحت بهذا، الا أعلمك باكثر مما سبحت بهِ؟! فقالت: ((علمني))

(١) ـــ تەماشای شەرحی هەمان فەرمودە(٨١٥ـ ٨١٦) لە سەرچاوەی پێشو بكە.

فقال: ((قولي: سبحان الله عَدَد خلقهِ)) رواه الترمذي (٣٥٤).

له‌خاتو سه‌فیه وه هاتوه، كه وتویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خواﷺ هاته لام له‌وكاته‌دا چوار هه‌زار ـ ناوكی ـ خورمام لابو ته‌سبیحاتم پـێ ئـه‌كرد، فـه‌رموی: (( بـه‌وه ته‌سـبیحاتت كردوه، ئایا فێری شتێكت نه‌كه‌م، كه زۆر بێ لـه‌وه‌ی، كـه ته‌سـبیحاتت كـردوه؟! وتـی: ((فێرم بكه) فه‌رموی: بڵـێ: سـبحان الله عـدد خلقـه)) پـاكی و بـێ عـه‌یبی بـۆ خـوا به‌ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی هه‌مو دروستكراوه‌كان.

له‌م فه‌رمودانه‌دا ئه‌مانه وه‌رئه‌گرین.

١ـ دروسته ته‌سبیحات به‌ته‌سبیح وشتی تریش بكرێت، هه‌رچه‌نده چاكتروایه به‌په‌نجـه بێت، چـونكه شـایه‌تی ئـه‌ده‌ن له‌سـه‌ر ئـه‌و ته‌سـبیحاته لـه (ڕۆژی قیامـه‌ت دا وه‌كـو له‌فه‌رموده‌ی (فأنهنَّ مسئولاتٌ مُستَنطِقات) به‌ڕاستی ئـه‌وان پرسـیار لێ كـراون و داوای قسه‌یان لێ ئه‌كرێت) دا هاتوه.

٢ـ ئه‌گه‌ر ئینسان زكرێكی كردو وتی: به‌ئه‌ندازه‌ی هه‌رشـتێ ئـه‌وه‌ی بـۆ ئه‌نوسـرێت، والله أعلم.

١٦٧-ن/٨٢٢ ((عن زيد بن أرقم قال: كُنَّا نتكلَّمُ في الصَّلاة، يُكلِّمُ الرَّجُلُ منَّا صاحِبهُ وَهو الى جنبِهِ في الصلاةِ حَتىَّ نزلَتْ: (( وَقوموا للهِ قَانتين) فَأُمرْنَا بِالسُكوت، وَنُهِينَا عَنِ الكلام. رواه الجماعة الا ابن ماجه. والترمذي فيه: (( كُنّا نـتكلَّمُ خَلْـفَ رَسُـولِ اللهِﷺ في الصّلاةِ)) (٤/ ٣٦٨). خ/ ١٢٠٠) م/ ٣٥/ ٥٣٩).

له زیدی كوڕی ئه‌رقه‌مه‌وه هاتوه، كه وتویه‌تی: ئێمه له‌نوێژدا قسه‌مان ئه‌كرد، پیـاو بو له‌ئێمه قسه‌ی ده‌كرد له‌گه‌ڵ ره‌فیقه‌كه‌یدا، كه له‌ته‌نیشتیا بو له نوێژدا، تا ئه‌م ئایه‌تـه هاته خواره‌وه( بوه‌ستن بۆ خوا بێ ده‌نگانه)، جا فرمانمان پێ كرا به‌بێ ده‌نگی له نوێـژدا، به‌رگری كراین له‌قسه... له ڕیوایه‌تی ترمزی داوای تێـدا هـاتوه، كـه ((ئێمـه قـسه‌مان ئه‌كرد له پشتی پێغه‌مبه‌ری خواﷺ له‌نوێژدا.

١٦٨-ن/ ٨٢٥((عن ابي هريرةﷺ قال: قام رسول اللهﷺ الى الصلاة وَقُمنا مَعَهُ، فقال: اعرابيٌّ و هو في الصلاة: اللهم أَرْحَمْنِي و محمداً، ولا ترحم معنا أحَداً، فَلَمَا سَلَّم النَّبِي قال للاعرابي: (( لقد تحجَّرتَ واسعاً)) يُريدُ رحمةَ الله. رواه الجماعة الا مسلما وابن ماجه.

لەئەبو هریرەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەڵسا بۆ نوێژ لەگەڵیا، ئێمەش هەڵساین عەرەبێکی دەشتەکی، کە لەو نوێژەدابو وتی: ئەی خوایە بەزەییت بێت بە من و بە(محمد)داﷺو لەگەڵ ئێمەدا بەزەییت بەهێچ کەسێکی تردانەیەتەوە، کاتێ پێغەمبەرﷺ سەلامی دایەوە، بەکابرای عەرەبی فەرمو: بەڕاستی فراوانەکەت تەسك کردەوە، واتە سۆزو فراوانی ڕەحمەتی خوات کەمکردەوە، ئەبوایە داوای سۆزو بەزەیت بۆ هەمو خوشك و برا موسڵمانەکانت بکردایە، ئەمە ئەکری بەبەڵگە ئەگەر بەنەزانی دوعایەکی ناڕەوایی لەناو نوێژدا کرد، نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، چونکە پێغەمبەری خواﷺ بەو کابرایەی نەفەرمو نوێژەکەت بکەرەوە.

أحمد( ٢٣٩/٢)خ (٦٠١٠)وأبو داود(٣٨٠)والترمذي (١٤٧) والنسائي( ١٤/٣).

١٦٩-ن/ ٨٢٨((عن عبدالله بن الشّخير قال: (( رَأيتُ رَسولَ اللهﷺ يُصلّيَ وَفي صدرِهِ ازيز كأزيز المرجَل مِنَ البُكاءِ)). رواه الخمسة الا ابن ماجه.

لەعبداللە ی کوڕی شەخیرەوە هاتوە، کە وتویەتی: (( چاوم بەپێغەمبەری خواﷺ کەوت، کە نوێژی دەکرد لەبەرگریان لەسنگی قورتە قورت ئەهات وەکو قورتە قورتی قابلەمەی شێوی سەر ئاگر). واتە: گریانی ناو سنگ و، دەنگە دەنگی ناو سنگ، گریان نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵکو ئیشێکی باشیشە، والله اعلم.

١٧٠- ن/ ٨٣١((عن سهل بن سعيد عن النَّبِيﷺ قال: (( من نا بَهُ شَيْءٌ في صَلاتهِ فليُسبِّحْ، فَإنَّما التَّصْفِيقُ للنسّاء سَجْدَتَيْنِ، وهُوَ جَالِسٌ)) أخرجاه: رواه الجماعة إلا الترمذي ، احمد (٣٣٧٥) خ /٦٨٤م (١٠٢/ ٤٢١)، رواه ابو داود(٩٤٠) والنسائي(٧٧،٧٨/٢) وابن ماجه(١٠٣٥). لەسەهلی کوڕی سەعدەوەﷺ هاتوە، کە

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (( هەرکەسێك شتێ روی دا بۆی لەنوێژدا باسُبحان الله ی بکات، چەپەڵێدان بۆ ئافرەتانە، واتە: سوننەتە پیاو(سُبحان الله) بکات و ئافرەتان بەری دەستی ڕاستیان لەپشتی دەستی چەپیان بدەن، خەڵکەکەی ترئاگادار ئەبنەوە.

١٧١- ن/٨٦١((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنّ النَّبِيﷺ قالَ: إذا نُودِيَ بالصَّلاةِ أَدْبَرَ الشَيْطَانُ، وَلَهُ ضُراطٌ حَتّى لا يَسْمَعُ الآذان، فإذا قُضِيَ الآذانُ أَقْبَلَ، فَإذا ثُوِّبَ بِهَا أَدْبَرَ، فَإذا قُضْيَ التَثوِبُ أَقْبَلَ حَتّى يَخْطُر بَيْنَ المَرءِ، وَنَفْسِهِ، يَقُولُ: اذْكُرْ كَذا اذْكُرْ كَذَا، لِما لَمْ يَكُنْ يَذكُرُ؛ حَتّى يَضِلَّ الرَّجُلُ إنْ يَدْري كَمْ صَلَّى، فَإذا لَمْ يَدْرِ أَحَدُكُمْ ثَلاَثاً صَلَّى أَوْ أَرْبَعَاً فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَينِ وهو جاليسٌ))، وقال البخاري: قال عمر إنِّي لأجَهز جيشى، وأنا في الصّلاة. خ/٦٠)م (٣٨٩/١٩).

له ئەبو هورەیرەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێ بانگ کران بۆ نوێژ شەیتان پشت تێ دەکات و تڕ دەکەنێ ، تا گوێی لە بانگ نەبێ، کاتێ بانگ دوای هات دێتەوە جاهەرکاتێ قامەت کرا دیسان پشت تێ دەکات، هەرکاتێ قامەتیش دوای هات دێتەوە، تا خەیاڵ لە نێوان کابرای نوێژکەرو دڵیا دروست بکات، ئەڵێ: یادی ئەوە بکە ــ ئەیخاتەوە بیری ــ ئەوەی، کە لە پێشەوە لە بیریا نەبوە، تا مرۆڤ وای لێ دێ نازانێ چۆنی نوێژ کردوە، جا هەرکام لە ئێوە وای لێ هات نەیزانی سێ ڕکات نوێژی کردوە، یان چوار با لەو کاتەی، کە دانیشتوە دو سوجدە ببات، واتە: بەو خەیاڵ و خەتەرانە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە، وەکو ئیمامی بوخاری لە پێشەوای باوەڕدارانەوە عومەری کوڕی خەتابەوە دەگێڕتەوە، کەوتویەتی: من کارو باری سوپا ڕێك ئەخەم لە کاتێکدا، کە لە نوێژدام، واتە: ئیشی دڵ نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، والله أعلم.

١٧٢-ن/ ٨٣٩ ((عَنْ عَوْفِ بن مَالِك، قَالَ: قُمْتُ مَعَ رَسُول اللهﷺ فَبَدأَ فَاسْتَاكَ وَتَوَضَّأَ، ثُمَ قَامَ فَصَلَى فَبَدَأ فَاسْتَفتَحَ((البَقَرة)) لا يَمْرُ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إلا وَقَفَ فَسَأَلَ، قَالَ: وَ لايَمُرُّ بِآيَةِ عَذابٍ إلا وَقَفَ فَتَعَوَّذَ، ثُمَّ رَكَعَ فَمَكَثَ رَاكِعاً بِقَدرِ قِيامِه يَقُولُ فِي

رُكُوعِهِ(سُبْحَانَ اللهِ ذِي الْجَبْرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ والْكِبرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ) ثُمَّ سَجَدَ بِقَدَرِ رُكُوعِهِ، يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: ((سُبْحَانَ اللهِ ذِي الْجَبْرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ والْكِبرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ) ثُمَّ قَرأَ(آلِ عِمران) ثُمَّ سُورَةً سُورَةً، ثُمَّ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ)) رواه النسائي(٢/ ٢٢٣)، وَ أبو داود وَلَمْ يَذْكُرْ الْوُضُوءَ، وَالسِوَاكَ. (٨٧٣).

لە عەوفی کوڕی مالیکەوە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ شەو لەگەڵیدا هەستام، یەکەمجار سیواکی کرد و دەستنوێژی گرت، ئینجا هەستا نوێژی کرد، ئەوسا دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی بەقەرە بەسەر هیچ ئایەتێکی ڕەحمەتدا تێ نەدەپەڕی هەتا ئەوەستاو داوای دەکرد، وتی: بەسەر هیچ ئایەتێکی سزادا تێ نە دەپەڕی، هەتا ئەوەستاو پەنای بە خوا دەگرت، لە پاشان ئەچوە رکوعەوە بە ئەندازەی وەستانەکەی ئەمایەوە، لە رکوعەکەیدا ئەیوت: (پاك و بێ گەردە ئەو زاتەی، کە خاوەنی هێزو دەسەڵاتەو خاوەنی موڵك و گەورەی و عەزەمەتە) لە پاشان سوجدەی ئەبرد بە ئەندازەی رکوعەکەی و لە سوجدەکەیدا ئەیوت: (پاك و بێ گەردە ئەو زاتەی، کە خاوەنی هێزو دەسەڵاتەو خاوەنی موڵك و گەورەی وعەزەمەتە) لە پاشان (ئالی عیمرانی) خوێند لە پاشان سورەت سورەتی ئەخوێند، لە پاشان هەروەکو ئەوەی ئەکرد.

١٧٣-ن/ ٨٤٠ ((عَنْ إبنِ عمرِ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ لِبِلالٍ كَيْفَ كَانَ رَسول اللهِﷺ يُرَدُّ عَلَيْهِمْ حِينَ كَانُوا يُسَلِّمُونَ عَلَيْهِ، وَهُوَ فِي الصَّلاةِ؟ قَالَ: يُشِرِ بِيَدِهِ)) رواه أحمد(٦/ ١٢)، وأبوداود(٩٢٧)، والترمذي(٣٦٦).

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە هاتوە، کە وتی: وتم بە بیلال، پێغەمبەری خواﷺ چۆن وەڵامی ئەدانەوە، کاتێ لە نوێژدا سەلامیان لێ ئەکرد ؟ وتی: بەدەست هێمای بۆ ئەکردن)).

١٧٤- ن/٨٤٣ ((عَنْ عَائشة قَالَتْ سَأَلْتُ رَسُول اللهِﷺ عَنِ التَّلَفُتِ فِي الصَّلاة فِي الصَّلاةِ؟ فَقَالَ: ((إِخْتِلاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَيْطَانُ مِنَ صَّلاةِ العَبْدِ)) رواه أحمد(٦/ ٧٠) والبخاري(٧٥١)، أبو داود(٩١٠)، والنسائي(٨/٣). لە خاتون عائیشەوە هاتوە، کە

وتویەتی: لە پێغەمبەری خواﷺ پرسیاری تەماشاكردنی ئەم لاو لام لە نوێـژدا كـرد؟ فەرموی: فڕاندنێكی شەیتانە لە نوێژی بەندەدا، واتە: ئەو تەماشاكردنە بەم لادا لاو لـە نوێژدا خەیری نوێژ كەم ئەكاتەوەو، ئیشەكە ئیشی شەیتانە.

١٧٥- ن/ ٨٤٦ ((عَنْ أَبِي سَعْيدٍ أنّ النَّبِيﷺ قالَ: ((إِذا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي المَسْجِدِ فَـلا يُشَبِّكَنّ؛ فَإِنَّ التَّشْبِيكَ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لا يَزالُ فِي صَلاةٍ مَادامَ فِي المَسْجِدِ حَتّى يَخْرُجَ مِنْهُ)) رواه أحمد(٤٣/٣).

لە باوكی سەعیدەوە هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەركات یەكێك لە ئێـوە لە مزگەوت دابو با پەنجە نەكات بـەناو یەكـدا، چـونكە پەنجـە كـردن بـەناو یەكـدا لـە شەیتانەوەیە، تا لە مزگەوت دابن ــ هەروەكوــ لە نوێژدابن وایە، هەتا لە مزگـەوت دا دێنە دەرەوە.

١٧٦- ن/٨٥٦((عَـنْ أَبـي رافـعٍ قَـالَ نَهَـى النَّبِـيُﷺ أَنْ يَـصَلِّيَ الرَّجُـلُ، وَ رَأْسُـهُ مَعْقُــوصٌ)) رواه أحمــد(٨/٦، ٣٩١) وإبــن ماجــة(١٠٤٢)، وَأبــو داود(٦٤٦)، والترمذي(٣٨٤)

لە باوكی ڕافعەوە هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەرﷺ بەرگری كردوە لەو پیاوەی، كـە نوێژ بكات و قژ(پرچ)ی كردبێ بەپەلكـە(كـەزی) ولـە پـشت سـەریەوە بێـت، واتـە قـژ كردنەكەزی بۆ پیاو لە نوێژدا حەڕامە، بەڵام بۆ ژن قەیناكات. والله أعلم.

١٧٧- ن/ ٨٥٧((عَنْ أَبِي هُورَيْرَة، وَأَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ رَسُولُ اللهﷺ رَأى نخامةً فِي جِدارِ المَسْجِد، فَتَنَاوَلَ حَصَاةً فَحَتَّهَا، وَ قَالَ: إِذا تَنَخَمَ أَحَدُكُمْ فَلا يَتَنَخَمْنَ قِبَـلَ وَجْهِـهِ، وَلا عَـنْ يَمِنِهِ؛ وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ، أَو تَحْتَ قَدَمِهِ اليُسْرى)) أخرجاه خ (٤١٦)م (٥٣/ ٥٥٠)

لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ چـاوی كـەوت بـە بەڵغـەمێك بـە دیواری مزگەوتەوە بـو، جـا بـەردێكی هـەڵگرت لـە دیوارەكـەی كڕانـدەوەو فـەرموی: هەركاتێ یەكێك لە ئێوە بەڵغەمی فڕێدا، با بـەرەو بـەردەمی، یـان لای ڕاسـتی فڕێـی

نەدات، بەڵکو بەلای چەپیدا، یان ژێر پێی چەپی ــ ئەگەر ئەگونجا ــ فڕێی بدات.[١]

١٧٨- ن/٨٥٩((عَنْ أَبِي هُورَيرة: أَنَّ النَّبِيﷺ أَمَرَ بِقَتْلِ الأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلاةِ: الْعَقْرَبُ، وَالْحَيَةُ)) رواه أحمد(٢/٢٣٣)، والترمذي(٣٩٠)، وابو داود(٩٢١)، وإبن ماجة(١٢٤٥)

لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فرمانی داوە بە کوشتنی دو ڕەشەکان لە ناو نوێژدا: دوپشك ومار)). واتە: ئەو جموجوڵەی لەو کاتەدا بکرێت بۆ کوشتنی ئەو دوانە، نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

١٧٩- ن/ ٨٦٣ ((عَنْ أَنَسﷺ أنّ النَّبِيﷺ قَنَتَ شَهْراً يَدْعو عَلى أحياءٍ مِنْ أَحْيَاءِ العَرَبِ ثُمَ تَرَكَهُ. رواه أحمد(٣/ ١١٦)ومسلم، والبخاری ٢/ ٢٠٠مِنْ طريق إبن ماجة م(٢٩٩/ ٦٧٧)خ (٤٠٩٤)

لە ئەنەسەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ مانگێك قنوتی خوێند و دوعای لە چەند تیرەیەکی عەرەب ئەکرد، کە کۆمەڵێ لە قورئان خوێنیان بە فڕو فێڵ شەهیدکردبو، لە پاشا وازی لێ هێنا. واتە قنوت بەو شێوەی، کە ئەمڕۆ باوە، پێغەمبەرﷺ نەیخوێندوەوئەوفەرمودانەی لە بارەی خوێندنی قنوتەوە گرێی تری لێ پەیدا ئەبن، چاك وایە بۆ ئەنجامدانی سوننەتێك دەیان فەرز لە دەست خۆ نەدەین و، بۆ بیدعەیەك دەیان سوننەت پشت گوێ نەخەین و، هەوڵی فەرزەکان بدەین و واز لە قەدەغەکان بهێنین، کە

تێبینی:

١ــ پێغەمبەری خواﷺ خۆی ئەوشتە قێزەونەی لە مزگەوت لابرد پاشان خەڵکی ڕێنمایی ئەکات چاك وردبەرەوە.

٢ــ ئەگەر کەسێك لە نوێژدابو ناچار بو بەبەڵغەم فڕێدان و لە چیاو چۆڵێك دا بو، ئەوە ئەتوانێ بەلای چەپدا لا بکاتەوە بۆ فڕێدانی، یان بیکاتەوە ژێر پێیەوە، بەڵام ئەوکارە لەمزگەوتدا نابێت، بەڵکو پێویستە، یان خۆی بگرێ، تاکو لەنوێژ ئەبێتەوەو پاشان فڕێی جێگایەکەوە، کە ئازار بۆ خەڵك دروست نەکات.

لە دوو وشەی قورئانی پیرۆز کۆتایی دێت: ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ ﴾ ئەگینا حاڵمان لە ئێستە خراپتر ئەبێ‌و چاکتر نابێ، والسلام على عبادالله الصالحين.

١٨٠- ن/ ٨٦٤ ((وَعَنْـهُ قَـالَ: كَـانَ القُنُـوتُ فِـي المَغـرب، والفجـر. رواه البخـارى خ(٧٩٨) هەر لەوەوە هاتوە، کە زۆر قنوت لە نوێـژی مـەغریب و بەیانیـدا بـوە، واتـە: پاشان لە مەغریب دا بە ئیتفاقی زانایان لە مـەغریب دا هـەڵگیراوەو، طـەحـاوی ئـەوە ئەکات بە بەڵگە، کە گوایە هەروایش لە نوێژی بەیانیدا هەڵگیراوە. والله أعلم.

١٨١- ن/ ٨٧٦ ((عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبيِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إذا صَلَّى أحدكم فَلْيَجْعَلْ تِلْقاءَ وَجْهِهِ شيئاً، فإذا لَمْ يجد فَلْيَصُبْ عَصًا فَإِنّ لم يكـن مَعَـهُ عَـصاً، فَلْـيَخُطْ خَطَـاً، وَلا يَضُرُهُ ما مَرَ بَيْنَ يَدِيهِ. رواه أحمد

هەر لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویـەتی هـەرکاتێ یـەکێك لـە ئێوە نوێژی کرد، باشتێك بخاتە بەر دەمی خۆی و بیکا بە پەردەیـەك لـە نێـوان خـۆی و خەڵکیدا، ئەگەر شتی گەورەوچاکی دەست نەوکەوت، بادارێك لەبەر دەمیـدا بکوتێـت، ئەگەر داریشی پێ نەبو، باخەتێك بکێـشێ، زیـان بەوەناگـەینێ ئـەوەی، کـە لـە پـێش دەمیدا هاتو چۆ بکات. واتە: ئەگەر وای نەکردو گرنگی بەجێگاو چـۆن وەسـتان و ئـەو پەردەیە نەدا، هەرچی بەبەردەمیا هاتو چۆ بکات، لە خەیری نوێژەکەی کەم ئەکاتـەوە، وەکو لە لێکدانەوەی باقی فەرموودەکانی تری پەردە دەردەکەوێت، والله أعلم.

١٨٢- ن/ ٨٨٠ ((عَنْ أبي سعيد قال: سَمِعْتُ النَّبيِ ﷺ يَقُولُ : إذا صَلَى أَحَدُكُم إلى شَئٍ يَسْتُرُه مِنَ النّاسِ، فَأَرادأحدٌ أنْ يَجتاز بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعَهُ، فَإِنْ أبى فَلْيُقَاتِلْهُ فإنّما هُـوَ شَيْطانٌ. رواه الجماعة إلا الترمذي.

لە کوڕی سەعیدەوە رضي الله عنه هاتوە، کـە وتویـەتی: گوێبیـستی پێغەمبـەر بـوم ﷺ، کـە ئەیفەرمو: هەرکاتێ یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد بەرەو شتێك، کە لە خەڵك ئەیـشاردەوەو کەسێك ویستی لە پێش دەمیەوە تێ پەڕێت، بانەیەڵێت، جـا ئەگـەر هـەر ویـستی تـێ

پەڕێت باشەڕی لەگەڵ بکات، چونکە ئەوە بێجگە لە شەیتان، شتێکی تر نیە. لێرەوە دەردەکەوێت، کە ئەم بەرگری کردنە وەختێك ئەبێ، کە کابرای نوێژکەرپەردەی (ساتر) هەبێت، دەرئەکەوێت، کە ئەو لە بەردەم ڕۆیشتنەی نوێژکەر تاوانە، وەکو لە فەرمودەیەکی تردا هاتوو، جا هەبێ یان نەء[١]، بەڵام بەتاڵ نابێتەوە.

أحمد(٦٣/٣)خ (٥٠٩) م (٥٠٥/٢٥٩) أبو داود(٧٠٠)، والنسائي(٦٦/٢)، وإبن ماجة(٩٥٤)

١٨٣- ن/٨٨٣ ((عَنْ عائشة رضي الله عنها قَالَتْ: ((كَانَ رسول الله ﷺ يُصَلِي صَلاتَهُ مِنَ الليل، وأنا مُعْتَرِضَةٌ بينه وَبَيْنَ القِبْلَةِ إعْتِرَاضَ الجنازة، فأراد أن يُوتِرَ أَيْقَظَنِي فَأَوْتَرْتُ)) رواه الجماعة إلا الترمذي. أحمد(١٢٦/٦)، وأبو داود(٧١٢)، (٧١٤)، والنسائي(١٠١/١، ١٠٢)، وإبن ماجة(٩٥٦).

له خاتو عائیشەوە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا نوێژی خۆی ئەکرد من لەو کاتەدا لە بەردەمیا لە نێوان ئەو و قیبلەدا م وەکو جەنازە (تەرم) ڕاکشابو، هەرکاتێ بیویستبایە ویتر بکات، منیشی بە ئاگا ئەهێنایەوەو ویترم ئەکرد، واتە: ڕاکشانی ئافرەت لە پێش دەم پیاودا نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، هەروەها لەم فەرمودەوە دەردەکەوێت، کە پێغەمبەر ﷺ ویتری ئەخستە ئاخیری شەونوێژەوە سوننەتە پیاو خێزانی خۆی بە ئاگا بکاتەوە بۆ وەتر، ئەگەر پێش خەوتن نەیکردبو، جا ئەو فەرمودانەی، کە وای ئەگەیەنن، کە هاتوچۆی ئافرەت بە تایبەت، ئەگەر لە عوزرا بێت نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە، بەمانای کەم کردنەوەی خێری نوێژە، لەوانە.

١٨٤- ن/ ٨٨٦ ((عَنْ أَبِي هوريرة رضي الله عنه أنّ النَّبِي ﷺ قال: ((يَقْطَعُ الصّلاة: المَرأَةُ، وَالْكَلْبُ، والحِمَارُ)) رواه أحمد(٤٢٥/٢)، إبن ماجة (٩٥٠)، ومسلم، وزاد((وَبقيَ مِنْ ذلك مِثلُ مُؤَخِرَةِ الرّحِل )) م (٢٦٦/ ٥١١).

---

(١) ــ تەماشای ڕاڤەی فەرمودەی ٨٨١ سەرچاوەی پێشو بکە خ (٣٨٣/ ٥١٣)م (٢٦٨/ ٢٨٩)

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: نوێژ بەئافرەت و سەگ و کەر دەبڕێت لە ڕیوایەتی ئیمامی موسلیم دا ئەم زیادە لەگەڵ هاتوە، کە ((نایەڵێت بچڕێت، ئەگەر بەندازەی پاشکۆی سوارێك لە بەردەم نوێژ کەر دابێت، واتە ئەمانە خێری نوێژ کەم ئەکەنەوە، ئەگەر نوێژکەر شتێکی لە پێش دەم خۆیدا دانەنێت. بەڵێ لەم بارەیەوە زانایان زۆر مشت و مڕو ناکۆکیان هەیە، بەڵام ئەوەی وتمان شتێکە بەلامانەوە وایە ڕاسترین بۆچونە لەم بارەیەوە[1]، والله أعلم بە تایبەت فەرمودەی((لا يَقْطَعُ صلاةَ مسلم شيءٌ. هیچ شتێك نوێژی موسڵمان بەتاڵ ناکاتەوە، دارەقوتنی لە سوننەکەیدا،(١/ ٣٦٨) گێڕاویەتیەوە إسناده صَحيحٌ.

١٨٥- ن/ ٨٩٢ ((عَنْ عبدالله بن عمر ﴿رضي الله عنه﴾ قَالَ: حَفظْتُ عَنْ رسول اللهِ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُهْرِ، رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُهْرِ، وَ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ العشَاء، وَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الغَداة، كَانَتْ ساعَةً لا أَدْخُلُ عَلَى النَّبِيﷺ فِيها فَحَدَّثتني حَفْصَةُ: أَنَّهُ كانَ إذا طلع الفَجْرُ، وَ أَذَنَ المؤذِنُ صَلّى رَكْعَتَيْنِ)) أخرجاه خ (٩٣٧)م(١٠/ ٧٢٩)

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: لەبەرم کردو زانیم لە پێغەمبەری خواوەﷺ، کە دو ڕکات نوێژی سوننەتی کردوە پێش نوێژی نیوەڕۆ، دو ڕکات پاش نوێژی نیوەڕۆو دو ڕکات پاش عیشاو، دو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، ئەوە کاتێ بو، کە من نەم ئەتوانی بچمە لای پێغەمبەرﷺ، لەو کاتەدا حەفسەی خوشکم وتی: ئەو کاتی سپێدەی دەمی بەیانی پەیدا ئەبو بانگ وێژ بانگی ئەوت دو ڕکات نوێژی ئەکرد، ئەم دەرکات نوێژە، عەبدوڵا لە پێغەمبەریﷺ وەرگرتوەو چەندین سوننەتی تر هەن، کە ئێمە هەندێکمان لە گوڵزاری چاکان دا باسکردوە لێرە دوبارەی ناکەینەوە.

---

(١) ـ بۆ زیاتر تێگەیشتن تەماشای ڕاڤەی هەمان فەرمودە لە سەرچاوەی پێشو بکەن.

١٨٦- ن/ ٨٩٤ ((عَنْ أم حبيبة بنت أبي سفيانرضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قال: ((مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ، وَلَيْلَةٍ ثِنْتَي عَشَرَ سَجْدَةً سوى الْمَكْتُوبَةِ بُنْيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الجَنَةِ)) رواه الجماعة إلا البخاري، والترمذي(١٠٣/ ٧٢٨)

له خاتو ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانەوەرضي الله عنهما هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی هەرکەسێك لە ڕۆژو شەوێکدا دوانزە رکات نوێژ، بێجگە لە فەرزەکان بکات، ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست ئەکرێت، جا هەندێك ئەو دە ڕکاتەی سەرەوەیان وتوە، بەڵام وتویانە چوار ڕکات لە نوێژی نیوەڕۆ و هەندێکیشیان وتویانە: دو ڕکات پێش عەسریش، بەڵام باسی دورکاتی پاش عیشایان نەکردوە جا ئەوەی ئەیەوێ لەو خێرە بێ بەش نەبێت با (١٤) رکات بکات، با چوار رکاتی پێش نیوەڕۆ دوڕکاتی پێش عەسر ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەو قسە لائەبات، کە ئەڵێت: پێش عەسەر سوننەت نیە، زیاتر لە مەش لە گوڵزاری چاکان باسکراوە باتەماشای بکەن.

١٨٧- ن/ ٩٤٩ ((عَنْ أَبِي هوريرةرضي الله عنه قالَ سُئِلَ رسول اللهﷺ أَيُ الصَّلاة أَفْضَلُ بَعْدَ الَمكْتُوبَةِ؟ قَالَ: الصَّلاةُ فِي جَوْفِ اللَيْلِ، قَالَ فَأيُ الصِّيَامِ أفَضَلُ بَعْدَ رَمَضَانَ؟ قَالَ شَهْرُ اللهِ الُمحَرَمُ. رواه الجماعة إلا البخاري، ولابن ماجة منه فَضْلُ الصَّوم فقط.(٢٠٣/ ١١٦٣)).

له ئەبو هورەیرەوەرضي الله عنه هاتوە: لە پێغەمبەری خواﷺ پرسیارکرا، کام نوێژ بەخێرو بەرەکەت ترە بێجگە لە نوێژە فەرزەکان؟ فەرموی: (نوێژی ناو شەوێ، وتی: کام ڕۆژو بەخێرو بەرەکەت ترە، پاش ڕەمەزان؟ فەرموی: مانگەکەی خوا موحەرەم. لە ڕیوایەتی ئیبنو ماجەدا تەنها باسی گەورەو ڕێزی ڕۆژوکراوە.

١٨٨- ن/٩٦٤ ((وَعَنْهُ أنَّ النَّبِيﷺ قَالَ لبلال عِنْدَ صَلاةِ الصُبح: يَا بِلال حَدِّثني بأرجى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإسلام، فإنِّي سَمعتُ دَقَ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيّ فِي الجَنَةِ؟ قَالَ مَا عَمِلْتُ عَمْلاً أَرْجَى عِنْدِي أَنّي لَمْ أتَطَهَّرْ طُهُوراً فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيلٍ أَوْ نَهَارٍ، إلا صَلَّيْتُ بِذلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّي)) مُتَفَقُ عليه، أحمد(٢/ ٣٣٣، ٤٢٩)خ (١١٤٩)م (٢٤٥٨). هەر لەوەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ : بە بیلالی فەرموو: لە کاتی نوێژی

بەیانیدا: بیلال! پێم بڵێ كام كردەوەت لە ئیسلام دا كردوە، زیاتر چاوەڕێی چـاكەی لێ ئەكرێت، من لەبەهەشت گوێم لە خشەی نەعلەكانتــەوە بــو لــە پــێش دەممـدا واتــە: لــە خەوداو خەوی پێغەمبــەران ڕاســتن، بــیلال وتــی: هــیچ كردەوەیــەكم نــەكردوە زیــاتر چاوەڕانی چاكەی لێ بكەم، بێجگە لەوەی، كە مــن هیــچكاتێك نــە لەشــەو و نەلــە ڕۆژدا دەست نوێژم نەگرتوە، مەگەر بــەو هۆیــەوە ئــەوەی خــوا بــۆی نویــسیوم نوێــژم پێوەكردوە، واتە: سوننەتە نوێژی دەست نوێژكردن و خۆشۆردن لە هــەمو كاتێكـا، والله أعلم.

١٨٩- ن/٩٦٥ ((عَنْ جابر بن عبداللهﷺ قَالَ كَانَ رَسُـول اللهﷺ يُعَلِّمُنَـا الإسْـتِخَارَةَ فِي الأمُورِ كُلِّهَا كَمَا يُعَلِّمُنَا السُورة مِنَ القـرآن يَقُـولُ: ((إذا هَّـم أَحَـدُكُمْ بـالأمْرِ، فَلْيَركَـعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الفَرِيضَةِ ثُمَّ لْيَقُلْ: اللَّهُـمَ إنِّـي أسْـتَخِيرُكَ بِعِلمِـكَ، وأسْـتَقْدِرُكَ بِقُـدرتِّك، وَأسألكَ مِنْ فَضْلِكَ العَظِيم فَإنَّكَ تَقْدِرُ، وَلا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ، وَلا أعَلَمُ، وَأَنْتَ عَـلامُ الغُيُـوبْ، اللَّهُمَ إنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذا الأمر خَيْرٌ لِي فِي دِيـنِي، وَمَعَاشِـي، وَعاقِبَـةُ أمـري، أَوْ قَـالَ: عَاجِلِ أَمْرِي، وَآجِلِهِ، فَأُقَدِره لِي، ويَسِّرْهِ لي ثُمَّ بارِكْ لِي فِيهِ، وإن كُنْتَ تَعْلَمُ أنّ هذا الأمْـرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي، مَعَاشِي، وَعاقِبة أمري، أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أمْـرِي، وآجِلـهِ فَاصْـرِفْهُ عَنِّـي، وَاصرِفنِي عَنْهُ، وَاقدرْ لِي الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ)) قَالَ: ((وَ يُـسَمَّى حاجَتَـهُ)) رواه الجماعة إلا مسلماً، أحمد خ (١١٦٢)، (٦٣٨٢)، (٧٣٩٠).

لە جابیری كوڕی عەبدوڵاوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فێری نوێژی داوا كردنی چاكەی كردوین (صلاة الإستخارة) وەكـو چـۆن فێـری سـورەتێكی قورئـانی ئەكردین دەیفەرمو: هەركاتێك یەكێك لە ئێوە دەیویـست ئیـشێ بكـات، بـا دو ڕكـات نوێژی غەیری فەرز بكات و لە پاشان بڵێت: ئەی خوایە من داوای خێر لە تۆ دەكـەم و ئەتكەم بەسەر پشك بــە هــۆی زانیاریەكەتــەوە، داوای خێــر لــە تــۆ دەكــەم بــۆ هــۆی خێرەكەتەوە، داوای خێرو چاكەی گەورەت لێ ئەكەم ، تۆبە توانایت و من ناتوانـا، تــۆ ئەزانیت و من نازانم، تۆ زانەری هەمو پەنامەكییەكانیت، ئەی خوایە ئەگەر تۆ ئەزانی

ئەو ئیشە چاکە بۆ ئاینم و بۆ ژیانم و بۆ داهاتوی ئیشەکانم، یان فەرموی: بۆ ئێستەی کاروبارم و بۆ ئایندەی خوایە پێم بدەو ئاسانی بکەیت بۆم و لێم پیرۆزبکە، ئەگەرتۆئەزانیت ئەم ئیشە خراپە بۆ دین وژینم یان فەرموی: بۆ ئێستەی کاروبارم و بۆ ئایندەی، خوایە لایدە لێم و منیش لەو لادە، چاکەو خێر لە کوێدا هەیە بۆم دانێ و لە پاشان بەوەش ڕازیم بکەو فەرموی: ناوی پێویستیەکەی ببات لە ناو دوعاکەیدا)) أبو داود(١٥٣٨)، والترمذي( ٤٨٠)، والنسائي(٦/ ٨٠)، وإبن ماجة(١٣٨٣).

١٩٠ - ن/ ٩٦٦ ((عَنْ أَبِي هوريرةﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهﷺ قَالَ: ((أَقْربُ مَا يَكُونُ العَبْدُ مِنْ رَبِه، وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعاءَ)) رواه أحمد(٤٢١/٢)، ومسلم و أبو داود(٨٧٥)، وَ النسائي(٢٢٦/٢)م (٤٨٢/٢١٥)

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: نزکترین کاتێ، کە بەندە لە پەروەردگاری نزیك ئەبێتەوە ئەوکاتەیە، کە لە سوجدەدایە، دەی زۆر لەو کاتەدا بپاڕێنەوە.

١٩١- ن/٩٦٩ ((عَنْ جَابر أنَّ النَّبِي : قَالَ: ((أَفْضَلُ الصَّلاةِ طُولُ القُنُوتِ )) رواه أحمد، ومسلم، وإبن ماجة، الترمذي، صححه.

لە جابیرەوەﷺهاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: بە نرخترین بەشی نوێژ زۆر وەستانە، یان بەڕێزترین نوێژ ئەو نوێژەیە،کە زۆر تێیدا بوەستیت قنوت: وەستانە.
(٣٠٢/٣، ٣٩١)م (١٦٤، ١٦٥، ٧٥٦)، والترمذي (٣٨٧)، وإبن ماجة(١٤٢١).

١٩٢-ن/٩٧٠ ((عَنْ المغيرة بن شعبةﷺ قال: إنْ كان رسول اللهﷺ: لَيَقُومُ، وَيُصَلِّي حَتَّى تَرِمَ قَدَمَاه أو سَاقَاهُ، فَيُقالُ لَهُ، فَيَقولُ: أفَلا أكُونُ عَبَداً شَكُوراً)) رواه الجماعة إلا أبا داود، أحمد(٤/ ٢٥١، ٢٥٥) خ (١١٣٠)(٨٣٦)(٦٤٧١)م (٧٩، ٨٠، ٢٨١٩)، والترمذي (٤١٢)، والنسائي(٣، ٢١٩)، وإبن ماجة(١٤١٩).

لە موغیرەی کوڕی شوعبەوەﷺ هاتوە، کە بەڕاستی پێغەمبەری خوا ئەوەندە ئەوەستاو نوێژی ئەکرد، هەتا هەردو پێی، یان هەردو ڕانی ئاوسا، لە بەر ئەوەی پێی

وترا، كه بۆ ئەونده خۆت ئازار ئەدەيت، مەگەر خوا لە تاوانی پێش و پاشت خۆش نەبوە؟ له وەڵامدا فەرمويەتی: ئايا نابێ منيش بەندەيەكی سوپاسگوزاربم بۆ ئەو خوايەی، كە ئەوەی بۆ كردوم. واتە: مرۆڤ تا نيعمەتی زياتری پێ بدرێت پێويستە زياتر سوپاسی خوا بكات و زياتر سەری بەندايەتی بۆ نەوی بكات.

١٩٣- ن/ ٩٧١ ((عَنْ زيد بن ثابت أنَّ النَّبيﷺ قال: ((أَفْضَلُ صَّلاة المَرْءِ فِي بَيْتِهِ إلا المكتوبة)) رواه الجماعة إلا إبن ماجة له معناه من رواية عبدالله بن سعد. خ (٧٣١)، (٦١١٣)، (٧٢٩٠)م (٢١٣، ٢١٤/ ٧٨١).

له زەيدی كوڕی سابيتەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەر فەرمويەتی: به نرخترين نوێژ ئەو نوێژەيە، كە مرۆڤ له ماڵی خۆيدا ئەنجامی ئەدات، بێجگە له فەرزەكان، واتە: چاك وايە مرۆڤ نوێژە سوننەتەكانی لە ماڵەوە بكات و ئەوە خێری زياترە، بەڵام فەرزەكان لە مزگەوتدا خێريان زياترە.

١٩٤- ن/ ١٩٧٩ ((عَنْ عائشةﷺ قالَتْ: ((لَمَّا بَّدنَ رسولُ اللهﷺ وثقل كان أكثرُ صلاتهِ جالساً)) متفق عليه أحمد(٦/٢٥٧)م (١١٧/ ٧٢٣) خ(١١١٨) بغير هذا الفظ.

له خاتو عائيشەوەﷺ هاتوە، كە وتويەتی پێغەمبەری خواﷺ كاتێ لەشی پڕ گۆشت بوو، لەشی قورس بو، زۆرترين نوێژە سوننەتەكانی به دانيشتنەوە ئەكرد.

١٩٥- ن/ ٩٨١ ((عَنْ عِمْران بن حُصين أنَّه سَأَلَ النَّبِيﷺ عَنْ صّلاة الرَّجُلِ قَاعِداً قَالَ: إنْ صلى قائِماً فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِداً فَلَهُ نِصْفُ أجر القَائِم، وَمَنْ صَلَّى نائِماً فَلَهُ نِصْفُ أجر القَائِم)) رواه الجماعة إلا مسلما. خ (١١١٥)، وأحمد(٤/٤٣٥ )، وأبو داود(٩٥١)، والترمذي(٣٦٩)، والنسائي(٢/ ٢٢٣، ٢٢٤)، وإبن ماجة(٢٣١)

له عيمرانی كوڕی حوسەينەوەﷺ هاتوە، كە له بارەی نوێژی پياوەوە به دانيشتنەوە پرسياری له پێغەمبەر كردوە، پێغەمبەر فەرمويەتی: ئەگەر به پێوە نوێژ بكات ئەوە گەورەترو باشتر، هەركەسێك به دانيشتنەوە نوێژ بكات نيوەی خێری بە پێوەی بۆ

ئەنوسرێت، هەرکەسێك بە ڕاکشانەوە نوێژ بکات، نیوەی پاداشتی دانیشتوی بۆ ئەنوسرێت، ئاشکرایە مەبەست نوێژی سوننەتە ، ئەگینا نوێژی فەرز، وەستان فەرزە، مەگەر نەتوانێت، والله أعلم.

١٩٦-ن/ ٨٩٥ ((عَنْ أبي هُرَيْرةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ((إذَا أُقِيمَتِ الصَّلاةُ فَلا صَّلاة إلا المَكْتُوبَةَ)) رواه الجماعة إلا البخاري، وفي رواية لِأحمد((إلا الَّتِي أقِيمَتْ)) أحمد(٥١٧/٢١) م (٦٣/ ٧١٠)، وأبو داود(١٢٦٦)، والترمذي(٤١٩)، والنسائي(١١٦/٢، ١١٧)، وإبن ماجة(١١٥١)

لە ئەبو هوڕەیڕەوەﷺ، هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێ قامەت کرا نوێژ ئیتر ناکرێت بێجگە لەو فەرزەی، کە قامەتی بۆ کراوە.

١٩٧- ن/٩٨٧ ((عَنْ أبي سعيد أنَّ النَّبِيﷺ قال: ((لا صَلاةَ بَعْدَ صلاة العَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَمْسُ، ولا صَلاةَ بَعْدَ الصَّلاة الفجر حَتَّى تَطْلُعَ الشَمْسُ)) رواه الجماعة إلا الترمذي خ(٨٥٦)، م (٨٢٥) أحمد(٩٥/٣)أبو داود(٢٤١٧)، والنسائي(٢٧٨/١)، وأبن ماجة(١٢٤٩).

لە باوکی سەعیدەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەری فەرمویەتی: لە پاش نوێژی عەسر، تا ڕۆژ ئاوائەبێت نوێژ ناکرێت و، پاش نوێژی بەیانی، تا ڕۆژ هەڵدێت نوێژ ناکرێت. واتە نوێژکردن لەو کاتانەدا چاك نیە، مەگەر لە کەعبە بێت، ئەوە لەوێ لە هەمو کاتێك دا دروستە وەکو لەم فەرمودەی دواییەدا هاتوە.

١٩٨-ن/ ٩٩٤ ((عَنْ جُبَير بن مُطْعِم أنَّ النَّبِيﷺ قال: ((يَابَنِي عَبْدِ مَنَاف لا تَمْنَعُوا أَحَداً طَافَ بِهَذا البَيْتِ، وَصَلَّى أَيَّةِ سَاعَةٍ شَاءَ مَنَ لَيْلِ أو نَهَارٍ)) رواه الخمسة، أحمد(٤/ ٨٠)، وأبو داود(١٨٩٤)، والترمذي(٨٦٨) والنسائي(٢٢٣/٥)، وإبن ماجة(١٤٩). لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوەﷺهاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

ئەی کوڕانی عەبدومەناف ڕێگری لە هیچ کەسێك نەکەن، کە بەدەوری ئەم ماڵەدا بسوڕێتەوەو نوێژ بکات، هەرکاتێك ئارەزوی لێ بێت لە شەو، یان لە ڕۆژدا.

١٩٩- ن/ ٩٩٣ ((عَنْ يَزِيدَ بنِ الأسود قال: شَهِدتُ مَعَ النَّبِيﷺ حَجَّتَهُ فَصَلَيْتُ مَعَهُ صَلاةَ الصُبْحِ فِي مَسْجِدِ الخَيفْ، فَلَمَّا قَضَى صَلاتَهُ إنْحَرَفَ، فَإذا هُوَ بِرَجُلَيْنِ فِي أُخرى القَوْمِ لَمْ يُصلِّيا، فَقَالَ: (عَلَّيَ بِهِمَا) فَجِئَ بِهِما تَرعَدُ فَرَائِصُهُما، فَقَالَ: ((مَا مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيَا مَعَنَا؟ فَقَالا: يا رَسُولَ الله، إنَّا كُنَّا قَدْ صَلَيْنَا فِي رِحَالِنا قَالَ: فَلا تَفْعَلا، إذَا صَّلَيْتُمَا فِي رِحَالِكُمَا، ثُمَ أتَيْتُمَا مَسْجِدَ جَمَاعَةٍ (فَصُلَّيا) مَعَهُم فإنَّهَا لَكُمَا نافِلَةٌ)) رواه الخمسة إلَّاإبْنَ ماجة.

لە یەزیدی کوڕی ئەسوەدەوە‌ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ لە حەجەکەیدا، حەجی ماڵ ئاوایی لە خزمەت ئەودا نوێژی بەیانیم کرد لە مزگەوتی خیف دا، کاتێ لە نوێژ بویەوە لای کردەوە ــ بینی ــ بینی پیاو لە داوێنی خەڵکەکەوە وەستاون نوێژیان نەکردەوە، فەرموی: ((بیانهێنن بۆم)) جا بۆی هێنران، کە ڕەگی ملیان لە ترسا لێی دەدا، فەرموی: چ شتێك بەرگری کردن لەوەی، کە نوێژمان لەگەڵدا بکەن؟ وتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ بەڕاستی ئێمە لە ناو بنەوبارگەی خۆماندا نوێژمان کرد ــ ئینجا هاتین ــ بۆ ئێرە فەرموی: ئاوا هایی نەکەن، هەرکاتێك لە ناو بنەوبارگەی خۆتان نوێژتان کردو لە پاشان هاتن بۆ مزگەوتێ، کە جەماعەتی تێدا ئەکرا، ئێوەش لەگەڵ ئەودا نوێژ بکەن، بۆتان بەنوێژی زیادە حساب دەکرێ. لەم فەرمودەوە چەند شتێك وەرئەگرین لەوانە:

١ــ ئەتوانرێت فەرزێك چەند جار بکرێتەوە، ئەگەر هۆیەکی هەبو.

٢ــ پاش نوێژی بەیانی ئەتوانرێت نوێژێك، کە هۆیەکی هەبێ بکرێت و بەر ئەو بەرگرییەی پێشو ناکەوێت.

٣ــ چاك وایە ئیمام پاش سەلام دانەوە لا بکاتەوە بەلای خەڵکەوەو سەرنج بداتە مەئمومەکانی بەکامیانەوە هەڵەیەکی دی بۆی ڕاست بکاتەوە.

٤ــ نابێ هەر بەبینینی هەڵـە، گـورج دەسـت بکـەیت بەسـەر کۆنـەکردن، بـەڵکو پێویستە کابرا بانگ بکەیت لەو بارەیـەوە پرسـیاری لـێ بکـەیت و، ئینجـا ڕێنمـایی بکەیت.

٢٠٠- ن/ ٩٩٧ عَـنْ إبـن مـسعودﷺ أنَّ النَّبِـيﷺ قَـرَأَ((وَالـنَجمِ)) فَـسَجَدَ فِيهَـا، وسَجَدَ مَنْ كَانَ مَعَهُ غَيْرَ أَنَّ شَيْخَاً مِنْ قُرَيشْ أَخَذَ كَفَاً مِـنْ حَـصَى، أَوْ تُـرابٍ فَرَفَعَـهُ إلى جَبْهَتِـهُ، وَقَـالَ: يَكْفِنِـي هَـذَا، قَـالَ عَبْـدالله: فَلَقَـدْ رَأيْتُـهُ بَعْـدُ قُتِـلَ كَـافراً)) خ(١٠٦٧) (١٠٧٠)م(٥٧٦،١٠٥)أبو داود(١٤٠٦)، النسائي(٢/ ١٠٦)

لە عەبدوڵای کوڕی مەسـعودەوەﷺ هـاتوە، کـە پێغەمبـەرﷺ سـورتی (الـنجم)ی خوێندەوە، لە ئاخیریەوە سوجدەی بردوە، هەر کەسێکی لەگەڵ دابو سوجدەی برد بێجگـە لـە پیرێکـی قـورەیش، کـە پڕمـشتێ وردە بـەردیان خـۆڵی هـەڵگرت و بردیـەوە لای ناوچاوانی و وتی: ئەوەندە بەسە بۆ من، عەبدوڵا وتی: بەڕاسـتی ئـەو کابرایـەم دی لـە پاشدا بەکافری کوژرا. بەڵێ (١٥) شوێن هەیە لـە قورئـان سـوننەتە سـوجدەیان تێـدا ببردرێت.

١ــ کۆتایی سورەتی(الأعراف) لەکاتی خوێندنی( وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ﴿٢٠٦﴾)).

٢ــ لە سورەتی(الرعد) لە کاتی خوێندنی (( وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن دَآبَّةٖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٥٠﴾)).

٣ـ لەسورەتی (الإسراء) لە کاتی خوێندنی ((إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ سُجَّدٗا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ

وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ﴿١٠٩﴾)).

٥ــ له سورەتی (مریم) له کاتی خوێندنی ((إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا )).

٦ــ لەسورەتی(الحج) له کاتی خوێندنی (( أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ )) ١٨.

٧ــ له کاتی خوێندنی ((يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٧٧﴾)).

٨ ــ له سورەتی(الفرقان) لەکاتی خوێندنی(( وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُواْ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ))٦٠.

٩ــ له سورەتی (النمل) له کاتی خوێندنی ((أَلَّا يَسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٦﴾)) ٢٦.

١٠ــ له سورەتی(الم تنزيل) له کاتی خوێندنی ((إ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿١٥﴾))١٥.

١١ــ له سورەتی(ص) له کاتی خوێندنی ((قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ

وَظَنَّ دَاوُدُ أَنَّمَا فَتَنَّهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾)) ٢٤.

١٢ــ لە سورەتی(حم السجدة) لە کاتی خوێندنی وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾(یان) فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ﴿٣٨﴾))٣٧ــ ٣٨.

١٣ــ لە سورەتی(النجم) لە کۆتایی سورەتەوە.

١٤ــ لە سورەتی(الإنشقاق) لە کاتی خوێندنی ((وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ﴿٢١﴾)) ئایەتی٢١ .

١٥ــ لە کۆتای سورەتی (العلق) لە کاتی خوێندنی ((كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ﴿١٩﴾)).

ئەم پانزە شوێنە سوننەتە هەرکاتێ کابرا خوێندی سوجدە ببات، بەڵام ئەگەر لە نوێژدا بو بۆ سوجدەی(ص) سوجدە نەبات، چونکە سوننەتێکی دوپات کراوە(غير المؤكدة) نیە والله أعلم.

٢٠١-ن/ ١٠٠٣ عَنْ أبي رافِعِ الصائغ، قال: صَلَّيتُ مَعَ أبي هُرَيْرَةَ العَتَمَةَ فقرأ((إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ )) فَسَجَدَ فِيهَا، فَقُلْتُ مَا هَذِه؟ فَقَالَ سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أبِي القاسمﷺ فَمَا أزال أسْجُدُ فِيهَا حَتَّى ألقاه)).

لە باوکی ڕافیعی سائیغەوە هاتوە، کە وتویەتی: نوێژی خەوتنانم لەگەڵ ئەبو هورەیرە داکرد و سورەتی((إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ )) خوێند و لە نوێژەکەدا سوجدەی برد، پاشان وتم: ئەم سوجدە بردنە لە نوێژدا چیە؟ وتی: لە پشت پێغەمبەرەوەﷺ لە نوێژدا لە کاتی

خوێندنی ئەم سورەتە، سوجدەم بردوە منیش هەركاتێ بخوێنم سوجدە ئەبەم، هەتا بەو ئەگەمەوە، واتە: سوجدەبردن لەكاتی خوێندنی ئایەتێك لەم ئایەتانەی سوجدە، سوننەتە.

٢٠٢- ش/ ن/١٠١١عَنْ عائشةﭬقَالَتْ: ((كَانَ النَّبِيﷺ يَقُولُ في سجود القرآن بالليل: ((سَجَدَ وَجْهِي للذِي خَلَقَهُ، وشقَّ سَمْعَهُ، وَبَصَرهُ بِحَولِهِ، وقُوتِه)) رواه الخمسة إلا إبن ماجة صححه الترمذي، أحمد(٦/ ٣٠، ٢١٧) أبو داود(١٤١٤)، الترمذي(٥٨٠)

لە خاتون عائشەوەﭬ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەرﷺ لە سوجدەی قورئان لە شەو ئەیفەرمو ڕوی من بۆ سوجدەی ئەو زاتەی برد، كە دروستی كروە، وێنەی كێشاوە ـ وَصَوَرَهُ ـ گوێ و چاوی تێدا ڕواندوە، بەگۆڕانكاری خۆی و توانایی ئەو پاك و بێ عەیب وخاوەن خەیری زۆە، خوا چاكترین و جوانترینی هەمو دروستكەرەكانە ـ فَتَبَارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الخَالِقِين ـ واتە: خوێندنی ئەو دوعایە لە سوجدەی قورئاندا سوننەتەو، ئەو پارچەیش، كە وترا لە ڕیوایەتی تردا لەو شوێنە دا هاتون، والله أعلم.

سوجدەی شوكریش سوننەتەو، بونی دەست نوێژ بۆ هەردوكیان چاكە.

٢٠٣- ش/ ن/ ١٠١٩ عَنْ أَنَسﭫ قالَﷺ: ((إذا شَكَّ أَحَدُكُم فِي صَّلاتِهِ فَلَمْ يَدْرِ إِثْنَتَيْنِ صلَّى أوْ ثلاثاً فَلْيُلْقِ الشَّكَ، وَلْيَبْنَ على اليَقِينِ)) رواه البيهقي، ورجالُ إسناه ثقات[1](٢/ ٣٣٣)

لە ئەنەسەوەﭫهاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((هەركاتێ یەكێك لە ئێوە كەوتە گومانەوە لە بارەی نوێژەكەیەوە نەیئەزانی دوركاتی كردوە، یان سیان، با گومانەكە لابات و بیكات بە یەقین، واتە: هەمیشە لاخوارەكەی، كە بە یەقینی ئەنجامی داوە حیساب بكات و، لەسەر ئەوە پاشماوەی نوێژەكەی تەواو بكات، لە پاشا دو سوجدە سەهو ببات پێش، یان پاش سەلام دانەوە، وەكو لە چەند فەرمودەی تراهاتوە. والله أعلم)).

(١) ـ تەماشای فەرمودەی ژمارە (١٠٢٠) لە سەرچاوەی پێشو بكە.

٢٠٤- ن/١٠٢٤ عَنْ إبن بُحَيْنَةَ: ((أنَّ النَّبِيﷺ صَلَّى فَقَامَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ فَسَبَّحُوا بِهِ فَمَضَى، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاتِهِ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ)) رواه الجماعة إلا أحمد خ (١٢٢٤)م (٨٥/ ٥٧٠)

لە کوڕی بوحەینەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ نوێژی کرد، لە ڕکاتی دوەمدا هەستایەوە تەحیاتی نەخوێند و یارەکانی(سبحان الله)یان کرد، بەڵام ئەو نەگەڕایەوە بۆ دانیشتن و تەحیات، کاتێ، کە لە نوێژەکەی بویەوە دو سوجدەی بردو لە پاشا سەلامی دایەوە.أبو داود(١٣٤)، والترمذي (٣٨٩)، والنسائي(٣/ ١٩)، وإبن ماجة(١٢٠٦، ١٢٠٧).

٢٠٥- ن/ ١٠٢٧ عَنْ إبن مسعودرضي الله عنه أنَّ النَّبِيﷺ صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقِيلَ لَهُ أزيدَ فِي الصَّلاة؟! فَقَالَ: ((وَمَا ذَلِكَ)) قَالُوا صَلَّيْتَ خَمْسًا فَسَجَدَ سَجْدَتَيْن بَعْدَ ماسَلَّمَ)) رواه الجماعة خ(١٢٢٦)م (٩١).

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ نوێژی نیوەڕۆی بە پێنج ڕکات کرد، لە پاشا وترا: ئایا نوێژ زیاد کراوە؟! فەرموی: ئەوە چی بوە؟ وتیان پێنج رکات نوێژت کرد، جا پێغەمبەرﷺ دو سوجدەی برد پاش ئەوەی، کە سەلامی دابوەوە، هەندێك ئەمە ئەکەن بە بەڵگە، کە سوجدەی سەهو پاش سەلامە، بەڵام لەڕاستیدا ئەمە نابێت بە بەڵگە چۆن تازە پێغەمبەرﷺ سەلامی داوەتەوە، چی بکات هەر سوجدەکانی بر، بەڵام ئەتوانێ بەڵگەبێ لە سەر ئەوە، کە پاش سوجدەی ئاوەها سەلامی تر پێویست نیە، ئەوەی کە ئەم دو بۆچونە پەسەند ناکات ئەم فەرمودەیە، کە (أحمد و أبو داود و ترمذي ) هێناویانە، کە لەودا هاتوە((فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاتِهِ سَلَّمَ ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، وَ سَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ هَكَذَا صَنَعَ بِنَا رَسُول اللهِﷺ)) کاتی لە نوێژەکەی بوەوە، کە سەهوی تێدا کردبو، سەلامی دایەوەو دو سوجدەی برد و سەلامی تری دایەوە، لە پاشان وتی: پێغەمبەری خواﷺ ئاوای بۆ کردوین، بەڵام لە ڕیزی هێنەرەکانی داـ ئەلمەسعودییەکی تێدایە ــ هەنێدك قسەیان بەباش لەسەر نەکردوە، واتە: ڕیوایەتەکە

لاوازە. والله أعلم. هەرچەندە تورمزی بەڕاستی داناوەو ئیمامی بوخاریش زۆر ناکۆك نیە سەبارەت بەوکابرایە، واتە: ئەکرێ تەماشای ئەو فەرمودە بکرێت و هەندێك لـە زانایـان حوکمیان پێ کردوە لە وانە ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای لێ بێت.أحمـد(١/ ٢٧٩)، وَ أبو داود(١٠١٩)، والترمذي(٣٩٠)، والنسائي(٣١/٣)، وإبن ماجة(١٢٠٥).

٢٠٦- ن/ ١٠٢٩ عَنْ أبِـي هـوريرةﷺ قـالَ قـالَ رسـول اللهﷺ أثْقَـلُ الـصَّلاة علـى المنافقينَ صَّلاة العشاء، وَصَّلَاة الفَجر، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَـا لاتَوْهَمـا، وَلَـوْ حَبْـواً، وَلَقَـدْ هَمَمْتُ أنْ آمُرَ بالصَّلاةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجلاً فَيُصلِّي بالنَّاسِ، ثُمَّ انْطَلِقَ مَعِي بِرِجـالٍ مَعَهُـمْ حزم مِنَ حَطَبٍ إلى قَوْمٍ لا يَشْهَدُونَ الصَّلاة فـأُحَرِقَ عَلَـيْهِمْ بُيُـوتَهُمْ بالنَّـارِ)) رواه الجماعـة خ(٦٤٤)م (٢٥١/ ٦٥١).

لە ئەبی هـورەیرەوەﷺ هـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی: قورسترین نوێژ لەسەر مونافیقان، نوێژی عیشاو بەیانیە، ئەگەر بیانزانیە چـەندێك خێـرو پاداشتی تێدایە، ئەگەر بە گاگۆڵکەش بوایە بۆی دەهاتن، بەڕاستی مـن ویـستم فرمـان بدەم بە نوێژکردن و قامەت بکرێت، لە پاشان فرمان بدەم بە پیاوێـك نوێـژ بکـات بـۆ خەڵکی، لە پاشا من هەندێ پیاو لەگەڵ خۆمدا ببەم و دەستەوارەی ئاگریان پـێ بێـت بچینە سەر ئەو خەڵکەی، کە نەهاتون بۆ نوێژ ماڵەکانیان بە ئاگر بسوتێنین بەسـەریاندا، واتە: وازهێنان لە مزگەوت و جەماعەت، ئەگەر بەهانەیەکی شەرعی نەبێت، تـاوانێکی گەورەیەو مافی سزادانی هەیە، هەر لە دونیا بێجگە لە قیامەتیش.أحمد(٢٤٤/٢)، وأبو داود(٥٤٨، ٥٤٩)، والترمذي(٢١٧)، والنسائي(٢/ ١٠٧)، وإبن ماجة(٧٩١)

٢٠٧- ن/ ١٠٣٠ وَعَنهُ أنَّ رَجُلاً أعْمى قَالَ: يارسول اللهﷺ لَـيْسَ لِـي قائِـدٌ يَقُـودُنِي إلى المَسْجِدِ، فسألَ رَسُول اللهﷺ أنْ يُرَخِصَ لَهُ فَيُصَلِّي فِـي بَيْتِـهِ فَـرخَصَ لَـهُ، فَلَمَّـا وَلَّـى دَعَاهُ، فَقَالَ: ((هَلْ تَـسْمَعُ النِـدَاءَ؟)) قَـالَ: نَعْـم، قَـالَ: ((فأجِـبْ)) رواه مـسلم(١٠٩/٢)، والنسائي م(٦٥٣/٢٥٥). هەر لەوەوە هاتوە، کە پیاوێکی کوێر وتی: ئـەی پێغەمبـەری

خواﷺ كەسێكم نیە دەستم بگرێ بۆ مزگەوت، داوای لە پێغەمبەری خواﷺ كرد، كـە ماوەی پێ بدات، كە لەماڵی خۆیدا نوێژ بكات، پێغەمبـەریشﷺ مـاوەی داو، كاتـێ كابرا ڕۆیشت، بانگی كرد، فەرموی: گوێت لە بانگ ئەبێ؟ وتی: بەڵێ، فـەرموی: وەڵام بدەرەوە، واتە: ئەبێ بێیت بۆ مزگەوت و جەماعەت مادام گوێت لە بانگ دەبێت.

٢٠٨- ن/١٠٣٣((عَـنْ إبـن عمـر رضي الله عنهما قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهﷺ: ((صَّـلاة الجَمَاعَـةِ تفْضل عَلَـى صَـلاة الفَـذِّ بِـسَبعٍ وعِـشْرِينَ دَرَجَـة)) رواه الجماعـة إلا أبـا داود خ (١٤٥)م (٢٤٩/٢٥٠، ٦٥٠).

لـە عەبـدوڵای كـوڕی عومـەرەوە رضي الله عنهما هـاتوە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا فەرمویەتی: ((نوێژی جەماعەت لە نوێژی تاك بیـست و حـەوت پلـە خـەیری زیـاترە)) أحمد(٢/ ٦٥، ١٠٢)، والترمذي(٢١٥)، والنسائي(٢/ ١٠٣)، وإبن ماجة(٧٨٩).

٢٠٩- ن/١٠٣٦ وَعَنْـهُ عَـنِ النَّبِـيﷺ قَـالَ: ((إذا اسـتأذَنَكُمْ نِـساؤُكُمْ بِاللَّيْـلِ إلى المَسَاجِدِ، فَأذَنُوا لَهُـنَ)) رواه الجماعـة إلا إبـن ماجـة وفِـي لَفْظٍ: ((لا تَمْنَعُـوا النِـساءَ أنْ يَخرجنَ إلى المَساجِدِ، وَبُيُوتُهُنَّ خَيْرٌ لَهُـنَّ)) رواه أحمـد(٢/٧، ١٥١، ٩)، وابـو داود(٥٦٦) خ(٨٦٥)، (٧٨٣)م(١٣٤، ١٣٥/ ٤٤٢).

هــەر لــەوەوەو ئــەویش لــە پێغەمبــەرەوەﷺ هــاتوە، كــە فەرمویــەتی: ئەگــەر ئافرەتەكانتان داوایان لێ كردن بەشەو بچن بۆ مزگەوتەكان ماوەیان بدەن. لـە بێژەیـەكی تردا هاتوە، كە ئافرەتان بەرگری مەكـەن لـەوەی، كـە بـچن بـۆ مزگەوتـەكان، بـەڵام ماڵەكانیان چاكترە بۆیان. واتە بەرگری هاتو چۆی مزگەوتیان لێ مەكـەن بەشـەو بـێ، یان بە ڕۆژ، بەڵام پێویستە ئافرەتانیش ئەوە بزانن، كە نوێژی ناو ماڵیان خێری زیـاترە، تا چونیان بۆ مزگەوت. بەم شـێوەیە پێغەمبـەری ئازیزمـان ئافرەتـان هەڵئـەنێ لەسـەر ئەوەی، كە لە ماڵەكانیان بمێننەوەو، چونكە ئەوە بە سود ترە بۆیان.

٢١٠- ن/١٠٣٨ عَنْ أَبِي هُرَيْرةَ رضي الله عنه قالَ: قَالَ رسول الله ﷺ: ((أَيُّمَا إمرأةٍ أَصَابَتْ بخورا، فَلا تَشْهَدْ مَعَنَا عِشاءَ الآخرة)) رواه مسلم، وأبو داود(٤١٧٥)، والنسائي(٨/١٥٤) (٨/١٩٠)م (١٤٣/ ٤٤٤)، وأحمد(٢/٣٠٤).

له ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: هەر ئافرەتێك خۆی بۆن خۆش بکات، بانەیەت لەگەڵ ئێمە بۆ نوێژی عیشا، لێرە فەرمویەتی: با بۆ نوێژی عیشا نەیەتە جەماعەتی ئێمە. لە فەرمودەی تردا هاتوە، کە هەرکات بێت بێجگە لەشەویش ئەبێ بۆنی خۆش لە خۆی نەدات، واتە: بەم شێوانە هاتوچۆی ئافرەتی بۆ مزگەوت کەم کردەوە، ئەوە ئاشکراشە وەکو لە فەرمودەی پێشەوە دەرکەوت، نوێژی ماڵیشی خەیری زیاترە لە نوێژی مزگەوت، ئیتر ئەبێ بۆچی سور بێت لەسەر چون بۆ مزگەوت؟![1]

٢١١- ن/ ١٠٤١ عَنْ أَبِي موسى الأشعري قَالَ: قَالَ رَسُول الله ﷺ: ((إنَّ أَعْظَمَ النَّاسِ فِي الصَّلاة أجرًا أَبْعَدُهُمْ إِلَيْهَا مَمْشىً)) أخرجاه خ(٦٥١)م (٢٧٧، ٦٦٢).

له باوکی موساوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: گەورەترین خەڵك لە پاداشتی نوێژدا ئەو کەسانەن، کە دورترین لە مزگەوتەوە، واتە: تا زیاتر دور بێ پاداشتی زیاتر ئەبێ.

١١٢- ن/١٠٤٣(( عَنْ أُبَيَ بنِ كعب قال: قال: رسول الله ﷺ صَّلاة الرَّجلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَّلاتِهِ وَحْدَهُ، وَصَلاتُهُ مَعَ الرَّجلَيْنِ أَزْكَى من صَلاتِهِ مَعَ الرَّجُلِ، وَمَا كَانَ أَكْثَرُ فَهُوَ أَحَبُ إلى اللهِ تعالى.

له ئوبەی کوڕی کەعبەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: نوێژی پیاوێك لەگەڵ پیاوێکدا باشترە لە نوێژی یەك کەس بە تەنیا، نوێژی لەگەڵ دو کەسدا باشترە لە نوێژەکەی لەگەڵ یەك کەسدا، تا نەفەر زیاتر بێ ئەوە خۆشەویسترە لای خوای باڵادەست.

---

(١) ـ تەماشای فەرمودەی ژمارە(١٠٤٠)ی سەرچاوەی پێشو بکە.

٢١٣- ن/ ١٠٤٤ عَنْ أبي قَتادَةَ قَالَ: ((بَيْنَمَا نَحْنُ نُصلِّي مَعَ النَّبِيﷺ سَمِعَ جَلبةَ رِجَالٍ، فَلَمَّا صَلَّى، قَالَ ماشَأْنُكُمْ)) قَالُوا: إسْتَعجَلْنَا إلى الصَّلاة، قَالَ: ((فَلا تَفْعَلُوا، إذَا أتَيْتُم الصَّلاةِ فَعَلَيْكُمُ السَكِينَة فَمَا أَدْرَكْتمْ فَصَلُوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا)) متفق عليه، أحمد(٥/ ٣٠٦)خ (٦٣٥)م (١٥٥/٦٠٣).

لە باوکی قەتادەوە هاتوە، کە وتویەتی: لە کاتێکا، کە ئێمە لە گەڵ پێغەمبەرﷺ نوێژمان ئەکرد، لەو کاتەدا پێغەمبەرﷺ گوێی لە چرپەچرپی پیاوان بو، کاتێ، کە نوێژەکەی کرد فەرموی: بۆچی واتان ئەکرد؟ وتیان پەلەمان ئەکرد بۆ گەیشتن بە نوێژی جەماعەتدا، فەرموی: ئاوەها نەکەن، هەرکاتێ هاتن بۆ نوێژ، پێویستە لە سەرتان لەسەر خۆو هێواش بن و پەلە نەکەن، جا بە چەندا گەیشتن ئەوەندە نوێژ دەکەن و ئەوەی، کە ئێوەی فەوتاندوە لە پاشان تەواوی بکەن.

٢١٤- ن/١٠٤٦ عَنْ أبِي هُرَيْرةَ رضي الله عنه أنّ النَّبِيﷺ قال: ((إذا صَلَّى أَحَدُكُمْ بالنَّاس فَلْيُخَفِّف، فإنَّ فِهِيمْ الضَّعيفَ، وَ السَّقِيمَ، والكَبِير، فَإذا صَلَّى لنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّل مَاشَاءَ)) رواه الجماعة إلا إبن ماجة، أحمد(٢/ ٢٥٦/٣٩٣، ٤٨٦، ٥٣٧)خ (٧٠٣)م (١٨٢/ ٤٦٦)والنسائي(٢/٩٤)، وأبو داود(٧٩٤)، والترمذي(٢٣٦).

لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێ یەکێك لە ئێوە بو بە ئیمامی خەڵك لە نوێژدا، بە سوکی ئەو ئیمامەتە ئەنجام بدات، واتە: زۆر درێژەی پێ نەدات، چونکە لە ناو ئەواندا لاوازو نەخۆش و پیری تێدایە، پێویستە رعایەتی حاڵی ئەوان بکرێت، وەکو لە ریوایەتی تردا هاتوە: (پێویستە ئیمام بەگوێرەی لاوازترینی مەئمومەکانی رەفتار بکات)[1]

٢١٥-١٠٤٩٩ عَنْ أبي سَعيد قال: لَقَدْ كَانَتْ صَّلاة الظُهْرِ تُقَامُ فيَذْهَبُ الذَاهِبُ إلى البَقِيعِ فَيَقْضي حاجَتَهُ، ثُمَ يَتَوَضَأُ ثُمَّ يَأْتِي رَسُول اللهِﷺ فِي الرَّكعةِ الأُولى مِمَّا يُطَوِّلُها))

(١) ـ تەماشای راڤەی فەرمودەی(١٠٤٧ـ ١٠٤٨) لە سەرچاوەی پێشو بکە.

رواه أحمد(٣/٣٥، ٣٨)، مسلم، وإن ماجة(٨٢٥)، والنسائي(١٦٤)م (١٦١، ١٦٢، ٤٥٤).

لە باوکی سەعیدەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ: بەڕاستی نوێژی نیوەڕۆ قامەتی بۆ ئەکرا کابرا دەرئەچو بۆ بەقیع و دەستی بە ئاو ئەگەیاندو لە پەشا دەست نوێژی ئەگرت، ئینجا ئەهات بۆ جەماعەت هێشتا پێغەمبەری خواﷺ لە رکاتی ئەوەڵ دابو ئەوەندەی درێژەی پێئەدا تا ئەو خەڵکە بگەن بەرکاتی ئەوەڵ دا. والله أعلم.

٢١٦- ن/ ١٠٥١ عَنْ أَبِي هُريرةﷺ أنّ رَسُول اللهﷺ قال: ((إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَلا تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ فَإِذَا كَبَّرَ فَكبِرُّوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ فَقُولُوا: رَّبَنَا لَكَ الحَمْدُ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدوا وإِذَا صَلَّى قاعداً فَصَلُّوا قُعُوداً أجمعونَ)) رواه الجماعة إلا الترمذي خ(٧٢٢)م (٨٦/٤١٤).

لە ئەبو هوڕیرەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: وەکو ئیمام دانراوە بۆ ئەوەیە، کە پەیڕەوی بکرێت نارێکی مەکەن لەگەڵیا، جا هەرکاتێ (الله أكبر)ی کرد(الله أكبر) بکەن و نوێژ دابەستن، هەرکاتێ چەمیەوە ئێوەش بەدوای دا بچەمێنەوە، پاش و پێش نەکەون لێی، هەر کاتێ وتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَه) بڵێن: (رَّبَنَا لَكَ الحَمْدُ)، هەرکاتێ سوجدەی برد ئێوەش سوجدە ببەن، هەرکاتێ ئەو بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێوەش هەموتان بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن. أحمد(٣١٤/٢، ٤٦٧)، وأبو داود(٦٠٣، ٦٠٤)، والنسائي(٢/ ١٩٦)، وإبن ماجة(٨٤٦).

٢١٧- ن/ ١٠٥٢٢ وَعَنْهُ قَالَ رسول اللهﷺ: ((أما يَخْشَى أَحَدُكُمْ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإمام أنْ يُحَّوِلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأسَ حِمَارٍ، أَوْ يُحَوِّلُ صُورَتُهُ صُورَةَ حِمَارٍ)) رواه الجماعة أحمد(٢/ ٢٦٠، ٢٧١، ٤٢٥)خ (٦٩١) م (١١٤/ ٤٢٧)، وأبو داود(٦٢٣)، والترمذي(٥٨٢)، والنسائي(٩٦/١)، وإبن ماجة(٩٦١).

هەرلەوەوە هاتوە، کە فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: ئایا ناترسێت کەسێك لە ئێوە هەرکاتێ سەری بەرزکاتەوە پێش ئیمام خوا ئەوسەرەی بکات بەسەری

كەر، یان وێنەی ئەو بگۆڕێت بە وێنەی كەرێك. أحمد(٢٨٤)، وأبو داود(١٣٦٤)، والترمذي(٢٣٢)، والنسائي(٢/ ٢١٨)، وإبن ماجة(٤٢٣).

٢١٨-ن/ ١٠٥٥((عَن إبن عباس قالَ: ((بِتُّ عِنْدَ خَالِي مَيْمونَة، فَقَامَ النَّبِيﷺ يُصَلِّى مِنَ اللَيْلِ فَقُمْتُ أُصَلِّي مَعَهُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ فَأَخَذَ بِرَأْسِي، وَأقامِنِي عَنْ يَمِنِهِ))رواه الجماعة خ(١٨٣)، (٦٩٨)، (١١٩٨)، (٤٥٧٠)(٤٥٧١)، (٤٥٧٧٢)م (١٨٢/ ٧٦٣).

له عەبدولآی كوڕی عەباسەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی شەو لەلای پورم مەیمونە مامەوە، جاپێغەمبەرﷺ هەستا شەو نوێژی كرد، منیش هەستام نوێژی لەگەڵ دا بكەم لەلای چەپەوە وەستام جا پێغەمبەرﷺ سەری گرتم و هێنامیە لای ڕاستەوە. لەم فەرمودە ئەمانە وەرئەگیرێت:

١ــ شەونوێژ سوننەتە.

٢ــ تەنها لە ناو نوێژدا ئەبێ بە ئیمام بە منالێكی دەسالەش.

٣ــ نوێژی شەو نوێژ بەجەماعەت بەیەك نەفەر دروستە و پێویستە لە لای ڕاستەوە بوەستێت، دروستە مەئومیش خۆی تاك بكاتەوە، ئەگەر بەهانەیەكی شەرعی هەبێ[1] ئیمامیش ببێ بە مەئموم داستانی نخۆشی پێغەمبەرﷺ بەناو بانگە.

٢١٩- ن/١٠٦٤ عَنْ أبِي سعيد أنَّ رجلاً دَخَلَ المَسْجِدَ، وقَدْ صَلَّى رسول اللهﷺ بأصحابِهِ فَقَالَ رسول اللهﷺ: ((مَنْ يَتَصَدقُ عَلَى هذا فَيُصَلِّى مَعَهُ؟ فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ فَصَلَّى مَعَهُ)) رواه أحمد(٣/٦٤،٥، ٨٥) أبو داود(٥٧٤)والترمذي بمعناه

له باوكی سەعیدەوە هاتوە، كە پیاوێك هاتە مزگەوتەوە، پێغەمبەری خواﷺ نوێژی كردبو بۆ یارەكانی جا فەرموی: كێ چاكەیەك بەو دەكات و نوێژی لەگەڵ دا ئەكات؟)) پیاوێك لەناو ئەو خەڵكا هەستاو نوێژی لەگەل داكرد، لێرەدا ئەمانە

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە(١٠٥٧) لە سەر پێشو بكە.

وەرەدەگیرێ.

١ـ جەماعەت لەمزگەوت، پاش جەماعەتی یەكەمی ئیمامی ڕەسمی دروستە.

٢ـ نوێژی فەرز دوبارەكردنەوەی دروستە، ئەگەر هۆیەكی هەبو.

٣ـ ئیقتدای فەرز بەسوننەت، یان سوننەت بە فەرز دروستە، خێری جەماعەتی هەیە. ٤ـ ئەو یارمەتی دانە سوننەتە و، كابرا بێجگە لەخەیری نوێژەكەی، خۆی خێری یارمەتی دانەكەیشی بۆ هەیە ـ والله اعلم ـ.

٢٢٠- ن/ ١٠٦٥ عن ابي هريرةﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: (( اذا جِئتم الى الصَّلاة ونحن سُجُودٌ فاسْجُدوا ولا تَعُدُّوها شيئاً، ومن ادرك الرَّكعة فقد ادرك الصَّلاة)) رواه ابوداود٨٩٣ وصححه بن خُزيمة والحاكم.

لەئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (هەركاتێ هاتن بۆ نوێژ و ئێمە لەسوجدە دا بوین، ئێوەش سوجدە ببەن و بەهیچی حیساب نەكەن، هەركەسێك بە ركاتێك گەیشت، ئەوە بە نوێژی جەماعەت گەیشتوە.

٢٢١- ن/ ١٠٦٨ عن المغيرةَ بن شعبة، قال: (( تَخَلَّفتُ مَعَ رسول اللهﷺ في غزوة تبوك، فتبَرَّز ـ وذكر وضوءَهُ ـ ثم عمدَ النَّاس وَعَبدُ الرَّحمن يُصلِّي بهم فَصَلى مع النَّاس الرَّكعَةَ الأخيرةَ فلما سلَّم عبدالرحمن قام رسول اللهﷺ يُتمُّ صلاتهُ فلما قضاها اقبل عليهم فقال: قد أحْسَنَتُّمْ واصبْتُم)) يغْبطهم انْ صلَّوا الصلاة لِوَقْتِهَا)). احمد(٤/٢٥١،٢٤٩) م(١٠٥/ ٢٧٤) خ(٤٤٢١) وابوداود(١٤٩).

لەموغەیرەی كوڕی شوعبەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی دواكەوتم لەگەڵ پێغەمبەردا لەغەزای تەبوك دواكەوتم، جا پێغەمبەرﷺ دەستی گەیاند بەئاو ـ موغەیرە ـ باسی دەست نوێژ گرتنی پێغەمبەری خوایﷺ كرد، لەپاشان بەرەولای خەڵكەكە هات، لەو كاتەدا عەبدورەحمانی كوڕی عەوف ـ ئیمامەتی بۆ خەڵكی ئەكرد، جا ئەویش لەگەڵ ئەوخەڵكەدا بەئیمامەتی عەبدورەحمان گەیشت بەئاخیریدا و خوێندی و، كاتێ كە

عەبدورەحمان سەلامی دایەوە، پێغەمبەرﷺ هەستاو نوێژەكەی خۆی تەواو كرد، ئینجا ڕوی كردە ئەوان و فەرموی: (( چاكتان كرد و پێكاتان)) خۆشی بۆ ئەخواستن بۆ ئەوەی، كە نوێژكەیان لەئەوەڵی كاتەكەیدا كردوە. لێرەدا ئەمانە وەرئەگرین:

١ـ ئەگەر كاتەكە دوا ئەكەوت دروستە غەیری ئیمامی ڕەسمی، كەسێكی تر ببێ بەئیمام لەوشوێنەدا بۆ ئەو خەڵكەو، چاوەڕێی بەڕێزتر نەكرێت.

٢ـ پێویستە پایە بەرزو بەڕێزتر ئیقتیدا بەكەمتر لەخۆی بكات.

٣ـ پلەیەكی بەرزە بۆ عەبدورەحمان، كە پێغەمبەرﷺ ئیقتیدای پێ كردوە.

٤ـ هەر شتێكی زیادە، كە مەئموم لەگەڵ ئیمامدا ئەنجامی بدات لەپاشدا سوجدەی سەهوی ناوێت، لێرەدا پێغەمبەری خواﷺ تەحیاتێكی زیادی خوێند لەگەڵ عەبدورەحمان دا، موغەیرە نەیگوتوە، كە پێغەمبەرﷺ سوجدەی بردوە ئەو نوێژەو ئەو نوێژەش، نوێژی بەیانی بوە، وەكو لەڕیوایەتی تردا هاتوە.

٢٢٢- ن/ ١٠٧١عن ابن عمر رضي الله عنهما عن النَّبِيِّ ﷺ: ((انَّه كـانَ يـأمُرُ المُنـادي فَيُنـادى بالـصَّلاة يُنـادي: صَـلُّوا في رِحـالِكُمْ في الليلـة البـاردةِ وفي اللَّيلـة المطـيرة في الـسَّفرِ)) رواه الجماعة الا الترمذي خ(٦٦٦) م (٢٢ـ ٣٤/ ٦٣).

لەعەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە رضي الله عنه هاتوە لە پێغەمبەرەوەﷺ، كە فرمانی ئەدا بەسەر بانگ دەردا، كە بانگ بدات. لەبانەگەكەیدا ـ لەباتی حَيَّ علی الصَّلاة ـ بلَيَ (صَلُّوا في رحالكم / نوێژ لەناو بنەوبارگەی خۆتاندا بكەن لەشەوی ساردو شەوی باران لەسەفەردا، عەبدوالله ی كوڕی عباس رحمه الله بەبانگ دەری ئەوت بەشەوی باران لەماڵدا، پاش: ( اشهد اَلاَّ اله الا الله واشهد ان محمد رسولَ الله نەڵێت (( حيَّ علی الصلاة) بڵێ (صَلُّو فی بيُوتِكمْ / لە ماڵەكانی خۆتاندا نوێژ بكەن.

احمد (٢، ٤، ٥٣،١٠، ٦٣، ١٠٣) وابو داود(١٠٦٤،١٠٦) وأنَسائي(٢/ ١٥) وابن ماجه(٣٠٢/١)(٩٣٨).

٢٢٣-٥/١٠٧٥ عن عائيشةؓ قالت: سَمِعتُ النَّبِيﷺ يقول: (( لا الصّلاةَ بِحَضْرِهِ طَعامٍ وَلا وَهوَ يَدافِعُ الأ خْبَثَيْنِ))رواه احمد (٦/ ٤٣، ٧٣، ٥٤) ومسلم وأبو داود(٨٩) م/ (٦٧/ ٥٦٠) لەخاتون عائيشەوەؓ هاتوه، كە وتويەتی: گوێبيستی پێغەمبەر بومﷺ كە ئەيفەرمو: (( چاك نيە نوێژكردن كاتێ، كە خواردن ئامادەبێ و ئارەزوی لێ بێت وەبەنوێژ دانانرێت ئەو نوێژەی، كە كابرا ميزو پيسی زۆری بۆ هێنا، تا خۆی لەوە ڕزگار نەكات و دەست نوێژ نەگرێتەوە.

٢٢٤- ن/ ١٠٧٨ عن ابي مسعود عُقْبَةَ بنِ عَمرو قَالَ: قال رسُولُ اللهﷺ : (( يَؤُمُّ القَومَ اقْرَأُهُمْ لِكتابِ الله فَإِنْ كانوا في القِرَاءَةِ سَوَاءً فاعلمهُمْ بالّسُنَّةِ فانْ كانوا في السُنةَ سَواءً فاقْدَمَهُمْ هجْرَةً فأنْ كانوا في الهِجْرَةِ سَواء فَاقْدَمَهُمْ سِناً ولايؤُمَنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ في سُلْطانِهِ، وَلايَقْعُدُ في بَيْتِهِ عَلى تَكْرِمَتِهِ الاَّ بأذْنهِ وفي لفظ((سِلْماً)) بَدَلَ ((سِناً)) رواه الجماعة البخاري. م( ٢٩٠/ ٦٧٣)احمد(٤/ ١١٨) وأبو داود(٥٨٢) والترمذي(٢٣٥) و النسائي(٢/ ٧٦) وابن ماجه(٩٨٠).

لەباوكی مەسعودەوە عوقبەی كوڕی عەمرەوە هاتوە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمويەتی : ((ئيمامەت بكات بۆ قەومەكەی، ئەوەيان كە زياتر قورئانی لەبەرەوچاكتری ئەزانێ، جا ئەگەر لەقورئانە كەدا وەكو يەك بون باشارەزاتريان بەسوننەتی پێغەمبەر ببێت بەئيمام، ئەگەر لەسونەتيشدا وەكو يەكبون، باكاميان كۆنترە لەكۆچ كردن دا، ئەگەر لە كۆچيشدا وەكو يەكبورن باكاميان بەتەمەنترە- يان كۆنترە لە مسوڵمان بوندا ئيمامەت بكات، هيچ پياوێك نەبێ بەئيمامی كەسێك لەجێگای دەسەڵاتی دا، بادانەنيشێت لە ماڵيان لەسەر شوێنی تايبەتی خاوەن ماڵ، مەگەر خاوەن ماڵ خۆی ڕێی پێ بدات))، وەلەشەوەيەكی تردا هاتوەكە ( هيچ پيٚاوێك نەبێ بەئيمامی پيٚاوێكی تر لەماڵی خاوەن ماڵدا يان لەجێگای دەسلاَتيا)).

٢٢٥- ك/ ١٠٩١ عن عَمْرو بنِ سَلَمَةَ قال: لَمَّا كَانتْ وَقْعَةُ الفتْح بادَرَ كُلُّ قَومٍ باسْلَامِهِمْ وَبادرَ اَبِى قومي باسلامِهِمْ فَلَّما قَدِمَ قال: جئتُكُمْ مِنْ عند النَّبِيﷺ حقاً فقال:

صَلُّوا صَلاةَ كذا في حِين كذا وصَلاةَ كذا في حين كـذا، فـاذا حَضَرَتالـصّلاة فْليُـؤذِّنْ اَحَـدُكُمْ ولْيَؤُمَّكُمْ اَكْثَرُكُمْ قُرآناً فنظروا فَلْمَ يَكنْ اَحَـدٌ اَكْثَـرَ قُرْآنـاً مِنَـي لِمَـا كُنـتُ اَتَلَقّـى الرُّكْبـان فَقَدموني بين اَيدِيهِمْ وَاَنا ابْنُ سِت سنينَ اوْ سَبْع سِنينَ وَكانَتْ عَلَـيَّ بُـرْدَةٌ كُنْـتُ اذا سَـجَدْتُ تَقَلَّصَتْ عَنِّي فقالت امراءَة من الحيّ: اَلا تُغَطُّونَ عَنَا اسْتَ قـارِئكمْ: فاشـتَرَوا فَقَطَعـوا لى قَميصاْ، فَمَا فَرِحْتُ بَشَيءٍ فَرحي بـذالكَ القَمـيص)) رواه البخـاري والنـسائي بنحـوه قـال فيه((كُنْتُ اَؤُهمْ واَنا ابْنُ ثمان سنين)) وابوداود، وقال فيه(( وانا ابـن سَـبْع او ثمـانِ سـنين)) واحمـد(٣/ ٤٧٥)، (٥/ ٣٥، ٧١)، وَلَـمْ يـذكر سـنةُ، خ ( ١٣٢٠٢) وابـوداود (٥٨٥) والنسائي(٢/٩).

له عـەمری کوڕی سەلەمەوە هاتوە، کە وتویەتی: کاتێ فەتحی مەکە کرا، هەمو تیرەو هۆزێك پەلەیان ئەکرد، کە زوتر مسوڵمان بن، باوکم پێشگەلەکەی مـن کـەوت و کاتـێ گەڕایەوە وتی: من لـە لای پێغەمبـەری ڕاسـتەقینە هاتومەتـە لای ئێـوە و، فـەرموی: نوێژی فلانی لەکاتی فلانی دا بکەن و، نوێژی فلانی لەکاتی فلانی دابکەن. واتە: نوێـژ و کاتەکانی بۆ باسکرد بو، ئەویش بەگەلەکەی خۆی گەیاندو، وتی: بایەکێك لەئێوە بـانگ بدات و، ئەوەتان کە زیاتر قورئان دەزانێ ببێ بەئیمامتان، تەماشایان کرد لەناوخۆیانـدا هیچ کەسێکیان نەدی زیاتر لەمن قورئان بزانێت لەبەرئەوەی، کـە مـن هەمیـشە بـەدەم قافڵەوە دەچوم و لەڕێگا هەرچی قورئانیان بخوێندایە لەبەرم ئەکرد، لەبـەر ئـەوە منیـان کرد بەئیمامی خۆیان، من ئەو کات شەش حەوت ساڵان بوم، کراسێکی کورتم لەبەردابو، کاتێك دەچومە سوجدەوە زیاتر هەڵدەقرچاو بەدەنم زیاتر روت دەبو، بۆیە ئافرەتێـك لـەو تیرەیە وتی: ئەوەبۆ دوای قورئان خوێنەکەتان ناشارنەوە لەئێمە! ئەوانیش پارچەیان کـڕی و کراسێکیان بۆ دادڕیم و پۆشیم، بەهیچ شتێك کەیف خۆش نەبوم بەو ئەندازەی، کە بەو کراسە کەیف خۆش بوم، ئەم فەرمودەیە بوخاری بەم شێوە ڕیوایەتی کـردوە، نەسـائیش، بەڵام لەم فەرمودەدا وتویەتی: مـن ئیمامـەتم بۆ ئەکردن، کەتەمەنم هەشت سـاڵان بـو)). ئەبواودیش ڕیوایەتی کردوە، بەڵام ئـەویش لەڕیوایـەتی خۆیـدا ئـەڵێ: (( مـن حـەوت،

هەشت سالآن بوم، بەهەرحالّ هەموی ئەوە ئەگەیەنێ،کە:

١ـ ئەوەی کە زیاتر قورئانی لەبەر بێت و زیاتر شارەزایی قورئان بێ، شایستەی ئیمامەتی هەیە، بابەتەمەنیش نەبێ.

٢ـ ئیمامەتی نا بالّغ بۆ بالّغ دروستە و ئەو ڕیوایەتانەی، کە ئەڵێن دروست نی یە ناگەن بەپلەیەك، کە بەرەنگاری ئەم ڕیوایەتەی پێ بکرێت ـ والله اعلم ـ ئاشکرایە، کە ئەمە بەشی تەقریرە.

٢٢٦- ن/ ١١٠٤ عن ابي هريرةﷺ قال: قال رسُول اللهﷺ: (( يُصَلُّونَ بِكُمْ فان اصابوا فَلَكمْ وَلَهم وَانْ اخطأوا فَلَكمْ وَعلَيْهِمْ)).رواه احمد (٢/ ٣٥٥، ٥٣٦) والبخاري. خ(٦٩٤).

لەئەبو هریرەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: پێشەوایانتان نوێژتان بۆ ئەکەن، جا ئەگەر ئەوان لەکاتی خۆیدا هەڵەیەکی خراپیان تێدا نەبو، ئەوە هەم ئێوەش و هەم ئەوانیش سودیان کردوە، ئەگەر بە دەستی ئەنقەسی کاتیان دوا خست بێ، یان خۆیان نارێك بن لەبیرو باوەڕو پاکی لەش و جل و بەرگ و جێگا، ئەوە ئێوە هەر سودی خۆتانتان دەست ئەکەوێت، بەلام ئەوان لەناو زیان دان.

٢٢٧-ن/ ١١١١ عن جابر قال: (( قام رسول الله لِيُصَلِّيَ فَجِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يساره فَاَخَذَ بِيَدى فَاَدارَني حَتَّى اَقامَني عَنْ يَمِنهِ ثُمَّ جَاءَ جَبَّارُ بِنَ صَخْرٍ فَقَامَ عَنْ يَسار رسول اللهﷺ فأخَذَ بايدينا فَدفعْنَا حَتَّى اَقامَنَا خَلْفَهُ)). رواه مسلم وابو داود( ٦٣٤)، م(٤ـ١/ ٣٠١٠).

لەجابیرەوە هاتوە ،کە وتویەتی: (( پێغەمبەری خواﷺ هەڵسا بۆ ئەوەی نوێژ بکات، منیش هاتم و لەلای چەپیەوە وەستام، دەستی گرتم و چەرخانیە لای ڕاستیەوە، لەپاشان جەیاری کوڕی سەخر هات و لەلای چەپی پێغەمبەرەوەﷺ وەستا، جا دەستی هەردوکمانی گرت و بەرەو دوا پاڵی ناین، تا هەردوکمانی لەپشتی خۆیەوەدانا. واتە

مەئموم ئەگەر یەك نەفەر بێ، دەبێ لەلای ڕاستی ئیمامەوە بوەستێ، ئەگەر بون بەدوان، لەپشتی ئیمامەوە بوەستن، نەك لەم لاو لایەوە، مەگەر مەجال نەبێ.

٢٢٨- ن/ ١١١٧عن ابي مسعود الانصاريﷺ قال: كانَ رسول اللهﷺ يَمسَحُ مَنَاكِبَنَا في الصلاة ويَقُولَ: ((استوا وَلاتَختَلفوا، فَتَختَلِفَ قَلَوبُكمْ لِيَلِيَنيِّ مِنْكم اولُوا الأحلام وَالنُّهى ثُمَّ الَّذينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الذينَ يَلُونَهُمْ)).رواه احمد ٤/ ١٢٢ ومسلم والنسائي ٢/ ٨٧،٨٨ وابن ماجه م(٤٣٢/١٢٣).

لەباوكی مەسعودی ئەنساریەوەﷺ هاتوه، كە وتویەتی: (( پێغەمبەری خواﷺ - لەكاتی ڕیزبونمان ـ دەستی ئەهێنا بەسەر شانەكانماندا بۆ نوێژو ئەیفەرمو:ڕێك بوەستن و نارێك نەبن، چونكە ئەو نارێكیە ئەبێ بەهۆی نارێكی دڵەكانتان، وەكو ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین ـ با ئەوانەی باڵغ و عاقڵن لەپشت منەوە بن، جا هەر بەو پێیەش ڕێزەكانتان ڕیز لەدوای یەك تەواو بكەن ، واتە پێویستە باڵغ و عاقڵەكان ڕێزی یەكەم پڕبكەنەوە، هەروا بچن بۆ ڕێزەكانی تر، پاش ئەوان منداڵ و نابالغ و، پاش ئەوان ئافرەتان، وەكو لە ڕیوایەتی ترەوە ڕون ئەبێتەوە.

٢٢٩- ن/ ١١٢٢ عن أنَسﷺ قال: ((صَلَّيْتُ اَنا وَالْيَتيمُ في بيتنا خَلْفَ النَّبِيﷺوأمِيَّ خَلْفَنا اُمُّ سُلَيْمٍ))رواه البخاري واحمد٣/١١٠والنسائى٢/١١٨، خ( ٧٢٧).

لەئەنەسەوەﷺ هاتوه، كە گوتویەتی: من ومناڵێكی هەتیو لەپشت پێغەمبەرەوەﷺ ـ ودایكم ـ ئومی سولەیم ـ لەپشتمانەوە وەستا، واتە ئافرەتان ئەبێ لەپشت پیاوەوە بوەستن، ئەگەر چی مەحرەم، یان كوڕێكی مناڵیش بێ و، بەتەنیایش بن قەیناكە.

٢٣٠- ن/ ١١٢٣ ((عن ابي هريرةﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((خيرُ صفوف الرِّجال أوَّلُها وَشَرُّهَا آخرِها وخَيْرُ صُفوفِ النساءِ آخرها وَشَرُّها اَوَّلُها)) رواه الجماعة الا البخاري م ( ١٣٠/ ٢٤٠.

لەئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: باشترین

ریزی پیاوان ـ لەنوێژدا ـ ڕیزی یەکەمە و، خراپ ترینیان ڕیزی ئاخر یانەو، باشترین ڕیزی ئافرەتان، ڕیزی ئاخریانەو خراپترینیان ڕیزی یەکەمیانە، چونکە لەتەماشاکردنی نامەحرەمەوە نزیك ئەکەونەوە.

احمد(٢/ ٣٣٦، ٣٥٤) وابوداود(٦٧٨) والترمذي(٢٢٤) والنسائي(٢/٩٣، ٩٤) وابن ماجه(١٠٠٠).

٢٣١- ن/ ١١٢٥ عن وابصةّ بن مَعبَد: (( انَّ رسول اللهﷺ رأى رَجُلاً يُصلِّي خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ فامَرهُ انْ يُعيدَ صَّلاتَهُ)) رواه الخمسة الا النسائي.

لەوابسەی کوڕی مەعبەدەوە هاتوە کە: (( پێغەمبەری خواﷺ چاوی کەوت بەپیاوێك، کە لەدوای ریزەوە لەجەماعەت دا بەتەنیا نوێژ ئەکات، لەبەر ئەوە فەرمانی پێ کرد، کە نوێژەکەی بکاتەوە. لەسەر ئەم فەرمودەیە هەندێ لەزانایان نوێژی تاکی پاش ڕیزیان بەلاوە بەتاڵە و پێویستە موسڵمانان ئاگایان لەنوێژەکانیان هەبێ، هەندێکی ئەم نوێژە بەبەتاڵ نازانن لەبەرئەم فەرمودەیەی، کە ئەبو بەکرە ڕیوایەتی کردوە, احمد ـ٤/ ٢٢٨) وابوداود(٦٦٢) والترمذي(٢٣١) وابن ماجه(١٠٠٤).

٢٣٢-ن/ ١١٢٦ عن ابي بَكرةَ انَّهُ انْتَهى الى النَّبيﷺ وَهُوَ راكِعٌ، فَرَكَعَ قَبْلَ انْ يَصِلَ الصَّفَّ فَذَكَر ذلك لِلنَبيّﷺفقال: ( زَادَكَ الله حِرْصاً وَلا تَعُدْ) رواه البخاري واحمد(٥/ ٣٩) وابو داود٦٨٣ والنسائي(٢/ ١١٨)، خ (٧٨٣) لەئەبو بەکرەوە هاتوە بۆ نوێژ کە گەیشتە پێغەمبەری خواﷺ لەو کاتەدا پێغەمبەرﷺ لەچەمینەوە دابو ـ ئەویش هەر لەدورەوە چوە چەمینەوە، پێش ئەوەی بگاتە ڕیزەکە، جا بەو شێوەیە هات تا خۆی گەیاندە ریزەکەوە، لە پاش ـ نوێژەکە ئەوەی بۆ پێغەمبەرﷺ باسکرد ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ( خوا زیادی بکات بۆ سوربونت لەسەر بەندایەتی، جارێکی تر ئەوە ئەکەیتەوە، واتە هەندێ لە نوێژەکەی کرد لە دەرەوە ڕیزەوە، لە پاشان پێغەمبەرﷺ نەیفەرمو نوێژەکەت بکەرەوە.

٢٣٣- ن/ ١١٣٨ عن ابي قتادة قال: قال رسول اللهﷺ: (( اذا أقيمتِ الصَّلاةُ فلا

تَقُومُ حَتَّى تَرَوْني قد خَرَجْتُ)) رواه الجماعة الا ابن ماجه ولم يذكر البخاري فيه (( قد خَرَجْتُ)) خ(٦٣٨) م(١٥٧/ ٦٠٥) احمد(٥/ ٣٠٤) وابوداود (٥٣٩) والترمذي(٥٩٢) والنسائي(٢/ ٨١).

لەباوکی قتادەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((هەرکاتێ قامەت بۆ نوێژ ئێوە هەڵمەسن، تا من ئەبینن، کە هاتومەتە دەرەوە. واتە: با خەڵك ماتەلی ئیمام نەبێت بەپێوە، بەڵام ئەگەر ئیمام نزیك بو نەتوانی لەگەڵ قامەت دا هەستن و ڕیزەکەی خۆیان پێش هاتنی ئیمام بۆ میحراب ڕێك و پێك بکەن، وەکو لەم فەرمودەیەی دواییدا هاتوە.

٢٣٤- ن/ ١١٣٦ عَنْ أَبِي هُريرةَ رضي الله عنه: أَنَّ الصَّلاةَ كَانَتْ تُقَامُ لرَسُولِ اللهِﷺ فَيَأخُذُه النَّاسُ مَصَافَّهُمْ قَبْلَ أَنَّ يأخُذَ النَّبِيﷺ مَقَامَهُ)) رواه مسلم (١٥٩ــ ١٦٠)، وأبو داود(٥٤١).

لە ئەبو هورەیرەرضي الله عنه هاتوە، کە قامەتی نوێژکراوە بۆ پێغەمبەرﷺ، خەڵك ڕێزەکەی خۆیانیان ئەگرت، پێش ئەوەی پێغەمبەرﷺ بوەستایە، واتە پێش هاتنی ئیمام ڕێز ڕێك کردن دروستە.

٢٣٥- ن/١١٤٢ عَنْ أَبِي مسعودٍ، قالَ نَهَى رَسُول اللهِﷺ أَنْ يَقُومَ الإمَامُ فَوْقَ شَيءٍ، والنَّاسُ خَلفُهُ، يَعْنِي: أَسْفَلَ مِنْهُ)) رواه الدَّارالقطني(٢/٨٨)، والحاكم(١/٢١٠)، والبيهقي في السنن الكبرى(٣/ ١٠٨)، وذكر الحافظ في التلخيص(٢/٩١) وسكت عنه.

لە باوکی مەسعودەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ بەرگری کردوە لەوەی، کە ئیمام لەسەر شتێکی بەرزا بوەستێت و مەئمومەکان لە دوایەوە لە شوێنێکی نزمتر لەو بوەستن. واتە: ئەم بەرزو نزمی ئیمام و مەئمومە، ئەگەر فەرمودەی نوێژی پێغەمبەرﷺ لە میحراب نەبوایە، بە حەرام دائەنرا. والله أعلم

٢٣٦- ن/ ١١٤٣ ((عن سهل بن سَعدٍرضي الله عنه ان النَّبِيﷺ جَلَسَ على المنبر في اوّل يوم وُضع فكبر وهو عليه ثم ركع ثم نزل القهقرى فَسَجَدَ وسجد الناس معه ثم عاد حتى فرغ

فلما وانصرف قال: (( ايها الناس، انما فعلت هـذا لِتَـأْتَمُّوا بـي ولِيَتَعَلَّمُـوا صَـلاتِي)) رواه الجماعة ع (٩١٧) م( ٤٤/ ٥٤٤) احمد( ٥/ ٣٣٩) وابوداود (١٠٨) والنسائي(٢/ ٥٧، ٥٨) وابن ماجه(١٤١٦).

لەسوهەیلی كـوڕی سـەعدەوەﷺ هـاتوە، كـە پێغەمبـەرﷺ یەكـەم ڕۆژی دانـانی میمبەر لەسەری دانیـشت وهـەر بەسـەر ئـەو میمبـەرەوە وەسـتاو ( الله اكـبر)ی نوێـژ دابەسـتنی كـرد و پاشـان لـە سـەر ئەوچـەمیەوەو ـ پـاش (سمـع الله) پـشتاو پـشت لەمیمبەرەكە هاتە خـوارو سـوجدەی بـردو، خـەڵكیش لەگـەڵ ئـەودا سـوجدەیان بـرد، لەپاشان گەڕایەوە، هەتا نوێژەكەی تەواو كرد، واتـە لەهـەمو ڕكاتەكانیـدا، تـا روكـوع لەسەر میمبەرەكەی ئەوەسـتا و، بـۆ سـوجدە ئەهاتـە خـوارەوە، جـا كاتـێ لێ بویـەوە فەرموی: ئەی خەڵكینە ئەمەم كرد لەبەرئـەوەبو، تـا ئێـوە چـاو لـەمن بكـەن و فێـری نوێژەكەم ببن)).

٢٣٧- ن/ ١١٥٥ عن ابن عمرﷺ قال: (( صَحِبْتُ النَّبِيﷺ كَانَ لايزيد في الـسفر عَلَـى ركعـتين وابـابكر وعمـر و عثمـان كَـذلِكَﷺ)). رواه الجماعـة الترمـذي خ( ١١٠٢) م(٦٨٩) احمد(٢/ ٥٦،٢٤) وابوداود(١٢٢٣) والنسائي(١٢٣/٣) وابن ماجه(١٠٧١).

لەعەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، كە وتویـەتی: (ڕەفیقـی پێغەمبـەرمﷺ كردەوە لەسەفەردا، لە دوركات نوێژی زیاتری نەدەكرد ـ لەنوێژی چـوار ڕكاتەكانـدا ـ وە ئەبو بەكرو عومەرو عوسمانیشﷺ هەروەها.

٢٣٨- ن/ ١١٥٩ عن عمرﷺ انَّه قـال: (( صـلاة الـسَّفر ركعتـان وصـلاة الاضـحى ركعتان وصلاة الفِطِر ركعتـان وصـلاة الجمعـة ركعتـان، تمـامٌ مِـنْ غـير قـصرٍ علـى لـسان محمدﷺ. رواه احمد(١/ ٣٧) والنسائي(١١٨/٣،١١١، ١٨٣) وابن ماجه(١٠٦٣).

لەعومەرەوەﷺ هاتوە، كە گوتویەتی: (( نوێژی سەفەر دوركاتـەو، نوێـژی چـەژنی قوربان دو ڕكاتەو، نوێژی جەژنی ڕەمەزان دوركاتەو، نوێژی جومعە دوركاتەو، تـەواوە و كورت نیە لەسەر زمانی محمدﷺ.

٢٣٩- ن/ ١١٦١ عن ابن عمر قال: (( قال رسول اللهﷺ: (( ان الله يُحِبُّ اَنْ تُـؤتى رُخصُهُ كَمَا يَكرَهُ ان تُؤْتِي مَعْصِيَتُهُ)) رواه احمد (٢/ ١٠٨) ، وابـن ماجـه وابـن خزيمـة في صحيحهما.

لەعەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە هاوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویـەتی: ((خوا پێی خۆشە روخسەتەکانی( ئاسنکارییەکانی) ئەنجام بدرێت، هـەروەکو چـۆن پێـی ناخۆشە سەرپێچی کردنی ئەنجام بدرێت. لەڕیوایەتی تردا ئەم بێژەی دواییە بـەم شـێوەیە هاتوە: (( كَما يُحِبُّ أنْ تُـؤْتِيَ عَزَائِمُـهُ/ وەکـو پێـی خۆشـە فرمانـە قورسـەکانی ئـەنجام بدرێت)).

٢٤٠ـ ن/ ١١٦٢ عن أنَس قال: (( صَلَّيْتُ مَـعَ رسـول اللهﷺ الظُّهْـرَ بالمدينـة اربعـاً وصَلَّيْتُ معه العصر بـ(( ذى الحليفة)) ركعتين . اخرجاه / خ ( ١٠٨٩) م(٦٩٠).

لە ئەنەسـەوەرضي الله عنه هـاتوە، کـە وتویـەتی: (( نوێـژی نیـوەڕۆم لەمەدینـە دا لەگـەڵ پێغەمبـەری خـواداﷺبەچـوار رکـاتی کـردوە، نوێـژی عەسـرم لەخزمـەت ئـەودا لـە زیلحولەیفە بەدورکات کرد. واتە پێویست نیە ئەگەر ڕۆژ سەفەرت کرد، تـا شـەو، نوێـژ کورت ئەکرێتەوە، زیلحولەیفە شوێنێکە، کەشەش میل لەمەدینەوە دورەو بەرو مەککـە دەچون. واتە: ئەوەندە مسل نابێ بە بەڵگەی نوێژ کورت کردنـەوە، چـونکە بـۆ جێگـای دورتر ئەڕۆیشتن، هەروەکو ئەگونجێش بکرێت بە بەڵگە، والله أعلم.

٢٤١ـ ن/ ١١٦٣ عن شعبة عن يَحيى بن يزيد الهنائيِّ قال: سـاَلْتُ أنَـساً عـن قـصر الصّلاة؟ فقال: (( كان رسول اللهﷺ اذا خَرَجَ مـسِيرةَ ثَلاثَـةِ اَمیَـالٍ اَوْثلاثَـة فراسِـخَ صَـلَّى ركعتين)) شعبة الشاكَ رواه احمد(٣/ ١٤٦ ومسلم وابوداود ١٢٠١ م( ١٢/ ٦٩١).

لەشوعبەوە لەیەحیای کوڕی یەزیدی هەنائیەوە هاتوە، کە وتویەتی: لـەبارەی کـورت کردنەوەی نوێژەوە پرسیارم لەئەنەس کرد وتی: پێغەمبـەری خـواﷺ ئەگـەر سـێ میـل بچوایە یان سێ فرسەخ نوێژی بەدورکات ئەکرد)) گومانە کە هی شوعبەیە.

٢٤٢ـ ن/ ١١٧١ عن أنس قال: كان رسول اللهﷺ اِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ اَنْ تَزِيغَ الشَمْسُ اُخَّر الظُّهْرَ الى وَقْتِ العَصْرِ ثُمَّ نَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا فإِنْ زَاغَتِ (الشُّمْسُ) قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ صَلّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَكِبَ)) رواه الجماعة الا الترمذي وابن ماجه خ(١١١٢) م(٤٦/ ٧٠٤).

لەئەنەسەوە‌ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەرکاتێ لەحاڵی ڕۆیشتن بوایە، پێش لادانی ڕۆژ لەناوەڕاستی ئاسمان نوێژی نیوەڕۆی دوا ئەخست بۆ کاتی عەسر لەپاشا ـ لەکاتی عەسرا ـ دا ئەبەزی و هەردوکیانی کۆ ئەکردەوە ـ جمع التأخير ـ ئەگەر ڕۆژ لای بدایە و نیوەڕۆ بوایە پێشئەوەی، کە بکەوێتە ڕێگاوە ئەوە نیوە ڕۆکەی ئەکرد، ئینجا سوار ئەبو بۆ سەفەر. لێرەدا ڕواڵەتی کۆکردنەوە، کە تەنها دواخستن ئەگەیەنێ و هەر لەوبارەوە ناڕێکی هەیە لەنێوان زانایانەوە زۆربەیان لەسەرئەوەن، کە کۆکردنەوە لەسەفەردا پێش خستن و پاش خستن دروستەو، بەڵگەیان هەیە (جمع التقديم والتأخير): هەندێك ڕواڵەتی ئەم فەرمودەیان لەبەرچاوگرتوەو ئەڵێن دواخستن ئەبێ، بەڵام پێش خستن نابێت، هەندێکی تر ئەڵێن کۆکردنەوە تەنها لەموزدەلیفەو عەرەفاتدانە بێ نابێت، یەکە ڕای یەکەمیان ڕەئی زۆر تریانە ــ والله اعلم ـ. احمد(٢٤٧/٣، ٢٦٥) وابوداود(١٢١٨) والنسائي(١/ ٢٨٤)( ٥٨٦).

٢٤٣ـ ن/ ١١٧٦ عن إبن عمر ـ ((أَنَّ النَّبِيﷺ صَلَّى المَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بـ (الْمُزْدَلِفَةَ) جَمِيعًا كلَّ واحدة منهما بإِقَامَةٍ وَلَمْ يُسَبِحْ بَيْنَهُمَا ولا على أَثَرِ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا)) رواه البخاري والنسائي٥/٢٦٠، وابوداود(١٩٢٦، ١٩٢٧)، خ(١٦٧٣).

لەعەبدولای کوڕی عومەرەوە‌ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ نوێژی مەغریب و عیشای بەیەکەوە کرد لە موزدەلیفەدا بۆ هەردوکیان قامەتی جیاکرا، بەڵام یەك بانگ وتراوە، وەکولە ڕیوایەتی تردا هاتوە و لەحەجدا باس ئەکرێت، ئەگەر خوا ئارەزوی لێ بێت و لەنێوان ئەودو نوێژەدا و لەپاشیشیانەوە سوننەتی نەکردوە.

٢٤٤ـ ن/ ١١٨٠ عن ابي هريرة وابن عمر بانهما سمعا النَّبِيَّﷺ يقول على اعواد منبره: (( لَيَنْتَهِيَنَّ اَقوامٌ عَنْ وَدَعِهِمُ الجمعانِ او لَيَختَمِنّ الله قلوبهم ثم ليكونُن من

الغافلين)) رواه مسلم ورواه احمد(١/ ٢٣٩ والنسائي(٣/٨٨٠) من حديث ابن عمر وابن عباس م(٦٥٢).

لەئەبو هەوریرەو کوڕی عومەرەوە ﭭ هاتوه، کە ئەوان بیستویانە لەپێغەمبەرەوەﷺ، کە لەسەرمیمبەرەکەی ئەیفەرمو : ((بائەو گەلە واز بینن لەتەرککردنی جومعەکان یان باخوا دڵیان مۆر بکات و بچنە ڕیزی بێ ئاگایانەوە.

٢٤٥ـ ن/ ١١٩٢ عن سلمان الفارسيﭬ قال: قال النَّبِيُّﷺ: (( لايغتسل رجلٌ يَوْمَ الجُمَعَةِ وَيَتَطَّهَرُ بِمَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ وَيُدْهِنُ مِنْ دُهْنِهِ او يمس من طِيبِ بَيْتِهِ ثُمَّ يَروحُ الىَ المسجد وَلا يفرق بين اثنين ثم يصلّي مَاكُتب لَهُ ثُمَّ يُنصِتُ لِلامامِ اذا تَكَلَمَ الاغُفِرَ لَهُ مابين الجمعة الى الجمعة الأُخْرَى)). رواه احمد(٥/ ٤٣، ٤٤٠) والبخاري خ(٨٨٣)،(٩١٠).

لەسەلمانی فارسییەوەﭬ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هیچ پیاوێك لەڕۆژی جومعە دا خۆی ناشۆرێ و بەباشی خۆی پاك و خاوێن ناکاتەوە و لەو چەوریەی، کە هەیەتی خۆی چەور ناکا یان لەو بۆنەخۆشە، کە لەماڵیان هەیە، خۆی بۆنخۆش ناکات، و لەپاشان بچێ بۆ مزگەوت و دوکوس لەیەك جیانەکاتەوە، ئینجا چەند خوا بۆی نوسی بێت نوێژ بکات و، پاشان ئیمام هات، بێ دەنگ بێ بۆقسەی ئیمام، مەگەر خوا چاپۆشی بکات لەتاوانەکانی لەو جومعەیە، تا جومعەی تر، واتە ئەگەر بەو شێوەیە جوڵایەوە. خوا لەتاوانەکانی نێوان ئەو جومعە، تا جومعەی داهاتوی خۆش دەبێ.

٢٤٦ـ ن/ ١١٩٦ عن ابي هريرةﭬ انَّ رسول اللهﷺ قال: ((خير يوم طَلَعَتْ فيه الشمس يومُ الجمعة، فيه خُلِقَ آدمُﭺ وفيه أدخِلَ الجنَّة وفيه أُخْرِجَ منها وَلا تَقُومُ السَّاعَةُ الاّ في يوم الجمعة)). رواه احمد ومسلم(٢/ ٤٠١، ٤١٨، ٥١٢) والنسائي(٣/٨٩) والترمذي(٤٨٨) وصححه م(٨٥٤).

لەئەبو هورەیرەوەﭬ هاتوە، کە بەڕاستی پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((چاکترین ڕۆژێ، کە خۆری تێدا هەڵهاتبێ ڕۆژی جومعەیە، لەودا ئادەمﭺ دروست

کراوەو لەودا خراوەتە بەهەشتەوە و لەودا لەبەهەشت دەرهێنراوە، قیامەت نایەت مەگەر لەڕۆژی جومعەدا.

٢٤٧ـ ن/ ١٢١٧ عن عبدالله بن بُسرﷺ قال: جاءَ رَجلٌ يتخطّى رِقابَ النَّاسِ يوم الجمعةِ والنَّبِي يَخْطُبُ فقال له رسول اللهﷺ: (( اِجلِسْ فقدآذَيتَ٩٩ رواه ابو داود ١١١٨ والنسائي(٣/ ١٠٣) واحمد(١٨٨/٤، ١٩٠) وزاد(وَآنَيْتُ)).

لەعەبدوڵلای کوڕی بوسرەوە هاتوە، کە وتویەتی: پیاوێك لەڕۆژی جومعەدا کاتێ، کە پێغەمبەری خواﷺخوتبەری ئەخوێندەوە هات و هەنگاوی ئەنا بەسەر ملی خەڵکا، جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: دانیشە ئەزیەتت کرد... ئێستادێت)). واتە: هەنگاونان بەسەرخەڵکا ئازاردانیان دروست نیە.

٢٤٨ـ ن/ ١٢٢١) عن ابن عمرﷺ أنَّهُ كان يُطِيلُ الصَّلاةَ قَبْلَ الجُمُعَةِ وَيُصَلِّي بَعْدَها رَكْعَتَيْنِ، وَيُحَدِثُ اَنَّ رسول اللهﷺ كان يفعل ذلك)) رواه احمد(١٠٣/٢) وابو داود(١١٢٧،١١٢٨) والنسائي(٣/ ١١٣).

لەکوڕی عومەرەوە هاتوە، کە (درێژەی ئەدا بەنوێژی پێش نوێژی جومعە، لەپاشدا دورکاتی ئەکرد ئەیوت بەڕاستی پێغەمبەری خواﷺ ئاوای کردوە، واتە: ئەم سوننەتە وەکو باقی سوننەتەکانی تری لێ هێنراوەو کەسێ، یان چەند کەسێ بۆ دەنگ خۆشی، یان خەڵکی بابزانێ جومعەیە بەدەنگی بەرز لەمزگەوتەکاندا قورئان ئەخوێنێ، کە ئیشێکی نارێکەو هیچ بڕیارێکی لە سەر نیەو نوێژیش لەو کەسانە تێك ئەدات، کە خەریکی نوێژ کردنن، با دڵنیابن ئەو قورئان خوێنانە، کە ئیشەکەیان دژی سوننەتی پیغەمبەرە ئیتر ئەیخوێنن،یان نایخوێنن، خۆیان و پاشا ڕۆژی خۆیان، لەهەمو سەیرتر ئەوەیە، کەپارەی وەقفی موسڵمانان ئەدرێ بەو قورئان خوێنانە لەسەر ئەو قورئان خوێندنە؟! دوجار تاوان. (( قَضْيَةٌ وَلا اَبَابَكْرٍ لَهَا)).

٢٤٩ـ ن/ ١٢٢٤ عن جابرﷺ قال: دخل رَجُلٌ يَوْمَ الجُمُعَةِ ورسول اللهﷺ يخطب فقال: ((صَلَّيتَ؟)) قال: لا قال: ((فَصلَّ ركعتين)) رواه الجماعة. خ (١١٩٦) م(٠٥٧،

٥٩). لەجابیرەوە هاتوە، كە گوتویەتی لە ڕۆژی جومعە كاتێ، كە پێغەمبەری خواﷺ خوتبەی ئەخوێندەوە، پیاوێك هاتە ژورەوە فەرموی: نوێژت كردوە؟ وتی: نەخێر، فەرموی: (( دەی دوركات نوێژ بكە، لەڕیوایەتی تردا هاتوە، كە (( فلیركع ركعتین ولیتجوز فیهما)) با دوركات نوێژ بكات و پەلە بكات ـ تابگات بەخوتبەكەدا.

احمد(٣/٣٦٩) وابوداود(١١١٥) والترمذي(٥١٠) والنسائي(٣/١٠١) وابن ماجه(١١١٢).

٢٥٠ـ ن/ ١٢٢٧ عن أنسؓ قال: (( كان النَّبِيﷺ إذا اشْتَدَا البردُ بَكَّرَ بالصّلاةِ واذا اشتد الحَرُّ ابْرَدَ بالصّلاةَ يَعْنِي يَوْمَ الجُمُعَةِ)) رواه البخاري(١/٤٢٨) النسائي خ(٩٠٦).

لەئەنەسەوە هاتوە، كە وتویەتی: (( پێغەمبەری خواﷺ هەركاتێ زۆر ساردبوایە بەیانیان زو دەچو بۆ نوێژی جومعەو زوو تەواوی ئەكرد، تاخەڵك سەرمایی نەبێت و نارەحەت نەبن، كەمێ پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە ناوەڕاستی ئاسمان جومعەی دەست پێ ئەكردو، بەزویی كۆتایی پێ ئەهێنا، واتە: خوتبەی كۆتا بو نوێژەكەی درێژتر بو بەپێچەوانەی ئەمڕۆی ئێمە ـ بەداخەوە؟! هەركاتێ زۆر گەرم بوایە نوێژی دوا ئەخست تاكەمێ فێنكی ئەكردە، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ ئێمەعادەتەو لە عادەت لا نادەین و تەماشای ڕەوشتی پێغەمبەر و فەرمودەكانی ناكەین.

٢٥١ـ ن/ ١٢٢٩ عن سهل بن سعدؓ قال: (( ماكنّا يَقبل وَلا نتغدّى الاّ بعد الجمعة))و رواه الجماعةخ(٩٣٩) م (٣٠/ ٨٥٩) والنسائي وزاد احمد ومسلم والترمذي.

احمد(٥/ ٣٣٦) وابوداود(١٠٨٦) والترمذي(٥٢٤) وابن ماجه(١٠٩٩).

لەسەهلی كوڕی سەعدەوەؓ هاتوە، كە گوتیویەتی: (( ئێمە نەئەخەوتین و نەخواردنمان ئەخوارد مەگەر دوای جومعە... لەزەمانی پێغەمبەرداﷺ. ئەو خەوەی پێش نیوەڕۆ ـ قەیلولەی ـ پێ ئەڵێن و سوننەتە، بەڵام ئایا ئەمڕۆ لەبەردونیا و كارو تەلاشی دنیایی هەرگیز لەبیری و چانێكی ئاوادایین؟ نازانم كەی لەودونیادا مرۆڤ و چان

ئه‌دات و هه‌ناسه‌یه‌كی ئارام و ئاسوده هه‌ڵئه‌كێشێت؟ ئه‌گه‌ر ئێمه دونیا ته‌قه‌ڵا نه‌ده‌ین دڵنیابن، كه دونیا ته‌ڵاقمان ده‌دات. نان نه‌خواردنیش باشه یه‌كه‌م كه‌متر خه‌ودێت و دوهه‌م بۆنی ده‌م كه‌متر دێت، ئه‌مه تایبه‌ت كه‌ری ئه‌وفه‌رموده‌یه، كه فه‌رمویه‌تی: ((خواردن پێش نوێژ بخه)).

٢٥٢ـ ن/ ١٢٣٣ عن السائب بن يزيدﷺ: (( كان النّداء يوم الجمعة اَوَّلُهُ اذا جلس الامام على المنبر عَلى عَهْدِ رَسُولُ اللهِﷺ وابي بكر وعمرَ فَلّما كان عثمانُ وكَثُرَ النَّاسُ زاد النداء الثالث على الزوراء ولم يكن للنَّبيﷺ مؤذن غير واحدٍ. احمد(٣/٤٥٠) رواه البخاري وابوداود(١٠٨٧) والنسائي(٣/١٠٠) وابن ماجه(١١٣٥) والترمذي(٥١٦) قال: حسن، صحيح. خ (٩١٢).

له‌سائیبی كوڕی یه‌زیده‌وه هاتوه، كه وتویه‌تی: (( بانگ له‌ڕۆژی جومعه‌دا ئه‌وه‌ڵه‌كه‌ی ئه‌وكاته بوه، كه ئیمام دائه‌نیشت له‌سه‌ر میمبه‌ر له‌زه‌مانی پێغه‌مبه‌ری خواداﷺ و ئه‌بو به‌كرو عومه‌ردا كاتێ، كه عوسمان بو ـ به‌خه‌لیفه ـ و خه‌ڵك زۆر بو بانگی سێهه‌می ـ به‌قامه‌ته‌وه ـ زیاد كرد، كه له (زه‌وراو)دا ئه‌درا وه پێغه‌مبه‌رﷺ بێجگه له‌یه‌ك بانگ ده‌ر ـ بۆ جومعه ـ نه‌یبو. واته: ئه‌و بانگه‌ی یه‌كه‌م، كه ئه‌مرۆ ئه‌وترێت له‌زه‌مانی عوسمانه‌وه‌ﷺ داهاتوه‌و به‌بیدعه ناژمێردێت له‌به‌ر فه‌رموده‌ی : ((عليكم بِسُنَّتي وسنة خلفاء الراشدين)) پێویسته ده‌ست به ڕه‌وشتی من و خه‌لیفه راشیدینه‌كانه‌وه بگرن)).

٢٥٣ـ ن/ ١٢٣٨ عن جابر بن سَمُرَةَﷺ قال: (( كَانَ رسول اللهﷺ يَخطُبُ قائماً وَيَجْلِسُ بين الخُطبتين وَيَقرأُ آياتٍ وَيُذكِّرُ النَاس)) رواه الجماعة الا البخاريَّ والترمذيَّ م( ٨٦٢).

له‌جابیری كوڕی سه‌موره‌وه‌ﷺ هاتوه، كه وتویه‌تی: ( پێغه‌مبه‌ری خواﷺ به‌پێوه خوتبه‌ی ئه‌خوێنده‌وه و دائه‌نیشت له‌نێوان دو خوتبه‌كانیدا وه چه‌ندین ئایه‌تی ئه‌خوێنده‌وه‌و ئامۆژگاری خه‌ڵكی ئه‌كرد و ئامۆژگاریه‌كانی درێژ نه‌بو، وه‌كو له‌م فه‌رموده‌ی دواییدا هاتوه.

٢٥٤ـ ن/ ١٢٣٩ وعَنْهُ ايْضاًﷺ عن النَّبِـيِّﷺ: (( انـه كـان لايُطيـلُ المَوْعِظَـةَ يَـوْمَ الجُمُعَةِ انَّما هُنَّ كلماتُ يَسيرَاتٌ)) رواه ابوداود(١١٠٧).

هەر لەوەوە دوبارەهاتوە، کە پێغەمبـەری خـواﷺ ڕۆژی جومعـەدا درێـژەی نەئـەدا بەئامۆژگاری لە فەرمودەکانی چەند وشەیەکی ئاسان بون، بەڵێ ئەو چەند وشـە کەمـە، چونکە لەو دڵەوە ئەهات چاك کاری ئەکردە سەر دڵەکان، بـەڵام ئـەمڕۆ نیـو سـەعات و بگرە زیاتر قسە ئەکرێت، بەڵام چونکە هەردەمە لەم گوێیەوە وەری ئەگرێت و لەو یانەوە دەرئەچێت، کارێکی وانەکاتە سـەرخەڵك. داواکـارم لـەخوا تـا نـەمردوین و زینـدومان بکاتەوەو قسەکانمان لە دڵەوە بێت و لەخۆماندا ڕەنگ بداتەوە و کار لە خەڵکیش بکات. آمین.

٢٥٥ـ ن/ ١٢٤٠١ عن ام هشام بِنتُ حارثـة بـنِ النعمـانﷺ قالـت: (( مَـا اَخَـذْتُ ((قٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ )) الاّ عن لسانِ رسول اللهﷺ، يَقْرَؤُها كُـلَّ جمعـةٍ علـى المنـبر اذا خطـب النـاس)) رواه احمـد(٤٣٦/٦،٤٣٥) ومـسلم(١١٠٣/١١٠) وابـوداود(١٥٧/٢) والنسائي، م(٨٧٣ ـ ٥١).

لەداکی هیشامی کچی حاریسەی کوڕی نوعمانەوە هاتوە، کە وتویەتی: قاف والقـرآن المجیـد ـ) بێجگە لەپێغەمبەری خواﷺ لـەدەمی کەسـەوەو، وەرمنـەگرتوە، کـە هـەمو جومعەیەك لەسەر مینبەر کاتێ، کە خوتبەی ئەخوێندەوە بۆ خـەڵك ئەیخوێنـدەوە، واتـە خوێندنی ئەم سورەتە لەخوتبەکانی جومعەدا سوننەتە.

٢٥٦ـ ن/ ١٢٤٣ عن الحكم بن حَـزنِ الكلفـيّﷺ : (( قَـدمْتُ الى النَّبِـيﷺ سَـابِعَ سَبْعَةٍ اوتاسع تسعة فَلَبِثْنَا عِنْدَهُ ايّاماً شـهدنا فيهـا الجمعـة فَقَـامَ رَسُـول اللهﷺ متوَكِّئًـا على قَوْسٍ او قال على عَصاً فَحمد الله واثنى عليه كلمات خفيفات طيباتٍ مباركاتٍ ثـم قال: (( أيها النـاس إنَكُمْ لَنْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تطيقوا كُلَّ مَا اُمِـرْتُم ولكـن سَـددوا وأبْـشِرُوا)). رواه احمد وابوداود(١٠٩٦).

لەحەکەمی کوڕی حەزەنیکە لەفیەوەڕەزی‌الله‌عنه هاتوە، کەوتویەتی: (( هاتمە خزمەتی پێغەمبەرﷺ، کە حەوتەمینی حەوت کەس بووم، یان نۆهەمین نۆکەس، چەند ڕۆژێك لەوشارەدا، ماینەوە لەخزمەت ئەو داو ئامادەی جومعەیەك بوین، جا پێغەمبەری خواﷺ هەڵساو خۆیدا بەسەرکەوانێك، یان وتی: عەسایەك، ئینجا سوپاسی خوای کردو، وەسف و سەنای کرد بەچەند وشەیەکی سوك وپاك و بەڕێز لەپاشان فەرموی: (( ئەی خەڵکینە ئێو ناتوانن بیکەن و تواناتان نیە،کە هەمو ئەو بڕیارەی، کە بەسەرتاندا دراوە بیکەن، بەڵام دڵسۆزو بەردەوام خۆگربن و مژدە دەربن، واتە: دڵسۆزی بۆ ئایین و ڕاست ڕۆیشتن وبەردەوامیتان، ئەبێ بەهۆی پڕکردنەوەی کەم و کوڕیتان و پێویستە مژدە دەربن و خەڵك نەتارێنن و نەتۆرێنن لەئایین.

٢٥٧ـ ن/ ١٢٤٤ عنِ عمارِ بن یاسرﷺ قال: سمعت رسول اللهﷺ یقول: ((إنَّ طولَ صَلاةِ الرَّجُلِ وقِصَر خُطبَتِهِ مَئِنةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأطیلوا الصّلاةَ وَاقصُرُوا الخطبة)). رواه (٢٦٣/٤) ومسلم م(٨٦٩).

لەعەماری کوڕی یاسرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بومﷺ ئەیفەرمو: ((درێژی نوێژی پیاوو کورتی خوتبەکەی، بەڵگەیە لەسەر دەرك و زانای ئەو، دەی با نوێژەکانتان درێژی بێت و خوتبەکانتان کورت کەنەوە.

٢٥٨ـ ن/ ١٢٥٠ عن ابي هريرةﷺ أنّ النَّبِيﷺ قال: (( إذا قُلْتَ لِصاحِبِكَ يَوْمَ الجُمة أَنصِتْ والإمام يخطب فقد لَغَوْتَ))رواه الجماعة الاّ ابنَ ماجة خ(٩٣٤) م( ١١، ١٢/ ٥٨١).

لەئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (( هەرکاتێ لەڕۆژی جومعەدا بەهاوڕێکەت بێ دەنگبەو ئیمام خوتبەی ئەخوێندەوە، بەڕاستی خێرو چاکەی جومعەی خۆتت هەڵوەشاندوەتەوە، واتە پێویستە لەکاتی خوتبەدا بێ دەنگ بیتو هیچ قسەیەك نەکەیت، مەگەر ناچاری بێت.

احمـــــــد(٢/ ٢٨٥، ٢٨٠، ٢٧٢، ٢٤٤) وابـــــــوداود(١١٢)والترمـــــــذي(٥١٢) والنسائي(٣/١٠٤) وابن ماجه(١١١٠).

٢٥٩ـ ن/ ١٢٥٩ عن النُعمان بن بشير رضي الله عنهما قال: (( كان النَّبِيُّ ﷺ يَقْـرَأُ في العِيـدَيْنِ والجمعةِ بـــ((سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى و هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ )) قـال: واذا اجتمـع العيـد والجمعة في يوم واحد يَقْرأُ بهما في الصَّلاتَيْنِ)) رواه الجماعة الا البخاريَّ. م (٨٧٧،٦١).

لەنوعمانی كوڕی بەشیرەوە رضي الله عنهما هاتوە، كە وتويەتی: ((پێغەمبـەر ﷺ لەجەژنـەكان و لەجومعەدا سورەتی: الاعلی وـ الغاشيه ـ ی ئەخوێند، وتی هەركاتێ جەژن و جومعـە لەيـەك ڕۆژدا كۆبونايـەوە لەهـەردو نوێژەكانـدا ئـەو دوسـوڕەتەی ئەخوێنـدەوە ، واتـە خوێندنی ئەم دو سورەتە سوننەتە لەو نوێژانەدا. لە ڕیوايەتی تریشدا هاتوە، كە لـەكاتی يەكەمی جومعەداـ سوڕەتی جومعەی ئەخوێندو لەڕكاتی دوهەمدا سوڕەتی مونـافيقون. واتە خوێندنی ئەم دوانەش لەجومعەدا سوننەتەـ والله اعلم ـ.

احمـــد(٢/ ٢٧١) وابـــوداود(١١٢٢) والترمـــذي(٥٣٣) والنـــسائي(٣/ ١١٢) وابـــن ماجه(١٢١٨).

٢٦٠ـ ن/ ١٢٦١ عن ابن عباس رضي الله عنهما : ((اَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ كَـانَ يَقْـرَأُ يَـوْمَ الجُمَعَـةِ فِـي صَلاةِ الصبح(( الم تنزيل)) و ((هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ )) وفي صلاة الجمعة بسورة ((الجمعة))و (( المنافقين)) رواه الجماعة الا البخاري م(٨٧٩).

لەعەبدڵلای كوڕی عەباسەوە رضي الله عنه هاتوە، كە : ((پێغەمبەری خوا ﷺ لەنوێژی بەيانی ڕۆژی جومعەدا ((الم تنزيل)) و((هل أتى على الأنسان)) واتە: سورەتی سەجدە و سورەتی ئينسانی ئەخوێندوە لەنوێـژی جومعـەدا ـ وەكـو لەپێـشەوە وتمـان ـ سـوڕەتی جومعـە سوڕەتی مونافقين ئەخوێند.

احمـــد(١/٣٢٨،٢٢٦) وابـــوداود(١٠٧٤، ١٠٧٥) والترمـــذي(٥٢٠) والنـــسائي(٢/ ١٥٩) وابن ماجه(٨٢٠).

٢٦١ــ ن/ ١٢٧٤ عـن ام عطيـة قالـت: (( كُـنّ نُـؤمَر اَنْ نُخْـرِجَ الحـيُضَّ فَيُكبِّـرْنَ بتَكْبيرِهِمْ)) رواه الجماعة.

لە دایکی عەتیە وە هاتوە، کە وتویـەتی: (( ئێمـە ئـەمرمان پـێ کـراوە ـ لەلایـەن پێغەمبەرەوەﷺ کە ئەو ئافرەتانەیش، کە لە عوزی شەرعیدان دەریان بکـەین ـ و ڕۆژی جەژن بێنە شوێنی نوێژەوە، لە کەناری جێگـای نوێـژە وە دانیـشن و (الله أكـبر) بکـەن لەگەڵ (الله أكبر)ی پیاواندا. واتە جەژن تایبەت مەندییەکی هەیە، وەکـو حـەج هەنـدێ شت مـاوەی پێـدراوە وەکـو سـرود بـەدەنگی ئـافرەت و دەف لێـدان و هاتنــە دەرەوەی ئافرەتان بۆ شوێن نوێژی جەژن و(الله اكبر)کردنیان لەگەڵ دەنگی پیاواندا، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین، کە ئەمــە تایبەتەمەندییــەو لەیاسـایەکی گـشتی لادراوەو، نابـێ بیکـەیت بەقیاس بۆ شتانی تر ـ والله أعلم ـ.

احمـــد (٥/٨٤) خ(٩٧٤) م(١٢/ ٨٩٠) وابـــوداود(١١٣٦) والترمـــذي(٥٣٧) والنسائي(٣/١٨٠) وابن ماجه(١٣٠٨.

٢٦٢ـ ن/ ١٢٧٧ عن بُرَيدةرضي الله عنه قال: (( كـان رسـول اللهﷺ لايَغْـدو يَـوْمَ الفِطْـرِ حَتَّـى يأكُـلَ ولايأكُـلَ يـومَ الاضـحى حتّـى يرجِـعَ)) رواه ابـن ماجـه(١٧٥٦) والترمـذي(٥٤٢) واحمد(٢/٣٦٠،٣٥٢) وزاد: (( فيأكل مِنْ أضحيته)).

لەبورەیدەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: (( پێغەمبەری خواﷺ بەیانی جەژنی ڕەمـەزان نە ئەچو بۆ نوێژ، تا چەند دەنکە خورمـای بـەتاکی نەخواردایـە، ڕۆژی جـەژنی قوربـان هیـچی نەئـەخوارد هـەتا لەنوێـژ ئەگەڕایـەوە... جـا لەقوربانیەکـەی ئـەخوارد، واتـە نەخواردنی شت پێش نوێژی قوربان و خواردنی پێش نوێژی جەژنی ڕەمـەزان سـوننەتەو، کوشتنەوەی قوربانی لەڕۆژی یەکەم داو خواردن لەو قوربانیە هەر سوننەتن.

٢٦٣ــ ن/ ١٢٧٨ عـن جـابررضي الله عنه قـال: (( كـان النَّبِـيﷺ اذا كـانَ يَـوْمُ عِيـدٍ خـالَفَ الطَّرِيقَ)) رواه البخاري خ(٩٨٦).

لەجابیرەوەرضي الله عنه هـاتوە، کـە وتویـەتی: (( پێغەمبـەرﷺ لـەڕۆژی جـەژن دا ڕێگـای ڕۆیشتنو گەڕانەوەی ـ ئەگۆڕی. لەڕێگایەکەوە ئەچو، لەڕێگایەکی ترەوە ئەگەڕایەوە.

٢٦٤ـ ن/ ١٢٨٤ عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: (( كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَبُو بَكَرَ وَعُمُرَ يُصَلُّونَ العيدَيْنِ قبل الخُطبَة)) رواه الجماعة الا اباداودَ. خ (٩٦٣) م (٨/ ٨٨٨).

لەعەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە رضي الله عنهما هاتوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەكرو عومەر نوێژی جەژنیان پێش خوتبە ئەنجام ئەدا، واتە بەپێچەوانەی جومعەیە.
احمد(٢/ ١٢) والترمذي(٥٢٩) والنسائي(٣/ ١٨٣) وابن ماجه(١٢٧٦).

٢٦٥ـ ن/ ١٢٨٥ عن جابر بن سُمَرة رضي الله عنه قال: (( صَلَّيتُ مَعَ النَّبيِّ ﷺ العيدَ غَيْرَ مَرَّةٍ ولا مَرَّتين بغير اذانٍ ولا اقامَةٍ)) رواه احمد(٥/ ٩١، ٩٤)، وابوداود(١١٤٨)، والترمذي(٥٣٢)، م(٢٨٧/٧).

لەجابیری كوڕی سەمورەوە رضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: ((نوێژی جەژنم نە جارێك نە دوجار، بەڵكو زیاتر لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ كردوە، بەبێ بانگو بەبێ قامەت. واتە بانگ دان و قامەت كردن بۆ نوێژی جەژنەكان سوننەت نیە.

٢٦٦ـ ن/ ١٢٨٩ عن عَمْرو بن شُعيب عن ابيه عن جَدِّه: (( اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كبَّرَ في عيدٍ اثِنْتَيْ عَشْرَ تكبيرةً سَبْعاً في الاولى وخمساً في الآخِرَةِ ولَمْ يُصَلِّ قَبْلَها وَلا بَعْدَها)). رواه احمد وابن ماجه(١٢٧٨).

لەعەمری كوڕی شوعیب لەباوكیەوە لەباپیریەوە ﷺ هاتوە، كە: ((پێغەمبەر ﷺ دوانزە جار (الله اكبر)ی وتوە لەنوێژی جەژن دا، حەوتیان لەركاتی یەكەم، پێش خوێندنی فاتیحەو، پێنجیان لەڕكاتی دوهەم، پێش خوێندنی فاتیحە[1]، لەپێش نوێژی جەژن و لەپاشیەوە نوێژی نە دەكرد، لەپاش گەڕانەوە بۆ ماڵ دوركات سوننەتە.

٢٦٧ـ ن/ ١٣٠٠ عن الهرماس بن زياد رضي الله عنه قال: (( رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ النَّاسَ عَلَى نَاقَتِهِ العَضباءِ يَوْمَ الأضحى بِمِنَى)) رواه احمد وابو داود.

لەهیرماسی كوڕی زیادەوە رضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: ((ڕۆژی جەژنی قوربان لەمینا

---

(١) ـ تەماشای راڤەی هەمان فەرموده و فەرمودەی (١٢٩٠) لەسەرچاوەی پێشو بكە.

پێغەمبەرم بینی ﷺ لەسەر وشترەكەی كەناوی ـ عەزبا بو ـ خوتبـەی ئەخوێنـدەوە بـۆ خەڵك واتە: خوتبەی ڕۆژی جـەژنی قوربـان سـوننەتە، ئەگـەر پێویـست بـو بەسـواریش ئەخوێنرێت. احمد (٣/ ٤٨٥)، (٥/ ٧) وابوداود(١٩٥٤).

٢٦٨ـ ن/ ١٣٠٤ عن عَمَيرِ بن أنَس عمومة له مِن الانصارﷺ قالوا: (( غُـمَّ عَلَيْنـا هِلالُ شَوّالَ فَاَصْبَحنَا صِياماً، فَجَاءَ رَكْبٌ مِنْ آخر النهارِ فشهدوا عند رسول اللهﷺ أنّهم رأوا الهلال بالْأمسِ فَامَرَ النّاسَ ان يُفْطِروا مِنْ يَـوْمِهِمْ وَانْ يَخْرجـوا لِعِيـدهِمْ مِـنَ الغَـدِ)) رواه الخمسة الاّ الترمذي.

لەباوكی عومەیری كوڕی ئەنەسەوە لەمامۆكانیەوە، كە یاریـدەدەر بـون هـاتوە، كـە وتویانە: ((مانگی یەكشەوی شەوالمان بە هۆی هەورەوە لیّ شارایەوە، لە بەیانیدا بـەڕۆژو بوین، جا لە ئاخری ڕۆژەوە قافڵەیەك هاتن و لەخزمەت پێغەمبەری خواداﷺ شـایەتیان دا، كە دوێنێ ئێوارە مانگیان دیوە، گورج فرمانی بەخەڵكدا، كە ڕۆژوەكەیان بشكێنن و بەیانی دەربچن بۆ نوێژی جەژنەكەیان. واتە: ئەگەر مانگی شەوال نەبینرا بـەهۆی تـەم و مژ و هەورەوە، لەشەوی سێهەمی ڕەمەزان دا، حەق وایە بە ڕۆژوبن و سی ڕۆژەكە تـەواو بكەن، جا ئەگەر لەبەیانی ڕۆژی سـێهەمی ڕەمەزانـدا، تـا ئیوارەكـەی شـایەت هـات و شایەتی دا، كـە شـەوی سـیهەم مـانگی شـەوالمان دیـوە، دەبـێ ئـەو ڕۆژە بـشكێنن و نوێژەكەیان لەڕۆژی دوهەمدا ئەكەن ، واتە نوێژەكەیان نافەوتێ.

احمد(٥٨/٥) وابوداود(١١٥٧) والنسائي(٣/ ١٨٠) وابن ماجە(١٦٥٣).

# نوێژی ترس

٢٦٩ـ ن/ ١٣١٠ عن صالح بن خَوّات عَمَّن صَلّى مَعَ النَّبـيﷺ ذات الرِّقـاع: (( اَنَّ طائفَةً صَفَّتْ مَعَهُ وَطائِفَةٌ وجاهَ العَـدوّ. فَـصَلَّى بـالَّتي مَعَـهُ رَكْعَـةً ثُـمَّ ثَبَـتَ قَائِمـاً فَـأَتَموُّ لأنْفُسِهِمْ ثم انصرَفوا وِجاه العَدُوِّ وَجاءت الطائِفَةَ اْلأخرى فَصَلَّى بِهِـمْ الرَّكْعَـةَ الـتي بقيـتْ مِنْ صلاته فأَتَمَوّا لِأَنْفُسِهمْ فَسَلَّم بِهِمْ)) رواه الجماعة الا ابـنَ ماجـة والترمـذي خ(٤١٢٩) م(٣١٠/ ٨٤٢) احمد(٤٤٨/٣) وابوداود(١٢٣٨) والنسائي(١٧١/٣).

لەسالّحی كوڕی خەواتەوە لەوانەی، كە لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ لەزاتوریقاع دا نوێژیان كرد هاتوە، كـە: (( كۆمــەڵێك لەگــەڵ ئــەوداﷺ ڕیزیــان بەســتوەو كۆمــەڵێكی تریــان بەرەورووی دوژمن وەستاون، جا لەگەڵ ئەوانەی، كـە لەگـەڵیا نوێـژیان دابەسـتبو، یـەك ركاتی كرد، ئیتر بەپێوە وەستا، تا ئەوان ركاتەكەی تریان تەواو كرد بـۆ خۆیـان و بـەرەو ڕوی دوژمن ڕۆیشتن و كۆمەڵەكەی تر هاتن و بـۆ ئـەوانیش ركـاتێكی كـرد، كـە پـاش ماوەی نوێژەكەی بو، جا ئەوان لەكاتی دانیشتنی پێغەمبەرداﷺ هەسـتان و ركاتەكـەی تریان بۆ خۆیان تەواوكردو بەوان سەلامی دایـەوە، واتـە پێغەمبـەرﷺ دوركـاتی كـردو ئەوانیش هەریەكەی دوركاتیان كرد، ئەمە شێوەیەكە لەشـێوەی جۆراوجۆرەكـانی نوێـژی كاتی ترس. بۆ شـێوەكانی تـریش ئـەتوانیت تەماشـای فـەرمودەكانی ژمـارە ١٣١١ ـ ١٣٢٢ لە نیل الأوطار بكەیت.

٢٧٠ـ ن/١٣٢٥ عن عائشة قالت: (( خَسف الـشمس في حيـاة رسـول اللهﷺ فَخَـرَجَ رَسُول اللهﷺ إلى المَسجد، فَقَامَ فَكَبَّرَ، وَصَفَ النَّاسَ وَراءَهُ، فَقرأ قـرَاءَةً طَويلَـةً، ثُـمَّ كَبَّـرَ فَركَعَ رُكوعاً طَويلاً هُوَ أَدنى مِنَ القـرَاءَةِ الأُولى، ثُـمَّ رَفَـعَ رَأْسَـهُ فَقَـالَ: ((سَـمِعَ اللهُ لِمَـنْ حَمِدَهُ رَبَنَّا لَكَ الحَمْد)) ثُمَّ قَامَ فَقْرأ قِرَاءَةً طَويلَةً هـيَ أَدْنَـى مِـنَ القـراءةِ الأولى، ثُـمَّ كَبَّـرَ فَركَعَ رُكوعاً هُوَ أَدنى مِنَ القِرَاءَةِ الأُول، ثُمَّ قَالَ: ((سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَنَّا لَكَ الحَمْد، ثُمَّ

سَجَدَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الأخرى مِثْلَ ذلكَ حَتَّى اسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكعاتٍ، وَ أَرْبَعَ سَجْدَاتٍ، وانْجَلَتِ الشَمْسُ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ، ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ النَّاسَ، فَأَثْنى عَلى اللهِ بِما هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَ قَالَ: إنَّ الشَمْسَ والْقَمَر آيتانِ مِنْ آيات اللهِ ـ عزوجل ـــ لا يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلا لِحَياتِهِ، فَإذا رأيتموهُمَا فَافْزَعُوا إلى الصَّلاةِ)) رواه الجماعة احمد، خ (١٠٤٤)م (١٠٤٦).

لەخاتو عائیشەوه‌ﷺ هاتوه، كه وتویەتی: (( لەسەردەمی پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆژ گیرا، جا پێغەمبەری خواﷺ دەرچو بۆ مزگەوت و وەستاو(الله اكبر)ی ـــ نوێژ دابەستن ـ كردو، خەڵك لەدوایەوه ڕیزی بەست، قورئانێكی زۆر درێژی خوێند، لەپاشان (الله اكبر)ی كردو چوه ركوعەوه، ركوعێكی درێژی كەمتر بو لەقورئان خوێندنەكەی ئەوەڵ لەپاشان سەری بەرزكردەوه فەرموی: (سمع اللهُ، لِمَنْ حَمِدَهُ، ربنا لَكَ الحَمدُ) لەپاشان وەستاو دەستی كرد بە قورئان خوێندنێكی درێژ، كه كەمتر بو لەقورئان خوێندنی یەكەم، لەپاشان ( الله اكبر)ی كرد و چوه ركوعەوه، ركوعێكی درێژ، كەكەمتر بو لەركوعی یەكەم لە پاشان سەری بەرزكردەوەو فەرموی: (سمع الله لمن حمدَهُ ربنا لك الحمد) لەپاشان سوجدەی برد، لەپاشا لەركاتی دوهەمیش دا هەروەكو ركاتی یەكەمی كرد، هەتا چوار ركوع و چوار سوجدەی تەواو كرد، پێش ئەوەی لەنوێژەكەی دەرچێت ڕۆژ دەركەوت، لەپاشان وەستاو خوتبەی بۆ خەڵك خوێندەوه، حا سوپاس و سەنای خوای كرد بەوشێوەی كەشایستەی ئەو بێت و لەپاشان فەرموی: ( ڕۆژو مانگ دو نیشان لەنیشانەكانی خوای تواناو گەوره گیرانیان بۆ مردن و ژیانی هیچ كەسێك نیە،هەركاتێ ئەو دوانەتان دی كە گیران ـ بەپەله دەست بكەن بە نوێژ. ئەمە شێوەیەك بو لەشێوەكانی نوێژی ڕۆژگیران و مانگ گیران بەچەند شێوەی تریش هاتوەو هەمویان دروستن.[1] وابو داود (١١٧٧) والترمذي(٥٥٨) والنسائي(١٣٢/٣) وإبن ماجه(١٢٦٣).

---

(١)ـ بۆ زیاتر شارەزا بونی شێوەكانی تر تەماشای فەرمودەی ژمارە(١٣٣٢ــــ ١٣٣٣) لەسەرچاوەی پێشو.

٢٧١ــ ن/ ١٣٣٥ وعنها ايضاً رضي الله عنه اَنّ النَّبِي صلى الله عليه وسلم جَهر في صلاة الخسوف بقراءَتِه فَصَّلى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي ركعتين واربع سَجَدات)) اَخرجاه خ (١٠٦٥) م (٥/ ٩٠١).

وه دوباره هەر لەوەوە رضي الله عنه هاتوه كە: ((بەڕاستی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆنوێژی ڕۆژ گیران بەدەنگی بەرز قورئانی خوێندوەو چوار روكوعی لە دوركات دا و چوار سوجدەی ئەنجام داوەو وەكو فەرمودەكەی پێشو.

٢٧٢ـ ن/١٣٤٠ وعنها أيضاً: (( اَنَّ النَّبِي صلى الله عليه وسلم قال: (( ان الشمس والقمر آيتان مِنْ آيات الله لايخسفان لموت احدِ ولا لِحَياتِهِ فاذا رأيتم ذلك فادعوا الله وكبِّرواو تَصَدَّقوا وصَلَّوا)).رواه الجماعة الا احمد خ (١٠٤٤)، (١٠٤٦) م(١/ ٩٠١).

وەهەر لەوەوە رضي الله عنها هاتوه كە : (( پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: ((ڕۆژ و مانگ دوئایەتن لەئایەتەكانی خوا نە بۆ مردنی كەسێك و نەبۆ ژیانی كەسێك ناگیرێن ، جا هەر كاتێ ئەوەتان دی، با بپاڕێنەوە لەخواو (الله اكبر) بكەن و چاكە بكەن و نوێژ بكەن.

ابو داود(١١٧٧) والترمذي(٥٥٨) والنسائي(٣/ ١٣٢) وابن ماجه(١٢٦٣).

# نوێژە بارانە

٢٧٣ـ ن/ ١٣٤ عن ابي هريرةﷺ قال: ((خَرَجَ نَبِيُﷺ يوماً يَسْتَسْقِي فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ بِلا أذانٍ، ولا إقَامَةٍ، ثُمَّ خَطَبْنَا، وَ دُعاء الله ـ عزوجل ـ وَحَوِّلْ وَجْهَهُ نَحْوَ القِبْلَةِ رَافِعَاً يَدَيْهِ ثُمَّ قَلَبَ رِدَاءَهُ فَجَعَلَ الأَيْمَنَ عَلَى الأَيْسَرِ وَالأَيْسَرَ على الأيمنِ)). رواه احمد(٢/٣٦٢) وابن ماجه(١٢٦٨).

لەئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: ( ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ بۆ داوای باران کردن دەرچو ، جا دورکات نوێژی پێ کردین بێ بانگ و بێ قامەت، لەپاشا خوتبەی بۆ خوێندینەووە لەخوای ـ بەهێزو گەورە ـ پاڕایەوە و چەرخایەوەو ڕوی کردە قیبلەو دەستەکانی بەرز کردەوە، لەپاشا عەباکەی هەڵگێڕایەوە لای ڕاستی خستە سەر لای چەپی ولای چەپیشی خستە سەر لای ڕاستی، واتە خوایە هەر ئاوەها ئەم وەزعەمان بۆ بگۆڕە و ئەم بێ بارانیەمان بۆ بکە بەباران. لێرەدا ئەمانە وەرئەگیرێن.

١ـ سوننەتە نوێژی داوای باران کردن، دورکاتە.

٢ـ نوێژ بەر لەخوتبەیە.

٣ـ بانگ و قامەتی تێدا نیە وەکو نوێژی جەژنەکان.

٤ـ خوێندنەوەی خوتبە سوننەتە.

٥ـ دەست بەرزکردنەوە بۆ کاتی دوعاو پاڕانەوە سوننەتە.

٦ـ لەکاتی خوتبە ڕو ئەکرێتە خەڵك و، بۆ دوعای داوای باران کردن ڕو ئەکرێتەوە قیبلە.

٧ـ گۆڕاندنی عەبا، یان بەر ماڵ، یان چۆخە سوننەتە چ سەروبنی بکەیت، یان ئەم دیو دیوی بکەیت، یان چەپ و ڕاست، هەروەها سوننەتە بەدەنگی بەرز نوێژەکە

بخوێندرێت، وەكو لە فەرمودەی دروست داهاتوە.

٢٧٤ــ ن/ ١٣٥٧ عَـنْ عائـشةرضي الله عنها قالـت: كـان رسـول اللهﷺ اذا رأى المَطَـرَ قـال: ((اللهم صَيِّباًنَافِعاً)) رواه احمد(٦/ ١٢٩) والبخاري(٩٢١) والنسائي(١٠٣٢).

لەخاتون عائیشەوەرضي الله عنها هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هـەركاتێ چـاوی بەباران بكەوتایە ئەیفەرمو: ((اللهم صیبا نافعاً ئەی خوایە ئەم بارانە بكە بە بـارانێكی بەسود)).

## سەردانی نەخۆش

٢٧٥ـ ن/ ١٣٦١ عن ثوبانرضي الله عنه قال: قال رسول اللهﷺ: (( اِنَّ المُسلِمَ اذا عَـادَ أخـاهُ المُـسلِمَ لم يـزل في مَخْرَفَـةِ الجنَـةِ حَتَّـى يَرْجِـعَ)) رواه احمـد مـسلم والترمـذي م(٤١، ٤٤/ ٢٥٦٨).

لەسـەوبانەوەرضي الله عنه هـاتوە، كـە وتویـەتی: (( پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی: ((مسولْمان هەركاتێ سەردانی برایەكی مـسولْمانی ـ نەخۆشـی ـ كـرد بـەبێ پـسانەوە لەچێنراوی بەهەشت دا ئەبێت، هەتا ئەگەڕێتەوە.

احمد(٥/٢٧٦، ٢٧٧، ٢٨١،٩٧٩، ٢٨٣،٢٨٢) والترمذي(٩٦٧، ٩٦٨).

٢٧٦ـ ن/ ١٣٦٦ عَنْ أَبِي سعيد، عـن النَّبِـيِّﷺ قـال: ((لَقِّنـوا مَوْتَـاكمْ ((لا الـه الاّ الله)) رواه الجماعة الا البخاري م(١/ ٩١٦).

لەباوكی سەعیدەوەرضي الله عنه هاتوە لە پێغەمبەرەوەﷺ، كە فەرمویـەتی: (( وشـەی ـ لا اله الا الله)) بلْێن بەو كەسانەی كە نزیكی گیان دانن.

احمد(٣/٣) وابوداود(٣١١٧) والترمذي(٩٨٣) والنسائي(٤/٥) وابن ماجه(١٤٤٥).

٢٧٧ـ ن/ ١٣٧١ عن ابي هريرة، عن النَّبِيﷺ قـال: (( نفـس المـؤمِنْ مُعَلَّقَـةٌ بِدَيْنِـهِ حتى يُقْضَى عَنْـهُ)) رواه احمـد(٢/ ٥٠٨،٤٤٠) وابـن ماجـه(٢٤١٣) والترمـذي(١٠٧٨،

١٠٧٩)، وقال: حديث حَسنٌ. لەئەبو هوریرەوەﷺ هاتوە لەپێغەمبەرەوەﷺ کە فەرمویەتی: (( گیانی مسولمانان بەستراوە بەقەرزەکەیەوە. واتە: ئەو قەرزە ئەبێ بەهۆی ئێش و ئازار دروست کردن ـ هەتا قەرزەکەی بۆ جێ بەجێ ئەکرێت.

٢٧٨ـ ن/ ١٣٧٣ عن عائشةﷺ : (( اَنَّ اَبَا بكر دَخَلَ فَبَصُرَ بِرسول اللهﷺ وهو مَسَجىّ بِبَردِهِ فَكَشَفَ عن وجهه واكبَّ عليه فَقَبَّلَهُ)).رواه احمد(٦/ ١١٧)والبخاري(٤/١١) والنسائي خ(١٢٤٢،١٢١٤).

لەخاتون عائیشەوەﷺ هاتوە، کە ئەبو بەکر هاتە ژورەوە چاوی بەپێغەمبەری خوا کەوت، کە بەعەباکەی داپۆشرابو، جا عەباکەی لەسەردەم و چاوی لاداو خۆی خستە بەسەریاو ماچی کرد. واتە داپۆشینی مردو وتەماشاکردنی دەم و چاوی وماچ کردنی دروستەو، پێغەمبەرﷺ عوسمانی کوڕی مەزعون بەمردوویی ماچ کردوە ـ کەبرای شیری بو ـ فرمێسك بەچاویدا دەهات.[1]

٢٧٩ـ ن/ ١٣٨٢)عن جابر قال: كان رسول اللهﷺ يجمع بين الرجلين مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ ثُمَّ يَقُولُ: (( أَيُّهُم أَكْثَر أَخْذَاً للقرآن؟)) فاذا أشير الى احدهما قَدَّمَهُ في اللَّحدَ وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ وَلَمْ يُغَسَّلُوا وَلَم يُصلِّ عَلَيْهم)). رواه الجماعة الا مسلما وابو داود خ(١٣٤٧).

لەجابیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەردوو نەفەر لەکوژراوانی ئوحودی لەیەك پۆشاك دا دائەناو، لە پاشا ئەیفەرمو: ((کامیان قورئانی زیاتری لایە)). جا گەر هێما بکرایە بۆ لای یەکێکیان، پێشی ئەخست لەگۆڕەکەداو فرمانی ئەدا بیانشارنەوە بە خوێنەکەیانەوە و نوێژیان لەسەر نەکرا.((لَحَد) بەو گۆڕە ئەڵێن کەتا ئەندازەی زەلامێك قوڵ ئەکرێت، ئینجا لەژێرەوە لەلای قیبلەوە دادەنرێت، تا جێگای مردوەکەی تێدا ئەبێتەوە، ئینجا مردوەکە ئەخەنە ژێری و لەپشتیەوە بەردوشت دا

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە(١٣٧٥) لەسەرچاوی پێشو بکە.

ئەنرێت و هەڵكەنراوەكە بەباشی پڕ ئەكرێتەوە، كە ئەو شـێوە گـۆڕ كردنـە لـەم وڵاتـەی خۆماندا باونیە، بەڵكو ئەوەی باوە لێرە پێی ئـەوترێ(شـق) لـەتكردنی زەوی و ناشـتنی مردوەكەیە تێیدا.

احمد(٤٣١/٥) والترمذي(١٠٤١) والنسائي(٦٢/٤) وابن ماجه(١٥١٤).

٢٨٠ـ ن/ ١٣٨٥ عن ام عطية قالت: دَخَـلَ عَلَيْنَـا رَسُـولُ اللهِﷺ حِينَ تُوفِيَـتْ ابنتُـهُ فقال: (( اِغسِلْنَهَا ثَلاثاً اوخمسا او اكثر من ذلك ان رأيْتُنَّ بماء وسِدْرٍ واجعلن في الأخيرة كافوراً، اوشيئاً من كافورٍ ـ فاذا فَرَغتنَ فآذنني فلما فرغن آذنَّاه، فاعطانا حَقْوَه فقـال: (( اَشعِرنها ايـاه)) يعـني إِزَارَهُ وَراه الجماعـة في روايـة لهـم: (( ابـدأْن بِميامِنَهَـا وَمَوَاضِـعَ الْوضُوءِ مِنْهَا)) وفي لفظ ( اِغسلْنها وِتْراً ثَلاثـاً اوخمـساً او سـبعاً او اكثـر مـن ذلـك ان رأيْتنّ)) وفيه: قالت: فضفرنا شَعْرَهَا ثَلاثَةَ قَرُونٍ فَأَلْقَيْنَاهَا خَلْفَهَا)) متفق عليه لكن لـيس لمسلم فيه(( فألقيناها خلفها)). خ (١٢٥٣) م(٩٣٩/٣٨).

لەخاتو ئومەعەتیەوە رضي الله عنها هاتوە، كە وتويـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ كاتـێ، كـە كچەكەی مرد بو هاتە لامان و فەرموی: (( سێ جار، یان پێنج جار، یان زیـاتر، ئەگـەر واتان پێ باش بو بەئاو و بەمۆرد بیشۆن لەكۆتاییدا كافوریـشی تـێ بكـەن، یـان شـتێ لەكافور ـ جا هەر كاتێ لێ بونەوە خەبەرم بدەنێ، جا ئێمەیش كەلێ بوینەوە خەبـەرمان پێدا.

ئەوسا كراسەكەی خۆی پێ داین و فەرموی: لەژێری كفنەكەیەوە بكەنە بەری... هـەر لەڕیوایەتێكی تری هەموویانەوە هاتوە، كە فەرمویەتی: (( پێشەكی ـ بۆ شۆردن ـ لەلای ڕاست و جێگای دەست نوێژییەوە دەست پێ بكەن)).

فەرموی: (( بەتاك بیشۆن، سێ، پێنج، حەوت، یان زیاتر، ئەگەر واتان بەلاوە بـاش بو، هەر لەو ڕیوایەتەوە هاتوە، كە ئومو عەتیە ئەڵێت: قژەكەیان كرد بەسێ كەزییـەوەو خستمانە پشتیەوە، ئەوەی باسكرا لەچـۆنیەتی و چـەندیەتی شـۆردن سـوننەتە.احمـد(٥/ ٨٤) ابوداود(٣١٤٢) والترمذي(٩٩٠) والنسائي(٣١/٤) وابن ماجه(١٤٥٨).

٢٨١ـ ن/ ١٣٩٠عن جابر، قال النَّبيﷺ: (( اذا كفّنَ أَحَدُكُمْ اَخاه فُلْيُحْسنْ كَفَنَـهُ)) رواه احمد(٢٩٥/٣) ومسلم وابوداود(٣١٤٨) م( ٩٤٣/٤٩) والنسائي(٤/ ٣٣).

لەجابیرەوەﷺ هاتوە كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: كە: (( هەركاتێ یەكێك لـەئێوە برایەكی كفن كرد، با بەچاكی كفنی بكات)).

٢٨٢- ن/ ١٣٩٨ وعنهما ايضاً قال: قال رسول اللهﷺ: ((اِذاَ اَجمـرْتُمُ المَيِّـتَ فـأجْمرِوُهُ ثَلاثاً)) رواه احمد(٣٣١/٣).

هەروەها لەوەوەﷺ هاتوە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ((هـەركاتێ مردویەكتان بۆن خۆش كرد، سێ جار بۆنی خۆشی لێ بدەن)).

٢٨٣ـ ن/ ١٤٠٣ عن زيد بن خالد الجهني اَنّ مِن المسلمين توفى بــ(خيـبر) وانَّـهُ ذُكِـرَ لرسول اللهﷺ فقال: (( صَلوا على صاحبكم) فتغيَّرتْ وجوه القوم لذلك، فلما رأى الذي بهم قال: (( اِنَّ صَاحَبِكُم غَلَّ فِي سَبِيلِ اللهِ) ففتـشنامتاعه فوجدنا فيـه خـرزاً مـن خـرزِ اليهودِ مايساوي دِرهمين)). رواه الخمسة الا الترمذيَّ واحمد.

لەزەیدی كوڕی خالیدی جوهەینیەوەﷺ هاتوەكە: پیاوێك لەمسولْمانان لە(خەیبەر)دا وەفاتی كردو بۆ پێغەمبەری خواﷺ باسكرا ـ كە نوێژی لەسەربكات ـ فەرموی: ((نوێـژ بكەن لەسەر رەفیقەكەتان)) خەلْكەكە بەوە نارەحەت بون و ڕەنگیـان تێكـچو جـا كاتـێ ئەوەی لەوان دی فەرموی: ((بەڕاستی رەفیقەكەتان لـەرێگای خـوادا خیانـەتی كـردوە ، جائێمەیش تەماشای كەل و پەلەكەیمان كرد، دیمان هەندێ مروی جولەكەكانی تێدایە بای دو درهەم نابێت. واتە خیانەت لەغەنیمەت تـاوانێكی زۆر گەورەیـە و ئیمـامی ئەحمـەد دەبێ: پێغەمبەری خواﷺ تەنها لەسەر ئەو كەسە وئەو كەسـەی، كـە خـۆی كوشـتبێت نوێژی نەكردوە. ابوداو(٢٧١٠) والنسائي(٦٤/٤) وابن ماجه (٢٨٤٨).

٢٨٤ـ ن/ ١٤٦عن جابرﷺ أنَّ النَّبِيَّﷺ صَلّى عَلَى أَصْـحِمَةَ النَّجَاشِـي فَكَبَّـرَ عَلَيْـهِ أَرْبَعَاً فِي لَفْظٍ قَالَ: (( توفى اليـوم رجـل صـالح مـن الحَـبَشِ فَهَلُـمَّ فَـصَلُّوا عَلَيْـهِ)) قـال:

فَصَفَفَنَا فَصَلَّى رَسُولُ اللهِﷺ عَلَيْهِ وَنَحْنُ صُفُوفٌ. متفق عليهما احمـد(٣/ ٣٦١، ٣٦٣). خ(١٣٣٤) م( ٦٤/ ٩٥٢).

لەجابیرەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ نوێژی لەسەر ئەسحەمە كرد ـ پاشـای حەبەشە بەنادیاری ـ صلاة الغائب ـ جا چـوار (الله اكـبر)ی كـرد ـ لەنوێژەكەیـدا ـ لـە بێژەیەكی تردا هاتوە، كە فەرمویەتی: ئەمڕۆ پیاوێكی چـاكی حەبەشـی مـردوە هەسـتن بانوێژی لەسەر بكەین، (جابیر ئەڵێ) ڕێزمان بەست و پێغەمبەری خواﷺ نوێژی لەسـەر كردو، ئێمە چەند ریز بوین. واتە دروستە هەواڵی مردن بە خەڵك بوترێ و نوێژ ئـەكرێت بۆ مردوی نادیار. واتە: باشوێنێكی زۆر دوریش بێ، وەكو لەمەدینەوە بۆحەبەشە.

احمـــد(١/ ٢٢٤) والترمـــذي(١٠٥٧) والنـــسائي(٤/ ٨٥) وابـــن ماجـــە(١٥٣٠) خ(١٣٤٠) م(٩٥٤/٦٨).

٢٨٥ـ ن/ ١٤٠٩ عن ابن عباس قَالَ إِنْتَهَى رَسُولُ اللهِ إلى قَبْرٍ رَطْبٍ فَصَلَّى عَلَيْهِ وَصَفّوا خَلْفَهُ وَكَبَّرَ أَرْبَعَاً)) رواه الجماعة الا ابو داود.

لەعەبدوڵلای كوڕی عەباسەوەﷺ هـاتوە، كـە وتویـەتی: (( پێغەمبـەری خـواﷺ گەیشتە گوڕێكی تازەو نوێژی لەسەر كرد ـ لەنوێژەكەیدا ـ چوار جار (الله اكـبر)ی كـرد. واتە دروستە پاش ناشتن مردو نوێژی لەسەر بكرێ، كە چوار جار( الله اكبر)ی ئەوێ، بـەم شێوەیە.

١ـ الله اكبر ـ ی یەكەم و پاشان سورەتی فاتیحە ئەخوێنرێت.

٢ـ الله اكبر ـ ی دوهـەم ئـەكرێت سـڵاوات لەپێغەمبـەریﷺ ئـەدرێت هـەر شـێوە سڵاوەتێك بێ دروستە، پاشان.

٣ـ الله اكبر ـ ی سێهەم ئەكرێت، ئینجا دوعا بۆ مردوەكـە ئـەكرێت و بـە عـەرەبی چاكە، جا ئەگەر عەرەبی نەدەزانی بەزمانی خۆی.

٤ـ الله اكبرـ ی چوارەم ئەکرێت و ئەوترێت ((اللهم لاتحرِمْنَا اَجرَهُ وَلاتفتنا بَعْدَهُ وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ))و، پاشان سەلام ئەدرێتــەوە، بەتاك و بەجەماعەت ئەکرێت و هەتا نوێژکەرەکان زۆر تر و چاکتربن بۆ مردوە، کەچاکترە، والله اعلم.

هەروەها هەرچەند دواکەوتبێ، هەر دروستە نوێژی لەسەر بکرێت، با نوێـژی تریـشی بۆ کرابێ.

٢٨٦ـ ن/١٤٣٢ عن عوف بن مالك قال: سَمْعتُ النَّبِيَّﷺ وَصَلَّى عَلَى جَنَازةٍ يَقُـولُ: ((اَللهمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمُهُ وَاعْفُ عَنْهُ وَعافِهِ واكرم نُزُلَـهُ وسِّعْ مُدْخَلَـهُ واغـسله بمـاءٍ وَثَلجْ وَبَرِدْهُ وَنَقّهُ مِنْ الخَطايا كَما يُنْقيَّ الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، وَابْـدِ لُـهُ دَاراً خَيْـراً مِـنْ دَارِهِ وَأَهْلاً خَيْراً مِنْ أَهْلِهَ وَزَوْجاً خَيْراً مِنْ زَوْجِهِ وَقِهِ فِتْنَةَ القبرِ وَعَـذابِ النـارِ)) رواه الجماعـة الا البخاري واباداود م(٨٥/ ٩٦٣).

لەعەوفی کوڕی مالیکەوە‌رضي الله عنه هاتوە، کـە وتویـەتی: گوێبیـستی پێغەمبـەر بـومﷺ ونوێژی لەسەر مردویەك یەك ئەیفەرمو: (ئەی خوایە لێی خۆشببەو ڕەحمی پێ بکەو چاو پۆشی لێ بکەو ڕزگاری بکەو ریـزی میوانـداری بـۆ دابنـێ و جێگاکـەی فـراوان بکـەو بیشۆرەوە بەئاو و بە بەفرو تەرزە، پاکی بکەرەوە لەتاوان وەکو چۆن پۆشاکی سـپی پـاك دەبێتەوە لە چڵك، خانوەکی پێ بدە چاکتر لەخانوەکەی خۆی، ماڵ و منداڵێکی پـێ بـدە چاکتر لەماڵو منداڵی خۆی، هاوسەرێکی پێ بدە چاکتر لەهاوسەرەکەی خۆی، بیپـارێزە لەبەڵای قەبرو سزای ئاگر)).

واتە ئەم دوعایە سـوننەتە لـەجێگای ئـەو دوعایـەی، کـە لەپێـشەوە باسمـان کـرد بخوێندرێ، چەندین دوعای تر هاتوە ، بـەڵام ئیمـامی بوخـاری رحمه الله فەرمویـەتی، کـە : ((ئەمە ڕاسترین شتە لەو بارە هاتوە)).

احمد(٦/ ٢٣) والترمذي(١٠٢٥)والنسائي(٤/ ٧٣) وابن ماجه(١٥٠٠).

٢٨٧ـ ن/ ١٤٣٥عن سَمُرة، قال: (( صَلَّيْتُ وَرَاءَ رَسُولِ اللهِﷺ عَلى إمرأةٍ مَاتَتْ فـي نِفاسِـــها فَقَـــام َعَلَيْهَـــا رَسَـــولُ اللهِﷺ فِي الـــصَّلاة وَسَـــطَهَا)) رواه الجماعـــة. لەسەمورەوە‌رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: لەپشت پێغەمبەری خواوەﷺ نوێژم دەکـرد، کـە

لەسەر ئافرەتێك، کە بەهۆی منداڵ بونەوە مردبو نوێژی دەکرد، جا پێغەمبەرﷺ وەستا بۆ نوێژ لەناوەڕاستیدا، واتە: سوننەتە لەکاتی نوێژ لەسەر ئافرەتی مردودا لە ڕاست ناوەڕاستیدا بوەستیت. لەڕیوایەتی تریش دا هاتوە، کە بۆ پیاوان لەڕاست سەریا بوەستیت.[1]

احمد(١٩/٥، ١٤) وابوداود(٣١٩٥) والترمذي(١٠٣٥) والنسائي(٧٢/٤) زابن ماجه(١٤٣٩).

٢٨٨ـ ن/ ١٤٤٠عن عائشة رضي الله عنها قَالَتْ: (( مَا صَلَّى رَسُول اللهِﷺ عَلَى سُهيل بن بَيْضَاءَ إلا فِي جَوْفِ المَسْجِدِ)) رواه الجماعة الا البخاري واحمد م(٩٩/٩٧٣). وابوداود(٣١٨٩) والترمذي(١٠٣٣) والنسائي(٦٨/٤) وابن ماجه(١٥١٨).

له خاتون عائیشەوە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺنوێژی نەکردوە لەسەر (سوهەیلی کوڕی بەیزا)، مەگەر لەناو مزگەوتدا. واتە دروستە لەناو مزگەوت نوێژ لەسەر مردو بکرێت، هەروەکو چۆن لە دەرەوە و لەسەر گۆڕو لەناو گۆڕودیارو نادیار(الحاضروالغائب)ـ والله اعلم ـ.

٢٨٩ـ ن/ ١٤٤٩عَنْ جابر بن سَمُرَةَ: ((انّ النَّبِيَﷺ إتَبَعَ جَنَازَةِ الدَّحْداحِ مَاشِياً وَرَجَعَ على فرسٍ)) رواه الترمذي وفي رواية ((أُتِيَ بِفَرَسٍ مَعْرَوْرٍ فَرَكِبَهُ حِينَ إنْصَرَفَ مِنْ جَنَازَةَ إبن الدّحْداحِ وَنَحْنُ نَمْشِي حَوْلَهُ)) رواه الجماعة الا البخاري وابن ماجه م (٨٩/ ٩٦٥).

لەجابیری کوڕی سەمورەوە رضي الله عنه هاتوە، کە بەڕاستی پێغەمبەری خواﷺ بەپیادە لەگەڵ جەنازەی دەحداح دا چو، بەسواری گەڕایەوە... لەڕیوایەتێکی تر دا هاتوە، کە کاتێ لەجەنازەی کوڕی دەداح گەڕایەوەوە، ئەپێکی ڕوتی بێ توکیان هێناو سواری بو، ئێمەش لەچواردەوریەوە دەڕۆیشتین. ئەوەی لێرە وەرئەگیرێ ئەمانەن:

١ـ سوننەتە بەپیادە لەگەڵ جەنازە بچیت بۆ سەرقەبران، مەگەر شوێنەکە دوربێ دەکرێ دەکرێ بەسواریی بڕۆیت.

---

(١) ـ تەماشای فەرمودەی ژمارە١٤٣٩لەسەرچاوەی پێشو بکە.

٢ـــ لەگەڕانــەوەدا بەســواری یــان بــەپیادە هــەردوك ســوننەتە، یەکــەم فیعلەکــەی پێغەمبەرو، دوهەم تەقریرەکە هەر لەم فەرمودەدایە.

٣ـ بەڕوتی سواری ئەسپو ماین سوننەتە.

٤ـ عارەقی ئەسپ و ماین پاکە، مرۆڤ لەنوێژ نابات هەروەها کورکەکەی.

٥ـ کەسێك لەبەر عیلم، یان لەبەر تەمە، ئەگەر لــەناو کۆمــەڵێك ســوار بــێ خــراپ نیــە.وەختــێ خراپــە کەســوار بــو بەدەعیــەو فیــز و خــۆ بــەزل زان ســواربێتو خــەڵکی لەچواردەوریەوە بڕۆن.

٦ـ چون بۆسەر قەبران سوننەتەو، لەبارەیانەوە، چەندین فەرمودەی ڕاست هەیە لێــرە ئەوەندە بەسە.

احمد(٥/١٠٢،٩٥،٩٠) وابوداود(٣١٧٨) والترمذي(١٠١٣) والنسائي(٤/٨٥).

٢٩٠ـ ن/ ١٤٥٤عن ابي سعيد قال: قال رسول اللهﷺ : ((إِذَا رَأَيْـتُمُ الجَنَـازَةَ فَقُومُـوا فَمَنْ تَبِعَهَا فَلا يَجْلِسُ حَتَّـى تَوضَـعُ)) رواه الجماعـة الا ابـن ماجـه وابـاداود. خ (١٣١٠) م(٩٥٩/٧٧).

لەباوکی سەعیدەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((هەر کاتــێ چــاوتان بەجــەنازە کــەوت هەســتن، هەرکەســێك لەگەڵێــدا چــو بۆســەر قــەبران، بادانەنیشێ، هەتا ئەو ـ جەنازەـ دا ئەنرێت.

جا ئەگەر بتوانرێت هەتا ئەخرێتە قەبرەوە دانەنیشێت باشترە، چونکە لەڕیوایەتێکـدا هاتوە ـ حَتَّى تُوضَعَ فِي اللَّحْدِ ـ هەتا ئەخرێتە گۆڕەوە. احمـد(٤١/٣) والترمـذي(١٠٤٣) والنسائي(٤/٤٤).

٢٩١ـ ن/ ١٤٧٥عـن أَنَس قال شهدنا بِنْتُ رَسُولِ اللهﷺ تُدفَنَ وهو جالس علـى القـبر رأيتُ عينيه تدمعان: (( هَلْ فِيكُمْ مِنْ اَحَدٍ لَمْ يُقَارِبِ اللَّيْلَةَ؟ فَقَالَ أَبُو طَلْحَـةَ، أَنـا، قَـالَ: ((فَـانْزِلْ فِـي قَبْرِهَـا)) فنـزل في قبرهـا فقبَرَهـا. رواه احمـد(١٢٦،٢٢٨/٣) والبخـاري خ(١٣٤٢). لەئەنەســەوەﷺ هــاتوە، کــە وتویــەتی: کاتــێ کــچی پێغەمبــەری خــوا ئەشارایەوە لــەوێ بــون، ئــەو تەشــریفی لەســەر لێــواری قەبرەکــە دانیــشتبو و، چــاوی

فرمێسکی لێ ئەباری و فەرموی: (( ئایا لەناو ئیوەدا کەسێك هەیە ئەمشەو نەچوبێتە لای خێزانی؟)) ئەبو تەلحە وتی: من، فەرموی بچۆرە ناو قەبرەکەیەوە) ئەویش چوە ناو قەبرەکەیەوە خستیە ناو قەبرەوە، واتە: سوننەتە لەناشتنی ئافرەت دا کەسێ بینێژێ، کە ئەوشەوە نەچوبێتە لای خێزانی، دورستە پیاوی نامەحرەم ئافرەت بخاتە گۆڕەوە.

٢٩٢ـ ن/ ١٤٩٨عن عبدالله بن جعفر قال: لَمّا جاء نَعِني جَعْفَرْحِيَنَ قُتِلَ، قَال َالنَّبِيُّ ﷺ ((إصْنَعُوا لِآل جَعْفَرَ طَعَامَاً فَقَدْ آتَاهُمْ ما يَشْغَلُهُمْ)) رواه الخمسة الا النسائي.

لەعەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: کاتێ ، کە هەواڵی مەرگی جعفەر هات ئەوکاتەی کە کوژرا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (( خواردن دروست بکەن بۆ خاوخێزانی جەعفەر، بەڕاستی دەنگوباسێکی وا گەیشتوە پێیان، سەرگەرمی کردون نایان پەرژێتە سەر خواردن دروست کردن)) واتە: نان دروست کردن بۆ ماڵی تازیە دار سوننەتە، بەداخەوە ئەمڕۆ ماڵی تازا دارەکە ئەبێ خواردن دروست بکەن بۆ خەڵك؟! احمد(١/٢٠٥) وابوداود(٣١٣٢) والترمذي(٩٩٨) وابن ماجه(١٦١٠).

٢٩٣ ـ ن/ ١٥٠٠) عن أنَس أَنَ النَّبِيَّ ﷺ: (( لَاعَقْرَ فِي الإسْلامِ)) رواه احمد(٣/ ١٩٧، ١٤٠) وابوداود(٣٢٢٢).

لەئەنەسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (( سەربڕین نیە لەئیسلام)) واتە: کاتێ کابرا خرایە ناو گۆڕەوە، نابێ لەوێ لەسەر گۆڕەکەی ولاخ، یان مەڕو ماڵات سەر ببڕێت، ئەمە ڕەوشتێکی سەردەمی نەفامیەو ئیسلام هەڵیوەشاندۆتەوە.

٢٩٤ـ ن/ ١٥٠١عن جابر قال: أُصِيبَ أَبِي يَوم َأُحُدٍ فَجَعَلْتُ اَبْكِي فَجَعَلُوا يَنْهَوْنِي، وَرَسُول اللهِ ﷺ لايَنْهَانِي، فَجَعَلَتْ عَمَتِي فَاطِمَةُ تَبْكِي، فقال: النَّبِيُ ﷺ ((تَبْكِينَ أَوْ لا تَبْكِينَ مَازِالَتِ المَلائِكَةُ تُظِلُّه بأجِنتها حَتَّى رَفَعْتُمُوهُ)) اخرجاه خ ( ١٢٤٤) م (١٢٩، ١٣٠، ٢٤٧١).

لەجابیرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: باوکم لە ڕۆژی ئوحود دا شەهید بو، منیش جا ئەگریام، ئەوانیش بەرگریان لێ ئەکردم، پێغەمبەری خوا ﷺ بەرێگری نەئەکردمو

فاتیمەی پورم ئـەگریا، جـا پێغەمبـەری خـواﷺ فـەرموی: ((بگـرین، یـان نـەگرین ـ بەئافرەتەکەی فەرمو ـ فریشتەکان بەباڵەکانیان سێبەریان بۆ کردوە، تـا ئەوکاتـەی، کـە بەرزیان کردەوە ـ و بەرەو گۆڕی برد ـ واتە گریـان ئەگـەر یەخـەدڕین و هـات و هـاوارو پێداوتنی تێدا نەبێ بۆ مردوەکە، دروستە، چونکە پێغەمبـەری خـوا بـەرگری لـەجابیرو پوری جابیر نەکرد، بەڵام ئەگەر ئەوانەی پێشوی تێدا بێ، ئەوا حەرامەو دروست نـی یـە فەرمودەمان لەم بارەوە لەگوڵزاری چاکان دابۆ نوسیون، تەماشـایان بکـەن و لێـرە لـەوە زیاتر نانوسین.

٢٩٥ـ ن/١٥٢٣ عـن ابـي هريـرة : (( أَنَّ رَسُـولُ اللّٰهِﷺ لَعَـنَ زُوَّارات القبـور)). رواه احمـد(٢/ ٣٣٧، ٣٥٦) وابـن ماجـه(١٥٧٦) والترمـذي(١٠٥٦) صـححه وابـنُ حبـان في صححه.

ن/ ١٥٢٣) لەئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺنەفرینی کردوە لـەو ئافرەتانەی بەزۆری ئەچنە سەر گۆڕستان.

٢٩٦ـ ن/١٥٢٥ وعنه أَيْضَاً أَنَّ النَّبِيَﷺ أَتَى المَقْبَرَةَ فَقَـالَ: الـسَّلامُ عَلَـيْكُمْ دَارَ قَـوْمُ مُؤْمِنِينْ وَأَنَّا ـ إنْ شَاءَاللّٰهُ ـ بِكُمْ لاحِقُونَ)) رواه الجماعـة الا البخـاري والترمـذي. م((٣٩/ ٢٤٩) واحمـــد(٢/٤٠٨،٣٠٠) وابـــوداود(٣٢٣٧) والنـــسائي(٩٣١،٩٥) وابـــن ماجه(٤٣٠٦).

دوبارە هەر لەوەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ چۆتە گۆڕسـتانێکەوەو فەرمویـەتی: (( سەلام لەئێوە ئەی گەلی باوەڕداران بەڕاستی ئێمەش ـ ئەگەر خوا ئارەزوی لێ بێـت ـ بەئێوە ئەگەین. واتە: سوننەتە سەلام کردن لە گۆڕستانی بـاوەڕداران، هـەروەها دوعـای خێریان بۆ بکرێت وەکو لەفەرموودەی تردا هاتوە، بەداخەوە ئـەمڕۆ زۆربـەی هـەر زۆری خەڵك ئەم سوننەتە ئـەنجام نـادات و، خـۆی بـە شـتێکەوە خـەریك ئـەکات، کـە هـیچ بەڵگەیەکی ڕاست و دروستی نیەو کردویەتی بەفەرز، کە سوننەتیش نیە؟!

٢٩٧ــ ن/١٥٢٨ عن جابر قال: (( أَمَرَ رَسُولُ اللهِﷺ بِقَتْلَى أُحُدٍ أَنْ يُرَدُّوا إلى مَصَارِعِهِمْ وَكَانُوا نُقِلوُا إلى المَدِينَةِ)) رواه الخمسة وصححه الترمذي.

لەجابیرەوەرضي الله عنه هاتوە،کە وتویەتی: (( پێغەمبەری خواﷺ فرمانی دا شـەهیدەکانی ئوحود کە هێنرابون بۆ مەدینە بیانبەنەوە ئەو جێگایەی، کە تێیدا شـەهید بـون. واتـە: سوننەتە هەرکەسێ لە کوێدا شەهید بو، هەر لەو شوێنەدا بنێژرێت.

٢٩٨ـ ن/ ١٥٢٩ وعنه قال: (( دُفِنَ مَعَ أَبِي رَجُلٌ فَلَمْ يَطِبْ نَفْسِي حَتَّى اَخْرَجتُهُ فجعلتُهُ فِي قَبْرٍ عَلَى حِدَةٍ)) رواه البخاري والنسائي(٤/ ٨٤) خ (١٣٥٢).

وەهەر لەوەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویـەتی: (( بـاوکم لەگـەڵ پیاوێـك خرانـە گۆڕێکـەوە لەشەهیدەکانی ئوحود ـ پێم خۆش نـەبوو دڵـم لەسـەری نـەبو، تـا دەرم هێنـا خـستمە گۆڕێکی ترەوە بەتەنها. واتە: دروسـتە بـۆ مەبەسـتێکی دروسـت گـۆڕ هەڵکەنـدرێ و، مردوی لێ بگوزارێتەوە.

٢٩٩ـ ن/١٤٩٩عن جرير بن عبداللهرضي الله عنه قال: (( كنَّا نَعُدُّ الْأجتماعَ إلى أهْلِ المَيِّتِ وَصَنْعَةَ الطَّعَامِ بَعْدَ دَفنِهِ مِنَ النِّيَاحِةِ))رواه احمد وابن ماجة(١٦١٢).

لەجەریری کوڕی عەبدوڵڵاوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: (( ئێمە کۆبونـەوەی خـەڵك ـ لەدەوروبەری خاوەن مردوو دروست کردنی خواردن پاش شاردنەوەی مردوەکەمان، رۆ ڕۆو حیساب ئەکرد)). واتە: بەشتێکی تـاوان و خراپـان ئـەزانی، هیـوادارم خـاوەن بـاوەڕان ڕێگەی ڕاست و دروستی خۆیان بدۆزنەوە و، بەشێوەی ڕەوشتی پێغەمبەرو یارانی ڕەفتـار بکەن، چونکە هەر ئەو دینە و باقی لادان و سەر لێشێوانە.

# باسی پۆشاك

٣٠٠ـ ن/ ٥٤٤ عن عمرﷺ قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: ((لا تَلبِسُوا الحَرِيرَ فَإنَّهُ مَنْ لَبَسهُ في الدُّنيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الآخِرَة)).

احمد(١/ ٣٧، ٢٠) خ(٥٨٣٤، ٥٨٣٠)م(١١/ ٢٠٦٩) والنسائي(٨/٢٠٠).

لەعومەرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: (( گوێبیستی پێغەمبەر بومﷺ کەئەیفەرمو: ((ئاوریشم نەپۆشن، هەرکەسێ لەدنیادا بیپۆشێت، لەقیامەت نایپۆشێت. واتە: حەرامە پۆشاکی ئاوریشم بۆ پیاوان، مەگەر کەمتر بێ لە لەپێك وەکو لەفەرمودەی تردا هاتون.

٣٠١ـ ن/٥٤٧ عن علىﷺ قال: ((أُهدِيَتْ إلى النَّبِيِّﷺ حُلَّةٌ سَيْرَاءٌ فَبَعَثَ بِهَا إليَّ فَلَبْستُها فَعَرفتُ الغَضَبَ فِي وَجْهِهِ فَقَالَ: إنِّي لَمْ أبْعَثْ بِهَا إلَيْكَ لِتلبَسَها إنَمَا بَعَثْتُ بِهَا إلَيْكَ لِتُشققَها خُمُراً بَيْنَ النِّسَاءِ)) مَتَفَقُ عليه خ( ٢٦١٤) م(١٧/٢٠٧١) واحمد(١/١٥٣، ٩٧).

لەعەلیەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: ((پۆشاکێکی ئاوریشمی بەدیاری درایە پێغەمبەری خواﷺ ئەویش ناردی بۆ من، منیش پۆشیم ـ کاتێ منی بینی ـ بەناوچاوانیدازانیم، توڕەبوە، جا فەرموی: من نەم نارد بۆ تۆ، کە لەبەری بکەیت، بەڵکو بۆ ئەوەم ناردووە، کە تۆ پارچە پارچەی بکەیت بۆسەر پۆشی ئافرەتەکان. واتە: پۆشینی ئاوریشم بۆ پیاوان دروست نیە، وەکو لەفەرمودەی پێش ئەوەش زانراوە، بەڵام بۆ ئافرەتان دروستە.

٣٠٢ـ ن/ ٥٤٩عن حذيفة قال: ((نَهَانَا النَّبِيُّﷺ أنْ نَشْرِبَ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالفْضَّةِ وَأنْ نَأْكُلَ فِيهَا وَعَنْ لَبْسِ الحَرِيرِ وَالدِيبَاجِ وَأنَ نَجْلسَ عَلَيْهِ)). رواه البخاري خ(٥٨٤٢).

لەحوزەیفەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەرﷺ ڕێگری کردین لەوەی، کە

لەقاپو دەفری ئاڵتون و زیودا بخۆینەوەو بخۆینو، لەپۆشینی ئاوریشم رێگری کردین و هەروا، لەسەری دانیشین.

٣٠٣ـ ن/٥٥٤ عن أنس، أنَّ النَّبيَﷺ رَخّصَ لِعَبْدالرحْمنِ بنِ عَوْفٍ وَالزُبَيْرَ فِي لَبْسِ الحَرير لِحِكَّة كانت بهما)) وراه الجماعة الا ان لفظ الترمذي أنَّ عبدالرحمن بنِ عَوْفِ والزبير شكوا إلى النَّبِيَّ ـ القَمْلَ في غَزَاةٍ لَهُمَا؟ فَرَخَّصَ لَهُمَا قَمِصُ الحَرِير. خ(٢٩١٩) م(٢٠٧٦/٢٤،٢٥).

لەئەنەسەوەؓ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ ماوەی داوە بەعەبدورەحمانی کوڕی عەوف و زوبێر، کە پۆشاکی ئاوریشم بپۆشن لەبەر خورشتێك (لەشیان دەخورا) ، کە هەیانبو... لە بێژەی لای ترمذیدا ئاوا هاتووە، کە عەبدورەحمانی کوڕی عەوف و زوبێر سکاڵای خۆیان لای پێغەمبەرﷺ کرد لەدەست ئەسپێ لەغەزایەك لەغەزاکانیان دا؟ ئەویش ماوەی پێدان، کە کوراسی ئاوریشم بپۆشن. واتە پۆشینی ئاوریشم بۆ پێویستی بۆ پیاوان دروستە.

احمد(١٢٧/٣)وابوداود(٤٠٥٦) والترمذي(١٧٢٢)و النسائي(٢٠٢/٨) وابن ماجه(٣٥٩٢).

٣٠٤ـ ن/ ٥٦٢ عَنْ عَلِيؓ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللهِﷺ عَنِ التَخَتُمِ بِالذَهَبِ وَعَنْ لِبَاسِ القَسِيِّ وَعَنِ القِرَاءَةِ فِي الرُكُوعِ وَالُسُّجُودِ وَعَنْ لِباسِ الْمُعَصْفَرِ. رواه الجماعة الا البخاريّ وابن ماجه. م(٣/ ٢٠٧٨،٣١).

لەعەلیەوەؓ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ بەرگری کردم لەئەنگوستیلەی ئاڵتون (زێڕ) و لەپۆشاکی ئەوەی چواردەورو لێوارەکانی بەئاوریشم گێرابێ ـ ئەگەر هەموی لەلەپێك زیاتر بێ وەکو لەفەرمودەکانی تردا باسکراوە ـ وەلە خوێندنی قورئان لە رکوع و سوجدە داو لەپۆشاکی زەردکراو.

٣٠٥ـ ن/٥٦٥ عَنْ سُمْرة بن جَنْدُبْ قَالَ: قَـالَ رَسُـولاللهِﷺ ((إلْبَـسُوا ثِيَـابَ البَيَـاضَ فَإنّها أَطْهَرُ، وَأَطْيَبُ وَكَفِنُوافِيهَا مَوْتَاكُمْ))

رواه أحمد، والنسائي الترمذي وصححه، الحافظ إسناده في الفتح(٤٦١/١١)

لـه سـه‌موره‌ی كـوڕی جوندبـه‌وه‌ رضي الله عنه هـاتوه‌، كـه‌ وتویـه‌تی: پێغه‌مبـه‌ری خـواﷺ فه‌رمویه‌تی: پۆشاكی سپی بپۆشن، به‌ڕاستی ئه‌وه‌ چاكترو پاكتره‌وه‌، كفنی مردوه‌كانی پێ بكه‌ن.

٣٠٦ عَنْ أبي رِمِثْـةَ قَـالَ: ((رَأْيـتُ النَّبـيَّﷺ وَعَلَيْـهِ بَـرْدَانِ أَخْـضرانِ))(ن/٥٦٧) رواه الخمسة إلا إبن ماجة

له باوكی ریمسه‌وه‌ رضي الله عنه هاتوه‌، كه وتویه‌تی: چاوم به پێغه‌مبه‌رﷺ كه‌وت دووپۆشـاكی سه‌وزی پۆشی بو. واته: پۆشینی پۆشاكی سه‌وز سوننه‌ته‌و پێغه‌مبه‌رمان مێـزه‌ری ڕه‌ش و پۆشاكی ڕه‌نگ كراوی لا جـوان و خۆشه‌ویـست بـو، بـه‌لاّم سـوری تـۆخی نه‌پۆشـیوه‌ و به‌رگری له زه‌ردكراوكردوه‌، وه‌كو له پێشه‌وه باسكراوه‌، ئه‌مانه‌ی كه باسكران فـه‌رموده‌ی ڕاستیان له سه‌ره‌.

أحمد(٤/ ١٦٣)، وأبو داود(٤٠٦٥)، والترمذي(٢٨١٢) والنسائي(٣/ ١٨٥)

٣٠٧ـ ن/٥٧١ عَن عائشة رضي الله عنها : ((أنَّ النَّبيَﷺ لَـمْ يَكُـنْ يَتْـرُكُ فِـي بَيْتِـهِ شَـيْأً فِيـهِ تَصَالِيبُ إلا نَقَضَهُ)) أحمد ٥٢/٦، رواه البخاري، وأبو داود٤١٥١خ ٥٩٥٢.

له عـائیشه‌وه‌ رضي الله عنها هاتوه‌، كه ((به‌ڕاستی پێغه‌مبه‌رﷺ هیچ وێنه‌یه‌كی سـه‌لیبی لـه‌ هیچ شتێكا نه‌هێنالاّو له ماڵیا مه‌گه‌ر هه‌ڵیوه‌شاندبێته‌وه‌. واته‌: بونی وێنـه لـه مـاڵ دا حه‌رامه‌و ئه‌بێ به‌هۆی ئه‌وه‌، كه فریشته‌ی ره‌حمه‌ت ڕونه‌كاته ئه‌و ماڵه‌وه‌.

بۆ زیاتر ڕون بونه‌وه ته‌مه‌شای: چل فه‌رموده‌ی قودسی وگوڵزاری چاكان بكه به‌سوده‌و لێره له‌وه زیاتر نانوسین له‌م باره‌وه‌.

٣٠٨- ن/ ٥٧٨ عَنْ أم سَـلَمَة رضي الله عنها قَالَـتْ: ((كَـانَ أَحَـبُ الثِيَـابِ إلى رَسُـولِ اللهﷺ القَمِيصُ).

رواه أحمد٦/ ٣١٧إلا الخمسة النسائي وأبو داود ٤٠٢٥، والترمذي ١٧٦٢، ١٧٦٤، وإبن ماجة (٣٥٧٥)

له دايكی سەلەمەوەﷺ هاتوە، كە وتويەتی: خۆشەويسترين پۆشاك بەلای پێغەمبەری خواوەﷺ كوراس بوە، چونكە داپۆشەرێكی چاكە بۆ مرۆڤ.

٣٠٩ - ن/ش/ ٥٨١ عَنْ جَعْفَر بنُ عَمْرو بن حريث عن أبيه قال: ((رَأَيْتُ النَّبِيَّﷺ عَلى المِنْبَرِ، وَعَلَيهِ عَمَامَةٌ سَوْدَاءُ قَدْ أُرْخَيَ طَرَفُهَا بَيْنَ كَتِيفَيْهِ))

رواه مسلم، وأبو داود والنسائی، وإبن ماجة والترمذي في الشمائل تصحيح محمد ناصرالدين الألباني ٩٣.

له جعفری كوڕی عەمری كوڕی حورەيسەوە لە باوكيەوە هاتوە، كە وتويەتی: لە سەرمينبەر چاوم بە پێغەمبەری خواﷺكەوت، كە مێزەرێكی ڕەشی لەسەر بو لچكەكەی لە نێوان هەردو شانيا. واتە: مێزەر سوننەتەو ڕەنگی ڕەشيش دروستەو لچكەكەی لە نێوان هەردوو شانيابێ سوننەتە، بەڕاستی ئەوە وەكو لەنگەر وايە بۆ ڕاگيركردنی مێزەرەكە، وبێ لچكيش دروستە، بەڵام لچكی درێژ حەرامە.

٣١٠- ن/٥٨٢ عَنْ إبن مسعود قال: قال رسوالله ﷺ: ((لا تَدْخل الْجَّنَةَ مَنْ كَانَ فِي قَلبِهِ مِثْقَالَ ذَرَةٍ مِنْ الكِبْرِ، فَقَالَ رَجُلٌ: إنّ الرَّجُلَ يُحِبُ أنْ يَكونَ ثَوْبُهُ حَسَناً، وَنَعْلُهُ حَسَناً قَالَ: إنَّ اللهِ جَمِيلٌ يُحِبُّ الجَمَالَ، الكِبْرُ بَطْرالحَقِ وَ غَمّصُ النَّاسِ))رواه أحمد٤٥١، ومسلم، والترمذي١٩٩٩.م (٩١/١٤٧)

لەعەبدوڵای كوڕی مەسعودەوەﷺ هاتوە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خواﷺفەرمويەتی: ئەو كەسەی بە ئەندازەی گەرديلەيەك تەكەبور ـــ خۆبەزل زانی و لوت بەرزـــ ی تێدابێ ناچێتە بەهەشتەوە)) كابرايەك وتی: بەڕاست مرۆڤ هەيە پێی خۆشە پۆشاكەكەی جوان بێ و، پێی خۆشە پێڵاوەكەی جوان بێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: خوا جوانەو جوانی پێخۆشە، ئەوە تەكەبورو خۆ بەزل زانين نيە، بەڵكو تەكەبور لادانە لە ڕاستی و سوك تەماشاكردنی خەڵك و پێشێل كردنی مافيەتی.

٣١١- ن/ ٥٨٣ عَنْ سهل بن معاذ الجهني عَنْ أبيه، عَنْ رَسُولُ اللهِﷺ أنّهُ قَالَ: مَنْ تَرَكَ أَنْ يَلْبَسَ صَالِحَ الثِيَابِ وَهُوَ يَقْدِرُ عَلَيْهِ تَواضُعاً لِله عزوجل دَعَاهُ اللهُ عَزَوَجَلْ عَلَى رُؤسِ الخَلائِقِ حَتَّى يُخبره الله في حُلَلَ الإيمانِ أيَّتُهُنّ شَاءَ.رواه أحمد ٩/ ٤٣٩، والترمذي ٢٤٨١، وصححه الحاكم، وافقه الذهبي.

له سەهلی کوڕی موعازی جوهەنیەوە لە باوکیەوە لە پێغەمبەری خواوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێك واز لە پۆشاکی چاك بهێنێت و دەسەڵاتی ئەوپۆشاکەی هەبێ لەبەر خوای دەسەڵاتدارو گەورە وازی لێ بێنێت، خوای دەسەڵاتدارو گەورە لە ناو هەمو خەڵکو بەدیار چاوی هەموویانەوە بانگی ئەکات، هەتا ئەیکات بەسەر پشك لە پۆشاکی باوەڕداران کامیان خۆی هەڵبژێرێت، خوای میهرەبان پێی دەبەخشێت.

٣١٢- ن/ ٥٨٤ عَنْ إبن عمر قال: قال رسوالله ﷺ: ((مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ فِي الدُنْيَا أَلْبَسهُ اللهُ مَذَلَةٍ يَوْمَ القِيَامَةِ))رواه الخمسة إلا الترمذيأحمد(٢/٩٢، ١٣٩)، وأبو داود(٤٠٢٩، ٤٠٣٠)، والنسائي في السنن الكبرى(٥/ ٤٦٠) وإبن ماجة.

لە عەبدڵای کوڕی عومەرەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێك پۆشاکی ناوبانگ دار لە دونیادا بپۆشێت ، خوا لە قیامەتا پۆشاکی سەرشۆڕی پێ دەپۆشێ.

٣١٣- ن/٥٨٧عن أبي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيﷺ قَالَ: لا يَنْظُرُاللهُ إلى مَنْ جَرّ إزارَهُ بَطْراً))متفق عليه(٢/٣٨٦، ٣٧٩،٤٣٠، ٤٥٤، ٤٧٩٤٦٧) والبخاري((مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الإزَارِ فِي النَّارِ)) لە ئەبو هورەیرەوەرضي الله عنه هاتوە لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە فەرمویەتی: خوا بەمیهرەبانیەوە تەماشای ئەو کەسە ناکات، کە پانتۆڵی لە بەر فیزو دەعیە ئەوەندە شۆڕئەکات ئەیکێشێت بەزەویدا، لە ڕیوایەتێکی تری ئیمامی بوخاریدا هاتوە، کە ئەوەی لە قاپی بەرەو خوار بێ، حەرامە.خ (٥٧٨٨)م (٤٨/ ٢٠٨٨).

٣١٤- ن/ ٥٩٠ وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسول اللهِﷺ: ((صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا بَعْدُ: نِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مَائِلاتٌ مُمِلاتٌ عَلَى رُؤسِهِنَّ أمثالُ أَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لا يَرَيْنَ الْجَنَةَ وَلا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَرِجَالٌ مَعَهُمْ سَيَاطٌ كَأَذِنَابُ البَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسِ)) رواه أحمد، ومسلم م (٢١٢٨/٥٢، ٤٤) هەر لەوەوە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمويەتی: دو تاقم لە خەڵكی ئاگر هەن، من هێشتا نەم ديون، ئافرەتانێكی پۆشتەی ڕوتاڵ لارەو لەنجەكەرن و فريودەرو لادەری ــ خەڵكن ــ لەسەريانەوە وێنەی كۆپارەی وشتر هەيە، بەهەشت نابينن و بۆنيشی ناكەن، تاقمی پياوانێكن، كە بەدەستيانەوە قەمچی هەيە وەكو كلكی گا، بەوە لە خەڵكی ئەدەن، لێرە مەبەست لە پۆشتەو ڕوتاڵ چەندين شێوەی هەيە لە وانە پۆشتەن بەپۆشاك و ڕوتاڵن بە عيبادەت.

پۆشتەن بە پۆشاك، بەڵام توندە لە بەريان دا و هەمو ئەندامەكانيان دەردەخات، پۆشتەن بە پۆشاك، بەڵام تەنكەو ئەندامیان لە ژێرەوەيەوە ديارە، بەشێ لە لەشيان پۆشتەيەو بەشێكی تری ڕوتە، كە بەهەمو ماناكان قەدەغەيەو نابێ ئافرەتی موسڵمان بەوشێوە ڕەفتار بكات، ئەگينا ئەبێ چاوەڕانی بەهەشت نەبێ و، جێگای خۆی لە ئاگردا ئامادە بكات، خوا پەنامان بدات لە ئاگرو سزاكەی ـ ئامين ـ

٣١٥ - ن/ ٥٩٢ وعَنْه قال: ((كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ: إذَا لَبِسَ قَمِيصَاً بَدَأَ بِمَيَامِنِـه)) رواه الترمذي ١٧٦٦. وەهەر لە ئەوەوە هاتوە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خواﷺهەر كاتێ كراسی پۆشيوە لە لای ڕاستەوە دەستی پێ كردوە، واتە: سوننەتە لەكاتی پۆشاك پۆشين مرۆڤ لە ڕاستەوە دەس پێ بكات.

٣١٦- ن/ ٥٩٣ وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: ((كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ: إستَجَدَ ثَوباً سَمَاه بإسِمِهِ عَمَامَةً أو قَمِيصَاً أَوْ رِدَاءً، ثُمَّ يَقُولْ: ((اللَّهُمَ لَكَ الحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ أَسْأُلُكَ خَيْرَهُ، وَخَيْرَ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ، وَشَّرِ مَا صُنِعَ لَهُ)).

لە باوكی سەعيدەوەﷺ هاتوە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەركاتێ پۆشاكێكی تازەی بكردايە ناوی ئەبرد بەناوی خۆيەوە، مێزەر يان كراس، يان عەبا لە

پاشان ئەیفەرمو: ((ئەی خوایە هەر سوپاس بۆ تۆ، تۆ منت پۆشتە کردوە، داوات لێ ئەکەم لە چاکەی ئەمەو چاکەی ئەوەی، کە ئەمەی بۆ دروست کراوەو، پەنائەگرم بەتۆ لەخراپەی ئەمەوئەوەی، کە ئەمەی بۆ دروستکراوە.)) رواه أحمد(٣/٣٠، ٥٠)أبوداود(٤٠٢٠، ٤٠٢٢)، والنسائي(٦/٨٥) والترمذي(١٧٦٧).

٣١٧ - ن/ ٥٩٥ عن معاويةﷺ قالَ: قلتُ لِأُم حبيبةﷺ هل كان النَّبِيُّﷺ يُصَلِي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُ فِيهِ؟ قَالَتْ: نَعْم إذَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ أَذىً. رواه الخمسة إلا الترمذي، أحمد(٦/ ٣٢٥، ٤٢٧)، وأبو داود(٣٦٦)، والنسائي(١/١٥٥)، وإبن ماجة(٥٤٠)

لە موعایەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: بە ئوم حەبیبەم گوت، (خێزانی پێغەمبەرو خوشکی خۆی) ئایا پێغەمبەرﷺ بەو پۆشاکەی، کە جیماعی پێ دەکرد نوێژی کردوە؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر شتێکی قێزەونی ئازاردەری پێوەنەبوبێ.

# بەشی زەکات

٣١٨- ن/١٥٣٠ عن إبن عَبّاس أنَّ رَسُولُ اللهِﷺ لَمَا بَعَثَ مُعَاذاً إلى اليَمَنْ قَالَ: ((أنَكَ تَأْتِي قَوْمَاً مِنْ أَهْلِ الكِتَاب، فَادْعُهُمْ إلى شَهَادَةِ أَنْ لا إلَهَ إلا اللهُ، وَأَنِّي رَسُولِ اللهِ إفْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَواتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإنْ هُمْ أطَاعُوكَ لذَلكَ، فأعْلِمْهُمْ أنَّ اللهَ إفْتَرَضَ صَدَقَةً، تُؤْخَذُ مِنْ أغْنِيَائِهِمْ، فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإنْ هُمْ أطَاعُوكَ لِذلكَ، فَإيَاكَ وَكَرائِمُ أموالِهِمْ! وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ)) رواه الجماعة خ (١٣٩٥)م (٢٩/ ١٩) أحمد(١/ ٢٣٣)، وأبو داود(١٥٤٨)، والترمذي(٦٢١)، والنسائي(٥/٢)، وإبن ماجة(١٨٧٣)

لەعەبدوڵای کوڕی عەباسەوە‌ؓ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ لە کاتێکا موعازی نارد بۆ(یەمەن) فەرموی: تۆ ئەچیتە لای گەلێك لە ئەهلی کتاب پێشەکی بانگیان بکە شایەتمان بێنن، کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە، بێجگە لە خوا وە شایەتی بدەن، کە من پێغەمبەری خوام، جا گەر ئەوان پەیڕەوییان کردبۆ ئەمە، دەی ئیتر خەبەریان پێ بدە، کە بەڕاستی خوا پێنج نوێژی لە هەمو شەو ڕۆژێکدا لە سەریان فەرزکردوە، ئەگەر پەیڕەوییان کردیت بۆ ئەمەش هەواڵیان پێ بدە، کە خوا زەکاتی لەسەریان فەرزکردوە، کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگریت و ئەدرێتە فەقیرەکانیان، جا ئەگەر پەیڕەویان کردیت، دەی وریا بە نەکەی بەرێزترین ماڵیان لێ وەرگریت، خۆت بپارێزە لە دوعاو نزای ستەم لێکراو، بەڕاستی لە نێوان ئەو و دوعاو لە نێوان خودا پەردە نیە، واتە خوا دوعای ستەم لێکراو وەر ئەگرێت ئەگەرچی ماوەیەکیشی بەسەردا بڕوات، لێرەوە فەرزبونی زەکات و چۆنیەتی وەرگرتنی و، چۆنیەتی دابەشکردنی بەکورتی ڕون بۆتەوە.

٣١٩ - ١٥٣١عن أبي هريرة قالَ: قالَ رسول اللهﷺ: ((مَا مِنْ صَاحِبِ كَنْزٍ لايُؤَدِي زَكَاتَهُ إلا أُحْمِيَ عَلَيْهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَيُجْعَلُ صَفَائِحُ فَيُكْوَى بِهَا جَنْبَاهُ، وَجَبِينَهُ حَتَّى

يَحْكُمَ اللهُ بَيْنَ عِبَادِهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ؛ ثُمَّ يُرَى سَبِيلَهُ: إمَّا إلى الْجَنَةِ، وَ إمَّا إلى النَّارِ، وَ مَا مِنْ صَاحِبِ إبلٍ لا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إلا بُطِحَ لَهَا بِقاعٍ قَرٍ قَرٍ، كَأَوَفَرِ مَا كانَتْ، تَسْتَنُّ عَلَيْهِ؛ كُلَّمَا مَضَى عَلَيْهِ أُخْرَاهَا، رُدَّتْ عَلَيْهِ أُلاهَا حَتَّى يَحْكُمَ اللهُ بَيْنَ عِبَادِهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ؛ ثم يُرى سَبيله: اما الى الجنةِ وَ إمَّا إلى النَّارِ، وَمَا مِنْ صَاحِبِ غَنَمٍ لا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إلا بُطِحَ لَهَا بِقاعٍ قَرٍ قَرٍ، كَأَوَفَرِ مَا كانَتْ فَتَطَؤهُ بِأظلافِهَا، وَ تَنْطَحُهُ بِقُرونِهَا، لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ، وَلا جَلْحَاءُ،كُلَّمَا مَضَى عَلَيْهِ أُخْرَاهَا، رُدَّتْ عَلَيْهِ أُلاهَا حَتَّى يَحْكُمَ اللهُ بَيْنَ عِبَادِهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُون، ثُمَّ يُرَى سَبِيلَهُ، إمَّا إلى الْجَنَةِ، وَ إما الى النَّارِ)) قَالَ سُهَيْلٌ: فَلا أَذْكُرُ الْبَقَرَ أَمْ لا، قَالُوا: فَالْخَيْلُ؛ يَارَسُول اللهِ؟! قَالَ: ((الْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا أو قَالَ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرَ إلى يَوْمِ القِيَامَةِ الخَيْلُ ثَلاثَةٌ، هِيَ لِرَجلٍ أجرٌ، ولِرجلٍ سِترٌ، وَلِرَجلٍ وِزْرٌ؛ فَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ، فَالَّرجُلُ يَتَّخِذهَا فِي سَبِيلِ اللهِ وَيَعُدُّهَا لَهُ؛ فَلا تُغَيِّبُ شَيْئاً فِي بُطُنِهَا إلا كَتَبَ اللهُ لَهُ أَجْرَاً؛ وَ لَوْ رَعَاهَا فِي مَرجٍ، مَا أَكَلَتْ مِنْ شَيْئٍ إلا كَتَبَ اللهُ لَهُ أَجْرَاً، وَ لَوْ سَقَاهَا مِنْ لَهُ بِكُلِّ قَطْرَةٍ تَغَيّبُهَا فِي بُطُنِهَا أَجْرٌ حَتّى ذَكَرَ الأجْرُ فِي أبْوَالِهَا، وَ أرْواثِهَا، وَلَوْ إسْتَنَّتْ شَرَفَاً، أَوْ شَرَفَيْنِ كُتبَ لَهُ بِكُلِ خَطْوَةٍ تَخْطُهَا أَجْرٌ، وَأَمَا الَّذي هِيَ لَهُ سِتْرٌ : فَالَّرجُلُ يَتَّخِذهَا تَكَرُمَّاً، وَتَجَمُّلاً، وَلا يَنْسَى حَقَّ ظُهُورِهَا، وَبُطُونِهَا فِي عُسْرِهَا، وَ يُسْرِهَا، وَ أمَّا الَّذِي عَلَيْهِ وِزرٌ: فَالَّذِي يَتَّخِذُهَا أشْرَاً، وَبَطَرَاً، وَ بَذَخَاً، وَ رِيَاءَ النَّاسِ؛ فَذَلِكَ الَّذِي هِيَ عَلَيْهِ وِزْرٌ)) قَالُوا: فَالْحُمُرُ يَا رَسُولُ اللهِ؟! قَالَ: ((مَا أَنْزَل اللهُ عَلَيَّ شَيْئاً، إلا هَذِهِ الآيَةَ الْجَامِعَةُ الْفاذَّةَ((فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ)) رواه أحمد ومسلم(٢/ ٢٦٢، ٢٧٦، ٢٨٢). م (٢٦/ ٩٨٧) وأبوداود(١٦٥٨، ١٦٥٩).

له ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوه، كه وتويەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمويەتی: هیچ خاوەن خەزێنەيەك نيه، كه زەكاتەكەی لیٚ نەدات، مەگەر دۆزەخ بۆی گەرم ئەكریٚ بە

چەندین پارچە ئاسنەوە داخ ئەکرێت، بەو پارچە ئاسنانە هەردو تەنیشتی و ناوچەوانی، هەتا ئەو کاتەی خوا بڕیار ئەدات لە نێوان بەندەکانیدا لە ڕۆژێکدا، کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، لە پاشان ڕێگای پیشان ئەدرێت، یان بۆ بەهەشت، یان بۆ ئاگر.

هیچ خاوەن وشترێك نیە، کە زەکاتەکەی نەدابێ، مەگەر بەڕودا ڕاخرێت بۆی لە دەشتێکی ڕێك و پێك وگەورەدا و قەڵەوتر لەوەی، کە بوەو دێت بەسەریا هەرکاتێ ئاخرەکەی هات بە سەریا ئەوەڵەکەی ئەگێڕنەوە سەری، هەتا ئەوکاتەی، کە خوا بڕیار ئەدات لە نێوان بەندەکانی لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵەو، پاشان ڕێگای پیشان ئەدرێت، یان بۆ بەهەشت یان بۆ ئاگر.

هیچ خاوەن مەڕێك نیە، کە زەکاتەکەی نەدابێ، مەگەر بە ڕودا راخرێت بۆی لە دەشتێکی فراوان دا، قەڵەوتر لەوەی، کە بوە ــ لە پێشەوە ــ بەسمەکانی ئەیشێلن و بە شاخەکانی لێ دەدەن، نە شاخ چەماوەی تێدایەو نە بێ شاخ، واتە: هەمویان شاخدارن و شاخەکانیان ڕاستە، تا زیاتر سزای بدرێت خوا پەنامان بدات، هەرکاتێ ئاخریان بەسەریا تێ دەپەڕێت، یەکەمیان دەگەڕێتەوە سەری، تا ئەو کاتەی، کە خوا لە نێوان بەندەکانیدا فەرمان ئەدات، لە ڕۆژێکدا، کە ماوەی پەنجا هەزار ساڵە لەو ساڵانەی، کە ئێوە ئەیژمێرن، لە پاشا ڕێگای پیشان ئەدرێت، یان بۆ بەهەشت یان بۆ ئاگر.

سوهەیل ئەڵێ: (نازانم باسی ڕەشە وڵاخی کرد، یان نەء) وتیان: چارەوێش ئەی پێغەمبەری خواﷺ، فەرموی: ((چارەوێ لە ناو چاوانیدایە، یان فەرموی: چارەوێ بەسراوە بەناو چاوانیەوە، خەیر هەتا ڕۆژی قیامەت چارەوێی سیانن ئەو بۆ هەندێ کەس پاداشتەو بۆ هەندێ داپۆشەرەو، بۆ هەندێ تاوانە جا ئەوەی، کە ئەوە ئەبێ بە پاداش بۆی ئەو پیاوەیە، کە بۆ جیهاد ڕاگیری ئەکات و ئامادەی ئەکات بۆی، ئەمە هیچ شتێك ناخوات مەگەر خوا بەچاکە بۆی بنوسێت، ئەگەر لە مێرگێکدا بیلەوەڕێنێت هیچ شتێك ناخوات، مەگەر خوا بۆی بە پاداشت بنوسێت ئەگەر لە ڕوبارێکدا ئاوی بدات بە هەمو دڵۆپەیەکی ئەو ئاوەی، کە ئەیخوات پاداشتی بۆ هەیە، هەتا باسی پاداشتی لە

میزو تەرسەكەشیداكردوە، ئەگەر بەرزاییەك، یان زیاتریش ببڕێت بۆ هەمو هەنگاوێكی چاكەی بۆ دەنوسرێت.

ئەوەی كە داپۆشەرە ئەو پیاوەیە، كە ئەو چارەوێنی بۆ بەخشندەی و ئیشی جوانەو مافی پشتی وسكی لە بیر ناچێتەوە، واتە: چاكەی پێ ئەكات بۆ خەڵك لە بارو لە سواری و لە تەنگانە و خۆشی دا.

ئەوەی، كە تاوانە ئەو كەسەیە، كە چارەوێی بۆ خراپی و لوت بەرزی و خۆپیشاندانە بە خەڵك ئەوە ئەوەیە، كە ئەبێ بە تاوان لەسەرخاوەنەكەی، وتیان: ئەدی گوێدرێژ ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟ فەرموی: خوا لەم بارەیەوە هیچی بۆ نەناردوم، بێجگە لەم ئایەتە گشتیە كەم وێنەیە، (هەر كەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك چاكە بكات، پاداشتەكەی دەبینێ، هەر كەسێك بەئەندازەی گەردیلەیەك خراپە بكات سزاكەی ئەبینێ) لەم فەرمودەیە دەردەكەوێت، كە زەكات واجبە لە زێڕو زیو و وشترو ماڵات، لە ڕیوایەتی ئیمام موسلیم لەم فەرمودەیەدا ئەمەی زیاد كردوە، كە (ولا صاحب بقرٍ) وەهیچ خاوەن مانگایەك نیە هەروەكو باسی مەڕوماڵاتەكان. ئیمامی نەوەوی گوتویەتی: ئەمە ڕاسترین فەرمودەیە سەبارەت بە زەكاتی مانگا، جا ئەوەی لە پەراوە فیقهیەكاندا سەبارەت بە زەكات و بە چەندو بەكێ ئەدرێت، هەموی فەرمودەی ڕاست و دروستی لەسەرە، خوا خۆی زەكات گرانی لە سوڕەتی (تەوبە لە ئایەتی: ٦٠) داو فەرمودەش هەیە لە بارەیانەوە و بۆ كورتكردنەوەی باسەكە ئێمە نایانوسین، وەلای خواروی زەكاتی زێر بیست میسقاڵە، كە نیو مسقاڵی ئەكەوێت، ئەگەر ساڵی هات بەسەرا لە موڵكی كابرادا.

زەكاتی زیو دوسەد درهەمەو پێنج درهەمی ئەكەوێت، ئەگەر ساڵی هات بەسەردا لە موڵكی كابراو(بۆ هەردوكیان ـــ زێرو زیو ـــ بە ئەندازەیەك قەرزار نەبێ، كە لەو ژمارەیە دابەزێنێ).

زەكاتی مەڕو بزن چل سەرەو یەك سەری ئەكەویٚ و تا (١٢١) جا ئەبیٚ بەدو سەر لە دوسەدو یەك سەر سیٚ سەرە تاسیٚ سەد سەر، ئینجا هەر لە سەد سەر سەریٚكی ئەكەویٚت بەو مەرجە زیاتر لە نیوەی ساڵ بۆ خۆی بژیت، ئەگەر ئاڵەفی پیٚ نەردیٚت و ساڵی بیٚت بەسەرالەموڵكی كابرای و كار حیساب ئەكریٚ لەژمارەی زەكات دا و بەلاٚم نادریٚت لەزەكاتدا.

زەكاتی وشتر پیٚنج سەرەو لەوە(بزن یان مەڕیٚكی ئەكەویٚ هەربەم شیٚوەیە تابیست و پیٚنج سەر لەو وشتریٚكی میٚی یەك ساڵەی پیٚ لەدوی ئەكەویٚت تا سیو پیٚنج سەر بوبەسیو شەش سەر تا چلو پیٚنج(٤٥) سەر وشتریٚكی میٚی دووساڵی پیٚ لەسیٚ ساڵی ئەكەویٚت وەگەیشتە چل و شەش (٤٦)سەر تاشەست(٦٠)وشتریٚكی میٚی سیٚ ساڵی پیٚ لەچواری ئەكەویٚت وەگەیشتە (٦١) شەست و یەك تا حەفتاو پیٚنج(٧٥)وشتریٚكی چوارساڵی پیٚ لەپیٚنجی ئەكەویٚت, هەركاتیٚ گەیشتە حەفتاو شەش(٧٦) تانەوەت(٩٠)دو وشتری دو ساڵی پیٚ لەسیٚ ی ئەكەویٚت و لەنەوەت و یەك(٩١)تاسەدو پیٚنج دو وشتری میٚی سیٚ ساڵی پیٚ لەپیٚنجی پیٚ ئەكەویٚت , جا لەوە زیاتری كرد لەهەمو چل سەریٚك دا وشتریٚكی دو ساڵی پیٚ لەسیٚی ئەكەویٚت وەلەهەمو پەنجا سەریٚكدا وشتریٚكی میٚی سیٚ ساڵی پیٚ لەچواری ئەكەویٚت. زەكاتی مانگایش(٣٠) سی سەرە یەك گویٚرەكەی ئەكەویٚت لەچل سەر دا پاریٚنەیەكی ئەكەویٚت.

زەكاتی گەنم و جۆ لەسەر خەرمان و كاتی دوریٚنەوەی ئەكەویٚت لای خوارەكەی پیٚنج وسقە نزیكەی(٤٨)تەنەكەیەو لەوە بەو لاوە دەیەكەویٚت ئەگەر بۆخۆی و بەئاسمان پەروەر دەبو, بەلاٚم ئەگەر ئاودانی بەهۆی ئاودەرهیٚنانی ئاوەوەوە بو ئەو بیست یەكە, والله اعلم.

٣٢٠- ن/١٥٦٢ وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ قَالَﷺ: ((الْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارُ والْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدَنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِكَازِ الخُمْسُ)) رواه الجماعة.

هەر لەوەوەﷺ هاتوە، كە پیٚغەمبەرﷺ فەرمویەتی: برینی شاخدار حیساب ناكریٚت، بیر حیساب ناكریٚت، سەرچاوە حیساب ناكریٚت، وە لە شاراوەی كۆندا پیٚنج یەك

هەیە، واتە: ئەوانە ئەگەر خاوەنەکانی کۆتایی نەکردبێ و کەمتەرخەم نەبوبێ لەو سێ شوێنەدا تاوانی نیەو تۆڵە ناخرێتە سەری وە هەرکەسێکیش شتێکی ژێر زەوی کۆن بدۆزێتەوە ئەبێ پێنج یەکی بەزەکات لێ بدات ئەگینا تاوانبارە. أحمد(٢/ ٢٢٨)خ (٢٣٥٥)م (٤٥/١٧١٠)، وأبو داود(٣٠٨٥)، والترمذي(١٢٩١)، والنسائي(٥/٤٥)، وإبن ماجة(٢٥٠٩)

٣٢١- ن/ ٥٧٣ عن عبدالله بن أبي أوفى قال: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَةٍ، قَالَ: ((اَللَّهُمَ صَلِ عَلَيْهِمْ)) فأتاه أبي أبي أوفى ــ بِصَدَقَةِ فقال: ((اَللَّهُمَ صَلِ عَلَى آل أبي أوفى)) رواه الجماعة إلا الترمذي خ(١٤٩٧) م(١٧٦/ ١٠٧٨).

لەعەبدوڵای کوڕی ئەبو ئەوفاوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: هەرکاتێك گەلێك زەکاتی بهێنایە بۆ پێغەمبەری خواﷺ ئەیفەرمو: ئەی خوایە رەحمەت و سۆزی خۆت بڕژێنە بەرسەریان دا، باوکم ــ ئەبو ئەوفا ــ زەکاتی هێنا بۆی فەرموی: ئەی خوایە رەحمەت و سۆزی خۆت بڕژێنە بەسەر ئالی ئەوبو ئەوفادا، واتە: سوننەت دوعای خێر لە لایەن وەرگری زەکاتەوە بکرێت بۆ زەکات دەر.

أحمد (٤/ ٣٥٣، ٣٥٤، ٣٨١، ٣٨٢)، وأبو داود(١٥٩٠)، والنسائی(٥/ ٣١)، وإبن ماجة(١١٧٩٦)

٣٢٢- ن/ ١٥٧٦ عن إبن مسعود أن رسول اللهﷺ قال: إِنّها سَتَكونُ بَعدي أثرةٌ، وَأمُورٌ تُنْكِرونَها، قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِﷺ فَمَا تَأمُرونَا؟ قَالَ: ((تُـؤَدُّونَ الحَقَ الذِي عَلَيْكُمْ وَتَسْأَلُونَ اللهَ الذِي لَكُمْ)) ,أحمد(١/ ٢١)، والنسائي(٥/١٠٥).

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوەﷺ هاتوە، کە لەپاش من فەرق و جیاوازی و پێشخستنی هەندێك بەسەرهەندێكداو ئیشتیباهێك رودەدات، کە پێتان ناخۆشە، وتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ بۆ ئەو رۆژە چ فرمانێکمان بەسەرا ئەدەیت ؟ فەرموی: ئێوە ئەو ئەرکەی لە سەرتانە ئەنجامی بدەن وبۆ مافی خۆتان داوا لە خوا بکەن. واتە: خۆبگرن شەڕو شۆر دروست نەکەن، ئاشکرایە ئەمە لە کاتێکدایە، کەیاسا هی ئیسلامە، بەڵام

فەرمان ڕەوایان ستەمکارو لارن، نەك بۆ کاتێ، کە هەواڵێك لە یاسای خوا نیە.خ (٣٦٠٣)م (٤٥/ ١٨٤٣)، وأحمد(١/ ٤٢٨)، والترمذي(٢١٩٠).

٣٢٣ - ن/٧٩٣ عن إبن عمر قال: سَمِعْتُ عُمَرَ رضي الله عنهما، يَقُول: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُعْطِينِي الْعَطَاءَ، فَأَقُولُ: أَعْطِهِ مَنْ هُوَ أَفْقَرُ مِنِّي فَقَالَ: خُذْهُ إِذَا جَاءَكَ مِنْ هَذا الْمَالِ شَيْءٌ وَأَنْتَ غَيْرُ مُشَرِفٍ وَلا سَائِلٍ فَخُذْهُ، وَمَا لا فَلا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ)) خ(١٤٧٣) م(١١٠/ ١٠٤٥).

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە هاتوە، کە وتویەتی: گوێبیستی عومەر بوم رضي الله عنه ئەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ شتی پێ دەبەخشیم، منیش ئەموت: بیدەبە کەسێك، کە لە من فەقیرتربێ، دەیفەرمو: بیگرە، هەرکاتێ لەم ماڵەی (بیت المال)ت پێ درا تۆچاوەڕێت نە ئەکردو داواکاری نەبویت، وەری بگرە، دە ئەگەر وانەبو، دوای ئارەزوی خۆت مەکەوە.

٣٢٤ - ن/١٥٩٥عن المطلب بن ربيعة بن الحارث بن عبدالمطلب أنه ــ والمفضل بن عباس ــ إنْطَلَقَا إلَى رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: ثُمَّ تَكَلَّمَ أحدُنا فقالَ يا رَسُول اللهِ جِئْنَاكَ لِتُؤمِّرَنَا عَلى هَذِهِ الصَّدَقَاتِ فَنُصِبَ مَا يُصِبُ النَّاسُ مِنَ الْمَنْفَعَةِ، وَتُؤَدِّي إلَيْكَ مَا يُؤَدِّي النَّاسُ، فَقَالَ: إنَّ الصَدَقَةَ لا يَنْبَغِي لِمُحَمَدٍ، وَ لا لِلآلَ مُحَمدٍ، إنّما هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ.مختصر لأحمد ومسلم

لە موتەلیبی کوری ڕەبیعەی کوڕی حاریسی کوری عەبدلموتەلیبەوە هاتوە، کە ئەو ــ فەزلی کوڕی عەباس ــ چون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: یەکێك لە ئێمە قسەی کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوینە لات بۆ ئەوەی ئێمەش بکەیت بەکاربەدەست لە بارەی ئەم زەکاتەوەو، ئێمەش شتێکمان دەست کەوێت وەکو خەڵك و، بیدەین بەتۆ، ئەوەی کە خەڵك پێت دەدات، فەرموی: بەڕاستی زەکات نابێ بۆ محمد و دەەست و دایەرەی محمد ﷺ بەڕاستی ئەوە چڵکی خەڵکە.م (١٦٨/ ١٠٧٢) وأحمد(١٦٦/٤)، وأبو داود(٢٩٨٥)، والنسائي(٥/ ١٠٥).

٣٢٥ - ن/١٦١٤ عن بُرَيْدة عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ إسْتَعْمَلْنَاهُ عَلَى عَمَلٍ فَرَزَقْنَاهُ (رِزْقاً) فَمَا أَخَذَ بَعْدَ ذلك فَهُوَ غُلُولٌ. رواه أبوداود (٢٩٤٣).

له بورەیدەوە رضي الله عنه هاتوە، له پێغەمبەرەوە ﷺ، كه فەرمویەتی: ئێمە هەركەسێكمان كرد بەكار بەدەست لە هەرشتێكداو ڕۆزیمان پێدا بەڕۆزیەكی باش، ئەوەی پاش ئەوە هەڵی بگرێت ــ لەو ماڵە ــ ئەوە خیانەتە.

٣٢٦- ن/١٦١٤ عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: حَملتُ على فرسٍ في سَبيلِ الله فَأضَاعَهُ الذِّي كَانَ عِنْدَهُ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِيه وَظَنَنْتُ أَنَّهُ يَبِعْهُ بِرَخصٍ فَسَأَلْتُ(عَنْ ذَلك)النَّبِي ﷺ فقال: لاتَشْتَرِه، وَلا تَعُدهُ فِي صَدَقَتِكَ، وَ إنْ أعطاكه بدرهمٍ (وَاحِدٍ) فَإنَّ العَائِدَ فِي صَدَقَتِه كَالْعَائِد فِي قَيْئِه. خ (٢٦٢٣)م (١/ ١٦٢٠),احمد(١/٤٠)

لەعومەری كوڕی خەتابەوە رضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: ئەسپێكم لە ڕێگای خودا بەكابرایەك دا كەسواری بێ بۆ غەزا، لە پاشان ئەو كابرایە ئەیویست بیفرۆشێت، ویستم بیكڕم وام گومان برد، كە ئەو كابرایە بە هەرزان دەیفرۆشێت، لە بەرئەوە پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد، فەرموی: نەیكڕێتەوە لەچاكەی خۆت پەشیمان نەبیتەوە، ئەگەرچی بە یەك درهەمیش پێت بداتەوە، بەڕاستی ئەو كەسەی لە بەخشینی خۆی پەشیمان ئەبێتەوەە، پاش ئەوەی پێ بەخشراوەكە وەری گرت، وەكو ئەو كەسە وایە، كە ڕشانەوەی خۆی بخوات. واتە: ڕەوا نیە كەسێك زەكات بدات، پاشان زەكاتەكەی خۆی بكڕێتەوە، لەو كەسەی، كە ئەو زەكاتەی وەرگرتوە.

٣٢٧ ـ ن/١٦١٧ عن سلمان بن عامر عن النَّبِيِّ ﷺ قال: ((الصَدَقَةُ عَلَى الْمِسكِين صَدقَةٌ، وَهِيَ على ذِي الرَّحِم اثِنتانِ صَدَقَةٌ وصِلَةٌ)) رواه الخمسة إلا أبا داو، وصححهُ الحاكم، و وافقهُ الذهبي رواه أحمد(٤/ ١٧، ١٨، ٢١٤) والترمذي(٦٥٨) والنسائي(٥/ ٩٢)وإبن ماجة(١٨٤٤).

له سەلمانی كوری عامیرەوە رضي الله عنه له پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە، كە فەرمویەتی: چاكە لەگەڵ بێ نەوایان دا یەك چاكەیە، وە لەگەڵ خزمی بێ نەوادا دوو چاكەیە و پەیوەندی خزمایەتیە ــ سیلەی ڕەحمە ــ واتە دوهەمینیان خێری زیاترە، والله أعلم.

# زەكاتی سەر چاكردنەوە

٣٢٨ـ ن/ ١٦٢٠((عن إبن عمر قال: فَـرَضَ رَسُـول اللهﷺ زَكـاةَ الفِطْـرِ مِـنْ رمـضان صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أوْ مِنْ شَعِيرٍ عَلَى العَبْدِ وَالْحُرّ، والذَّكَرِ، والأُنْثَى، وَالـصَّغِيرِ، والْكـبِيرِ مِـنَ الْمُسْلِمِينَ)).

لە عەبدلأی كوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، كـە وتويـەتی: پێغەمبـەری خـوا، زەكـاتی تەواوكردنی ڕۆژ لە ڕەمەزان دا (١٨٠٠)گرام لە خورما، یان لە جۆ پێویستی كردوە بۆ بەندە ئازاد وونێرو مێ و بچوك و گەورە لە موسڵمانان.

٣٢٩ـ ن/ ١٦٢١عَنْ أبي سعيد قال: زَكـاةَ الفِطْـرِ مِـنْ رمـضان صَـاعاً مِـنْ طَعَـامٍ أوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍأَوْ صَاعًامِنْ تمر أَوْ صَاعًامِنْ أَقِطٍ أو صَاعاً مِـنْ زَبِيـبٍ)) رواه الجماعـة خ (١٥١٠) م (٩٨٥/١٧).

لەباوكی سەعیدەوە هاتوە، كە وتویەتی: ئێمە زەكاتی تەواو كردنی ڕۆژی ڕەمـەزانمان دەرئەكرد صاعێك لەخواردەمەنی، یان صاعێك لە جۆ، یان صاعێك لـە خورمـا، یـان صاعێك لەكەشك، یان صاعێك لەمێوژ. هەر صـانێك چـوار مـودە، مـودیش دومـشت جۆدەگرێت أحمد (٢٣/٣) وابوداود (١٦١٦) والترمزي (٦٦٨) والنـسائي (٥١/٥) وابـن ماجة (٢٩١٨).

٣٣٠ـ عن ابن عباس قال: ((فرض رسول الله ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْـوِ وَالرَّفَثِ وَطَعْمَةً لِلمَسَاكِينِ (٢٣ ــ١٦)فَمَنْ أَدَاهَاقَبْلَ الصَّلاةِ فِي فَهِـيَ زَكَـاةٌ مَقْبُولَـةٌ وَمَـنْ أَدَاهَا بَعْدَ الصَّلاةِ فِي صَدَقَةٌ مِنَ الصَدَقَاتِ). رواه أبو داود ١٦٠٩ وإبنُ ماجة (١٨٢٧).

لە عەبدوڵلای كوڕی عەباسـەوەﷺ هـاتوە، كـە وتویـەتی: ((پێغەمبـەری خـواﷺ زەكاتی تەواو كردنی ڕۆژوی ڕەمەزانی پێویست كردوە، كە پاك كەرەوە یەكە بۆ ڕۆژوەوان لەقسەی هەوانتەو پیس وخواردنێكیش بێت بۆ بێ نەوایان، جاهەركە سێك بەر لەنوێـژی

جەژن دەری بکات زەکاتێکی وەرگیراوە ــ لای خوا ــ وە هەرکەسێ پاش نوێژدەری بکات چاکەیەکە وەکو چاکەکانی تر. واتە بەر لە نوێژ چاکترەو مسۆگەرە وەرگرتنی لەلای خوداوە ندەوە، بەڵام پاش نوێژ بەسەراوە بە ئارەزوی خوای باڵادەستە وە بۆ وەرگرتنی، ـ والله أعلم ـ .

# باسی ڕۆژو

٣٣١ـ ن/١٦٢٥عَنْ إبن عمر ﷺ قَالَ.((تَرَاءَيَ النّاسُ الهِلالِ فَأَخْبَرْتُ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنِّي رَأَيْتُهُ فَصَامَ وَأَمَرَالنّاسَ بِصِيَامِهِ)) رواه أبو داود (٢٣٤٢) ـــ له عەبدللای كوڕی عومەرەوه ﷺ هاتوەكە وتویەتی: ((خەڵك چاویان بەمانگ كەوت منیش هەواڵكەم دابە پێغەمبەری خواﷺ، كە من بیستیومە، جا پێغەمبەریشﷺ ڕۆژوی گرت و فرمانی بەخەڵكیش دا، كە ڕۆژو بگرن. واتە: بینینی مانگ لە ئەوەڵی ڕەمەزانەوە بەیەك نەفەر سابت ئەبێ.

٣٣٢ ـ ن/١٦٢٧ وعن رَبِعِي بن حِرَاشٍ عَنِ رَجُلِ مِن أصْحَابِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ إخْتَلَفَ النَّاسُ فِي أخِرِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ فَقَدَمَ أَعْرَابِيَانِ فَشَهِدا عِنْدَ النَّبِيّﷺ بِالله لأَهَلَ الهِلالَ أمْسِ عَشِيْةً فَأَمَرَ رَسُولُ اللهﷺ النَّاسَ أنْ يُفْطِروا)). رواه أحمد ٣١٤/٤ وا بوداود ٢٣٣٩زاد في رواية ((وان يَغْدو الى مُصَلاَّهُمْ)).

لەرەبیعی كوڕی خیراشەوه لەپیاوێك لە یارانی پێغەمبەرەوهﷺ كەوتویەتی: (ناكۆكی كەوتە ناوخەڵكەوه لە كۆتا ڕۆژی ڕەمەزانەوه - كە ڕەمەزانیان ڕەمەزان نیەئەڵێ ـــ دو عەرەبی دەشتەكی هاتن و لە خزمەت پێغەمبەردا شایەتیان دا، كە بەخوا دوێنی ئێوارە مانگ یەك شەوە بوە لەبەرئەوه پێغەمبەری خواﷺ دەستوری بەخەلك دا، كە ڕۆژوەكەیان بشكێنن، لە ریوایەتی ترا هاتوە، كە فەرمویەتی (بەیانی بچنە جێگای نوێژ) لێرەدا ئەوه وەرئەگرین.

١ ـــ دوشایەت پێویستە بۆ بینینی مانگی شەوال و دواهاتنی ڕەمەزان.

٢ ـــ كەسابت بو ڕەمەزان نیە، نابێ ڕۆژو بگیرێت.

٣ ـــ نوێژی جەژن ئەكرێ لە ڕۆژی یەكەم دوابخرێت.

٤ ــ دەرەوە وجێگای نوێژ باشترە بۆ نوێژی جەژن، تا مزگەوت، ئەگەر باران و قوڕ، یان زۆر سارد، یان گەرم نەبو.

٥ ــ مانگی رەمەزان مەرج نیە،(٣٠) رۆژ بێت بەڵکو (٢٩) یان (٣٠)یە.

٣٣٣ـ ن / ١٦٣٠ عن ابن عمرﷺ عـن رسـول الله ﷺ قـال: (إذَا رَأيْتُمُـوهُ فَـصُومُوا وَإذَار رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا فَإنَ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ))رواه الجماعـة الا ابـاداود والترمـذي خ (١٩٠٦) (١٠٨٠/٨).

له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوەﷺهاتوە، لەپێغەمبەری خواوە ﷺ، کە فەرمویەتی: هەرکاتێ مانگتان دی ڕۆژوبگرن و، هەرکاتێ دیتان بێشکێنن، ئەگەر هـەورو تـەپو تـۆز نەیهێشت بیبینن بۆی دابنێن، واتە بیکەن بەسی شەوە، ئەگەر ڕەمەزانە ئەواسـی تـەواو بکەن، ئەگەر شـەعبانە، سـی تـەواو بکـەن، ئینجـا دەسـت بکـەن بەرەمـەزان. احمـد (١٤٥/٢) والنسائی (١٣٤/٤) وانیە ماجە (١٦٥٤).

٣٣٤ـ ن / ١٦٣٥ عن عمار بن یاسرﷺ قال (مَنْ صَامَ اليَـوْم الـذى يُـشَكُ فِيـه فَقَـدْ عَصَى أبَا القَاسم محمداً ﷺرواه الخمسة الا أحمد و صححه الترمذى قال ابنُ عبدالبر: هـذا سنة عندهم مرفوع.

له عەممارى کوڕی یاسرەوەﷺ هاتوە، کەو تویەتی: هەر کەسێك ئـەو رۆژە بگرێـت، کە گومانی تێدایە، بەراستی سەرپێچی فرمانی باوکی قاسم ــ محمد ــ یﷺکـردوە واتە، نابێ لە رۆژی گومان لێکراودا رۆژو بیگرێت. واتە ڕۆژێ لەپێش ئەوەی، کە سـابت بێ رەمەزانەیان لەپاش ئەوەی(٢٩) رۆژ گیراو لەبیننیی مانگـەوە کەوتنـە شـکەوەو، وا دەنگ، کە لە هەندێ جێگا مانگ بینراوە و جـەژن کـراوە، بـەڵێ خـوا پەرسـتی ئـەبێ بەندایـەتی و عیبـادەت بـێ، نـەك ئـارەزو کـاری و عـادەت ...[1] أبـوداود (١٣٣٤) والترمذي (٦٨٦) والنسائی (١٥٣/٤) وابن ماجە (١٦٤٥).

(١)ــ تەماشای فەرمودەی ژمارە(١٦٣٢) لە نیل الأوطار بکە.

٣٣٥ـ ن/١٦٤٥عن ابن عباس (أَنَّ النَّبِيَّﷺ إحْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، واحْتَجَمَ وَهوَ صَائِمٌ). رواه ٢٨٦/١ احمد والبخاري.

لەعەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە‌ هاتوە: کە: (بەڕاستی پێغەمبەرﷺ کەڵەشاخی کردوە لە حاڵێکا، کە لە ئحیرام دا بوە کەڵەشاخی کردوە لە حاڵێکدا، کە بە رۆژو بوە، واتە کەڵەشاخ نەئیحرام نە رۆژو بەتاڵ ناکا تەوە، ئەمەش نزیکترین قسە یەلەم بارەوە ...خ (١٩٣٩،١٩٣٨) واالترمذي(٧٧٢)، وأبو داود(٢٣٧٢ــ ٢٣٧٣).

٣٣٦ ـ ن / ١٦٥١ عن أبي هريرة قال: قال رسول اللهﷺ(مَنْ نَسْيَ وَهُوَ صَائِمٌ فَأكَلَ، أَوْ شَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا الله أَطْعَمَهُ، وَسَقَاهُ)رواه الجماعة الاالنسائى وابن ماجه/خ (١٩٣٣) م (١٧١) (١١٥٥).

لەئەبو هورەیرەوە‌ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەر کەسێك لەبیری بچێتەوە کە بە ڕۆژوە جا کە خوارد، یان خواردنەوەیەکی خواردەوە، با رۆژوەکەی تەواوبکات، واتە ڕۆژەکەی ناشکێت، ئەوە خوا خۆی خواردن وخواردنەوەیشی پێداوە. احمد (٣٩٥/٢) وابوداوە (٢٣٩٨) والترمذي (٧١٧).

٣٣٧ ـ ن/١٦٥٢ وعنه أن النَّبِيَّﷺ قال (إذاكَانَ يَوْمَ صَوْمِ اَحِدِكُمْ فَلا يَرْفَثْ يَومَئِذٍ ــ وَ لايصَخَبْ فَإِنْ شَاتَمَهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيُصَلِّ: أَنِّي إمْرُؤُ صَائِم، وَالذِّي نَفْسُ محمد بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ الله مِنْ رِيحِ المِسْكِ .وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفرَحُهُمَا إذا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ.رواه الجماعة إلا إبن ماجة

هەر لەوەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێك یەکێك لە ئێوە بە رۆژ وبو، لەو رۆژەدا بائیش وقسەی ناپەسەندو ناحەز نەکات ــ قەپوقاڵ نەکات، جا ئەگەر کەسێك جنێوی پێدا، یان شەڕی لەگەڵ کرد، بابڵێت بە من بەرۆژووم ــــ نامەوێ وەلامت بدەمەوە خێری رۆژی خۆم لە دەست بدەم، بەڵکو ئەویش بیر بکاتەوە و وازبهێنێ، قسەی خراپ نەکات. سوێند بەو کەسەی، کەگیانی (محمد) ی بەدەستە، بۆنی

دەمی رۆژوەوان لای خوا لەبۆنی میسك خۆشترە، بۆ ڕۆژوگر دوو خۆشی هەیـە و بـەوان كەیف خۆش ئـەبێ یەكـەمیان: هـەركاتێ بـەربانگی كـردەوە كـەیف خـۆش ئـەبێ بـە رۆژوەكەی. دوهەم: وەهەركاتێ گەیـشتە پـەروەردگاری خـۆی، كـەیف خـۆش ئـەبێ بـە ڕۆژوەكەی ــ بە هۆی ئەو هەمو چـاكەی، كـە پـەروەردگاری لەگـەڵیا ئـەكات. أحمـد (٢/٤٦٥،٢٨،٢٧٣ ..... خ (١٨٩٤،٤ ــــ١٩،٥٩٢٧) م (١١٥١/١٦٢) وابـــو داود (٢٣٦٣) والترمذي (٧٦٤) والنسائی.

٣٣٨ ـ ن/١٦٥٥عن ابی بكر بن عبدالرحمن عَنْ رَجُـلٍ مِـنْ أَصْحَابِ النَّبِـيِّ ﷺقَـالَ رَأَيْـتُ النَّبِـيﷺ يُـصَبُّ الْمَـاءُ عَلَـىَ رَأْسِـهِ مِـنْ الْحَـرِّ وَهُـوَ صَـائِمٌ) رواه احمـد ٣/٤٧٥) ٤٦٣/٤٦(٥/٤٠٨،٣٨،٣٧٦)وابو داور(٢٣٦٥).

لـە ئەبوبـەكری عەبدورحمانـەوە لـەپیاوێك لـەیارانی پێغەمبـەرەوەﷺهـاتوە، كـە وتویەتی: (من چـاوم بەپێغەمبـەرﷺ كـەوت لەبەرگـەرما ئـاوی ئەكردبـە سـەریا، كـە لەوكاتەدا بەرۆژو بو. واتە خۆسارد كردنەوە و خۆ شۆردن، رۆژو بـەتاڵ ناكاتـە هـەروەكو ئاو گێڕان بەدەم دا، والله اعلم... احمد (٦/٢٣٠،٢١٦،٤٢) وابن ماجه (١٦٨٧).

٣٣٩ـ ن/١٦٥٨عن عمر بن أبِي سَلَمَةَ، سَأل رَسُـول اللهﷺ اَيُقَبِّـلُ الـصَائِم؟ فَقَـالَ لَـهُ سَلْ هَذِهِ لِأُمِ سَلَمَةَ ــ فَأَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولُ اللهﷺ يَفْعَلُ ذَلِكَ، فَقَالَ: يَارَسُولَ الله، قَـدْ غَفَـرَ اللهُ لَكَ مَاتَقَدَمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَاَ تَأَخَرَ فَقَالَ لَـهُ (اَمَـا وَاللهِ إِنِّـي لأتْقَـاكُمْ لِلـهِ وَأَخْشَاكُمْ لَـهُ مُـسلم خ (١٩٢٧) م (١١٠٦/٦٥). لەعومەری كـوڕی ئەبوسـەلەمەوەﷺ هـاتوە، كـە پرسیاری لە پێغەمبەری خواﷺ كرد، كە، ئایا رۆژوەوان بۆی هەیە خێزانی ماچ بكـات؟ پێـی فـەرمو (ئـەم پرسـیارە ئـوم سـەلەمە بكـە) ئوموسـەلەمەی دایكـی، خێزانـی پێغەمبەرﷺ بو، جائەویش هەواڵی پێدا، كە پێغەمبەری خـوا ئـەوە ئـەكات، جـاوتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بە ڕاستی خوا لەگوناهی پێشو پاشی تۆ خۆشبوە. واتـە ئەگـەر تۆ ئەوەیش بكەیت قەیناكە، چاو پۆشـیت لێكـراوە، پێغەمبـەرﷺ بەتونـدی وەلاّمـی

دایــەوە و فــەرمویی ئاگاداربــە، مــن لــەئێوە زیــاتر خۆلــە تــاوان دەپــارێزم و لــە ئێــوە زیاترلەخوادەترسم. واتە: وانەزانن کەئیتر من خۆم ناپارێزمو لەخوا ناترســم، چــونکە لــێم خۆشبوە ــ هەروەها لەم فەرمودەوە دەرئەکەوێت، کەکرداری پێغەمبەرﷺ بەلگەیــەو، نابێ هەر وا لەخۆوە تایبەتی بکەین بەخۆیەوە ــ تایبەت کردنی بەلگەی دەوێ.

٣٤٠ـ ن/ ١٦٦١ عن عائشة وأُمْ سَلمَة: أَنَّ النَّبِيَّﷺ كَـانَ يُـصْبِحُ جُنُبَـاً مِـنْ جِمَـاعٍ غَيْرِ إحْتِلامٍ ثُمَّ يَصُومُ فِي رَمَضَانَ) رواوه الجماعة الا النسائى وابن ماجة.

لە عائیشە وئوموسەلەمەوە هاتوە، کـە (پێغەمبــەرﷺ ڕۆژی کردوەتــەوە بــە لــەش پیسی جوتبون، نەك لە خەو بینین لـە پاشـا لەڕەمــەزان دا ڕۆژی ئــەگرت : واتــە لــەش پیسی ڕۆژو بەشەو رۆژو بــەتاڵ ناکاتــەوە، بــەڵام بــەجیماع بــەتاڵ ئەبێتــەوە وەکــو لــەم حەدیسەی دێت. احمد (٣٦/٦) خ (١٩٢٥،٢١٩٢٦) م (١١٠٩/٧٨) وابوداود (٢٣٨٨) والترمذی (٧٧٩).

# کەفارەتی ئەو کەسەی ڕۆژووی ڕەمەزان بەجیماع بەتاڵ بکاتەوە

٣٤١ـ ن / ١٦٦٣ عن أبى هريرة قال: جاء رَجُلٌ إلى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ هَلَكْتُ يَارَسُولُ اللهﷺ قَالَ: (وَمَا أَهْلَكَكَ؟ قَالَ وَقَعْتُ عَلَى إمْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ قَالَ (هَلْ تَجِدُ رَقَبَةً؟ قَالَ: لا، قَالَ: (فَهَلْ تَسْتَطِعُ أنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟) قال: لا، قَالَ (فَهَلْ تَجِدُ مَا تُطْعِمُ سِتِينَ مِسْكِيناً؟ قال: لا، قَالَ ثُمَّ جَلَسَ، فَأَتَى النَّبِيُ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمرٌ، قَالَ تَصَدَقْ بِهَذا) قَالَ: فَهَلْ عَلَى أَفْقَر مِنَّا، فَمَا بَيْنَ لا بَتِيْهَا أهْلُ بَيُتٍ أحْوَجُ إلَيْهِ مِنَّا (فَضَحِك النَّبِيﷺ حتى بدت نَواجذُهُ، و قال: إذْهَبْ فَأَطْعمه أَهْلَكَ) رواه الجماعة.

لەئەبو هرەیرەوەﷺ هاتوە، کەوتویەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ، وتی: لە ناو چوم ئەی پێغەمبەر خواﷺ، فەرموی: (چی تۆی لەناو بردوە؟) وتی: لە رەمەزان دا لەگەڵ خێزانی خۆمدا جوتبوم، فەرموی: (بەندەیەکت دەست ئەکەوێت ئازادی بکەیت؟) وتی نەخێر، فەرموی (ئەتوانی دومانگ لەسەر یەك بەرۆژو بیت؟ وتی: نەخێر، ئەڵێ: لەپاشا کابرا دانیشت، جالەو کاتەدا زەمیلەیەك خورما هێنرا بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ فەرموی: (ئەمە بکە بەخێر) وتی: ئایا بەسەر فەقیرتر لە ئێمەدا، لەحاڵێکا لە نێوان ئەودو بەردەڵانەی شاری مەدینەدا هیچ خێزانێکی تێدانیە، کە لە ئێمە پێویستی زیاتر پێی بێت، جا پێغەمبەرﷺپێکەنی، هەتا دانی پیوزی دەرکەوت، فەرموی: برۆ بیدە بەخاو خێزانی خۆت. احمد (٢/٢٨١،٢٤١،٢٠٨) خ (١٩٣٦) م (١١١١/٨١) وابوداود (٢٣٩٠) والترمذی (٧٢٤) وابن ماجة (٦٧١)

٣٤٢ ـ ن/١٦٦٦ عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ نَهَاهُمْ النَّبِيُّ عَنْ الوِصَالِ رَحْمَةٍ لَهُمْ فَقَالُوا

أَنَكَ تُوَاصِلُ؟ فَقَالَ: (أَنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ أَنِّي يُطْعِمُنِي رَبِي وَيُسْقِنِي) اَخرجاه خ(٩١٤) و م(١١٠٥/٦١).

لەخاتو عائیشەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی پێغەمبەری خوا قەدەغەی كردن لەگرتنی چەند رۆژ رۆژو بەیەكەوە، بێ خواردن و خواردنەوە بەزەیی بەوان دا هاتەوە، جا ئەوان وتیان: تۆ خۆت (وِصَال) ئەكەیت؟ فەرموی من وەكوئێوە نیم، من پەروەردگارم خواردن و ئاوم پێ ئەدات..

٣٤٣ـ ن/١٦٦٨ عن ابن عمر قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَﷺ يَقُولُ: (إذا أَقْبَلَ الْلَيْلُ وَأَدْبَرَ النَّهَارُ وَغَابَتِ الشَمْسُ فَقَدْ أَفْطَرَ الصَائِمُ)

له كوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: گوێبیستی لە پێغەمبەر بومﷺ، كە ئەیفەرمو ئەگەر شەو هات و رۆژی و خۆی ئاوابو ئیتر رۆژو وەوان بەربانگ ئەكاتەوە خ (١٩٥٤) م (١١٠٠/٥١) واحمد (٤٨/٢٨،٣٥/١) والترمزی (٦٩٨).

٣٤٤ـ ن/ ١٦٦٩ عَنْ سَهْلُ بن سَعْدٍ أنَّ النَّبِيَﷺ قَالَ: (لايَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَاعَجِلُوا الفِطْرَ) رواه الجماعة الا أبا داود والنِّسَائِي.

لەسەهلی كوڕی سەعدەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: خەڵك هەر لەسەر خەیرن مادام پەلەبكەن ـ لەپاش رۆژئاوابون ـــ لەبەربانگ كردنەوە دا. احمد (٣٣٧،٣٣٩/٥) خ (١٩٥٧) م (١٠٩٨/٤٨) والترمذي (٦٩٩) وابن ماجه (١٦٩٧).

٣٤٥ ـ عَنْ سَلْمَانَ بنُ عَامِرِ الضَّبِي قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهﷺ(إذَا أَفْطَرَ اَحَدُكُمْ فَلِيُفْطِر عَلَى فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ فَإِنَّهُ طُهُورٌ) رواه الجَمَاعَة إلاالنَّسَائِي وَقَالَ الحَاكِمُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَيْخَيْنِ وَافَقَهُ الذهبِي.

له سەلمان كوڕی عامری زەبیەوە هاتوە، كە وتویەتی پێغەمبەر خواﷺ فەرمویەتی: هەركاتێ یەكێك لەئێوە بەربانگی كردەوە، بابەر بانگەكەی بەخورمابێ ئەگەر دەستی نەكەوت، بابە ئاو بێ، بەڕاستی ئاو پاكۆ كەرە. احمد (١٧،١٨) وابداود (٢٣٥٥)

والترمذی (٦٥٨) (٦٩٥) وابن ماجه (١٦٩٩).

٣٤٦ ـ ن/١٦٧٥ عَنْ أنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ (تَسَحَرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُور بَركَة) رواه الجماعة إلاأبا داود.

له ئەنەسەوە‌ رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: پارشێوبکەن بەڕاستی لە پارشێودابەرەکەت هەیە. جونکە مرۆڤ بەهێز دەبێ و ڕۆژوەکەیشی بەئاسانتر بۆ تەواو ئەبێ. خ (١٩٢٣) م (١٠٩٥) واحمد (٢١٥/٣) والترمذی (١٠٦/٢) والنسائی (١٤١/٤) وابن ماجه (١٦٩٢).

٣٤٧ـ ن/١٦٧٧عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّ حَمْزَةَبن عَمْرو الاسلمي قال لِلنَّبِيِ ﷺ أَصُومُ فِي السَفَرِ؟ وَكَانَ كَثِيرُ الصِّيامِ فَقَالَ: (إِنْ شِئْتِ فُصُمْ وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِر. رواه الجماعة خ (١٩٤٣) م (١١٢١/١٠٣).

له خاتو عائیشەوە رضي الله عنها هاتوە، کە حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی وتی بە پێغەمبەر ﷺ ئایا لەسەفەردا ڕۆژوبگرم؟ ئەو زۆر ڕۆژوی ئەگرت، پێغەمبەر فەرموی: ئەگەر ئارەزوت لێ بو ڕۆژو بگریت بیگرە، ئەگەر ئارەزوت لێ بۆ نەیگریت لەسەفەردامەیگرە. واتە لەسەفەردا کابرابەدەست خۆیەتی ڕۆژو بگرێت یان نا. احمد (٤٩٤/٣) وابوداود (٢٤٠٢) والترمذي (٧١١) والنسائی (١٨٧/٤) وابن ماجە (١٦٦٢)

٣٤٨ ـ ن/١٦٩٠ عن عُبَيْد بن جبر قَالَ: (رَكَبْتُ مَعَ أَبِي بُصْرَةَ الغَفَارِي فِي سَفِينَةِ مِنَ الفُسْطَاطِ فِي رَمَضَانَ فَدَفَعَ ثُمَّ قَرَّبَ غَدَاءهُ فَقُلْتُ اَلَسْت بَيْنَ البُيُوتِ؟ فقال: أَبُو بَصْرَةَ: اَرَغِبْتَ عَنْ سُنَةِ رَسُولُ اللهِ ﷺ؟ رواه احمد ٣٩٨/٦) وابوداود (٢٤١٢).

لەعوبەیدی کوڕی جەبرەوە هاتود، کە وتەیەتی: لەگەڵ باوکی بەسرەی غەفاری، سواری کەشتیەك بوم لە ڕەمەزان دا، پاڵی بەکە شتیەکەوە نا، لەپاشان خواردنی هێنا منیش وتم ئایا تۆهێشتا لەنێو مالاّن دانیت؟ باوکی بەسرە وتی: ئایا تۆ پشت ئەکەیتە ڕەوشتی پێغەمبەری خوا؟. واتە ڕێبوار هەر، کە کەو تەسەر ڕۆیشتن، ئەتوانێ ڕۆژو

بشکێنێ، باهێشتا لەسنوری جێگای خۆیدابێت، والله أعلم.

٣٤٩ـ ن/١٦٩١ عَنْ إبنْ عَبَاسْ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ غَزا غَـزْوَةَ الفَـتْحِ فِـي رَمَـضَانَ وَ صَـامَ حَتَّى اِذَا بَلَغَ الْكَدِيدَ ــ الْمَاءُ الـذِّي بَـيْنَ قُدَيْـدٍ وَعَـسْفَانِ فَلَـمْ يَـزَلْ مُفْطِـراً حَتَّـى إنْـسَلَخَ الشَّهْرَ) رواه احمد الا الترمذي وإبن ماجة (٤٢٧٥).

لەعەبدوللای کوڕی عەباسەوە هاتوە، کە (پێغەمبەرﷺ لە غەزای گرتنی مەککەی لە ڕەمەزاندا کرد، کە بە ڕۆژو تاگەیشتە (کەدید) ــ ئاوێکە لەنێوان قودەیدو عوسفان دا ــ ئیتر بە ڕۆژو نەبو، هەتا ڕەمەزان دوایی هات، گرتنی مەککە لە بیستی ڕەمەزان دا بـــووە. احمـــد (٢١٩،٢٩١،٣٢٥) م (١١١٣) وابـــوداود (٢٤٠٤) والنـــسائی (١٨٤،١٨٩/٤).

٣٥٠ - ن/١٦٩٢عن أَنَسْ بن مَالك الْكَعْبِيّ أَنَّ رَسُولُ اللهﷺ قَالَ: أَنَّ اللهَ عزوجل ــ وَضَعَ عَنْ الْمُسَافر الصَّوْمَ وَشَطْرالصَّلاةِ وَعَنِ الْحُبْلَى وَ الْمُرْضِـعِ الـصَّوْم). رواه الخمـسة وَفِـي لَفْـظٍ بَعْـضِهِمْ (وَعَـنْ الحَامِـل والْمُرْضِـع) احمـد (٣٤٧/٤) وابـوداود (٢٤٠٨) والترمـذی (٧١٥) والنسائی (١٨٠/٤) وابن ماجة (١٦٦٧) (٣٢٩٩)

لەئەنەس کوڕی مالیکی کەعبیـەوەهاتوە، کـە پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی: خوای ـ گەورە لەسەر ڕێبوار (سەفەرکەر) ڕۆژو ونیوەی نوێژ هەڵگرتوە، هەروەها لەسەر ئافرەتی دووگیان وشیردەر ڕۆژوی هەڵگرتوە، بەڵام ئەم دوانە لـە پاشـان ڕۆژو ئەگرنـەوە. والله اعلم.

٣٥١ ـ ن / ١٦٩٥ عَنْ عَطَـاءٍ (سَـمِعَ إبْـنُ عَبَـاسَ يَقْـرَأُ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ﴾ البقرة /١٨٤ ــ قَالَ إبْنُ عَبَـاسُ خ (٤٥٠٥) لَيْـسَتْ مَنْـسُوخَةً، هِيَ لِشَيْخ الكَبِيرِ وَالْمَـرْأَةِ الكـبِيرة لايَـسْتَيطعانِ أنْ يَـصُومَانِ، فَيُطْعِمَـانِ مَكَـانَ كُـلُ يَـوْمٍ مِسْكِنَياَ)) رواه البخاری(٤٥٠٥) والنسائی (١٩٠/٤). لەعەتاوە هاتوە، کە گوێبیستی

عەبدوڵلا کوڕی عەباس بوە، کە ئەم ئایەتەی سورەتی بەقەرەی دەخوێندەوە، کە((لەسەر ئەوانەی، کە ڕۆژو سەختەبۆیان ــ ڕۆژو نەگرن، بەڵکو پێویستە بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی بێ نەوایەك بدەن )) عەبدڵلای کوڕی عەباس وتویەتی: ئەم ئایەتە ــ فرمانەکەی ــ هەڵنەوە شاوەتەوە ئەمە بۆ پیاوی پیرو ئافرەتی پیرە کە تونایان نیە ڕۆژوبگرن، جا ئەمانە لەباتی هەر ڕۆژێك، خواردنی بێ نەوایەك دەدەن .

٣٥٢ـ ن/١٦٩٩ عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ، قَالَتْ كَانَ يَكُونُ عَلَيّ الصَّوْمِ مِنْ رَمَضَانَ فِي فَمَا اسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَ إلافِي شَعْبَانَ وَذَلِكَ لِمَكَانِ رَسُولُ اللهﷺ رواه الجماعة.

لەخاتو عائیشەوە رضي الله عنها هاتوە کەوتویەتی: (ڕۆژوی ڕەمەزانم لەسەربوە نەم توانیوە بیگرمەوە، هەتا مانگی شەعبان لەبەرخاتری ــ دڵی ـ پێغەمبەری خواﷺ. واتە: دروستە تا ئەوکاتە ئافرەتان ڕۆژی ڕەمەزانیان دوابخەن، ئەگەر لەسەریان بوو. احمد (١٧٩/٦، ١٣١، ١٢٤) خ (١٩٥٠) م (١١٤٦) وابوداود (٢٣٩٩) والترمذي (٧٨٣) والنسائی (٤/٤، ١٩١/١٥٠) وابن ماجة (١٦٦٩).

٣٥٣ـ ن/١٧٢١ عَنْ إبْنِ عَبَاسِ قَالَ: لَمَا صَامَ رَسُولُ اللهﷺ يَوْمَ عَاشُورَاء وَأَمَر بِصِيَامِهِ قَالُوا يَارَسُولَ اللهﷺ إنَّهُ يَوْمٌ تُعَظِمَهُ اليَهُودُ وَالَنَّصَارَى فقال: (اذاكانَ العام أُلُمُقبلُ ــ إن شاء الله صمنا اليوم التاسع) قال فلم يأت العام المقبل حتى توفي رسول اللهﷺ رواه سلم وا بو داود فى لَفْظٍ: كَانَ رَسُوُلُ اللهﷺ (لَئِن بَقَيْتُ إلى قَابِل لأَصُمُومنّ التَّاسِعِ) رواه ابوداود ومسلم.

لەعبدوڵلای کوڕی عەباسەوە رضي الله عنه هاتوە، کەو تویەتی لەوکاتەی، کە پێغەمبەری خواﷺ ڕۆژوی عاشورای گرت و فرمانی ڕۆژو گرتنیشی دا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوە ڕۆژێکە جولەکەوگاور بەگەورەی دائەنێن، بۆیەفەرموی: (ئەگەر ساڵی ئاینده هاتەوە ــ ئەگەر خوا حەز بکات ڕۆژی نۆهەمیش ئەگرین.

ئەڵێ ساڵی ئاینده نەگەڕایەوە، تا پێغەمبەری خـواﷺ لـەدنیا دەرچـو، لەبێژەیـەكی تردا ئاوا هاتوە: ئەگەر تاساڵی ئاینده مام، ڕۆژوی نۆهـەمیش ئـەگرم. واتـە: پێویـستە مسوڵمانان لە خۆ چواندن بەگاور وجولەكە خۆیپارێزن، لەفەرمودەی تردا هاتوە، كە (مَنْ تَشَبَهَ بِقَوْمٍ فَهُوَمِنْهُمْ) جا بۆ خۆشكە خواناسەكان چاك لـەم فـەرمودە یـە سـەرنج بـدن و خۆتان لە لاسـایی كردنـەوەی كـافرو بـێ بـاوەڕان بپـارێزن .م (١١٣٤/١٣٣) وابـوداود (٢٤٤٥).

٣٥٤ـن/١٧٢٣ عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ مَارَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ اِسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَـهْرٍ قَطُّ إلاشَهْرَ رَمَضَانَ وَمَارَأَيْتُهُ فِي شَهْرٍ أَكْثَرَمِنْه صيَاماً مِنْ شَعْبَانَ)).

له خاتون عائیشەوه رضي الله عنها هاتوە، كە وتویـەتی پێغەمبـەر ی خـوامﷺ نـەدی، كـە رۆژوی هیچ مانگێك بەتەواوی بگرێت، بێجگە لە مـانگی ڕەمـەزان، لـەهیچ مانگێـك هەروا زیاتر لە مانگی شەعبان رۆژوی گرتبێ. واتە ڕۆژوی شەعبان تانیوەی سوننەتە .

٣٥٥ـ ن/١٧٢٥) وَعَنْهَا قَالَتْ أَنَّ النَّبِيَّﷺ يَتَحَرَّ صِيَامُ الإِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ) رواه الجماعة إلا أبا داود لكنه له من رواية أسامة بن زيد.

وەهەر لەوەوە رضي الله عنها هاتوە، كە وتویەتی: (پێغەمبەرﷺ زۆر هەوڵی ئـەدا بـۆ گرتنـی رۆژوی دوشەممە و پێنجشەمە). احمـد (٨٠،،٨٩،١٠٦/٦) والترمـذی (٧٤٥) والنـسائی (١٥٢،١٥٣/٤) وانت ماجة (١٧٣٩،١٦٤٩).

٣٥٦ـن/١٧٢٩ عن ابی هریـرةرضي الله عنه قـال رسـول اللهﷺ((لاتَـصُومُوا يَـوْمَ الْجُمَعَـةِ إلاَّ وَقَبْلَهُ يَوْمٌ أَوْ بَعْدَهُ يَوْمٌ) رواه الجماعة الا النسائي.

لەئەبو هورەیرەوەرضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: لە ڕۆژی جومعەدا ڕۆژوو مەگرن مەگەر لە پێشەوەی، یان لە پاشەوەی ڕۆژێك بگرن. واتە: ڕۆژوی جومعـە بەتـەنهاباش نیـە. خ(١٩٨٦) م (١١٤٤) احمـد (٤٩٥/٢) وابـوداود (٢٤٢٠) والترمذی (٧٤٣) وابن ماجه (١٧٢٣).

٣٥٧ـ ن/١٧٣٩ عَنْ عَبْدُالله بن عمر أنَّ رَسُولُ اللهِﷺ قال (صُمْ فِي كُلِ شَهْرٍ ثَلاثَةَ أيَّامٍ قُلْتُ أنِّي أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ فَلَّمْ يَزَلْ يَرْفَعَنِي حَتَّى قَالَ: (صُمْ يَوْمَاً وَأَفْطِرْ يَوْمَاً فَإِنَّهُ اَفضَلُ الصِيَامِ وَهُوَ صَوْمُ أخِي داود عَلَيْهِ السلام) وەهەر لەوەوە هاتوە، کە (قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ لاصام مِنْ صِيَامِ الأَبَدِ) متفق عليهما.

لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوەؓ هاتوه، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: لەهەمو مانگێك داسێ رۆژ رۆژوبگرە، وتم: من بەتوانا ترم جاهەر بۆی بەرزکرد مەوە، تافەرموی: (رۆژێ بگرەو رۆژێ مەگرە، بەراستی ئەوە باشترین ڕۆژوی برام داو دە سەلامی خوای لێ بێ ... وەفەرموی: (ئەوەی کە هەمیشە بە رۆژودەبێ رۆژوی نەگرتوە) واتە: شێکی چاك نیەو بێ پاداشە چونکە ڕاستی نەپێکاوە و بەوە چەندین مافی لەدەست داوە.

٣٥٨ـ ن/١٧٤٦ عَنْ أُمْ هَانِئٍؓ قَالَتْ وَفِيهِ قِصَةَ ــ قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ الصَائِمُ الْمُتَطَوِّعُ أميرُ نَفْسِهِ إنْ شَاءَ صَامَ وَإنْ شَاءَ أَفْطَرَ رواه احمد وابو داود الترمذي.

لەدایکی هانیئەوەؓ هاتوە، کە وتویەتی: (لێرەدا چیرۆکێکی تێدایە) پێغەمبەر خواﷺ فەرموی: ئەوەی، کە ڕۆژوی سونتەت ئەگرێت، خۆی سەرپەرشتی نەفسی خۆیەتی، ئەگەر ئارەزوی لێ بو ڕۆژو بگرێت، بابیگرێت، ئەگەر ئارەزوی لێ بو بیشکێنێنێ. واتە: خۆی سەرپشکە لە گرتن و لەشکاندنیداو هیچی ناکەوێت، کە ئەمە ڕاست ترە. والله أعلم

٣٥٩ ـ ن/١٧٤٨ عن ابی هریره ؓ قال رسول اللهﷺ: لايَتَقَدَ مَنَّ اَحَدُكُم رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمِ أَو يَوْمَيْنِ إلا أنْ يَكُونَ رَجُلُ كَانَ يَصُومُ صَوْمَاً فَلْيُصُمْهُ (رواه الجماعة)

لەئەبو هورەیرەوەؓ هاتوە، کە وتویەتی پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی (هیچ کەس لەئێوە پێش ڕەمەزان نەکەوێت بەگرتنی رۆژێك، یان دو رۆژ، مەگەر کەسێك باوی وابێ هەمیشە لە ئاخری مانگەوە چەند رۆژ بە ڕۆژوبێت ئەوە بارۆژوی خۆی بگرێت ــ

هەر چەند رۆژوەكەی رۆژێ یان دو رۆژێش ڕەمەزانە ـــ واتە: بۆ كەسێ خراپە بەناوی دڵسۆزی و تەقواوە، كە نەوەك رەمەزان كەم بێ ئاوابكات، یان بەهەر هۆیەتی تروەئەوە لادانە لەفرمانی پێغەمبەرﷺ، نەك بەندایەتی نیە بەڵكو تاوانە. احمد (٢/٥٢،٥١٣،٤٧٧،٤٠٨،٣٤٧،٢٨،٢٣٤) وابوداود (٢٣٣٥) والترمذي والنسائي (٤/١٥٤،٤،١٤٩) وابن ماجة (١٦٥٠).

٣٦٠ـ ن/١٧٥١) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ عَنْ رَسُولُ اللهِﷺ أَنَّـهُ نَهَى عَنْ صَوْمِ يَوْمَيْنِ يَوْم الفِطْرِ وَيَوْمِ النَّحْرِ) متفق عليه.

له باوكی سەعیدەوەرضي الله عنه هاتوه له پێغەمبەر خوا وەﷺ كە: (قەدەغەیە كردوە لە رۆژوی دو رۆژ، رۆژی جەژنی رەمەزان و رۆژی جەژنی قوربان). احمد (٣/٧١،٥٢،٥١،٣٤،٧) خ (١١٩٧) م (١٤١،١٤٠/٨٢٧).

٣٦١ـ ن/١٧٥٣ عن سَعْدُ بن وَقَّاصرضي الله عنه قَالَ: أمَرَنِي النَّبِيُّ ﷺ أنْ أُنَادِيَ أَيَامَ مِنَى أَنَّهَا أَيَامَ الحِلِ وَشُربِ، وَلاصَوْمَ فِيْهَا يَعْنِي أَيَامَ التَشْرِيقِ. رواه احمد (١/١٦٩/١٧٤)

لەسەعدی كوڕی وەقاسەوەرضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی پێغەمبەرﷺ فرمانی پێ كردم، كە لە رۆژەكانی مینادا بانگ بكەم و بڵێم: بەراستی ئەم رۆژانە رۆژی خواردن و خواردنەوەن رۆژوی تێدانیە. واتە: سێ رۆژ پاش جەژنی قوربانی ڕۆژی تێدا ناگرێت، مەگەر حاجیەك كەفارەتی لەسەر بێ، وەكو لەسورەتی بەقەرەدا هاتوەئەوە ئەتوانێ لەو ڕۆژانەدا ڕۆژوو بگرێت.

٣٦٢ ـ ن/١٧٥٥عَنْ عائشةرضي الله عنها قَالَتْ (كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَعْتَكِفُ العَشْرَ الأواخِر مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَاهُ اللهُ عَزَّوَجَلَ) رواه الجماعة الا النسائي وابن ماجة.

له خاتو عائیشه وەرضي الله عنها هاتوه، كه وتویەتی: (پێغەمبەری خواﷺ لەمزگەوتدا ئەوەدە ڕۆژەی كۆتایی ڕەمەزان دەمایەوە، هەتا خوای دەسەلاتدارو گەورە بردییەوە بۆ لای خۆی بردەوە. (٦/٢٧٩،٢٣٢،١٦٨،٩٢) خ (٢٠٢٦) م (١١٧٢) وابوداود (٢٤٦٢) والترمذي (٧٩٠).

٣٦٣ـ ن/ ١٧٦٥ عَنْ إبْنِ عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: كُنْتُ نَذَرْتُ فِي الجَاهِلَيَةِ؛ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي الْمَسجِد الحرامِ؟ قَالَ: فَأَوْفِ بِنَذْرِك)). رواه ا الجماعة إلا النسائي و إبن ماجة.

لەعەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە عومەر رضي الله عنه پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو، وتی: من لەسەردەمی نەفامیدا لە سەرخۆمم نەزرم کردوە ـــ کەشەوێك لەبەیتولحەرامدا بمێنمەوە؟ پێغەمبەر فەرموی نەزرەکەت جێ بەجێ بکە). واتە: ئەگەر نەزر بۆ ئیش تاوان و گوناە نەبو پێویستە جێ بەجێ بکرێت، هەروەها لێرەوە دەرئەکەوێت، کە مانەوە لەمزگەوتدا (الإعتكاف) پێویستی بە ڕۆژونیە، چونکە بە شەو ڕۆژو ناگیرێ. خ (٢٣٢) م (١٦٥٦/٢٧) احمد (٢٧،٢،٢٠/١) وابوداود (٣٣٢٥) والترمذي (١٥٣٩).

٣٦٤ ــ ن/ ١٧٧٠ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أنَ النَّبِيَ ﷺ قَالَ ((مَنْ قَامَ لَيْلَةَ القَدْرِإِيماناً وَاحْتِساباً غُفِرَ مَاتَقَدَمَ مِنْ ذَنْبِهِ)) اخرجاه خ (٣٥) م (١ ب/١٧٧٠)٧٦/٧٦٠).

لەئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی هەر کەس شەوانی قەدر هەستێت و باوەڕی پێبێ و چاوەڕوانی پاداشت بکات، ئەوا چاو پۆشی لەو تاوانانەی دەکرێت، کەلە پێشەوە کردونی

**تێبینی**: شەوەکان تاکی ئاخری ڕەمەزان یەکێکیان قەدرە و لەوبارەوە چەندین قسە هەیە یەکەمیانەو، هەمویان فەرمودەیان بەدەستەوەیەو لێرەدا لەمە زیاتر نانوسین.

٣٦٥ـ ن/١٧٧ عن عائشة رضي الله عنها قَالَتْ قُلْتُ يَارَسُولُ اللهِ ﷺ اَرأَيْتَ إنْ عَلِمْتُ أَيَ لَيْلَةٍ لَيْلَةَ القَدْرِ مَا أَقُولُ فِيهَا؟ قَالَ قُولِي اللَّهُم إنَّكَ عَفُوٌ تُحِبُ الْعَفُوُ فَاعُفُ عَنِي) رواه الترمذي ٣٥١٣ صححهُ وأحمد وابن ماجة ٣٨٥٠ احمد (٢٠٨/٦،١٨٣،١٨٢،١٧١).

لەخاتون عائیشەوە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: بە پێغەمبەری خوام گوت: پێم بڵێ ئەگەر زانیم کام شەو شەوی قەدرە، لەوشەوەدا چی بڵێم؟ فەرموی: بڵێ: ((ئەی خوایە بەڕاستی تۆ زۆر چاوپۆشی کاری چاوپۆشیم لێ بکە)). لێرەدا ئەمانەوەر ئەگرین:

١ــ ئەم دوعایە لەشەوی قەدردا سوننەتە.

٢ــ مانای وایە شەوی قەدر لەوانەیە پێی بزانرێت.

٣ــ مانای وایە شەوی قەدر ئەمێنێتەوە

# بەشی حەج

٣٦٦ـ ن/١٧٨٤ عَنْ إبْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: خَطَبْنَا رَسُولُ اللهِﷺ فَقَالَ: يَأَيُّهَاالنـاسُ كُتِـبَ عَلَيْكُمُ الحَجَ فَقَامَ الأَقْرَعُ بُن حابِسٍ فَقَالَ: أَفِي كُـلِ عَـامٍ يَارَسُـولُ اللهِﷺ؟ فَقَـالَ لَـوْ قُلْتَهَـا لَوَجَبَتْ وَلَوْجَبَتْ لَمْ تَعْمَلَوا بِهَا وَلَمْ تَـسْتَطِيعُوا أنْ تَعْمَلُـوا بِهَـا؛ الحَـج مَـرَةً فمَـنْ زَادَ فَهُـوَ تَطَـوْعٌ)) رواه أحمـد وغـيره. احمـد (١/٣٧١،٣٧٠،٣٥٢،٢٩٠،٢٥٥) وابـودواد (١٧٢١)والنسائى (٥/١١١) وابن ماجة (٢٨٨٦).

لەعەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوەﷺ هاتوە، كەوتویەتی پێغەمبەری خـواﷺ خوتبـەی بۆ خوێندینه وه و فەرموی: (خەڵكینە! حەج لەسەر تان فەرزكراوە، جا ئـەقرەعی كـوڕی حابیس هەستاو وتی: لەهەموساڵێكا ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟ فەرموی ئەگەر بم وتایـە بەڵێ: بەڕاستی فەرزدەبو، ئەگەر فەرزیش بوایە نـەتان ئـەكرد، نـەتان دەتـوانی بیكـەن، حەج یەك جارە، جاهەركە سێك زیاتر بكات، ئەوە سوننەتە.

٣٦٧ ـ ن/١٧٨٩ عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ أنَّ رَسُولُ اللهِﷺ قَالَ: لَعُمْـرَةَ إلى الْعُمْـرَةِ كَفَّـارَةٌ لِمَـا بَيْنَهُمـا وَالْحَـجُّ الْمَبْـرُور لَـيْسَ لَـهُ جَـزَاءٌ إلا الجَنْـةَ) رواه الجماعـة إلا أبـاداود خ/ ١٧٧٣/ ٤٣٧/ ١٣٣٩، والترمـذي ك٩٣٣، والنِـسَائِي/٥/١١٥، وإبـن ماجـة/ ٢٨٨٨، وأحمد٢/٢٤٦، ٢٦١، ٢٦٢.

لەئەبو هورەیرەوە هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (ئەم عومرە بـۆ ئـەو عومرە دەبێتە سڕینەوەی گوناهەكان، حـەجی تێـرو تـەواو بـەهیچ پاداشـت نادرێتـەوە، بێجگە لە بەهەشت.

٣٦٨ ـ ن/١٧٩٣عَنْ إبْنِ عَبَاسٍ أنَّ إمْرأَةٌ ، مِـنْ خَـثعَمِ قَـالَ: يَارَسُـولُ اللهِﷺ إنَّ أَبِـي أَدْرَكَتْهُ فَرِيضَةَ اللهِ فِي الحَجِّ شَـيْخَاَ كـبيراَ، لايَـسْتَطِيعُ أَنْ يَـسْتَوِي عَلَـى ظَهْـرِ بَعِـيرِهِ قَـالَ: ((فَحُجِي عَنْهُ)) رواه الجماعة الا الترمذي وابن ماجة.

لەعەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوەﷺ هـاتوە، كـە ئـافرەتێكی خەسـعەمی وتـی: ئـەی

پێغەمبەری خواﷺ باوکم حەجی لەسەر فەرزبوە کە پیاوێکی پیری گەورەیە، خۆی ناگرێ بەسەر وشترەکەیەوە، (فەرموی حەجی بۆبکە) واتە، کوڕو کچ ئەتوانێ حەج بۆ باوك دایکی خۆی بکات، بەو مەرجەی خۆی حەجی کردبێ، چ نەمابێ، یان مابێ و خۆی نەگرێ بۆ ئەنجامدانی ئیشەکانی حەج. احمد (١/٣٥٩،٣٤٦،٣٢٩،٢٥١،٢١٩) وابوداود(١٨٠٩) والنسائی(٥/١١٨، ١١٩) (٥/١١٩٠،١١٨٨) خ (١٥١٣)، (١٨٥٤)، (٤٣٩٩)، (٦٢٢٨) م (١٣٣٤/٤٠٧)

٣٦٩ـ ن/١٨٠٢ وَعَنْهُ أَنَّهُ سَمَعَ النَّبِيﷺ يَخْطُبُ يَقُولُ: ((لايخْلُونَّ رَجُلٌ بِإمرأَةٍ لا وَمَعَهَا ذُومَحْرَمٍ وَلاتُسافِرالمَرْأَةُ إلامَعَ ذِي مَحْرَمٍ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَارَسُولُ اللهﷺ إنَّ إمْرَأَتِي خَرَجَتْ في حَاجَة وَإنِّي اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةٍ كَذَا وَكَذَا قَالَ(فَانْطَلِقْ فَحُجْ مَعَ إمْرَأتِكَ) متفق عليه.

هەر لەوەوە هاتوە، کە بەراستی گوێبیستی پێغەمبەر بوەﷺ، کە خوتبەی ئەخوێندەوەو ئەیفەرمو: ((نابێ هیچ پیاوێك بەتەنهای لەگەڵ ئافرەتێکدا دانیشێ، مەگەر لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا ــ حرەمێك هەبێت، نابێ ئافرەت سەفەر بکات، مەگەر لەگەڵ مەحرەمی دابێت، جاپیاوێك هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بەڕاستی خێزانی من بۆ حەج دەرچوە و من ناوم بۆ غەزای فلان و فلان تۆمارکراوە، فەرموی ((بچۆوحەج بکە لەگەڵ خێزانەکەت دا. واتە، بۆ سەفەری حەجیش، ئەبێ مەحرەمی لەگەڵ دابێ.احمد (١/٢٢٢) (٣٠٠٦)،(٥٢٣٣)م (١٣٤١/٤٢٤).

٣٧٠ـ ن/١٨٠٦ وَعَنْهُ أنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ عَنْ شُبرُمةَ قَالَ: (مَنْ شُبْرمَةَ؟) قَالَ أَخٌ لِي ــ أَوْقَرِيبٌ لِي ــ قَالَ ((حَجَجْتُ عَنْ نَفْسِكَ؟ قَالَ: لا. قَالَ: ((حُجَّ عَنْ نَفْسِكَ ثُمَّ حُجَّ عَنْ شُبُرْمَةَ)) رواه ابوداود وابن ماجة.

هەر لەوەوە هاتوە، پێغەمبەرﷺ گوێی لێ بو پیاوێك ئەیوت، ئەمە لە بۆ (شبرمە) فەرموی ((شبرمەکی یە؟)) وتی برامە ــ یان خزممە، فەرموی تۆ خۆت حەجت کردوە؟)) وتی: نەخێر، فەرموی: ((حەج بکە بۆ خۆت ئینجا ــ ساڵێکی تر ــ حەج

بکە بۆ شوبرمە. واتە دروستە حەج کردن لەباتی خەڵك، بەڵام ئەبێ پێشەکی حەجی خۆی بکات، واتە ساڵی یەکەم ئەبێ بۆ خۆی بێ، حەج لەساڵێکدا یەکجار ئەکرێت.ابوداود (١٨١١) واين ماجه (٢٩٠٣).

٣٧١ـ ن/١٨٠٧ وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَقِيَ رَكْباً بِالرَّوْحَاءِ، فَقَالَ: ((مِنَ القَوْمِ؟)) قَالُوا: الْمُسْلِمُونَ فَقَالُوا: مَنْ أَنْتَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ)) فَرَفَعَتْ إِلَيْهِ إِمْرَأَةٌ صَبِيَاً، فَقَالَتْ: أَلِهَذا حَجٌّ؟ قَالَ: ((نَعَمْ وَلَكَ أَجْرٌ)) رواه احمد ومسلم وابوداود والنسائی (٣٤٤/١، ٢١٩،٢٤٤،٢٨٨،٣٤٣،٣٤٤) (١٧٣٦) (٢٠،١٢١) م (١٣٣٦).

هەر لەوەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ گەیشتە قافڵەیە لە(رەوحاء) فەرموی: ئەو گەلەکێ یە؟)) وتیان: مسوڵمانن وتیان تۆکێ ی؟ فەرموی: پێغەمبەری خوامﷺ جالەو کاتەدا ئافرەتێك منالێکی بردە لای پێغەمبەروﷺ وتی: ئایا حەج بۆ ئەمە هەیە؟ فەرموی: بەڵێ، بۆ تۆیش پاداشت هەیە)). واتە حەج بۆمنال ئەنوسرێت و پاداشتیش ئەنوسرێت بۆ ئەو کەسەی لەگەل خۆیدا ئەیبات، دایك بێ، یان باب، یان هەر کەسێکی تر، بەڵام ئەو حەجە نابێ بەهۆی ئەوە، کە ئەگەر منالەکە گەورە بو دەسەڵاتی حەجی بو، حەج نەکات، ئەبێ حەج بکات، لەبەر فەرمودەی: ((فَإِنْ اَدْرَكَ فَعَلَيْهِ الحَجُ)) ئەگەر حەجی لەسەر واجب بو ئەبێ حەج بکات).

٣٧٢ـ ن/١٨١١ وَعَنْهُ قَالَ: ((وَقَّتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ (ذا الْحُلَيْفَةِ) وَلِأَهْلِ الشَّامْ (الْجُحَفَةَ) وَلِأَهل نَجَدْ (قَرْنُ الْمَنَازِلِ) وِلِأَهْلِ اليَمَنِ (يَلْمْلَم) قَالَ: فَهُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ لِمَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَجَ وَالْعُمْرَةَ فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمَهِلُهُ مِنْ أَهْلِهِ حَتَّى أَهْلُ مَكَةَ يُهِلُونَ مِنْهَا).

هەر لەوەوە هاتوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ جێگای ئیحرام بەستنی بۆ خەڵکی دیاری کردو فەرموی: (بۆ خەڵکی مەدینە (زلحولەیفەیە)، بۆ خەڵکی شام (جوحفەیە) بۆ خەڵکی نەجد (قەرنولمەنازیلە)و بۆ خەڵکی یەمەن (یەلەملەمە)، فەرموی:

ئەم شوێنانه بۆ خەڵکی ئەو شوێنانەیە و بۆ هەر کەسێکی تر کەلەو شوێنانەوە بێ و ئەوانەی لەو شوێنانە نزیکترن بۆ حەج، لەماڵی خۆیەوە ئیحرام دەبەستێت و نیەتی حەج و عومرە دێنێ، تەنانەت خەڵکی مەککە لەناو مەککەدا ئیحرام دەبەستن. لە ریوایەتێکی تردا بۆ خەڵکی عێراق (زاتو عیرق) دنراوە .

## چونە ناو مەككە بەبێ ئیحرام لەبەر بونی بەهانە

٣٧٣ ـن/ ١٨١٩ عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه (أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم دَخَلَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ عَمَامَةٌ سَوْدَاءٌ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ) رواه الجماعة الا البخاري م(٤٥١ / ١٣٥٨) (٣٦٣/٣ / ٣٨٧) و أبوداود(٤٠٧٦) و الترمذي (١٦٧٩، ١٧٣٥)

لە جابرەوە هاتوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕۆژی فەتحی مەککە چوە ناو مەککە مێزەرەیێکی ڕەشی بەسەرەوە بو بەبێ ئیحرام.

٣٧٤ـ ن/١٨٢١ عَنْ إِبْنُ عَبَاسٍ قَالَ: مِنَ السُنَةِ ألا يُحْرِمُ بِالْحِج إلاَّ فِي أشْهُرِ الحَجِ) رواه البخاري.

لە عەبدولای کوڕی عەباسەوە هاتوە، کە وتویەتی بەشێکە لە سوننەت کە ئیحرام نەپۆشێت بۆ حەج، مەگەر لەمانگەکانی حەجدا بێت. مانگەکانی حەج ئەمانەن: شەووال، زولقەعدە و دە ڕۆژی ئەوەڵی مانگی زولحەجە .

٣٧٥ ـ ن/ ١٨٢٢ عَنْ أَبِي هُورَيْرَةَ قال: (بَعَثَنِي أَبُو بَكَرْ فِيمَنْ يُؤَذِنُ يَوْمَ النحر بِـ(مِنَّى) لا يَحُجُ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلايَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ وَيَوْمُ الْحَجِ الأكْبَرِ يَوْمُ النَحْرِ) رواه البخاري (خ) ٣١٧٧ و ابوداود ١٩٤٦.

لە ئەبو هوریرەوە هاتوە کەوتویەتی : ئەبو بەکر رضي الله عنه منی لەناو ئەو جارچیانەدا ڕەوانە کرد، کە لە ڕۆژی جەژندا لە (مینا) بڵێین: پاش ئەمساڵ، نابێ موشریك حەج بکات نابێ ڕوت تەوافی بەیت بکات، ڕۆژی حەجی گەورە ڕۆژی جەژنە، کە یەکەم ڕۆژی قوربانیە.

٣٧٦ـ ن/ ١٨٤٤ عَنْ إبْنِ عَبَاسٍ عَنِ النَّبِيَّ ﷺ قال: (عُمْرَةٌ فِي رَمَضَان تَعْدِلُ حَجَّـةً) رواه الجماعة إلاالترمذي ابوداود لكنه له من حديث أُمِّ مَعْقَلٍ.

له عەبدولاّی كوڕی عەباسـەوەرضي الله عنه هـاتوه لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ، كـە فەرمويـەتی: (عومرەیەك لەڕەمەزان دا بەرانبەر حەجێكە ــ عومرە هەمو ئیشەكانی حەجە بێجگە لە وەستانی عەرەفات. عومرە لە هەمو كاتێكا ئەكرێت، وەكو حەج نیە و لـە سـاڵێكدا ئەتوانرێت چەند جـار ئـەنجام بـدرێت. أحمـد(٢٢٩، ٣٠٨) و ابـن مـاجـه (٢٩٩٤) (خ) ١٧٨٢ ــ ٢٩٦٣) م (٢٢١، ١٢٥٦/٢٢٢) و النسائی (١٣٠/٤، ١٣١) .

٣٧٧ـ ن/ ١٨٢٩ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ (كَانَ النَّبِـيُّ ﷺ إذَا أَرَادَ أنْ يُحْـرِمَ تَطَيَـبَ بِأَطْيَـبِ مَا يِجِدُ ثُمَّ أَرَى وبِيَصُ الدُهْنِ فِي رَأْسِهِ لِحْيَتِهِ بَعْدَ ذَلِكَ) خ ٥٩٢٣، ٥٩٢٨) م(٣٦، ٣٧/ ١١٨٩، ٤٤، ١١٩٠).

لەخاتون عائیشەوەرضي الله عنها هـاتوە كـە وتویـەتی (پێغەمبـەرﷺ هـەركاتێ ئەیویـست ئیحرام بپۆشێت بە باشترین بۆنێ، كە دەستی كەوتایە خۆی بـۆن خـۆش ئـەكرد ،لەپاشـا من بریسكەی ڕۆنم لەسەر و ریشی ئەبینی لەپاش ئیحرام. واتـە: سـوننەتە بۆنخۆشـكردن لەپێش بەستنی ئیحرامەوە و ئەو بۆن و ڕەنگەی پاش ئیحرام زیانی نیە.

٣٧٨ـ ن/ ١٨٣٣ عَنْ جَابِرٍ أنَّ أهْلاَلَ رَسُولُ اللهﷺ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَـةَ حِينَ إسْـتَوَتْ بِـهِ رَاحِلَتُهُ)) رواه البخاری، وقَالَ: رواه أنَس و ابن عباس. (خ ١٥١٥).

لەجابیرەوە هاتوە، كە: پێغەمبەری خواﷺ حەجی هێنا لە زولحولەیفە، كـە جێگـای ئیحرامی خەڵكی مەدینەیە ــ وەختێ وەستا لە سەر وشترەكەی، ئـەو پـاش و پێـشە، كەوتراوە لەبەر ئەوەیە، كە چەندین جار لەبەر تێگەیاندنی خەڵك بەدەنگی بەرز، ئـەوەی فەرموە، جا هەركەس لە كوێ، گـوێ لێبـوە وتویـەتی پێغەمبـەرﷺ لـەوێ ئیحرامـی بەستوە (لبیك لبیك)ی فەرموە، و الله أعلم .

٣٧٩ ـ ن / ١٨٣٦ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى ضَبَاعَة بِنْتُ الزُبَيْرِ فَقَالَ لَهَا لَعَلَكَ أَرَدْتِ الْحَجَ فقالت: وَاللهِ مَا أَجِدُنِي إلا وَجْعَةً، فَقَالَ لَهَا ((حُجِي إشْتَرِطِي وَقُولِي: اللّهُمَّ مَحِلِي حَيْثُ حَبَسْتَنِي)) وَكَانَتْ تَحْتَ المِقْدَادُ بن الأسْوَد. (خ ٥٠٨٨) م(١٠٤ / ١٢٠٧) و النسائى (٥/ ١٦٧، ١٦٨) أحمد(٦/١٦٤).

لەخاتو عائیشەوە ﵂ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوە لای (زەباعەی کچی زوبەیر) فەرموی: ئومێدە حەج بکەیت؟ وتی: بەخوا مـن هەمیشە وەك ئـەزانی ئێش و ژانم هەیە پێی، فەرموی: حەج بکە و مەرج دانێ و بڵێ: ئەی خوایە شوێن حەڵاڵ بونم ئەو جێگایە ئەبێ، کە خۆت گیرم ئـەدەیت. واتـە، دروسـتە کەسـێ، کـە لـەخۆی ڕانەبینێ بەوشێوە مەرج بکات، جا ئەگەر بۆی تەواو کرا خۆچاکە، ئەگینا لە کوێ پەکی کەوت، ئیحرام لەخۆی دەکاتەوە و ئەگەرێتەوە.

٣٨٠ـ وَعَنْهَا قَالَتْ: خَرْجَنَا مَعَ رُسول اللهِ ﷺ فَقَالَ: مَنْ أراد مِنْكُمْ أَنْ يُهْلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةً فَلْيَفعَلْ، وَمَنْ أرادَ أَنْ يُهِلَ بِحَجٍّ فَلْيَفعَلْ، وَمَنْ أَرَادَ أَنْ يُهِلَ بِعُمْرَةٍ فَلْيَفْعَلْ)) قَالَت: وَأَهَلَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْحَجِ وَ أَهَلَّ بِهِ نَاسٌ مَعَهُ وَ أَهَلَّ مَعَهُ نَاسٌ بِالْعُمْرَةِ وَالْحَجُ وَأَهَلَّ نَاسٌ بِعُمْرَةٍ وَكُنْتُ فِيْمَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ . رواه الجاعة الا الترمذي. (٩/١٩١) وابن داود (١٧٧٩) و النسائي (٥/١٤٥) و ابن ماجه (٣٠٠٠) خ (١٥٦٢) م (١١١ ــ١١٨ / ١٢١١).

هەر لە وەوە ﵁ هاتوە، کە وتویەتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچوین بۆ حەج و فەرموی: ((هەر کەسێ ئەیەوێ ئیحرام بە نیـەتی حـەج و عـومرەوە ببەسـتێت، باوابکات، هەرکەس ئەیەوێ ئیحرام تـەنها بـۆ حـەج ببەسـتێت، باوابکـات، هەرکـەس ئەیەوێ ئیحرام تەنها بۆ عومرە ببەستێت، باوابکات)) وتی: پێغەمبەری خـوا ﷺ خـۆی ئیحرامی بۆ حەج بەست ، هەندێکیش لەگەڵ ئەودا وا ئیحرامیان بەست و، هەندێکی تر ئیحرامیان بە حەج و عومرە بەست و، هەندێ خەڵکی تریش ئیحرامی بەعومرە بەست ، من یەکێك بوم لەوانەی، کە ئیحرامیان بە عومرەوە بەست بو. واتە: ئەنجامدانی حـەج و

عومرە بەو سێ شێوە ئەبێ: یەکەمیان پێی ئەڵێن بە تاك (افراد)، دوهەمیان، بەیەکەوە لکاندن (قران)، سێهەمیان لەزەت وەرگرتن (تمتع).

٣٨١ـ ن/ ١٨٤٢ عَنْ حَفْصَةَ رضي الله عنها أُمْ الْمُؤْمِنِيْنْ، قَالَتْ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ مَاشَأْنُ النَّاسِ حَلُّوا أَوْ لَمْ تَحِلْ مِنْ عُمْرَتِكَ؟ قَالَ: أَنِّي قَلدتُ هَدْيِي، وَلَبَدْتُ رَأْسِي فَلا أُحِلّ حَتَّى أُحِلَّ مِنَ الْحَـجِ)) رواه الجماعة إلا الترمذي٢٠. واحمد (٢٨٣/٦) خ(١٧٢)م (١٢٢٩/١٧٦) و ابوداود (١٨٠٦) و النسائي (١٣٦/٥) واين ماجه (٣٠٤٦) .

لە خاتون حەفصەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: وتم بە پێغەمبەرﷺ ئەوە چیە خەڵك لە ئیحرام دەرچون و شتیان لێ حەڵاڵ بوەو، تۆ لە ئیحرام دەرنەچویت؟! فەرموی: من هەدیم لەگەڵ خۆما هێناوە و سەرم بەستوە، لە ئیحرام نابمەوە، تالە حەج نەبمەوە. واتە کەسێ هەدی برد بۆ حەج، ئەبێ ئیحرامەکەی، یان بەحەج، یان بە حەج و عومرە بێ، نابێ بە عومرەی روت بێو بەر لە حەج ئیحرام بکاتەوە، چونکە تا هەدی سەر نەبڕێت نابێ بکاتەوە، هەدیش تارۆژی جەژن سەرنابڕێت، مەگەر لەڕێگایدا کۆسپ پەیدابێ و نەتوانی حەج تەواو بکات، ئەوە ناچارە حەیوانەکەی سەربڕێت و ئیحرامەکەی بشکێنێ.

٣٨٢ـ ن/ عَنْ أَبِي بَكْرِ الْمُزَنِي عَنْ أَنَسٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولُ اللهِﷺ يُلَبِي بِالْحَجِ وَ الْعُمْرَةِ جَمِيعَاً يَقُولُ: ((لَبَيْكَ عُمْرَةً وَ حَجَاً)) رواه الجماعة الا الترمذي. خ(٣٥٣ـ٤٣٥٤) م (١٨٥ـ١٢٣٢) و احمد (٣ـ٩٩) وابوداود كرد (١٧٩٥) و النساء(٥ـ١٥٠) و ابن ماجد (٢٩٦٨، ٢٩٦٩) .

لە ئەبو بەرکری موزەنیەوە لە ئەنەسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی گوێبیستی پێغەمبەری خوا بوم ﷺ بۆ حەج و بە عومرەو بۆ هەردوکیان دەیفەرمو: ((وەڵامت ئەدەمەوە هەمیشە بۆ عومرەو بۆ حەج)) وشەی (لبيك) بۆ دوانە واتە دوجار وڵامت ئەدەمەوە لێرەدا مەبەست بۆ دوان نیە، بەڵکو بۆ بەردەوامی و زۆرە، بۆیە ئێمەش وامان ماناکرد. والله اعلم.

٣٨٣ـ ن/١٨٥٨ عَنْ إبنِ عُمَرَ رضي الله عنه أنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إذا إسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةَ عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ، أَهَلَّ فَقَالَ: ((لَبَيْكَ اللَّهُمَ لَبَيْكَ، لاشَرِيكَ لَكَ لَبَيْكَ، إنَّ الحَمْدَ وَالنِعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْك، لاشَرِيكَ لَكَ)) وَكَانَ عَبْدُاللهُ يَزِيدُ مَعَ هَذا: ((لَبَيْكَ لَبَيْكَ، وسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدِيكَ، وَ الرَّغْبَاءُ إلَيْكَ وَالعَمَلُ)). رواه الجماعة.

له عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ ئەوکاتەی، کە وشترەکەی بە پێوە وەستاوە لەلای مزگەوتی (زیلحولیفە)، نیەتی حەج عومرەی هێناوە، پاشان فەرموی: ((وەڵامم دایتەوە ئەی خودایە وەڵامم دایتەوە، هیچ هاوبەشێکت نیە وەڵامم دایتەوە، بەڕاستی تەواوی سوپاس هەر بۆتۆیە، هەمو نیعمەت هەر هی تۆیەو هەروەها دەسەڵات داریشی، هیچ هاو بەشێکت نیە)، عبدالله ئەمەیشی لێ زیاد کرد ((وەڵامم دایتەوە وەڵامم دایتەوە، دە هەرلەتۆوەیە هەموخۆشبەختیەکان، چاکە هەر لە دودەستەی تۆدایە و هەمو داخوازیە چاکەکان هەر لە تۆوە ئەبێت، هەروەها ئیشیش. واتە ئەتوانرێت لە سەر زیکرەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەمەیش و شتی تریش زیادە بکرێت، بەڵام وەستان لە سەر زیکرەکانی پێغەمبەرمان ﷺ زۆر چاکەو بە سودترە، تا مرۆڤ بە ناوی زیکرەوە نە کێشرێتە ناو بیدعەوە ، پێغەمبەر ﷺ لە ئێمە خوا ناسترو لێزانتر بوە، با خۆمان فەرز نەکەین بە سەر ئەو زاتە دا. وتراوە(الْخَيْرُ فِي الإتْبَاعِ لا فِي الإبْتِدَاعِ) أحمد(٢/ ٤٨) خ (١٥٤٩)م (١٩/ ١١٨٤) ، وأبو داود (١٨١٢)، والترمذي(٨٢٥) والنسائي(٥/ ١٦٠).

٣٨٤ـ ن/ ١٨٦١ عن السَّائِبِ بِنِ خَلاَّدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إذَا أَتَانِي جِبْرِيلُ فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي أنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالإهْلالِ، وَالتَّلْبِيَةِ، رواه الخمسة، وصححه الترمذي.

له سائیبی کوڕی خەلادەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی پێغەمبەر فەرمویەتی: جبرەئیل هاتە لام و فەرمانی پێدام، کە فرمان بدەم بە یارەکانم، دەنگیان بەرز بکەنەوە بۆ دابەستنی نیەتی حەج و عومرە بە وتنی ئەو زیکرەی، کە لە فەرمودەی پێشودا باسکرا.

أحمد(٤/ ٥٦)، و أبو داود(١١١٤)، والترمذي(٨٢٩)، والنسائي(٥/ ١٦٢)، وإبن ماجة (٢٩٢٢).

٣٨٥ـ ن/ ١٨٦٤ عن الفضل بن العباس، قَالَ: كُنْتُ رَدِيفَ رَسُولَ اللهِﷺ مِنْ جَمْعٍ إِلَى ((مِنَى)) فَلَمْ يَزَلْ يُلبِي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةَ. رواه الجماعة ./احمد)١/٢١٠, ٢١٤(خ)١٥٤٣, ١٥٤٤(و ابو داود)١٨١٥(و الترمذي)٩١٨(و النسائي)٥/٢٦٨(و ابن ماجه)٣٠٤٠.

لە فەزڵی کوڕی عەباسەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: من لە پاش تەرکی پێغەمبەری خواوەﷺ بوم لە ((جەمع))دا و هەتا ((مینا)) هەر زیکری(لبیك لبیك)ی ئەکرد، تا ڕەجمی یەکەمی ئەکرد، لە ڕیوایەتی تردا هاتوە، هەتا سەلامی لە بەردە ڕەشەکە ئەکرد ئیتر زیکرەکە دوای هات و لەگەڵ هەمو بەردێکی شەیتان ڕەجم کرندا)الله اکبری ئەکرد، ئەمە بەو مانا نیە، کە هیچ زیکرێکی نەدەکرد، بەڵکو جێگیر بو، هەندێ زیکر لە هەندێ جێگای تایبەتدا و ئێستا هەموی دیاری کراوە و حاجی بە ئاسانی ئەتوانێ بیانزانێت ئێمە لێرەدا لەوە زیاتر نانوسین.

٣٨٦ـ ن/١٨٦٨ عن اسماء بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: خَرْجَنَا مُحْرِمِينَ فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ ((مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدىٌ فَلْيُقِمْ عَلى إحْرَامِهِ وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ (فَلْيَحْلِلْ)) احمد٦/ ٣٥٠, (٣٥١)(١٢٣٦) والنِّسَائِي)٥/٢٤٦(و ابن ماجه)٢٩٨٣.

لە خاتو ئەسمای کچی ئەبو بەکرەوەرضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ دەرچوین ـ بۆ حەج وـ ئیحرامان پۆشی، فەرموی: هەرکەسێ هەدی پێیە، با لە ئیحرامی خۆیدا بمێنێتەوە، هەرکەسێکیش هەدی لەگەڵ نیە، با ئیحرام لە خۆی بکاتەوە. جا ئەوانە ڕۆژی هەشتەم ئەچنە مینا لەگەڵ باقی حاجیان و، دوبارە ئیحرامی حەج ئەپۆشن وەکو لە ڕیوایەتی تردا هاتوە.

٣٨٧ـ ن/١٨٧٩ ((عَنْ إبْنُ عُمَر قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِﷺ مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ؟ قَالَ: ((لا

يَلْـبَسُ الْمُحْـرِمُ القَمِـيصَ وَلا العَمَامَـةَ وَلا البُـرْنُسَ ولا الـسَّراوِيلَ وَلا ثَوْبَـاً مَـسَّهُ وَرَس وَلا زَعْفَرَانِ وَلا الخِضْنَ إلاّ أنْ لايجِدَ نَعْلَيْنِ فَلْيَقْطَعْهُمَا حَتَّى يَكُونَ أسْفَلَ مِـنَ الكَعْبَـيْنِ)) رواه الجماعة. خ)١٥٤٢(م)١/١١٧٧(و احمد)٢/٣, ٤, ٢٩, ٣٢, ٤١, ٥٤, ٧٧, ١١٩(و ابو داود)١٨٢٤(و الترمذي)٨٣٣(و النسائي)٥/١٣١, ١٣٢(و ابن ماجه)٢٩٢٩).

له عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوەﷺهاتوە، کـە وتویـەتی: پرسـیار لـە پێغەمبـەری خواﷺ کرا، ئەو کەسەی ئیحرام دەبەستێ، چـی بپۆشـێت؟ فـەرموی: ((ئـەو کراسـەی ئیحرام دەبەستێ و مێزەر و عەبا و شەرواڵ و پۆشاکێك کە وەرس و زەعفەرانی پێوەبێ و نابێ خوفەکان بپۆشێت، مەگەر نەعلی دەست نەکەوێت، ئەو کاتە پێویـستە ملـەکانیان ببڕێت، کە بکەوێتە خواری قاپەوە.

٣٨٨ــ ن/١٨٨٠ وَعَنْـهُ أنَّ النَّبِـيَﷺ قَـالَ: ((لاتَنْتَقِـبُ الْمَـرأةُ الْمُحْرِمَـةُ وَلا تلْـبَسُ الْقَفَازَيْنِ )) (رواه الجماعة إلاَّ مُـسْلماً وإبْـنَ مَاجَـه خ١٨٣٨(و احمـد)٢/٢٢, ١١٩(و ابـو داود)١٨٢٥(و النسائي)٥/١٣٣(و الترمذي)٨٣٣( وَصَحَحَهُ).

هەر لەوەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((ئافرەتی مـوحرم نیقـاب نـەکات (دەم و چاوی دانەپۆشێت) و دەستکێش نەپۆشێت. واتە تەنها ئەو دو شـتە لـە ئـافرەت قەدەغـە کـراوە، ئـیتر هەرچـی بپۆشـێت و هـەر ڕەنگـێ بـێ قەیناکـە بـەس وەرس و زەعفەرانیان پێوەنەبێ, والله اعلم.

٣٨٩ـ ن/١٨٨١ عن جابر قال: قال رسول اللهﷺ((مَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَـيْنِ وَمَنْ لَمْ يَجِدْ إزَارَاً فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ)) رواه احمد ٣/٣٢٣ و مسلم م)٥/١١٧٩(وصحَّحه)).

له جابیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((هەرکەسـێك نەعلی دەست نەکەوێت، با خوف لەپێ بکات، هەرکەسێك کراسی دەست نەکـەوێت، بـا شەرواڵ لەبەربکات.

٣٩٠ـ ن/١٨٨٦((عَنْ أُم الحُصَيْنِﷺ قَالَتْ: ((حَجَجْنَا مَـعَ رَسُـولُ اللهِ حَجَـةَ الـوَدَاعِ فَرأيْتُ أُسَامَةً وَبِلالاً وَأَحَدُهُمَا آخذ بِخِطَامِ نَاقَةِ النَّبِـيﷺ والآخـر رافِـعٌ ثَوْبَـهُ يَـسْتُرُهُ مِـنَ

الَحرِّ حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ العَقَبَةِ)). رواه احمد ٤٠٢/٦ و مسلم(١٢٩٨) و ابوداود ١٨٣٤ و النسائي ٢٦٩/٥. م).

له دایكی حوصەینەوەﷺ هاتوه، كە وتویەتی: ((لە خزمەت پێغەمبەری خواداﷺ حەجی ماڵ ئاوایمان كرد، ئوسامە و بیلال بینی یەكێكیان ڕێشمەی حوشترەكەی پێغەمبەرﷺی گرتوه، ئەویتریان پۆشاكەكەی بۆ كردبو بەسێبەر لە بەر گەرما، هەتا ڕجمی شەیتانی كرد، واتە سێبەركردن لە كاتی ئیحرام دا زیانی نیە، بەڵام سەرو دەمو چاوی داپۆشێت.

٣٩١ـ ن/١٨٨٧((عَنْ إبنِ عَبَاس: أنَّ رَجُلاً أوْ قَصَتْهُ راحِلَتُهُ وَهُوَ مُحَرِمٌ، فَمَاتَ فَقَالَ رَسُولُ اللهﷺ: ((إغْسلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبِيهِ وَلا تخَمَرُوا وَجْهَهُ وَلا رَأسَهُ فَإنّه يُبْعَثُ يَومَ القِيَامَة مُلَبياً)). رواه الجماعة. احمد)١/٢٢٠, ٢٢١, ٢٨٦, ٣٢٨, ٣٣٣, ٣٤٦(وابو داود)٣٢٣٨ (خ)١٢٦٧(م)١٢٠٦/٩٨,٩٩(و الترمذي)٩٥١(و النسائي)١٤٤/٥(و ابن ماجه)٣٠٨٤.

لە عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوە ﷺهاتوە كە: پیاوێك وشترەكەی بەری دایەوەو ملی شكاند و مرد، كە ئەو لە ئیحرام دا بو، پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: بە ئاو و بەمۆرد بیشۆرن و، هەر ئەو دو پۆشاكەی بۆ بكەن، بە كفن دەم و چاو وسەری دانەپۆشن، ئەو لە ڕۆژی قیامەت دا كاتێ زیندو ئەكرێتەوە (لَبَيْكَ لَبَيْكَ)دەڵێتەوە.

٣٩٢ـ ن/١٨٩٤((عَنْ كَعْبُ بِنُ عُجْرَةَ قَالَ: كَانَ بِي أذَى مِنْ رَأْسِي فَحُمِلْتُ إِلى رِسُول اللهﷺ (وَالْقُمَلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهي فَقَالَ: ((مَا كُنْتُ أرَى الجَهْدَ قَدْ بَلَغ مِنْكَ مَا أرَى أتَجِدُ شَاةً؟)) قُلْتُ: لا فَنَزَلَتِ الآيَة: ((فَفِدۡيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوۡ صَدَقَةٍ أَوۡ نُسُكٍۚ ))(البقرة/١٩٦ قال: ((هُوَ صَوْمُ ثَلاثَةِ أيَامٍ أوْطَعَام سِتَةِ مَسَاكِين نِصْفَ صاعٍ نِصْفَ صاعٍ، طعاماً لِكُلِ مِسْكِين)) رواه الجماعة.

لە كەعبی كوڕی عوجرەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: سەرم ژانی دەكرد، لەبەرئەوە برامە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ، لەو كاتەدا ئەسپێ دائەباری بە سەرو چاوما.

فەرموی: ((وام نەئەزانی نارەحەتی گەیشتوە بەو جێگایەی، کە ئێستە ئەیبینم، ئایا حەیوانێکت دەست ناکەوێت؟) وتم: نەخێر، جا ئەم ئایەتەی سورەتی بەقەرە هاتە خوارەوە، کە ئەفەرموێت: (بافیدیە بدات لە باتی ئەو سەرچاکردنە بەڕۆژوو، یان چاکەکردن، یان حەیوان سەربڕین) بەقەرە ئایەتی ١٩٦، وتی: ئەو ڕۆژەوە سێ ڕۆژە، یان خواردنی شەش فەقیرە بۆ هەر فەقیرێك نیوصاع.

٣٩٣ـ ن/١٨٩٥((عَنْ عَبْدُاللهِ بِنِ بُحَيْنَةَ قَالَ: ((إحْتَجَمَ النَّبِـيُّ ﷺ وَهُـوَ مُحَـرِمٌ بِلْحَـي جَمَـلٍ مِـنْ طَرِيـقِ مَكَـةَ فِـي وَسَـطِ رَأْسِـهِ)). رواه الجماعـة الاابـاداود و الترمـذي خ)١٨٣٦(بـرقم)٥٦٩٨(م)١٢٠٣(/احمـد)٥/٣٤٥(و النـسائي)٥/١٩٤(و ابـن ماجه)٣٤٨١).

لە عەبدوڵڵای کوڕی بوحەینەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: ((پێغەمبەرﷺ کەڵەشاخی کردوە لە کاتێکدا موحریم بوە لە(لحی جەمەل لە ڕێگەی مەککە لە ناوەڕاستی سەریدا. واتە: کەڵەشاخ ئیحرام بەتاڵ ناکاتەوە. هەروەها سەر شۆردنیش وەکو لە ڕیوایەتی تردا هاتوە. [1]

٣٩٤ ـ ن/١٨٩٨((عَنْ عُثْمَانُ بن عَفَان أنَّ رَسُولُ اللهِﷺ قَـالَ: ((لا يَـنْكِحُ الْمُحـرْمُ ولا يُـنْكِحُ وَلا يَخْطُـبُ)) احمـد)١/٦٩(و ابـو داود)١٨٤١(و الترمـذي)٨٤٠(و النسائي)٥/١٩٢(و ابن ماجه)١٩٦٦رواه الجماعة الا البخاري و لـيس للترمـذي فيـه(ولا يَخْطُبُ)).

لە عوسمانی کوڕی عەفانەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((موحریم نیکاح نەکرێت و نیکاحیش نەکات و خوازبێنیش نەکات))... بەڵام لە ڕیوایەتی تورمزیدا بێژەی خوازبێنی نەکات تێدا نیە. مەسئەلەی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەرﷺ: ڕاستتر ئەوەیە کە هەردوکیان لە ئیحرام دا نەبون.

---

(١) ـ تەماشای فەرمودەی ژمارە ١٨٩٧ لە سەرچاوە پێشو بکە.

# حەڕامیی گۆشتی نێچیری شاری مەککەو

# زامن بون بە خوێنەکەی

٣٩٥ـ ن/١٩٠٦((عَنْ جَابِر قَالَ: ((جَعَلَ رَسُولُ اللهِﷺ فِي الضّبع يُصِيبُهُ الْمُحْرِمُ كبْشاً وَجَعَلَهُ مِنَ الصَّيْدِ)) رواه الخمسة و قال البيهقى هو حديث جيد تقوم به الحجة.

لە جابیرەوەﷺ هاتوە کە وتویەتی: ((پێغەمبەری خواﷺ لە کەفارەتی(کەمتیار)دا، کە موحریم بیکوژێت بەرانێکی داناوە و فەرمویەتی بەشێکە لە نێچیر. بەڵێ، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بەو شێوە فرمانی داوە بۆ کەمتیارو، بەران بۆ ئاسك بزن و سبۆ کەروێشك چتیرو بۆ رزق بەرخۆلە. وەکو لە(الموطأ) ئیمامی مالیك دا هاتوە.

٣٩٦ـ ن/ ١٩١٧(( وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيّ ﷺ قَالَ(صَيْدُ الْبَرِ لَكُمْ حَلالٌ وَأنْتُمْ حُرُمٌ مَالْ تَصِيدُوهُ أوْ يُصِدْكُمْ لَكُمْ)رواه الخمسة الا ابن ماجة وقال الشافعي هذا احسن الحديث روي في هذا الباب .

هەر لەوەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (نێچیری کێوی و وشکانی، لە کاتێکا، کە ئێوە لە ئیحرام دابن حەڵاڵە خواردنی بەو مەرجەی، کە خۆتان نەیگرن، یان بۆتان نەگیرێ. احمد(٣٦٢/٣) وابو داود(١٨٥١) والترمزي(٨٤٦) والنسائي(١٨٧/٥).

٣٩٧ـ ن/ ١٩١٩((عَنْ أَبِي هُرَيْرَة أنَّ النَّبِيَﷺ لَمَا فَتَحَ مَكَّةَ قَالَ: ((لايُنْفَرُ صَيْدُهَا وَلا يُخْتَلَى شَوْكَهَا وَلا تَحِلُّ سَاقِطَتَهَا الا لِمَنْشدٍ)فَقَالَ العَبَاسُ : إلاّ الإذْخِرَ فَإنَّا نَجْعَلُ لِقُبُورِنَا وَ بُيُوتِنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺإلا الإذْخِر) رواه الجماعة. احمد(٢٣١/٢) وابو داود (٢٠/٧ ، ٥٠٥) ، خ(١١٢)، (١٤٣٤) ، (٦٨٨٠) ، (١٣٥٥) والترمزى(١٤٠٥)

والنسائی(٣٨/٨)وابن ماجه(٢٦٢٤) .

له ئەبو هورەیرەﷺ هاتوە، كه پێغەمبەرﷺ لەكاتێ، كـه مەككـەی گرتـووە (فـتح المكه)فەرموی((نابێ نێچیرەكانی بتارێنرێـت و بكوژرێـت و نـابێ دارو درەخـت و گیـای ببڕێت و، نابێ هیچ شتێكی كەوتوی هەلگرێتەوە، مەگـەر ئـەوەی، كـه بانگـەوازی بـۆ بكات))لەو كاتەدا عەباس وتی"بێجگه له ئیزخیر (ناوی گیایەكه) ، چونكه ئەوە بـەكار دێنین بۆ گۆڕەكانمان و بـۆ مالـەكانمان. پێغەمبـەری خـواﷺ فـەرموی : ((بێجگـه لـه ئیزخیر)).

## ئەوانه كه هەمیشه كوشتنیان دروسته

٣٩٨ـ ن/١٩٢١((عَنْ عائشةل قَالَتْ: ((أَمَرَ رَسُولُ اللهِ بِقَتْلِ خَمْسٍ فَوَاسِقَ فِـي الْحِـلِّ وَالْحَـرَمِ الغُـرابُ، وَالْحِـدَاة ، وَالْعَقْـرَبُ، وَالفَـأْرَةُ وَالْكَلْـبٌ العَقُـور)). والترمــزی(٨٣٩) والنسائی(١٨٨/٥) خ(٣٣١٤) م(١١٩٧٦٨).

له خاتون عائیشەوه ﵂هاتوه كەوتویەتی ((پێغەمبەری خواﷺ فرمانی داوه بـه كوشتنی پێنج فاسق لەهەمو شوێن و هەمو كاتێكا، بێ ئیحرام یان له ئیحـرام دا بیـت، قەله ڕەشه، كۆلارە، دوپشك و، مشك و، سەگی هار. واته ئەمانه دەبێ بكوژرێن، با لـه مەككەو كابرایش له ئیحرام دا بێ، مەبەست هەر شـتێكی زیـان هێنـەرە، چـونكه لـه ریوایەتێكی تری ئیمامی موسلمدا شەشن و ((ماریش))یەكێكه لەوان .

٣٩٩ـ ن/٧ ١٩٢((عَنْ إبنِ عَبَاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِمَكَّةَ: وَمَا أَطْيَبُـكَ مِـنْ بَلَدٍ، وَأَحَبُك إلـيّ، وَلَـوْلا إنّ قَـوْمِي أَخْرَجُـونِي مِنْـكِ مَـا سَـكَنْتُ غَيْـرَكِ. رواه الترمـذي، وصححه.

لەعەبدلای كوڕی عەباسەوە﵄ هاتوه، كه وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺفەرمویەتی: هیچ شارێك لەلای من له تۆ پاكتر نیەو له تۆ خۆشەویست تر نیـه ، ئەگـەر ئـەم گەلـەم لەناو تۆدا دەریان نەكردمایه، بێجگه له تۆ له هیچ جێگایەك دانیشتەجێ نەدەبوم.

# قەدغەی ڕاو کردن و درەخت بڕین

٤٠٠ ـ ن/ ١٩٢٩((عَنْ عليﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ((الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مابين عَيْرٍ وَ ثَوْرٍ )) هذا مختصر من حديث رواه الجماعة إلا النسائي، وإبن ماجة. خ (٦٧٥٥) م (٤٦٧ـــ ٤٦٨/ ١٣٧٠) أحمد (١/٨١، ١٢٦)، و أبو داود (٢٠٣٤)، والترمذي (٢١٢٧).

لە عەلیەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: مەدینە ڕاو لێ کردن و درەخت بڕینی لە نێوان عەیرو سەوردا قەدەغەیە، دو چیای ئەم لاولای مەدینەن، سەورئەکەوێتە چەپی ئوحودەوە، کە چیایەکی بچوکە و عەیریش بە ناوبانگە لای خەڵکی مەدینە.

٤٠١ـ ن/ ١٩٤٢(( عن عائشةﷺ: ((أنّ النَّبِيَّﷺ لَمَا جَاءَ مَكَّةَ دَخَلَ مِنْ أَعْلاهَا خَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا))لە خاتو عائیشەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەر کاتێ هاتە مەککە، لە لای سەرەوە هات، کاتێ دەرچو لە لای خوارەوە دەرچو، خ (١٥٧٧، ١٥١١، ٤٢٩٩٠، ٤٢٩١) م (٢٢٤/ ١٢٥٨).

٤٠٢ـ ن/ ١٩٥٤(( عَنْ عمرﷺ أَنَهُ كَانَ يُقَبِّلُ الحَجَرْ ويَقُول: ((إِنِّي لَأَعَلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لاتَضُرُ، وَلاتَنْفَعُ، وَلَوْلا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولُ اللهِ يَقَبِّلُكَ مَا قَبَلْتُكَ)) رواه الجماعة إلا إبن ماجة، أحمد(١/ ٧٦)، وأبو داود(١٨٧٣)، والترمذي (٨٦٢)خ (١٥٩٧)م (٢٥١/ ١٢٧٠)، والنسائي(٢/٢٢٧).

لە عومەرەوەﷺ هاتوە، کە ئەو، بەردی (حجر الأسود)ی ماچ ئەکرد و ئەیوت: ((من ئەزانم، کە تۆ بەردێکی، نەزیان دەگەیەنیت، نە سودت دەبێ، ئەگەر پێغەمبەری خوامﷺ نەدیبایە، کە ماچی ئەکردیت، ماچم نەدەکردیت)).

٤٠٣ـ ن/ ١٩٥٨((عَنْ أبي الطُفَيْلُ عامر بن واثِلَةَ قَالَ: ((رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَطُوفُ

بِالْبَيْتِ يَسْتَلِمُ الحَجَر بِمِحْجَنٍ معه،وَ يُقَبِّلُ المِحْجَنَ)) (٥/ ٤٥٤) رواه أحمد، ومسلم ٢٧٥/ ١٢٧٥، وأبو داود١٨٧٩، وإبن ماجة(٢٩٤٩).

لە باوکی توفەیلەوە عامیری کوڕی واسیلەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام بینی تەوافی بەیتی ئەکرد، بە گۆچانەکەی سەلامی لە بەردە ڕەشەکە ئەکرد و گۆچانەکەی ماچ کرد، واتە: ئەگەر نەگونجا لە نزیکەوە بەردەکە ماچ بکات، با دەستی خۆی، یان هەرشتێ، کە بەدەستیەوە هەیە ڕوبەڕوی بەردەکەو بەرزی بکاتەوە، پاشان ئەوە لە باتی بەردەکە ماچ ئەکات و هەوڵی پاڵ پاڵێن نەدات، چونکە پێچەوانەی سوننەتە.

٤٠٥ـ ن/١٩٦٥((عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَمَّا قَدِمَ مَكَةَ أتَى الْحَجَرَ فَاسْتَلَمُهُ، ثُمَ مَشَى عَلَى يَمِينِهِ فَرَمَلَ ثَلاثَاً، وَمَشى أَرْبَعَاً)) رواه أحمد، ومسلم، والنسائي، والترمذي.

لە جابیرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ گەیشتە مەککە چوە لای بەردەکەو سەلامی لێ کرد، لەپاشا بەلای ڕاستی بەردەکەدا ڕۆیشت بەشێوەی هەروەڵە سێ جار سوڕایەوەو، چوار جاریش بە ڕۆیشتن.أحمد(٣/ ٣٤٩)م (١٥٠/١٢١٨) والترمذي(٨٥٦)، والنسائي(٢٢٨/٥).

٤٠٦ـ ن١٨٦٨((عن عائشة رضي الله عنها : ((إِنَّ أَوَّلَ شَئٍ بَدَأَ بِهِ النَّبِيُ ﷺ حِينَ قَدِمَ المَدِينَةَ: أَنَّهُ تَوَضَأَ ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ)) خ(١٦٤١ــ ١٦٤٢)م(١٩٠/ ١٢٣٥)

لە خاتون عائیشەوە هاتوە، یەکەم شتێ، کە پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکردوە کاتێ گەیشتە مەککە، ئەوە بو، کە دەست نوێژی ئەگرت، لە پاشا بە دەوری ماڵی خوادا دەسوڕایەوە. واتە: دەست نوێژ پێویستە بۆ تەواف.

٤٠٧ـ ن/ ١٩٧٠((وعَنْها قَالَتْ: خَرَجَنَا مَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لا نَذْكُر إلا الحَجَّ حَتّى جِئْنَا سِرِفَ فَطَمِثْتُ فَدَخَلَ عَلَى رَسُوالله ﷺ وَ أَنَا أَبْكِي، فَقَالَ: ((وَمَا لَكِ لَعَلَّكِ نَفِسْتِ؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: هَذا شَئٌ كَتَبَهُ اللهُ عَزَّوَجَل عَلَى بَنَاتِ آدَمَ ، إفْعَلِي مَا يَفعَلُ الحَاجُ غَيْرَ

ألا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَطَّهَرِي)) متفق عليه، أحمد(٦/٢٤٥)، خ(٣٠٥)م (١١٩/ ١٢١١)، (١٢٠/١٢١١).

هەر لەوەوەﷺ هاتوە، كە ئەو وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ دەرچووین، بێجگە لە حەج باسی هیچی ترمان نە ئەكرد، تا گەیشتینە(سەرف)وە من لەو شوێنەدا كەوتمە ناو(عادەوە) جا پێغەمبەری خواﷺ هاتە لام، من ئەگریام فەرموی: چیتە لە وانەیە كەوتویتە بێ نوێژییەوە؟ وتم بەڵێ، فەرموی: ئەمە شتێكە خوا داینـاوە لـە سـەر كچانی ئادەم، ئەوەی كە حاجیان ئەنجامی دەدەن ئەنجامی بدە ، بـەڵام بـە دەوری بـەیتا مەسورێوە، هەتا پاك ئەبنەوە. لە ڕیوایەتی ئیمامی موسلیم دا هەتا خۆت ئەشۆی.

٤٠٨ ـ ن/ ١٩٧١((عَنْ عَبْدُاللهِ بنِ السَائِبِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللهِ يَقُولُ بَيْنَ الرُّكْنِ الْيَمانِي، والحِجْرِ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ رواه أحمد(٣/٤١١)، وأبو داود(١٨٩٢)، وقال: (بَيْنَ الركنين).

لە عەبدوڵای كوڕی سائیبەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بوم ﷺ ئەیفەرمو: لە نێوان گۆشەی یەمانی و بەردەكەدا، ئەی پەروەردگارمان چاكەمان پێ بدە لە دونیاداو لە دوایشدا چاكەو بمان پارێزە لە سزای ئاگر.

٤٠٩ ـ ن/ ١٩٧٤((عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: ((إنّمَا جُعِلَ الطَّوافَ بِالْبَيْتِ، وَبِالصّفَاءِ، وَالْمَرْوَةَ، وَرَمْيُ الجِمَارِ لِإقَامَةِ ذِكْرِاللهِ تَعَالَى)) رواه أحمد وأبو داود، والترمذي.

لە خاتون عائیشە رضي الله عنها هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: سوڕان بەدەوری بەیتاو سەفاو مەروەو ڕەجمی شەیتان دانەنراون، مەگەر بۆ نوێژكردن و بۆ بەرپاكردنی یادی خوای باڵادەست. واتە بیر لە دەسەڵات و هێزو زانایی و دانای خوا، مەبەست لەوە دروشمەكانی حەجە. أحمد(٦/ ٦٤، ٧٥، ١٣٨،) و أبو داود (١٨٨)، والترمذي(٩٠٢).

٤١٠ـ ن/ ١٩٧٥((عَنْ أُمِ سَلَمَةَ رضي الله عنها ، أنّهَا قَدِمَتْ وَهِيَ مَرِيضَةٌ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ

لِلنَّبِـيِﷺ فَقَـالَ: ((طُـوفِي مِـنْ وَرَاءِ النَّـاسِ، وَأَنْـتِ رَاكِبَـةٌ)) رواه أحمـد، وأبـو داود، والترمذي. خ(١٦١٩)م (٢٥٨/ ١١٢٧٦).

له ئومو سەلەمەوە رضي الله عنها هاتوه، كه گەیشته مەككـه و نـەخۆش بـو، جـا ئـەوەی باسكرد بۆ پێغەمبەرﷺفەرموی: له پاش خەڵكەوەو بەسواری، بسوڕێرەوە واتـە: كەسـێ به هانەیەكی هەبێ له هاتۆچـۆدا ئـەتوانی بەسـواریی بـەدەوری (طـواف) مـاڵی خـودا بـسوڕێتەوە.أحمـد (٦/ ٢٩٠، ٣١٩) وأبـو داود(١٨٨٢)، والنـسائي(٢٢٣/٥)، وإبـن ماجة(٢٩٦١).

٤١١ـــ ن/ ١٩٨٠((عَـنْ جَـابِرٍ أَنَّ رَسُـولَ اللهِﷺ لَمَّـا إنْتَهَـى إِلَـى مَقَـامِ إِبْـرَاهِمَ قَـرَأَ((وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى)) البقـرة(١٢٥) فَـصَلَّى رَكْعَتَـيْنِ فَقَـرَأَ(فَاتِحَـةَ الْكِتَـابِ)، و((قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ))((قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ))ثُـمَّ عَـادَ إِلَـى الـرُّكنِ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ خَرَجَ إلى الصَّفَا)) رواه أحمد(٣٢٠/٣)، مسلم، والنسائي هذا لفظه.

له جابیرەوەرضي الله عنه هاتوه، كـه پێغەمبـەری خـواﷺ كاتـێ گەیـشته شـوێن وەسـتانی ئیبراهیم، ئەم ئایەتەی خوێندەوە(جێگای وەستانی ئیبراهیم بكەن به جێگای نوێژ) جا له وێدا دو ڕكات نوێژی ئەكرد و سوڕەتی فاتیحەی ئەخوێند له هەردووڕكات داو، لـەڕكاتی یەكـەم پـاش فاتیحـه سـورەتی((قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ))، لـه ركـاتی دوو هەمـدا سورەتی (الإخلاص)ی ئەخوێند له پاشـا ئەهاتـەوە بـۆ گۆشـەی بەردەكـەو سـەلامی لێ ئەكرد، ئینجا بۆ سەفا دەرئەچو.

٤١٢ـ ن/ ١٩٨٤((وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولُ اللهِﷺ طَافَ وَسَعَى، رَمَـلَ ثَلاثَاًـ وَمَـشَى أَرْبَعَـاً، وَقَـرَأَ((وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى))(البقـرة: ١٢٥) فـصلى ركعـتين، وجعـل المقـام وَبَيْنَهُ، وَبَيْنَ الكعبة، ثُمَّ إِسْتَلَمَ الـرُّكْنَ، ثُـمَّ خَـرَجَ فَقَـالَ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾ فَابْدَءُوا بِمَا بَدأ اللهُ)) رواه النِّسَائِي، و فِي حَديث جَابِرٍ أَنَّ النَّبِـيَﷺ لَمَّـا دَنَـا مِـنَ

الصّفا قَـرَأَ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴾ أبْـدَأ بِمَـا بَـدأ اللهُ)) فَبَـدَأَ بِالـصَّفَا فَرَقَـى عَلَيْهِ حَتّى رَأى الْبَيْتَ، فَاسْـتَقْبَلَ القِبْلَـةَ فَوَحَـدَاللهُ، وَكَبَّـرَه، وَقَـالَ لا إِلَـهَ إلا اللهُ وَحْـدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَ هُوَ عَلَـى كُـلِ شَـيْئٍ قَـدِيرٌ، لا إِلَـهَ إلا اللهُ وَحْـدَهُ أَنْجَـزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَـبْدَهُ، وَهَزَمَ الأحْزَابَ وَحْدَهُ، ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذَلِكَ فَقَالَ مِثْلَ هَـذا ثَـلاثَ مَـرَّاتٍ، ثُمَّ نَزَلَ إلى الْمَرْوَةَ، حَتَّى أَنْصَبَتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الوادي حَتَّى إذَا صَعِدْنَا مَشَى حَتَّـى أَتَـى الْمَـرْوَة فَفَعَـلَ عَلَـى الْمَـرْوَةِ كَمَـا فَعَـلَ عَلَـى الـصَفا. رواه مـسلم، وكـذلك (٣/ ٣٢٠)، والنسائي بِمَعْنَاهُ م(١٤٧/ ١٢١٨)، والنسائي(٥/٢٣٦)، وإبن ماجة(٣٠٧٤)

لە وەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ بە دەوری کەعبەدا سوڕایەوەو هاتوچـۆی سەفا ومەروەی کرد، سێ جار بە هەروەڵـەو چـوار جـاریش بـە ڕۆیـشتن، لـە پاشـا ئـەم ئایەتەی خوێندەوە: جێگایی وەستانی ئیبراهیم بکـەن بـە جێگـای نوێـژ) جـا دو رکـات نوێژی کردو، جێگای وەستانی خستە نێـوان خـۆی و کەعبـەدا، لـە پاشـا سـەلامی لـە گۆشەی بەردەکە کرد، لە پاشا بەرەو سەفا دەرچو، فەرموی: ((بەڕاسـتی سـەفاو مـەروە بەشێکن لە دروشمەکانی خوا دەست پێ بکەن، وەکو خوا دەسـتی پـێ کـردوە )) واتـە: پێشەکی سەفا، ئینجا مـەروە، نەسـائی ئەمـەی گێڕاوەتـەوە وە لەفـەرمودەی جـابیردا هـاتوە، کـە پێغەمبـەرﷺ لـە کاتێکـا لـە سـەفا، نزیـك کەوتـەوە ئـەم ئایەتـەی خوێندەوە(سەفاو مەروە بەشێکن لە دروشمەکانی خوا) فەرموی: دەست پێ ئەکەم وەکـو خوا دەستی پێ کردوە.

لەبەر ئەوە پێشەکی سەرکەوت بۆ تەپۆڵکەی سەفاهەتا چاوی کەوت بـە مـاڵی خـوا، جا ڕوی کردە قیبلە و، خوای بە یەك داناو تەکبیری لێرەدا فەرموی: هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە خوا، تەنیایەو هاوبەشی نیە، هەرهی ئەوە، موڵك، هەر بۆ ئەو سوپاس وەئەو بە توانایە بەسەر هـەمو شـتێکدا، هـیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـتەقینە نیـە بێجگە لە خوای تەنیایە، بەڵێنی خۆی بردە سەر، یارمەتی بەندەی خۆی دا، بە تەنیایی پارتەکانی شکاند، لە پاشا لە نێواندا دەپاڕایەوە، وێنەی ئەمەی سێ جار فەرموە ئینجـا

دابەزی بۆ (مەروە)، هەتا گەیشتە ناو شیوەكەو بە توندی ڕۆیی، تا لە شیوەكە دەرچو، جاهات، تا گەیشتە سەر تەپۆلەكەی مەروە، جا لەسەر مەروەش ئەنجامیدا ئەوەی، كەلەسەر سەفادا كردی.

٤١٣ ـ ن/ ١٩٨٦((وعنه أنه حَجّ مَعَ النَّبِيﷺ يوم ساق البُدن معه، وَقَدْ أَهَلُّوا بِالْحَجِ مُفْرَدَاً فَقَالَ لَهُمْ أَحَلُّوا مِنْ إِحْرَامِكُمْ بِطَّوافِ الْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا، وَالْمَرْوَةَ، وَقَصَّرُوا، ثُمَّ أَقِيمُوا حَلاَلاً، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ، فَأَهِلُّوا بِالْحَجِّ، وَجَعَلُوا الَّتِي قَدِمْتُمْ بِهَا مُتْعَةً، فَقَالُوا كَيْفَ نَجْعَلُهَا مُتْعَةً، وَقَدْ سَمَّيْنَاهُ الْحَجَّ؟ فَقَالَ: إِفْعَلُوا مَا أَمَرْتُكُمْ، وَلَكِنْ لا يَحِلُّ مِنِي حَرَامٌ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدِيُ مَحِلَّهُ ففعلوا)) خ ١٥٥٧/ ٢٥٠٥/ ٤٣٥٢/ ٧٣٦٧) م (١٢١٦) أحمد(٣/ ٢١٧)، والنسائي(٥/٢٠٢)

هەر لەوەوەؓ هاتوە، كە ئەو لە خزمەت پێغەمبەرداﷺحەجی كرد ئەو ڕۆژەی، كە وشترەكانی لەگەڵ خۆیدا بردن، ئەوان بەناوی حەجەوە بە تەنیایی دەستیان پێ كرد، ئیجا پێی فەرمون: (( لە ئیحرامەكەتان دەرچن پاش سوڕانی دەوری بەیت و هاتو چۆی نێوان سەفاو مەروەو، سەرتان كورت بكەنەوە سەرتان، لە پاشا بەحەڵاڵی بمێنێنەوە، تا ڕۆژی هەشتەم، جا ئەو كاتە ئیحرام بپۆشن بۆ حەج، ئەوەی لە پێشەوە كردوتانە داینێن بە لە زەتێك(متعة))، جا وتیان: چۆن بیكەن بە لە زەت، ئێمە ناوی حەجمان بردوە، فەرموی: ئەوەی دەستورتان پێ ئەدەم بیكەن، بەڵام بۆ من هیچ قەدغەكراوێكم لێ حەڵاڵ نابێ، تا ئەو هەدیەی، كە هێناومە نەگاتە شوێنی خۆی، كە ڕۆژی جەژن و سەربڕینێتی، ئەوانیش وایان كرد. واتە: دروستە نونیەتی حەج بگۆڕی و ئەوەی لە پێشەوە وتوتە ئەنجامی نەدەیت و شێوەیەكی تری حەج ئەنجام بدەیت، بەڵام نابێ ئەو كەسەی هەدی هێناوە، حەیوانی لەگەڵ خۆیدا دیاری كردوە بۆ سەربڕینو هێناویەتی، ئیحرام بشكێنێ، تا ڕۆژی جەژن نەیەتو حەیوانەكە سەرنەبڕێت.

ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، كە پێویستە لە عومرەدا سەعی و سەرچاك كردن ببێت، ئینجا دروستە بیشكێنێ. والله أعلم.

٤١٤ـ ن/ ١٩٩٢(( وفي حديث جابر قال: لَمَّا كَانَ يَوْمُ التَرْوِيَةِ تَوَجَهُوا إلى مِنَىً فَأَهَلُّوا بِالْحَج، ورَكِبَ رَسُولُ اللهﷺ فَصَلّى بِهَا الظُهْرَ وَالْعَصرَ الْمَغْرِبَ، وَالْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ، ثُمَ مَكَثَ قَلِيلاً حَتَّى طَلَعَتِ الشَمْسُ، وَأَمَرَ بِقُبَّةٍ مِنْ شَعْرٍ وَتُضْرَبُ لَهُ بِنَمِرَةٍ، فَسَارَ رَسُولُ اللهﷺ، وَلا تَشُكُّ قُرَيْشٌ أَنَّهُ وَاقِفٌ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ كَمَا كَانَتْ قُرَيْشٌ تَصْنَعُ فِي الجَاهِلِيَةِ، فَأَجَازَ رَسُولُ اللهﷺأَتى عَرَفَة فَوَجَدَ الْقُبَةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ فَنَزَلَ بِهَا، حَتَّى إذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ أمَرَ بِالْقَصْوا فَرُحِلَتْ لَهُ، فَأَتَى بَطْنَ الْوادِي، فَخَطَبَ النَّاسَ قَالَ: إنَّ دِمَاءَكُمْ وأَمْوالَكُم حَرَمٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذا، فِي شَهْرِكُم هَذا فِي بلدكم هذا)) مختصر من مسلم. م(١٤٧/ ١٢١٨).

له ڕیوایەتی جابیرەوەﷺ هاتوه، كه وتویەتی: كاتێ ڕۆژی هەشتەم هات، ڕویان كرده مینا و نیەتی حەجیان هێناو پێغەمبەری خواﷺ سوار بو، جا نوێژی نیوەڕۆ و عەسرو مەغریب و عیشاو بەیانی لەوێ كرد، پاشان كەمێ مایەوە، تا ڕۆژ دەركەوت، فەرمانیدا، كه چادرێكی موی له (نەمیره)دا بۆ هەڵدرێت، جا پێغەمبەری خواﷺ ڕۆیشت قوەڕیش هیچ گومانیان لەوەدا نەبو، كه ئەو لە(مەشعەرولحرام)دا ئەوەستێت وەكو چۆن قورەیش له سەردەمی نەفامیدا وایان ئەكرد، كه چی پێغەمبەری خواﷺ ئەو شوێنەی بەجێ هێشت و چو، هەتا گەیشتە(عەرەفە) لەوێ لە(نەمیره) چادرەكەی بۆ هەڵدرا بو، له وێ دابەزی، هەتا ڕۆژ له ناوەڕاستی ئاسمان لایدا، فرمانی دا، كه بە (قسواء) كه بۆی ئامادە بكرێت، جا ڕۆیشت، تاگەیشته ناو شیوەكە لەوێ خوتبەی بۆ خەڵك خوێندەوە فەرموی: (بەڕاستی خوێنتان و ماڵتان لەیەكتر حەرامە، وەكو حەرامیەتی ئەم ڕۆژەتان و لەم مانگەتان و لەم شارەتان) أحمد(٣/٣٢٠)، والنسائي(٥/ ٢٣٦)، وإبن ماجة(٣٠٧٤).

٤١٥ ـ ن/١٩٩٣ ((عن محمد ابى بكر بن عوف قال: سأَلْتُ أَنَساً ونحن غاديان مِنْ (مِنَىً) إلى عَرَفَاتٍ عَنِ التَلْبِيَة: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ مَعَ النَّبِيﷺ؟ قَالَ: كَانَ يُلَبِي الْمُلَبِيّ فَلا يُنْكِرُ عَلَيْهِ وَيُكَبِرُ الْمُكبِّرُ فَلا يُنْكِرُ عَلَيْهِ. رواه الجماعة الاباداود

والترمذي)خ/١٦٥٩/٩٧٠(م/٢٧٤ و٢٧٥/١٢٨٥(واحمد)٣/١١٠) والنسائي)٥/٢٥٠، ٢٥١ (وابن ماجة (٣٠٠٨) .

له موحەممەدی كوڕی ئەبوبەكری كوڕی عەفەوه هاتوه، كه وتویەتی پرسیارم له ئەنەس كرد، كه ئێمه بەیانی دەچوین له میناوه بۆ عەرەفات لەبارەی وەلآمدانه(لبیك لبیك)وه، كه لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ چۆنتان ئەكرد فەرموی: ئەوەی كه(لبیك لبیك) ی ئەوت بەرگری نەئەكرا وه ئەوەی، كه(الله اكبر)ی ئەكرد بەرگری نەئەكرا، واته هەركامیان لەوزیكرانه لەوكاتەدا بكرێت باشه.

٤١٦ـ ن/١٩٩٦((عن عبدالرحمن بن يعمر: إنَّ نَاسَاً مِنْ أهْلِ نجْدٍ أتَـوْا رَسُـولَ اللهِﷺ وَهُوَ واقِفٌ بعرفة فَسألُوهُ، فَأمَرَ مُنَادِياً يُنادِي: الْحَجُ عَرَفَةٌ، مَنْ جَاءَ لَيْلَةَ جَمْعٍ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ فَقَد أدْرَكَ أَيَامَ مِنَىً ثَلاثَةُ أَيَامٍ فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ، وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ، واروف رجلا بنا وبهن. رواه الخمسة./احمد(٤/٣٠٩، ٣١٠) (ابوداود)١٩٤٩(والترمذي)٨٨٩(والنسائي)٥/٢٦٤، ٢٦٥(وابن ماجه)٣٠١٥.

له عەبدوڕەحمانی كوڕی یەعمورەوه هاتوه كه: هەندێ له خەڵكی نەجد هاتنه خزمەتی پێغەمبەری خواﷺوه، ئەو لەوكاتەدا له عەرەفات وەستابو، جا ئەوان پرسیاریان لەوكرد وئەویش فرمانی دا، كه جارچیەك جاڕ بدات و بڵێ ـ حەج عەرەفەیه، هەركەسێك شەوی كۆبونەوه (شەوی موزدەلیفه) بەر له نوێژی بەیانی هاتبێ ـ بۆ عەرەفەـ بەڕاستی ئەوه گەیشتوەبه حەج دا. ڕۆژەكانی مینا سێ ڕۆژن، جا هەركەسێك پەله بكات وله دوڕۆژدا ئەنجامیان بدات هیچ تاوانێكی ناگات، ئەگەر دوایشی بخات بۆ سێهەم ـ یان چوارەم هیچ تاوانێكی ناگات، پیاوێكی خسته پاشكۆی خۆیەوه ئەوجاڕه بدات وخەڵكی چاك بیبیستن.

٤١٧ـ ن/١٩٩٧((عَنْ جَابِرٍ أنَّ رَسُـولُ اللهِﷺ قَـالَ: نَحَـرْتُ هَهُنَـا وَمَنَـى كُلُّهَـا مَنْحَـرٌ فَانْحَرُوا فِي رِحَالِكُمْ وَ وَقَفْتُ هَهُنَـا، وَعَرَفَـةَ كُلُّهَـا مَوقِـفٌ، وَ وَقَفْـتُ هَهُنَـا، وَجَمَـعٌ كُلُّهَـا مَوْقِـفٌ)) (رواه احمد)٢/٣٢٠(ومسلم وابوداود)١٩٧٣ (والنسائي)٢٣٧٥

(م)١٤٧/١٢١٨(وابن ماجه)٣٠٧٤.

له جابرەوەﷺ هاتوە، كـه پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمويـەتی مـن لێـرەدا حـەیوانم سەربڕی وقوربانیم كرد وە مینا هەمووی جێگای قوربانیـە دەی هەركەسـێك لـە شـوێن خۆیدا قوربانی بكات. جا من لێرە وەستاوم و، عـەرەفات هـەموی جێگـای وەسـتانە، من لێرە وەستاوم وە جەمع(موزدەلیفە) هەموی جێگای وەستانە.

٤١٨ـ ن/ ١٩٩٨((عَنْ أسَامَةَ بنُ زَيْدٍ قَالَ: ((كُنْتُ رَدِفَ النَّبِيَﷺ بعَرَفَـاتٍ فَرَفَـعَ يَـدَهُ يَدْعُو فَمَالَتْ بِهِ نَاقَتُهُ فَسَقَطَ خِطَامِهَا فَتَنَاوَلَ الخِطَامُ بإِحْدَى يَدَيْهِ وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْـهِ الأُخْـرَى. رواه النسائي ٢٥٧٥ وأحمد ٢٠٩/٥.

لــە ئوســامەی كــوڕی زەیــدەوەﷺ هــاتوە، كــە وتویــەتی: ((مــن لــە پاشــكۆی پێغەمبــەرداﷺ بــوم لــە عــەرەفات، كــە هــەردو دەســتی بــەرزكردبوەوەو دەپاڕایــەوە، لەوكاتەدا وشترەكەی جوڵاندییەوە، لەبەرئەوە هەوسارەكەی ـ لە دەستی ـ كەوت، جا بـە دەسـتێكی هەوسـار، هەڵگرتـەوە ئـەو، دەسـتەكەی تـری بـەرزكردبوەوە. لێـرەدا ئـەوە وەرئەگرین كە.

١ـ دوكەس دروستە سواری وشترێك بن.

٢ـ دروستە بەڵكوسوننەتە لەكاتی دوعا ونزادا دەست بەرزكربكرێتەوە.

٣ـ ئەگەر لەوكاتەدا ناچار بویت بۆ بەكارهێنانی دەستێك ئەتوانرێت دەسـتەكەی تـر بە بەرزكراوەیی بمێنێ.

٤ـ وەستانی عەرەفات بە سواریی دروستە.

٤١٩ـ وَعنْهُ أنَّ رَسُولَ اللهِﷺ حِينَ أفاضَ مِنْ عَرَفَاتٍ كَانَ يَسِيرُ العَنَقَ فإذا وَجَدَ فَجْـوَةً نَـصَّ)) وابـن ماجـه)٣٠١٧(خ/١٦٦٦م/٢٨٣ـ١٢٨٠ وە هـەر لـەوەوەﷺ هـاتوە، كـە پێغەمبەری خواﷺ كاتێ، كە هاتە خوارەوە لە عەرەفات زۆر بە هێواشی ئەچـوە، هـەر بۆشاییەكی دەستكەوتایە، توندی دەكردەوە. واتـە پێویـستە پارێزگـاری خـەڵك بكرێـت لەوشوێنانەداو پاڵ پاڵێن نەكرێت،ئەگەر ماوە بەتوندی بڕوات،ئەگینا با بە هێواشی بێت.

٤٢٠ ـ ن/٢٠٠٣ ((عَنِ الفَضْلِ بنِ عَبَاسٍ وَكَانَ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ أنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: فِي عَشْيَةِ عَرَفَةَ وَغدَاةَ جَمْعٍ لِلنّاسِ حِينِ دَفَعُوا: ((عَلَيْكُمْ السَّكِينَةَ)) وَهُوَكَافٍ نَاقَتَهُ حَتَّى دَخَلَ مُحسِّرا وَهُوَمِنْ مِنَىً. وقال: ((عَلَيْكُمْ بِحِصَى الخَذْفِ الّذي يُرْمَى بِه الجَمرَةُ)) رواه احمد ١/٢١٠، ٢١٣ ومسلم والنسائي ٥/٢٨٥ م)١٢٨٢).

لە فەزڵی كوڕی عەباسەوە، كە ئەولە پاشكۆی پێغەمبەرﷺ پێغەمبەری خواﷺفەرمویەتی لە ئێوارەی عەرەفات وبەیانی موزدەلیفەدا بە خەڵك وەختێ، كە خەڵك ئەڕۆیشتن فەرموی: ((پێویستە لەسەرتان ئارام بن)). ئەو وشترەكەی خۆی بە توندی دەگرتەوە لە توند ڕۆیشتن هەتا چوە(حوسیرە)، كە ئەویش بەشێكە لە(مینا)و ئەیفەرمو: ((پێویستە لەسەرتان بەردی بچوك هەڵبگرن ـ كە بە پەنجە بتەقێت بۆ ڕەجمی شەیتان، واتە بەردەكان ئەبێ لە نێوان نیسك ونۆكدا بن، تا ئەگەر بەر خەڵك كەوت، بریندای نەكات.

٤٢١ـ ن/٢٠٠٤((وَفِي حَدِيثِ جَابِر: ((أنَّ النَّبِيَّ ﷺ أتـى المُزْدَلِفَةَ فَصَلَّى بِهَا المَغْرِبَ وَالعْشَاءَ بِآذَانٍ وَإقَامَتَيْنِ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شَيْئاً، ثُمَّ إضْطَجَعَ حَتَّى طَلَعَ الفَجْرُ فَصَلَّى الْفَجْرَ حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ بِآذانٍ، وَإقَامَةٍ ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْواءَ حَتَّى أَتَى المَشْعَرَ الحَرامِ فاسْتَقَبَلَ الْقِبْلَةَ، فَدَعَا اللهُ، وَكَبَّرَهُ، وَهَلَّلَهُ وَحْدَهُ، فَلَمْ يَزَلْ، وَاقِفاً حَتَّى أسْفَرَ جِداً، فَدَفَعَ قَبْلَ أنْ تَطْلُعَ الشَمْسُ، حَتَّى أتَى بَطْنَ مُحَسِّرٍ فَحَرَّكَ قَلِيلاً، ثُمَّ سَلَكَ طَرِيقَ الوُسْطَى الّتِي تَخْرُجُ عَلَى الجَمْرَةِالكُبرى حتى أتى الجمرة الّتِي عِنْدَ الشَجَرَةِ فَرَمَاها بِسَبعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرمَعَ كُلِّ حَصَيَاةٍ مِنْهَا حَصَىً الْخَذَفِ، رَمَى مِنْ بَطْنِ الوَادِي ثُمَّ انْصَرف إلى ((المَنْحَرِ)) رواه المسلم م)١٢١٨/١٤٧. /احمد)٣/٣٢٠(والنسائي)٥/٢٣٦(وابن ماجه)٣٠٧٤.

هەر لە حەدیسی جابیرەوەﷺ هاتوە، كە: ((پێغەمبەرﷺ چوەتە موزدەلیفە و لەوێ نوێژی مەغریب وعیشای بە یەك بانگ ودو قامەت كردوە و، هیچ سوننەتێكی لە نێوانیان دا نەكردوە لە پاشان ڕاكشا، تا ڕۆژ بویەوە، جا كاتێ بەیانی بە تەواوی

دەرکەوت نوێژی بەیانی بە بانگێك وقامەتێك کرد، ئینجا سواری(قەسوا) بو، هەتا گەیشتە(مەشعەرولحەرام)، جا لەویَ ڕوی کردە قیبلە و لە خواپاڕایەوە و(الله اکبر ولا الـه الا الله وحده لا شریك له)ی وت و، هەر لەویَ وەستا هەتا سواری کەوتە ئاسمان ئینجا کەوتە ڕێ پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵبێت، هەتا گەیشتە ناو(موحسیر) وکەمێ ڕۆیی و، لەپاشان ڕێگای ناوەڕاست، کە ئەچو، بەرەوشەیتانی گەورەی تا گەیشتە ئەوشەیتانەی، کە لای درەختەکەدایە، لەوکاتەدا درەختێکی لە لادا بوە، ئێستا ئەوە نەماوە وشوێنەکەی تەخت کراوە ـ جا ئەو ڕەجمی شەیتانی بە حەوت بەرد کرد ولەگەڵ فڕێدانی هەر بەردێکدا(الله اکبر)ی ئەکرد، بەردی بچوك لەناوشیوەکەدا بۆی فڕێ ئەدا، ئینجا گەڕایەوە بەرەوکوشتارگای قوربانیان.

تێبینی: جابیر هاوڕێی پێغەمبەرﷺ بوە لەم حەجەدا و بەتەواوی باسی کردوە، بەلاّم ڕاویەکان هەر یەکەی کە مەبەستی بوە باسی پارچەیەکیان کردوە.

٤٢٢ــ ن/٢٠٠٦((عَـنْ عَائِـشَةَ رضي الله عنها قَالَـتْ: ((كَانَـتْ سَـوْدَةُ إمْـرَاةً ضَـخْمَةً ثَبْطَـةً، فَاسْتَأْذَنَتْ رَسَـوُلَ اللّهِﷺ أَنْ تُفِـيضَ مِـنْ جَمْـعٍ بِلَيْـلٍ فَـأَذِنَ لَهَـا)رواه الجماعـة الا ابـاداود والترمـذي خ/١٦٨٠) م/٢٩٤/١٢٩٠) واحمـد)١/١٤، ٥٠(والنـسائي)٥/٢٦٢(وابـن ماجه)٣٠٢٧).

لە خاتو عائیشەوە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: خاتو سەودە رضي الله عنها ئافرەتێکە قەڵەوی کەم پیَ بوە ـ لەبەر قورسی ئەندامیـ لەبەرئەوە داوای ماوە خواست لە پێغەمبەری خواﷺ کە شەولە موزدەلیفەوە بۆ ڕەجمی شەیتان دابەزێت ئەویشﷺماوەی پیَ دا.

٤٢٣ ـ ن/٢٠١٠((عَنْ جَابِرٍ قَالَ: ((رَمَى النَّبِيُﷺ الجَمْـرَةَ يَـوْمَ النَّحْرِ ضُـحَىً، وَأمَّـا بَعْـدُ فـإذا زَالَـتِ الـشَمْسُ)) احمـد)٣/٣٢٠(م)١٢١٨/١٤٧(والنـسائـي)٥/٢٣٦(وابـن ماجه)٣٠٧٤).

لە جابیرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: ((پێغەمبەرﷺ ڕەجمی شەیتانی لە ڕۆژی جەژندا لە کاتی چێشتەنگاودا کردوە، بەلاّم ڕۆژەکانی تر پاش نیوەڕۆ بوە.

٤٢٤ـ ن/٢٠١٢(( عَنْ إبْنُ مَسْعُودٍ: ((أَنَّهُ إنْتَمَى إلى الجَمْرَةِ الكُبْرى فَجَعَلَ البَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ وَمِنَىً عَنْ يَمِينِهِ وَرَمَى بِسَبْعٍ وَقَالَ: هَكَذا رَمَى الّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيهِ سُورَةَ البَقَـــــــرَةِ)) رواه الجماعـــــــــة خ/١٧٥٠) م/١٢٩٦/٣٠٥) احمـــــــــد) ١/ ٤١٥(وابوداود)١٩٧٤(والترمذي)٩٠١(والنسائي)٢٧٣/٥(وابن ماجه)٣٠٣٠).

له عەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوەﷺ هاتوە كە: ((كاتیٚ، كە گەیشتنە شەیتانی گەورە ـ ئاوا بەناوبانگە لە كوردەواریدا ـ ماڵی خوای خستە لای چەپیەوە و(مینا)ی خستە لای ڕاستیەوە وحەوت بەردی بۆ فڕیدا وتی: ئاوەها بەردی بۆ فڕیٚ داوە ئەوكەسەی، كە سورەتی بەقەرەی دابەزیوەتە لای، واتە: پیٚغەمبەرﷺ بەوشیٚوەی كردوە.

٤٢٥ ـ ن/٢٠١٧((عَنْ أنَسٍ: ((أنَّ رَسُولُ اللهِﷺ أتَى مِنَىً فَأتَى الجُمْرَةَ فَرَمَاهَا ثُمَّ أتَى (مَنْزِله لَهُ بِمِنَىٍ وَنَحَرَ ثُمَّ قَالَ لِلحَلاقِ: ((خُذْ)) ((وَأشَارَ إلى جَانِبِ إلا بِمَنْ ثُمَّ الأيْسَرِ ثُمَّ جَعَلَ يُعْطِيه النَّاسَ)). رواه احمد ١١١/٣، ٢٠٨ ومسلم ١٣٠٥ وابوداود ١٩٨٢.

له ئەنەسەوەﷺ هاتوە، كە: پیٚغەمبەری خواﷺ هاتە(مینا)، ئینجا چوە لای شەیتان ڕەجم وڕەجمی كرد لە پاشا هاتە جیٚگای خۆی لە مینا وقوربانی كرد، لە پاشا وتی بە سەرتاش: بگرە، بتاشەو، هیٚمای بۆ لای ڕاستی كرد، ئینجا بۆ لای چەپی لە پاشا موەكەی دا بە خەڵك.

٤٢٦ـ ن/٢٠١٠((عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ ((اَللَّهُمَ اغْفِرْ لِلْمُحَلقِينَ)) قَالُوا يَارَسُولُ اللهِ وَلِلْمُقَصِّرِين قَالَ: ((اَللَّهُمَ اغْفِرْ لِلْمُحَلقِينَ)) قَالُوا: يَارَسُولُ اللهِﷺ وَلِلْمُقَصِّرِينَ! قَالَ: اَللَّهُمَ اغْفِرْ لِلْمُحَلقِينَ قَالُوا يَارَسُولُ اللهِﷺوَلِلْمُقَصِرينَ قَالَ ((وَلِلْمُقَصِرينَ)) خ/١٧٢٨) م ١٣٠٢/٣١٧) واحمد ٢٣١/٢ وابن ماجة ٣٠٤٣.

له ئەبوهورەیرەوەﷺ هاتوە كە وتویەتی: پیٚغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ئەی خوایە خۆشبە لەوانەی سەریان تاشی وتیان: ئەی پیٚغەمبەری خواﷺ لەسەر كورتكەرەوانیش! فەرموی: خوایە خۆشبە لەوانەی، كە سەریان تاشی، وتیان ئەی،

پێغەمبەری خواﷺ لەسەر کورتکەرەوانیش! فەرموی: ئەی خوایە خۆشبە لەوانـەی، کـە سەریان تاشی، وتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ لەسەر کورتکەرەوانیش، فەرموی: لەســەر کورتکەرەوانیش. واتە سەرتاشین لە حەجدا بـۆ پیاولەســەر کورتکردنــەوە چـاکترە، والله اعلم..

٤٢٧ ـ ن/٢٠٢٠((عَنْ إبْنُ عَبَاسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِﷺ((لَـيْسَ عَلَـى النِّـسَاءِ الْحَلْقُ، إنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ الْقَصْرُ)). رواه ابوداود ١٩٨٤، ١٩٨٥ والـدار قطنـي وحسنه الحافظ التلخيص)٢/٤٩٨.

لە عەبدوڵڵای کـوڕی عەباســەوە رضي الله عنه هــاتوە، کـە وتویــەتی: پێغەمبــەری خــواﷺ فەرمویەتی: ئافرەتان سەرتاشینیان لەسەر نیە، تەنیا سەر کورت کردنەوەیان لەسەرە.

٤٢٨ ـ ن/٢٠٢٣((عَنْ إبْنِ عُمَرَ: ((أَنَّ رَسُولُ اللهِﷺ أَفَاضَ يَوْمَ النَحْرِ ثُمَّ رَجَعَ فَـصَلَّى الظُهْرَ (بِمِنَىً)) رواه احمد ٢/٣٤ ومسلم١٣٠٨ وابوداود ١٩٩٨ والنسائي)٦/١٥٥).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە رضي الله عنه هاتوە کە: پێغەمبەری خواﷺ لە ڕۆژی جـەژن دا پاش سەرتاشین دابەزی وبە دەوری بەیتا سوڕایەوەو پاشـان گەڕایــەوە بـۆ مینــاو، لــەوێ نوێژی نیوەڕۆی کرد. واتە ئەم تەوافەیش سوننەتە ئەولەوکاتەدا باشترە.

تێبینی: لە ڕیوایەتی جابیردا ئەڵێت، نوێژی نیوەڕۆی لە مەککــەدا کــردوە، ئیمـامی نەوەوی بەم شێوەی خوارەوە هەردوکی کۆکردوەتەوە ئەڵێ: نوێژی نیوەڕۆی لــە مەککــەدا کردو لە کاتی خۆیدا، وەختێ گەڕایەوە مینا، دوبارە نیوەڕۆی کردوە بـۆ ئەوانــەی لــەوێ بون. ئەشگونجێ جاری دوهەم بە جەماعەتی ئەواندا گەیشتبێ، وەکو خۆی بڕیـاری داوە لەگەڵ ئەوان دا نوێژی نیوەڕۆی کردبێتەوە، والله اعلم.

٤٢٩ ـ ن/٢٠٢٥(( عَنْ عَبْدُالله بنِ عُمَرَ وَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ وَأَتَـاهُ رَجُـلٌ يَـوْمَ النَحْرِ وَهُوَ وَاقِفٌ عِنْدَ الجَمْرَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللهِ حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ، قَالَ: إرْمِ وَلا حَرَجَ، وَ أَتَاهُ آخَرُهُ، فَقَالَ: إنِّي ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ إرْمي وَلا حرجَ، وَأَتَى آخَرُهُ، فَقَـالَ: إنِّـي

أمْـضَيْتُ إلى الْبَيْـتِ قَبْـلَ أنْ أَرْمِـي؟ فقَـالَ: إرْمِ وَلا حَـرَجَ)) رواه الجماعـة الا النـسائي خ/١٧٣٦) م/١٣٠٦/٣٢٧) (واحمـد)١٥٩/٢(وابـوداود)٢٠١٤(والترمـذي)٩١٦(وابـن ماجه)٣٥٠١.

له عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: گـوێبیتی پێغەمبـەری خـوا بومﷺ، کە پیاوێك ڕۆژی جەژن هات بۆ لای کە ئەوله لای، شەیتانی ڕەجم دا وەسـتابو، وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺسەرم تاشی پێش ئەوەی شـەیتان ڕەجـم بکـەم، فـەرموی: ((شەیتان ڕەجم بکە قەیناکات)) یەکێکی تر هـات وتـی: مـن حـەیوانم سـەربڕی پـێش ئەوەی ڕەجمی شەیتان بکەم، فەرموی: ((شەیتان ڕەجم بکـە قـەیناکات))، یـەکێکی تـر هات وتی: من تەوافی هاتنـە خـوارەوەم کـردوە پـێش ئـەوەی ڕەجمـی شـەیتان بکـەم، فەرموی: ڕەجمی شەیتان بکە قەیناکات، واتە ئەم پاش و پێشانە لـەوڕۆژەدا قـەیناکات، بەڵام چاکتر وایە بەوشێوە بکرێن، کە پێغەمبەرﷺئەنجامی داون. واتە: ڕەجمی شـەیتان، قوربانی، سەرتاشین، یان کورتکردنەوە، تەوافی هاتنە خوارەوە ((طواف الافاضة)).

٤٣٠ـ ن/٢٠٣٢((عَنْ إبْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهﷺ((مَـنْ قَـرَنَ بَـيْنَ حَجِّـهِ وَعُمْرَتِـهِ اجزأه (لَهُمَا طَوَافٌ وَاحِدٌ)). رواه احمد (٦٧/٢)و إبن ماجه٢٩٧٥).

لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەرەوەﷺهـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویەتی: هەرکەسـێك حـەج وعـومرەی لکانـد بـە یەکـەوە، واتـە بـە یـەك نیـەت هەردوکیانی ئەنجام دا، ئەوە یـەك تـەواف بـۆ هـەردوکیان بەسـە، هـەروەها یـەك جـار هاتوچۆی سەفاومەروە.

# شەو مانەوە لە مینا بۆ ڕەجمی شەیتان

٤٣١ ـ ن/٢٠٣٦((عن عَائِشَةَ قَالَتْ: ((أَفَاضَ رَسُولُ اللهِﷺ مِنْ آخِرِ يَوْمٍ حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَجَعَ إلى مِنًى فَمَكَثَ بِهَا لَيَالِيَ أَيّامَ التَشْرِيقِ يَرْمِي الجَمْرَةَ إِذَا زَالَتْ الشَمْسُ كُلُّ جَمْرَةٍ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ وَيَقِفُ عِنَدَ الأولَى وعِنْدَ ثَانِيَةِ فَيُطِيلُ القِيَامَ وَيَتَضَرَّعُ وَيَرمَى الثَالِثَةُ لا يقِفُ عِنْدَهَا)) رواه احمد ٩٠/٦ وابوداود ١٩٧٣ والحاكم وصححه على شرط مسلم وافقه الذهبي.

لە خاتو عائیشەوە رضي الله عنها هاتوە، كە وتویەتی: ((پێغەمبەری خوا لە ئاخر ڕۆژی یەكەمی جەژنی قورباندا بە دەوری كەعبەدا سوڕایەوە، ئەوكاتەی كە نوێژی نیوەڕۆی كرد، لە پاشان گەڕایەوە بۆ میناو شەوەكانی تری جەژنی قوربان لە مینادا مایەوەو بەیانیەكانی پاش نیوەڕۆ ڕەجمی شەیتان بە حەوت بەرد ئەكرد ولەگەڵ فڕێدانی هەر بەردێكدا(الله اكبر)ی ئەكرد وە لە لای یەكەم ودوهەمیان ئەوەستا ودرێژەی بە وەستانەكانی ئەداو لە خوا دەپاڕایەوە وسێهەمی ڕەجم ئەكرد لەلایدا نەدەوەستا.

٤٣٢ـ ن/ ٢٠٤٦((عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: حَدَثَنِي مَنْ سَمِعَ خطبةَ النَّبِيِﷺ فَمَا وسَطَ أَيّامِ التَشْرِيقِ فَقَالَ: ((يَأَيُهَا النَّاسُ أَلا إِنَّ رَبَكُمْ وَاحِدٌ وَإِنَّ اَبَاكُمْ وَاحِدٌ أَلا لا فَضْلَ لِعَرَبِي عَلَى أَعْجِي عَلَى عَرَبِي، وَلا لِأَحْمَرَ عَلى أَسْوَدَ وَلا لِأَسْوَدَ عَلَى أَحْمَرَ، إلا بِالتَّقْوى، أَبَلَغْتُ؟ قَالُوا بَلَغَ رَسُولُ اللهِﷺ...)) رواه احمد ن/٢٠٤٦(/ احمد)٤١١/٥.

لە باوكی نەزرەوە هاتوە، كە وتویەتی: ئەوكەسەی خوتبەی پێغەمبەریﷺ لە ڕۆژە ناوەڕاستەكانی پاش جەژنی قوربان دا بیستوە، قسەی بۆ كردم، كە فەرمویەتی: ((ئەی خەڵكینە ئاگاداربن خواتان یەكە و باوكتان یەكە، ئاگاداربن هیچ زیادەیەك نیە بۆ عەرەب بەسەر غەیرە عەرەبدا وە بۆ غەیرە عەرەب بەسەر عەرەبدا، نە سور بەسەر ڕەشداو، نەڕەش بەسەر سوردا، مەگەر بە خۆ پاراستن لەگوناهان، ئایا نەم گەیاند؟ وتیان: پێغەمبەری خواﷺ گەیاندی.

٤٣٣ـن/٢٠٥٧((عَنْ عَائِشَةَ ، أَنَهَا كَانَتْ تَحْمِلُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمْ وَتُخْبِرُ أَنَّ رَسُولِ اللهِﷺ كَانْ يَحْمِلُه) . رواه الترمذي ٩٦٣ وقال حسن غريب.

له خاتون عائیشەوە هاتوە، کە ئەوئاوی زەمزەمی هەڵئەگرت بۆ خواردنەوە وئەیوت، کە بە ڕاستی پێغەمبەری خواﷺ هەڵیگرتوە. لە ڕیوایەتی جابیر، کە موتزری بە ڕاستی زانیوە وئیبنوحەجەر(الحافظ)بە (حسن)ی زانیوە هاتوە کە(مـاءُ زَمْـزَمْ لِمَاشُـرِبَ لَـهُ) / احمد/ ئاوی زەمزەم بۆ هەر مەبەستێ بخورێتەوە سودی ئەبێت.

## تەوافی خواحافیزی(طواف الوداع )

٤٣٤ ـن/٢٠٦١((عَنْ إِبنِ عَبَاسٍ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ فِي كُل وَجْهٍ، فَقَالَ رَسُـول اللهِﷺ: ((لا يَنْفِـرُ أَحَـدٌ حَتَّـى يَكُـونَ آخِـرَ عَهْـدِه بِالْبَيْـتِ)) رواه الجماعـة إلا الترمـذي والنسائي ، وفي رِوَايَةٍ أَمَرَ النَّاسَ أنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إلاّ أَنَّهُ خَفِفَ عَـنِ الْمَـرأة الحَائِض)). اخرجاه خ١٧٥٥ باللفظ الثاني)١٣٢٨/٣٨٥).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە هاتوە، کە خەڵك پـاش حـەج لـە هەمولایەکـەوە دەردەچون، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا فەرموی: ((با هیچ کەسێك دەرنەچێت، هەتا ئاخر جار لەماڵی خواوە دەردەچێت. واتە تەوافی خواحافیزی بکات وە لە ڕیوایـەتێکی تـردا هاتوە، کە: ((فرمان درا بەسەر خەڵکا، کە دواترین ئیـشیان تـەوافی مـاڵی خـوا بێـت، بەڵام ئەمە لەسەر ئافرەتانێ، کـە نوێـژیان لەسـەر نـەبێ ئاسـان کـرا. واتـە تـەوافی خواحافیزیان لەسەر نیە. واحمد)١/٢٢٢(وابوداود)٢٠٠٢(وابن ماجة(٣٠٧٠).

## دوعای کاتی گەڕانەوە لە جیهاد وحەج وعومرە

٤٣٥ـ ن/٢٠٦٤((عَنْ إِبنِ عُمَرَ أنَّ النَّبِيَ ﷺ كَانَ إذا قَفَـلَ مِـنْ غَـزْوٍ أوْحَـجٍ أوْعـمْـرَةٍ يُكَبِّرُ عَلَى كُلِ شَرَفٍ مِنَ الأَرْضِ ثَلاثَ تَكْبِيراتٍ، ثُمَّ يَقُولُ: لا إِلَـهَ إلا اللهُ وَحْـدَهُ لا شَـرِيكَ

لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَ هُوَ عَلَى كُلِ شَيْئٍ قَدِيرْ، آيُبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدونَ لِرَّبِنَا حَامِدُونَ صَدَقَ اللّهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزابَ وحده)).(اخرجاه خ ٢٩٩٥ م(١٣٣٤/٤٢٨).

له عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە‌ﷺ هاتوه، كه پێغەمبەرﷺ هەر كاتێ لەغەزا گەڕاوەتەوە، یان حەج یان عومرە لە هەموبەرزاییەكدا(الله اكبر)ی ئەكرد، لە پاشا ئەیفەرمو: هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە، بێجگە لە خواو، تاكە وهاوبەشی نیە، هەر ئەوخاوەنی موڵكە وسوپاس هەر شایستەی ئەوە، توانایی بەسەر هەموشتێكا هەیە ـ ئێمەـ ئەگەڕێینەوە بۆ ماڵ وتەوبەكارین وبەندایەتی دەكەین وكوڕنوش دەبەین بۆ پەروەردگارمان سوپاسكارین، خوا بەڵێنی خۆی هێنایەدیو، یارمەتی بەندەی خۆی داو، حیزبەكان بە تەنهایی شكاند.

٤٣٦ـ ن/ ٢٠٦٦(( وَعَنْهُ،أَنَّهُ كَانَ يُقُولُ: اَلَيْسَ حَسْبُكُمْ سُنَّةُ رَسُولُ اللّهِﷺ: ((إنْ حُبِسَ أَحَدُكُمْ عَنِ الحَجِّ طَافَ بِالْبَيْتِ وَبِالصَفَاءِ والْمَرْوَةِ ثُمَّ يَحِلُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى يَحُجَّ عَامَاً قَابِلاً، فَهُدْيَ أوْ يَصُومُ إنْ لَم يَجِد هَدْيَاً)) والنسائي ١٦٩/٥ خ/١٨١٠) واحمد)٣٣/٢ (والترمذي)٩٤٢.

هەر لەوەوە‌ﷺ هاتوه گوتویەتی: ئایا سوننەتی پێغەمبەری خواتانﷺ بەس نیە؟: ((ئەگەر یەكێ لە ئێوە لەحەج مەنع كراـ بە هەر هۆیەك بێ تەوافی ماڵی خوا بكات، سەفاو مەروە لە پاشا حەڵاڵ ئەبێ لە هەموشت، تا ساڵی ئاینده، جا لەباتی ـئەوفەوتانەداـ با حەیوان سەربڕێ، یان(١٠) ڕۆژ بەڕۆژووبێ، لە مەككە وحەوتی لە ماڵەوەـ ئەگەر تونای حەیوانی نەبو.

٤٣٧ ــ ن/٢٠٧١((عَنْ الْمِسْوَرِ وَمَرْوَانَ فِي حَدِيثٍ عُمْرَةَ الْحُدَيبِيَةِ وَالصُلْحُ: أنَّ النَّبِيَّﷺ (لَمَّا فَرَغَ مِنْ قَضِيَّةِالكِتَابِ قَالَ: لِأَصْحَابِهِ ((قُومُوا فَانْحَرُوا ثُم احْلِقُوا)) رواه احمد ٣٢٣/٤، ٣٢١ والبخاري٢٧٣٢/٢٧٣١ وابوداود ٢٧٦٥ اما لفظ البخاري عن

الْمِسْوَرِ: أنَّ النَّبِيَﷺ نَحرِ قَبْلَ أنْ يَحْلِقَ وَأمَرَ أصْحَابَهُ بِذَلِكَ)).

لە میسوەرو ومەروانەوە‌ رضي الله عنه لە حەدیسی عومرەی حودەبیەدا هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ لەکاتێکا لە ڕوداوی نوسینەکە لێ بوەوە، بە یارەکانی فەرموی:((هەستن و حەیوان سەربڕن وسەرتان بتاشن)) لە ڕیوایەتی ئیمامی بخاری، کە لە میسوەرەوە هاتوە بەم شێوەیە: پێغەمبەر حەیوانی سەربڕی پێش ئەوەی سەری بتاشێت و، فرمانیدا بە یارەکانیشی، کە حەیوان سەربڕنو سەریان بتاشن.

## باسی هەدی وقوربانی ودیاری کردنی وشتر و گەردن بەن خستنە ملیان.

٤٣٨ـ ن/٢٠٧٤ ((عَنْ إبْنِ عَبَاس: أنَّ رَسُولُ اللهﷺ صَلَّى الظُهْرَ بِذِي الْحُلَيفَةَ ثُمَّ دَعَا نَاقَتَهُ فَأَشْعَرَهَا فِي صَفِحَةٍ سَنَامَهَا الأَيْمَنِ وَسَالَتَ الدَّمَ عَنْهَا وَقَلَّدَهَا نَعْلَيْنِ ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتُهُ فَلَمَّا إسْتَوَتْ بِهِ عَلَى البَيْدَاءَ أَهَلَّ بِالْحَج)) رواه احمد ٢١٦/١ ومسلم وابوداود ١٧٥٢ والنسائي ١٧٠/٥، ١٧١ م/)١٢٤٣،٢٠٥.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە: ((پێغەمبەری خواﷺ نوێژی نیوەڕۆی لە(زولحولەیفە) کردوە لە پاشا داوای وشترەکەی کرد ودیاری کرد لەسەر بەشی لای ڕاستی کۆ پارەکەیە وخوێنی پێدا هاتە خوارەوە وە دونە علی کردە ملیەوە لە پاشا سواری وشترەکەی بوکاتێ وەستا لە(بەیدا)نیەتی حەجی هێنا وفەرموی(لَبَيْكَ حَجّاً).

٤٣٩ــ ن/٢٠٧٦((عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: ((فَتَلْتُ قَلائِدَ بُدُنِ رَسُول اللهﷺ ثُمَّ أَشْعُرُهَا وَقَلَدَهَا ثُمَّ بَعَثَ بِهَا إلى الْبَيْتِ، فَمَا حَرُمَ عَلَيْهِ شَيْئٌ كَانَ لَهُ حِلاً)). رواه الجماعة خ/١٩٦٩(م)٢٣٢١/٣٥٩(واحمد)٧٨/٦، ٨٥، ٢١٦).

لە خاتو عائیشەوە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: من کردومە بە پلێتە گەردن بەنەکانی وشترەکانی پێغەمبەری خواﷺ لە پاشا دیاری کردون وگەردن بەنی لە مل کردون ئینجا ناردونی بۆ ماڵی خوا، جا هیچی لێ قەدەغە نەکرا بو ئەوەی، کە زوبۆی حەڵاڵ بو واتە دروستە هەر کەسەی لە ماڵی خۆیەوە حەیوان دیاری بکات وگەردن بەنی لە مل بکات و ڕەوانەی ماڵی خوای بکات و، هیچی لێ حەرام نابێ لە ماڵەوە وەکوحاجی نیە. وابوداود)١٧٥٧، ١٧٥٩(والترمذي)٩٠٨(والنسائي)١٧٥/٥،١٧١(وابن ماجه)٣٠٩٨).

# هەدی دیاریکراو ناگۆڕێت

٤٤٠ ـ ن/٢٠٧٨((عَنْ إِبنِ عُمَرَ قَالَ: أَهْدَى عُمَرُ وَنَجِيباً فَأُعْطِيَ بِهَا ثَلاثَمِأَةِ دِينَارٍ، فَأَتَى (النَّبِيَﷺ فَقَالَ: يَارَسُولُ اللهﷺ أَنِّى أَهْدَيْتُ نَجِيبَاً فَأعُطِيتُ بِهَا ثَلاثِمِأَةِ دِينَارٍ، فَأَبِعْهَا وَأَشْتَرِي بِثَمَنِهَا بُدْناً؟ قَالَ ((لا)) إِنْحَرْهَا (إِيَاهَا)). رواه احمد ٢/١٤٥ وابوداود ١٧٥٦ والبخاري في ((تأريخه)) من طريق الجَهْمُ بِنُ الجَارُود عَنْ سَالْمٍ عَنْ أَبِيهِ خ)٢/٢٣٠).

لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: عومەرﷺ وشترێكی چاكی كرد بە(هەدی)، جا لە كاتی ناردنیدا بوسێ سەد دیناریان پێ دا ـ واتە: پارەیەكی باشیان پێ دا وشترێكی تری لەوكەم پلەتری ئەكرد، هەندێكیش لە پارەكە ئەمایەوە، لەبەرئەوە عومەرـ هاتە لای پێغەمبەر وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من وشترێكی چاكم داناوە بۆ(هەدی) وئێستا سێ سەد دینارم پێ ئەدەن، بیفرۆشم وبە پارەكەی وشترێكی تر بكرم؟ فەرموی: نەخێر، هەر ئەوسەربڕە واتە مەیگۆڕەوە.(مجیب) بە وشتری چاك ئەڵێن وهەر شتی چاك بێ.

٤٤١ ـ ن/٢٠٨٠ عَنْ جَابَرٍ قَالَ: ((أَمَرَنَا رَسُولُ اللهﷺ أَنْ نَشْتَرِكَ فِي الإِبِلِ وَالْبَقَرِ، كُلَّ سَبْعَةٍ مِنَا فِي بُدْنَةٍ)) رواه الجماعة والنسائي خ/١٣٦ في خلق افعال العباد لافى الصحيح. م/١٣١٨/٣٥١(احمد)٣/٣٥٣، ٣٦٣(وابوداود)٢٨٠٩(والترمذي)١٥٠٢(وابن ماجه)٣١٣٢).

لە جابیرەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: ((پێغەمبەری خواﷺ فرمانی پێ كردین، كە لە وشتر ولە گادا هاوبەشی بكەین ، هەموحەوت كەسێك لە ئێمە لە وشترێكدا، هەروەها لە گا یان مانگایەكدا).

٤٤٢ـ ن/٢٠٨٥(( وَعَنْهُ، أَنّهُ سُئِلَ عَنْ رُكُوبِ الْهَدْيِ؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللّهُ ﷺ يَقُولُ ((إرْكَبْهَا بِالْمَعْرُوفِ إذَا الْجِئَتَ إلَيْهَا حَتَّى تِجِدَ ظُهْراً)) رواه احمد ٣١٧/٣ ومسلم)١٣٢٤/٣٧٥(وابوداود ١٧٦١ والنسائي)١٧٧/٥).

هەر لەوەوەﷺ هاتوە، كە بەڕاستی لە بارەی سواربونی وشتری هەدیەوە، پرسیاری لێكرا؛ وتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بومﷺ، كە ئەیفەرموو: سواری ببن بە شێوەی چاك ـ واتە: زۆری ئازار مەدەن وباری قورس مەكەن ـ هەركاتێ ناچاركران بۆ سواربونیان، هەتا ولآخێكی سواری ترتان دەست ئەكەوێت سواریان بین. واتە: ئەگەر بارهەڵگر ولآخی ترتان پێ بو، با سواری وشتری هەدی نەبن، كە ئەمە فەرمودەی گشتی(وَيْلَكَ ارْكَبْهَا) (وای بۆ تۆ سواری بە[1]) تایبەت ئەكات.

٤٤٣ـ ن/٢٥٨٨ عَنْ نَاجِيَةَ الْخُزَاعِي وَكَانَ صَاحِبُ بُدْنِ رُسُولِ اللهِﷺ قَالَ: قُلتُ: كَيْفَ أَصْنَعُ بِمَا عَطِبَ مِنَ الْبُدْنِ؟ قَالَ: ((إنْحَرْهُ وَاغْمِسْ نعَلَهُ فِي دَمِهِ وَاضرِبْ صَفْحَتَهُ وَخلِّ بَيْنَ النَّاسِ وَبَيْنَهُ فَلِيَأكُلُوهُ)) رواه الخمسة الأ لنسائيَّ.

لە ناجیەی خوزاعیەوە ﷺ هاتوە، كە ئەو لەگەڵ وشترەكانی هەدی پێغەمبەرداﷺ بوە وتویەتی: وتم: ئەگەر وشترێك پەكی كەوت چی لێ بكەم؟ فەرمووی: سەری ببڕەو وئەوسەرپێ یەی، كە ـ لە ملیایەـ بیرەژنە بە خوێنەكەیدا بیدە لە ملی ـ یان كۆپارەكەیـ وازی لێ بهێنە بۆ خەڵك، جا ئەوانیش بیخۆن.

٤٤٤ـ ن/٢٠٩٠ حَدِيثُ جَابِرُ فِي صِفَةِ حَجِ النَّبِيﷺ قَالَ: ثُمَّ انْصَرَفَ إلى المَنْحَرِ فَنَحَرَ ثَلاثَ وَسِيتِنَ بُدْنَةً ثُم أعْطَى عَلَيًّاﷺ فَنَحَرَ مَا غَبَرَ، وَأشْرَكَهُ فِي هَدْيِهِ، ثُمَّ أَمَرَ مِنْ كُلِّ بُدْنَةٍ بِبِضْعَةٍ، فَجَعَلْتُ فِي قِدْرٍ فَطُبِخَتْ، فأكَلا مِنْ لَحْمِهَا، وَشِرباً مِنْ مَرَقِهَا)) رواه احمد ٣٢٠/٣ ومسلم م)١٢١٨/١٤٧).

لە حەدیسی جابرەوەﷺ لە بارەی حەدیسی پێغەمبەروەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: لە

---

(١) بوخاری (١٦٨٩)( و مسلم (١٣٢٢/٣٧١).

پاشا پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە بۆ کوشتارگاو شەست وسێ سەر وشتری بە دەستی خۆی سەربڕی وپاشان دای بە عەلیﷺ، کە باقیەکەی ـ کە (٣٧) سەر بون ـ سەری بڕی و، زکری بە هاوبەش لە(هەدیەکانی)خۆیدا لە پاشا فرمانیدا، کە لە هەر وشترێك پارچەیەك ببڕن، جا خرایە ناودێزەیەکەوەو کولێنرا، جا هەردوکیان لە گۆشتەکەیان خواردو گۆشتاوەکەیشیان خواردەوە. واتە دروستە، بەڵکوسوننەتە، کە موسڵمان لە(هەدی)وقوربانی خۆی بخوات.

٤٤٥ـ ن/٢٠٩٤ عن عائشةرضي الله عنها أنَّ النَّبِيَﷺ قَالَ: ((مَا عَمِلَ ابْنُ آدَمَ يومَ النَّحْرِ عَمَلاً أَحَبَّ إلى اللهِ مِنْ هِرَاقَةِ دَمٍ وَأَنَّهُ لَتَأْتي يَوْمَ القِيَامةِ بِقُرونِهَا وَأَظْلافِهَا وَأَشْعَارِهَا وَأَنَّ الدَّمَ لَيَقَعُ مِنَ اللهِ ـ عَزَوَجَل ـ بِمَكَانٍ قَبْلَ أنْ يَقَعَ عَلَى الأَرْضِ فَيَطِبُوا بِهَا نَفْسَاً)) رواه ابن ماجه ٣١٢٦ والترمذي)١٤٩٣وقال: حسن غريب.

لە خاتو عائیشەوەرضي الله عنها هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ئادەمیزاد هیچ شتێك ناکات، کە خۆشەویست تر بێ لە لای خوا، لە ڕۆژی جەژنی قوربان دا، لە قوربانی کردن، بەڕاستی ئەولە ڕۆژی قیامەتدا دێت بە شاخەکانی وبە قولەسمەکانی وبە موەکانی دێت ـ واتە هیچی لێ ون نابێ وەکوئەوکاتەی کە کراوە بە قوربانی ـ ئەوخوێنە لە لای خوای بە دەسەڵات وگەورە وەرئەگیرێ، پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی، دەبێت ئێوەش بەوقوربانیە خۆتان شادمان بکەن.

٤٤٦ـ ن/٢١٠٠ عَنْ أُمِ سَلَمَةَ أَنَّ رَسُولُ اللهِﷺ قَالَ: ((إذَا رَأَيْتُمْ هِلالِ ذِي الحِجَةَ وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أنْ يُضَحِّيَ فَلْيُمْسِكَ عَنْ شِعْرِهِ وَأظْفَارِهِ)) م/٤١/١٩٧٧. والنسائي)٢١٢/٧(واحمد)٣٠١/٦، ٣١١(وابوداود)٢٧٩١(والترمذي)١٥٢٣(وابن ماجه)(٣١٤٩).

لەخاتو ئوموسەلەمەوە هاتوە، کە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: ((هەرکاتێ مانگی ذي الحجە دەرکەوت و، کەسێك لە ئێوە ئەیویست قوربانی بکات، با موو نینۆکی نەکات، تا ئەوکاتەی حەیوانەکەی ئەکات بە قوربانی.

٤٤٧ ـ ن/٢١٠٢ عَنْ البَراءِ بنُ عَازِبٍ قَالَ: ضَحَى خَالٍ لِي يُقَالُ لَهُ: أَبُو بُرْدَة قَبْلَ الصَّلاةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِﷺ: شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللهِﷺ إنَّ عِنْدِي دَاجِنَاً جَذْعَةٍ مِنَ الْمَعْزِ قَالَ: إذْبَحْهَا وَلا تَصْلُحْ لِغَيْرِكِ، ثُمَّ قَالَ: من ذَبِحَ قَبْلَ الصَّلاةِ فَإِنَّما يَذْبَحُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ ذَبِحَ بَعْدَ الصَّلاةِ فَقَدْ تَّمَ نُسُكُهُ وَأَصَاب سُنَةِ الْمُسْلِمِينَ)) رواه الجماعة الا ابا داود وابن ماجة خ/٥٥٥٦(م/٤/١٩٦١)(واحمد)٤/ ٢٧٩(والترمذي) ١٥٠٨(والنسائي)٧/٢٢٢.

له بەرائی كوڕی عازیبەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: خالێكم، كە پێی دەوترا ـ ئەبوبوردەـ پێش نوێژی جەژنی قوربان، قوربانی كرد، پێغەمبەری خواﷺ فەرموی مەڕەكەت مەڕی گۆشتە، واتە بە قوربانی ناژمێررێت، چونكە بەر لە نوێژ سەرت بڕیوە، جا ئەویش وتی: بونێكی ماڵیمان لایە، فەرموی: سەریبڕە، بۆ تۆ نەبێ بۆ كەسی تر نابێ(واتە: بزنی یەك ساڵەی بێ لە دوناكرێت بە قوربانی، ئینجا فەرموی: ((هەركەسێك حەیوان سەربڕێت بەر لە نوێژی جەژن ئەوە بۆ خۆی سەربڕ یوە، ئەوكەسەی پاش نوێژی جەژن سەری بڕی، ئەوە تەواوە خواپەرستیەكەی وڕەوشتی موسوڵمانانی پێكاوە.

٤٤٨ ـ ن/٢١٠٩ وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ أَرْبَعٌ لا تَجُوزُ فِي الأضَاحِي: العَوْرَاءُ البَيْنُ عَوْرُهَا والمَرِيضَةُ البَيْنُ مَرَضُهَا والْعَرْجَاءُ الْبَيْنُ ضَلْعُهَا وَالْكَسِيُر الَّتي لا تُنْقَى)). رواه الخمسة وصححه الترمذي احمد)٤ /٣٠٠ (وابوداود)٢٨٠٢ (والترمذي)١٤٩٧ (والنسائي)٧/٢١٤(وابن ماجه)٣١٤٤).

هەر لەوەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی چوار حەیوان بۆ قوربانی ناشێن، یەكەمیان: كوێرێكی زۆر دیار لە كوێریدا دوهەم: نەخوشێكی ئاشكرا لە نەخۆشیدا. سێهەم: شەلێكی زۆر دیاری لەشەلیەكەیدا، كە نەتوانێت بگات بە ئاژەڵ بۆ لەوەڕ. چوارەم: لەڕێكی وا، كە مۆخی تێدا نەمابێ.

# قوربانی به خەسێنراو دروسته

٤٤٩– ن/٢١١٦ عَـنْ أبـي رَافـعْ قَـالَ: ((ضَـحىّ رَسُـولُ اللهِﷺ بِكَبْـشَيْنِ أمْلَحَـيْنِ مَوْجُوءَيْنِ (خَصَيَيّنِ)) رواه احمد)٦/٨، ٣٩١،٣٩٢

له له باوکی ڕافیعەوەرضي الله عنه هاتوه، که وتویەتی پێغەمبەری خواﷺ قوربانی کردوه بـه دوبەرانی سپی تێکەلاوبە کەمێ ڕەشی، که گونیان دەرهێنرابو،خەسێنرابون.

٤٥٠ ـ ن/٢١١٩ عَنْ عَطَاءٍ بِنِ يَسَارٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا أَيْـوبُ الأنْـصَارِي: كَيْـفَ كَانَـتِ الضَحَايَا فِيكُمْ عَلَى عَهْدِ رَسُولُ اللهِﷺ؟ قَالَ: ((كَانَ الرَّجُلُ فِـي عَهْـدِ النَّبِـيِﷺ يُـضَحِي بِالشَاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ حَتَّى تَبَاهَى النَّاسُ فَـصَارَ كَمَـا تَـرَى)) رواه ابن ماجه والترمذي وصححه. ت/١٥٠٥/٣١٤٧

له عەتای کوڕی یەسارەوە هاتوه، که وتویەتی: پرسیارم له ئەبوئەیوبی ئەنساری کرد: ئایا قوربانی له سـەردەمی پێغەمبـەرداﷺ لـەناوئێوەدا چـۆن بـوە؟ وتـی: ((پیـاو لـە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ حەیوانێکی ئەکرد بە قوربـانی لـەباتی خـۆی و خـاوخێزانی، لێیان ئەخوارد ولێیشیان ئەدا به خەلك، تا خەلك دەستیان دایه خۆهەلکێشان، ئـیتر وای لێهات که ـ ئەمڕۆـ ئەیبینی)) واته تاکه مەڕێك، یان بزنێك بۆ کابرا وخاوخێزانی بـەس بوە، بۆ زیاتر ڕون بونەوە تەماشای ئەم فەرمودەی تره بکه (٤٥١)

٤٥١ ـ ن/٢١٢٢ عَنْ عَائِشَةَ: أنَّ النَّبِيَﷺ أَمْرَ بِكَبْشٍ أَقْرَنِ يَطَأُ فِي سَوَادٍ وَيْبُرِكَ فِـي سَوَادٍ وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ فَأَتَى بِهِ لِيُضْحيّ بِهِ فَقَالَ لَهَا: ((يَا عَائِشَةَ هَلُميِّ الْمُدْيةِ)). ثُـمَّ قَـالَ: ((اشْحذْ بِهَا عَلَى حَجَرٍ)) فَفعَلْتُ ثُم اَخَذَهَا وَاَخَذَ الْكَبْشَ فَاضْجَعَهُ ثُمَّ ذَبَحَهُ ثُمَّ قَالَ: ((بِسْمِ اللهِ، اَللَّـهُمَ تَقَبَـلْ مِـنْ محمد وَآلِ محمدٍ وَمِـنْ أُمَـةِ محمدٍ)) ثُـمَّ ضَـحِّىّ. رواه احمد ٦/٧٨ ومسلم)١٩/١٩٦٧(وابوداود)٢٧٩٢).

لـه خـاتون عائیـشەوەرضي الله عنها هـاتوه، کـه پێغەمبـەرﷺ فرمانیـدا، کـه بـەرانێکی

شاخداری سەر سم ڕەشی ئەژنۆ ڕەشی ناوچاوڕەشی بۆ هێنرا، کە بیکات بە قوربانی، جا فەرموی و((ئەی عائیشە ئەوکێردەم بۆ بێنە))، لە پاشا فەرموی: ((بە بەردێك تیژی بکە)) منیش وام کرد، ئینجا ئەو، کێردەکەی وەرگرت وبەرانەکەیشی ڕاکشاندو سەری بڕیو، پاشان فەرموی: بەناوی خوا، ئەی خوایە لە موحەممەد وئالی موحەممەد وە لە ئوممەتی (محمد) وەری گریت ﷺ، لە پاشا کردی بە قوربانی.

## تێبینی:

١) وشەی لە پاشان کە لە پێشەوە هاتون بۆ تەرتیبی قسەکەیە نەك بۆ تەرتیبی ئیشەکە وەکولە کۆتایی فەرمودەکەوە دەرئەکەوێت.

٢) دەرئەکەوێت کە تاکە حەیوانێك دەبێ بۆ ئەوخەڵکە زۆرە.

٤٥٢ـ ن/٢١٢٥ قَالَ اللهُ تَعَالى: ﴿ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّ ﴾ (الحج: ٣٦) قَالَ البُخَارِي: قَالَ إبْنُ عَبَاسٍ: صَوافَّ: قِياماً، وَعَنْ إبْنُ عُمَرَ: أنَّهُ أتَى عَلَى رَجُلٍ قَدْ أنَاخَ بَدَنَتَهُ يَنْحَرُهَا، فَقَالَ: إبْعَثْهَا قِيَامَاً مُقَيَّدَةً، سُنَةُ محمدﷺ اثر ابن عباس علقه البخاری/٤/٣٧٦ أمَّا حَدِيثُ إبْنُ عُمَرَ أخْرَجَهُ الْبُخَارِي) ١٧١٣(م)١٣٢٠(وابوداود)١٧٦٨).

خوای باڵا دەست ئەفەرموێ: جا ناوی خودای لەسەر بێنن بە پێوە، واتە: پێوە سەری ببڕن، ئیمامی بوخاری وتویەتی: ئیبنوعەباس وشەی(صَوافّ)ی ئایەتی (٣٦)ی سورەتی حەجی: بە پێوە وڕاوەستانی، ماناکردوە، لە ئیبن عومەرەوەرضي الله عنه هاتوە، کە پیاوێك کە وشترێکی یخ دا، تابڕی، وتی: هەڵیسێنەوەو بە پێوە وبە بەستراوەیی سەری ببڕە، ئەوە ڕەوشتی محمدەﷺ. واتە: سوننەتە وشتر بە پێوە لاقی چەپی ببەسرێتەوە وسەری ببڕێت، بەڵام باقی حەیوانەکانی تر بە ڕاکشاوی سەربڕێن.

٤٥٣ ــ ن/٢١٣٦عَنْ بُرَيدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: ((كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنِ لُحُومِ الأضَاحِي فَوْقَ ثَلاثَةِ لِيَتَسِعَ ذَوُالطَّوْل عَلَى مَنْ لاطَوْلَ لَهُ فَكُلُوا مَا بَدَا لَكُمْ وَاطْعِمُوا

وَادْخِـرُوا)). رواه احمـد ٣٥٥/٥، ٣٥٠ ومـسلم)١٩٧٧/٣٧(والترمـذي ١٥١٠ وصـحححه النسائي)٢٣٤/٧.

له بوريدەوەﷺ هاتوە، كه وتويەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمويەتی: ((من بـەرگری ئێوەم كردبوله هەلگرتنی گۆشتی قوربانی بەشی زیاتر لەسێ رۆژ، تا ئەوەی، كە هەیانەو قوربـانی ئەكـەن بگـات بەوكەسـانەی كـە نـەدار وكـەم دەسـتن، ئێـستا ـ قوربانیەكـە زۆرەوئەمێنێتـەوە وخەسـار ئـەبێ ـ هەرچـەنتان پێخۆشـە بیخـۆن وبیـدەن بـە خـەڵكو هەڵیگرن)).

٤٥٤ ـ ن/٢١٣٦ عَنْ عَلِي بُنُ أَبِي طَالِبٍﷺ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِﷺ أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنه وَأَنْ أَتَصَدَّقَ بِلُحُومِها وَبِجُلودِهَا وَأَجِلَّتِهَا وَأَلاَّ أُعْطِيَ الجَازِرُ مِنْهَا شَيْئاً، وَقَالَ: ((نحْنُ نُعْطِيــهِ مِــنْ عِنْــدِنا)) خ/١٧٠٧واطرفــه في)١٧١٦، ١٧١٧، ١٧١٨، ٢٢٩٩م/٣٤٨، ١٣١٧/٣٤٩(وابوداود)١٧٦٩(والنسائی)٣٠٩٩، ٣١٥٧.

له عەلی كوڕی ئەبوتاڵبەوەﷺ هاتوە، كە وتويـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ فرمـانی بەسەردا دام، كە سەرپەرشتی وشترەكانی ـ قوربانی ـ بكەن وگۆشت وپێست وجلـەكانیان بكەم بەخێر و بیدەم بە خەڵك وبە سەربڕ (قەساب) هیچ نەدەم وفەرموی: ((ئێمە لەلایەن خۆمانەوە شتی پێ ئەدەین)). ئەوەی لەم فەرمودەیە وەرئەگیرێ.

١ـ دروستە كەسـێك بكرێـت بـە سەرپەرشـتی حـەیوانی قوربـانی، بـۆ سـەربڕین و دابەشكردنی گۆشتو شتەكانی.

٢ـ پێویستە پێست وجلەكانی قوربانی بـدرێت بـە فـەقیر ونیازمەنـدو، خاوەنەكـەی نەیباتەوە بۆ خۆی.

٣ـ سەربڕی قوربانی ( قەساب)، نابێ بەناوی حەقی سەربڕینەوە لەوقوربانیـە گۆشـت وشتی پێ بدرێ، ئەویش وەكوخەڵكی تر وایە، وەكو خێرو قوربانی بۆی هەیە لەوقوربانیە بخوات وبە خاوخێزانیشی بدات.

٤ـ هەركەسێ ئیشێ بۆ كەسێك بكات حەقی خۆیـەتی پاداشـتی بدرێتـەوە، ئـەوەتا

پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ئێمە لە لایەن خۆمانەوە شت بەسەربڕی وشترەکان (قەساب) ئەدەین.

٤٥٥ـ ن/٢١٣٩ عَنْ عَبْدالله بن قُرْطٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ قَالَ: ((أَعْظَمُ الأَيَّامِ عِنْدَالله يَوْمَ النَحْرِ (ثُمَّ يَوْمُ القَرِّ)) وَقُرِّبَ إلى رَسُولِ اللهِﷺ خَمْسُ بُدْنَاتٍ ـ أَوْ ستَ ـ يَنْحَرُهُنَّ فَطَفَقْنَ يَزْدَ لِفَنِ اِلَيْهِ أَيَتُهُنَّ يَبْدَ أَبِهَا فَلَمَا وَجَبَتْ جُنُوبُها قَالَ: كَلِمَةُ خَفِةً لَمْ أَفْهَمْهَا فَسَأَلْتُ بَعْضَ مَنْ يَلِينِي: مَا قَالَ؟ قَالُوا: قَالَ: ((مَنْ شَاءَ إقْتَطَعَ)) رواه احمد ٤/٣٥٠ وابوداود)١٧٦٥(لە عەبدوڵای کوڕی قورتەوەرضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ((گەورەترین ڕۆژەکان لە لای خوا ـ بۆ حەیوان سەربڕین ـ ڕۆژی جەژنی قوربانە پاش نوێژ، لە پاشا ڕۆژی پاش جەژنە، کە ڕۆژی ((وەستانی خەڵکە لە مینادا))، پێنج یان شەش ـ وشتر هێنرا بۆ پێغەمبەرﷺ بۆئەوەی بیانکات بە قوربانی، جا وشترەکان دەستیان کرد بە نزیك بونەوە لە پێغەمبەر، بۆئەوەی هەرکام دەیویست پێشەکی ئەوسەربڕێت! کاتێ سەربڕین وکەوتن وشەکی سوکی فەرموم، باش تێ نەگەیشتم جا پرسیارم کرد لە هەندێ لەوانەی نزیکم بون -وتم- چی فەرمو؟ وتیان، فەرموی: ((جا ئیتر هەرکەسێ ئەیەوێ، با بۆ خۆی گۆشتی لێ بکاتەوە)).

**تێبینی:**

١- بەو وشەیەی، کە زیادمان کرد - بۆ حەیوان سەربڕین- ئەتوانرێت کۆبکرێتەوە وە لەگەڵ ئەوفەرمودەی، کە ڕۆژی عەرەفەی بە گەورەترین ڕۆژ داناوە، چونکە زۆر کەس لەو ڕۆژەدا لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان دەبێ - یاخوا لەوانە بین- آمین.

٢- سەرنج بدە لەو موعجیزە ئاشکرا وگەورەیەی پێغەمبەری خواﷺ، کە ئاژەڵەکان کێ بەرکێ دەکەن، تا پێغەمبەر بیانکات بە قوربانی، تا ئەوڕێزەیان بەرکەوێت لە پێغەمبەرەوەﷺ، جا وای لەم ئینسانە چەند نەزانە، حەیوانێکی بێ دەم وزمان ئەوە ئەزانێ، کە نزیك بونەوە لە پێغەمبەرەوەﷺ ئەگەرچی بۆ لەناوچونی بێت و

دۆزەخ ونەبەهەشتی هەبێ مایەی سەرفەرازی وشانازییە، بەڵام ئینسان ئەوەنـدە سـەرلێ شـێواونەزانە، دژایـەتی ئـەکات وهـەوڵی لـەناوبردنی خـۆی لـەکاتی خۆیـدا وڕێبـازو سوننەتتەکانی لە پاش خۆیدا ئەدات. خوای باڵادەست وزانا وکاربەجێ ڕاسـتی فـەرموە، کە کافران(شَرّالْبَرِيَة)خراپترین دروستکراوی خوان(هەروەها وەکوچوار پـێ وان بەڵکولـەوان سەرلێ شێواوترن(أولئك كالأنعام بل هم أَضـل). ئـەی مـرۆڤ تـۆ بەهەشـت یـان دۆزەخ جێگاتە، بێگومان جێگایەکی ترت نیە وخۆتت پێ حەشار نادرێت و، ناتوانی پارێزگـاری لە خۆت بکەیت، هەڵبژاردنی ئەودوجێگایەش لە دنیادا بەدەست خۆتە ،ئەگەر بەتـەمای بەهەشتیت، دڵنیابە بەبێ نزیکبونەوە لـە پێغەمبـەر وخۆشەویـستی ئەووپـەیڕەوکردنی، هەرگیز بەهەشت نابینی، دەی ژیربە ولە کەری شەیتان دابـەزە ولەبـەر ئـەم چـەند ڕۆژە کورتەی ژیان، ئەوژیانە خۆشو هەتا هەتایە لە دەست خۆت مەدە، ئەی خوایـە مـن وتم وتۆیش شایەتبە.

٤٥٦- ن/٢١٤٣ ((عَنْ أُمِّ كَرْزٍ الْكَعْبِيَةَ أَنّهَا سَأَلَتْ رَسُولَ اللهﷺ عَنِ العَقِيقَةِ؟ فَقَـالَ: نَعَم، عَنِ الغُلامِ شَاتَانِ وَعَنِ الأنْثَى وَاحِدة لا يَضُرُكُمْ ذُكْراناً كُنَّ أَوْ إنَاثَـاً)) (. رواه الخمسة احمد)٦/٣٨١، ٤٢٢(وابوداود)٢٨٣٤، ٢٨٣٥(والنسائي)٧/١٦٥(والترمذي)١٥١٦(وابن ماجه)٣١٦٢وصححه، قال الحاكم صحيح الإسناد ووافقه الذهبـي.

لە دایکی کورزی کەعبیەوەﷺ هاتوە، کە لە بارەی گوێزەبانی منداڵەوە ئەوپرسـیاری لە پێغەمبەری خواﷺ کرد وە ؟ فەرموی: ((بەڵێ، لەباتی کوڕی دوو مەڕ ولەباتی کـچ یەك مەڕ -دەبێ- هیچ زیانی نیە بۆتان ئەو نێر بن یان مـێ. ئەوەیەکـەم مـافی هاتنـە دنیای منداڵە سەر باوك ودایکەوە، هەروەها ناونانی بە ناوێکی جوان، ئینجا شیر پێـدان وبەخێوکردنی، کە باس دەکرێت.

٤٥٧- ن/٢١٥٠ ((عَنْ أَنَسٍ أَنَّ أُمُ سُلَيْمٍ وَلَدَتْ غُلاماً قَالَ: فَقَالَ لِي أَبُوطَلْحَـةَ إحْفَظْـهُ حَتَّى تَأْتِي بِهِ النَّبِيُﷺ فَأَتَاهُ بِـهِ، وَأَرْسَـلَتْ مَعَـهُ تَمْـرَاتٍ فَأَخَـذَهَاالنَّبِيُﷺ فَمَـضَغَهَا ثُـمَّ

أَخَذَهَا مِنْ فِيهِ فَجَعَلَهَا فِي فمّي الصَّبِي وَحَنكَّهُ وَسَمَّاهُ عَبْدُاللهِ)). اخرجاه خ/٥٤٧٠)م/٢٢/٢٣/٢١٤٤).

له ئەنەسەوەﷺ هاتوه، کە ئوموسولەیمی -دایکی- کە خێزانی ئەبو تەلحەبو کوڕێکی بو ئەلێ ـ ئەبوتەلحە پێی وتم ئاگان لێی بێ ، تا ئەیبەیتە خزمەتی پێغەمبەرﷺجا ئەویش هێنایە خزمەتی و، چەند دەنکە خورمایەکیشی لەگەڵ دا نارد بو پێغەمبەری خوا، جا خورماکەی وەرگرت و خستیە دەمیەوە وجویی ولە پاشا لە دەمی خۆی دەرهێناو خستیە دەمی منداڵەکەوە سوای بەدەمیەوەو، ناوی نا عبداللە(بەڵێ، ئەم عەبدوڵلایە لە کەوتنە سکی دایکیەوە داستانێکی خۆشی هەیە.

٤٥٨ - ن/٢١٥٦ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: ((لا فَرْعَ وَلا عِتْرَةَ)) (وَالْفَرْعُ اوّلُ النتَاجِ كَانَ يُنْتِجُ لِهُمْ فَيَذبَحُونَهُ، وَالْعِتْرَةُ فِي رَجَبَ)) رواه الجماعة خ)٥٤٧٣-٥٤٧٤(م)١٩٧٦(واحمد)٢٧٩/٢، ٤٠٩(وابوداود) ٢٨٣١ (والترمذي) ١٥١٢(والنسائی) ١٦٧/٧(وابن ماجه)٣١٦٨).

له ئەبوهورەیرەوەﷺ هاتوه، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: فەرع وعەتیرە نیە. واتە ئەم دوجۆرە حەیوان سەربڕینە لە ئیسلام دا نیە: (فرع) یەکەم بەچکەی حەیوانەکە ئەبو، لە سەردەمی نەزانیدا یەکەم بەچکەیان سەرئەبڕی، (عەتیرە)ش ئەوە بو، کە لە مانگی ڕەجەب دا هەمیشە حەیوانێکیان سەردەبڕی.

# بەشی مامەڵەکان

٤٥٩- ن/٢١٥٨ ((عَنْ جَابِرٍ أَنَهُ سَمِعَ رَسُولُ اللهِﷺ يَقُولُ: انَّ اللهَ حَرّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ فَقِيلَ: يَارَسُولَ الله أرأَيتَ شُحُومَ المَيْتَةِ فَإِنَّهُ يُطْلى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَاالْجلُودُ، وَيُستَصْبَحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: لا، هُوَ حَرامٌ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ عِنْدَ ذَلكَ: قَاتَل اللهُ اليَهُودَ؛ إنَّ اللهَ حَرَّمَ لَمَا حَرَّم شُحُومَهَا حَمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ، فَأَكَلُواثَمَنَهُ)) رواه الجماعة خ/٢٢٣٦ م/١٥٨١/٧١)احمد)٣/٣٢٤، ٣٢٦(وابوداود)٣٤٨٦ (والترمذي)١٢٩٧ (والنسائي)٧/٣١٠،٣٠٩(وابن ماجه)٢١٦٧.

لە جابیرەوە ﷺ هاتوە، کە ئەو گوێبیستی پێغەمبەری خوا بوەﷺ کە ئەیفەرمو: خوا فرۆشتنی ئارەق ومردارۆبوو بەراز وبتەکانی قەدەغە کردوە)) وترا ئەی پێغەمبەری خواﷺ ، پێت چۆنە ئەگەر بە بەزی مردارۆبو کەشتیەکانی پێ چەور بکرێت وپێستەکانی پێ چەور بکرێت بکرێنە ناوچراوەو،خەڵك سودی لێ وەرگرێت؟ فەرموی: ((نابێ، قەدەغەیە)) جا پێغەمبەرﷺ لەم کاتەدا فەرموی: ((خوا جولەکە لەناوبات، خوا لە کاتێکا کە بەزی لێ قەدەغە کردن ئەوان تواندیانەوە و-کردیان بە ڕۆن- لە پاشا فرۆشتیان وپارەکەیان خوارد، واتە نابێ فێڵ بکرێت بۆ دەرباز بون لە یاسای ئیسلام.

٤٦٠ - ن/٢١٦٠((عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ أنَّه إشْتَرى حَجَاماً فأمْرَ فَكُسِرتْ مَحَاجِمَهُ وَقَالَ: ((إنَّ رَسُولُ اللهِﷺحَرَّمَ ثَمَنَ الدَّمَ، وَثَمَنَ الْكَلْبِ وَكَسْبُ الْبَغِيّ وَلَعَنَ الْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ وَآكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ وَلَعَنَ الْمُصَورِينَ)). رواه احمد ٤/٣٠٨، ٣٠٩ والبخاري(٢٠٨٦) وابوداود(٣٤٨٣).

لە باوکی جوحەیفەوەﷺ هاتوە، کە بەندەیەکی کەڵەشاخگری کڕی و فرمانی دا، کە کەڵەشاخەکەی بشکێنێ وتی: پێغەمبەری خواﷺ پارەی خوێن و پارەی سەگ و

كەسابەتی زینای قەدەغە كردوە ونەفرینی لەوئافرەتانە كردوە، كە خاڵ ئەكوتن و ئەوانەی داوای خاڵ كوتان ئەكەن و، نەفرینی كردوە لە سوخۆر وسودەرو، نەفرینی كردوە لە وێنەگران.

واتە ئەوانە هەمویان قەدەغەن ونابێ موسوڵمان ئەنجامیان بدات وبە ڕاستیان بزانێ، لە ڕیوایەتی تردا هاتوە، كە بەرگری كردوە لە شیرینی تەخمینچیان(كاهنان) وپارەی پشیلە (نَهَى عَنِ حَلُوىَ الْكَاهِنِ وَنَهَى عَنِ الكَلَب والسِنَّوْرِ).[1]

٤٦١- ن/٢١٦٥((عَنْ جَابِرِعَنِ النَّبِي نَهَى عَنْ بَيْعِ فَضْلِ الْمَاءِ)). رواه احمد ٣٥٦/٣ ومسلم)٣٤١٥٦٥(وابن ماجە)٨٢٨/٢، ٢٢٧٧ (لە جابیرەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ بەرگری كردوە لە فرۆشتنی ئاوی زیادە لە خۆی -ئەگەر لە ڕوبارەكان وبیردا بێ. والله اعلم.

٤٦٢- ن/٢١٦٨((عَنْ أَنس أَنَّ رَجُلاً مِنْ (كِلاَب) سَأَلَ النَّبِيُﷺ عَن عَسْبِ الْفَحْلِ فَنَهَاهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللهِﷺإِنَّا نَطْرُقَ الْفَحْلَ فَنُكْرِمُ ((فَرَخَّصَ لَهُ فِي الْكَرَامَةِ)). رواه الترمذي ١٢٧٤ وقال حديث حسن غريب، والنسائي(٣١٠/٧).

لە ئەنەسەوەﷺ هاتوە، كە پیاوێك لە تیرەی كیلاب پرسیاری كرد لە پێغەمبەرﷺ سەبارەت بە پارەی نێری حەیوان پەڕاندنەوە، ئەویشﷺ قدەغەیە كرد، ئینجاوتی ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئێمە ئەونێرانە لە میكان ئەپەڕێنین ولە پاشا هەدیە ئەدەین بە خاوەنەكانیان - پێغەمبەرﷺ ئەوڕێگایەی پێدان، كە هەدیە بە خاوەنەكانیان بدەن.

٤٦٣- ن/٢١٦٩ ((عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ: أَنَّ النَّبِيَﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الحَصَاةِ وبَيْعِ الْغَرَرِ (رواه الجماعة الا البخاري.)م)١٥١٣/٤(واحمد)٣٧٦/٢، ٤٣٦، ٤٣٩) وابوداود)٣٣٧٦(والترمذي)١٢٣٠(والنسائي)٢٦٢/٧(وابن ماجە)٢١٩٤.

(١) رواه الجماعة خ/٢٢٣٧

لە ئەبوهورەیرەوەﷺ هاتوە کە: پێغەمبەرﷺ مامەڵەی بەرد ومامەڵەی خەڵەتاندنی قەدەغە کردوە. لە مانای(بَيْعُ الْحَصَاة) مامەڵەی بەرد(نارێکێکی زۆر هەیە لەوانە:

١- ئەوەیە کە بڵێ هەرکام ئەم بەردەی کەوتە سەر پێم فرۆشێت، جا بەردەکەی بۆ فڕێ بدات.

٢- یان ئەم زەوییەم پێ فرۆشێت، تا ئەوجێگای کە ئەم بەردە پێی دەگات وبەردەکە فڕێ بدات.

٣- یان پەشیمان بونەوەم بۆ هەیە، هەتا ئەم بەردە فڕێ ئەدەم.

٤- یان هەرکاتێ ئەم بەردەم فڕێدا ئەوە مانای وایە ئەوشتەم پێ فرۆشتویت. هیچکام لەم مامەڵانە دروست نیە،( بَيْعُ الغَرَرْ)وەکوفرۆشتنی ماسی لە دەریا یان باڵندە لە هەوا.

٤٦٤- ن/٢١٧١((عَنْ إبْنُ عُمَرَﷺ قَالَ: ((نَهَى رَسُولُ اللهِﷺ عَنْ بَيْعِ حَبْلِ الحَبَلَةِ)) (رواه احمد ٦٣/٢، ١٠٨ (ومسلم)١٥١٤/٥(والترمذی)١٢٢٩..

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: ((پێغەمبەری خواﷺ فرۆشتنی سکی سکی قەدەغە کردوە. واتە لە سەردەمی نەفامی دا شتیان ئەفرۆشت وماوەکەیان دائەنا، هەتا ئەوحەیوانەی، کە ئاوسە سکەکەی ئەبێ وگەورە ئەبێ وئەویش سکی ئەبێ. وشەی (حَبْل) واتە: (حَمْل) ، سك وەك یەكن لە وشە ومانادا.

٤٦٥- ن/٢١٧٦) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: نَهَى رَسُول اللهِ ﷺعَنِ الْمُلامَسَةَ وَالْمُنَابَزَةَ فِي الْبَيْعِ)) رواه الجماعة الا أحمد والترمذي خ/٢١٤٢) م/١٥١٢/٣)، وأبو داود(٣٣٧٧، ٣٣٧٩)، والنَّسائی(٢٦٠/٧)، وإبن ماجة ٢١٧.

لە باوکی سەعیدەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: ((پێغەمبەری خواﷺ بەرگری لە کردوە مامەڵەی دەست لێدان وفڕێدان.(الْمُلاَمَسَة) دەست لێدان واتە بڵێ هەرکاتێ، یان لە کام کەلوپەل دەستم دا ئەوەم بە ئەوەندە پێ فرۆشتیت، بێ ئەوەی تەماشای بکەیت.

(الْمُنَابَذة) (ئەوەیە کە هەرکام لە فرۆشتیار وکڕیاری شتی خۆیـان فـڕێ بـدەن بـۆ ئـەوی تریان وئەوە مانای(فرۆشتن وکڕین بێ)بێ ئەوەی تەماشـای بکـەن وبـەوە ڕازی بـن. ئـەم جۆرە مامەڵەیە هەردوکیان دروست نیە.

٤٦٦- ن/٢١٧٨ ((عَنْ جَابِرٍ: ((أنَّ النَّبِيﷺ نهى عَنِ الُمحَاقَلَةِ وَالُمزابنَةِ والثُنَيَا إلا أنْ تُعْلَمَ)) رواه الجماعـة الا البخـارى ومـسلم)٨٥/١٥٣٦(واحمـد)٣١٣/٣، ٣٦٤(وابـوداود) ٣٣٧٥(والترمذي)١٣١٣(والنسائي)٢٩٦/٧(وابن ماجه)٢٢٦٦).

لە جابیرەوەﷺ هاتوە کە: ((پێغەمبەرﷺ بەرگری کردوە لە مامەڵـەی دەغڵـی پـێ نەگەیشتو بەگەنم، یان جۆ(الُمحَاقَلَة)وە لە کڕینی خورمای پێ نەگەیـشتوبە خورمـای پـێ گەیشتو(الْمُزَابَنَة). ئەمانە هەردوکیان ئەگەر دەغلێك دانی ڕەق بووەك خورماکـەی وا لێ هات، کە مەترسی لەناوچونی کەمتر بکرێت وسور بـو، دروسـتە -وە هـەروەها بـەرگری کردوە لە کـڕین وفرۆشـتنی گـۆترە(الثنیـا)یـانی جیاکردنـەوە بڵـێ: هـەر ئـەوەی لـەو خەرمانەدا، یان لەم عەمارەدایە، بێجگە لە هەندێکی ئەیفرۆشم یان ئەیکڕم بە ئەوەندە- ئەوەش، دروست نیە، بەڵام ئەگەر خەرمانەکە، یان عەمارەکە دەزانـرا چـەندە وئـەوەیش کە جیای ئەکردەوە دەزانرا، بۆ نمونە وتی لەوخەرمان کە (دە) تەنە بێجگـە لـە نیوتـەنی ئەیدەم بە ئەوەندە یان ئەیکڕم بە ئەوەندە ئەوە دروستە، چونکە زانراوە وکێـشەی لەسـەر نابێ.

**تێبینی:** زۆرێك لەم مامەڵانە لەبەر کێشە وئـازاردانی دڵ و، کێـشان بـۆ سـوخۆری بەرگرییان لێ کراوە، جا وای بۆ حاڵی ئەوکەسانەی، کە بە زانین وئارەزوکاری دڵی خـەڵك ئازار ئەدەن و، کێشەی بۆ دروست ئەکەن.

٤٦٧- ن/٢١٨٠ ((عَنْ سَمَاكٍ عَنْ عبدالرحمن بنِ عبدالله بن مسعود عَـنْ أَبِيـهِ قَـالَ: ((نَهَى النَّبِيُّﷺعَنْ صَفْقَتَيْنِ فِي صَفْقَةٍ)) قَالَ سَمَاكْ: هُوَ: الرَّجُلُ يَبِيـعُ البَيْـع َفَيَقُـولُ هُـو بِنِسَاءٍ بِكَذَا وَهُوَ بِنَقْدٍ بِكَذَا وَكَذَا)) رواه احمد٣٩٨/١.

له سیماكەو، له عەبدوڕەحمانی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود له باوكیەوه -واته- له عەبدوڵڵاوه هاتوه، كه وتویەتی: پێغەمبەرﷺ ڕێگری كردوه له دومامەڵـه لـه یـەك شت دا، سیماك ئەڵێ: ئەوەیە، كـه كابرایـەك شـتێك ئەفرۆشـێت وئـەڵێ بـه قـەرز بـه ئەوەندەو، به حازر به ئەوەندەو. واته: جیاوازی دادەنێ لەودوفرۆشتنەدا، ئەمە بـەڕێگری لێ كراوه، چونكه دەرگایەكه بۆ سوخۆری. خوا پەنامان بدات لەوئیشه پیـسه، مەترسـی كێشەشی لێ ئەكرێ.

٤٦٨- ن/ ٢١٨٢ ((عَـنْ أَنَـسٍ قَـالَ لَعَـنَ رَسُـولُ اللهِﷺ فِـي الْخَمْرِعَشْـرَةً عَاصِـرِهَا، وَمُعْتَصِرِهَا، وَشارِبِهَا، وَحَامِلِهَـا، والْمَحْمُولَـةِ إِلَيْهَـا، وَسَـاقِيهِا، وَبَائِعِهَـا، وَآكِـلِ ثَمَنِهَـا، وَالْمُشْتَرِي لَهَا، وَالْمُشْتَرَاةِ لَـهُ)) رواه الترمـذي ١٢٩٥ وابـن ماجـه ٣٣٨١ ن/٢١٨٢ (لـه ئەنەسەوه هاتوه، كه وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ سەبارەت به عارەق، نـەفرینی لـه كەس كردوه، لەوكەسەی كه میوەكه دەگوشێت وئەوەی داوای گوشینی دەكـات وئـەوەی ئەیخواتەوەو ئەوەی هەڵی ئەگرێتو ئەوەی بۆی هەڵئەگیرێت، ئـەوەی ئـەیگێڕێت، ئـەوەی ئەیفرۆشێتو، ئەوەی پارەكەی ئەخواتو، ئەوەی ئەیكڕێت، ئەوەی بۆی دەكڕێت

٤٦٩- ن/٢١٨٨ ((عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُول اللهِﷺ إِذَا إِبْتَعْتَ طَعَامَاً فَلا تَبِعْهُ حَتَّـى (تَسْتَوْفِيهِ)) رواه احمد ٣٩٢/٣ ومسلم)١٥٢٨/٤١(له جابیرەوه هاتوه، كه وتویـەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی هەركاتێ خواردنێكت كـڕی، نەیفرۆشـیت، هـەتا خـۆت وەری نەگریت، ئەگەر به ژماره بو بیژمێری، ئەگەر به كێشانه، یان پێوانه بو بیكێـشی، یان بیپێوی، وەكوله ڕیوایەتی ئیمامی موسلم دا هـاتوه(فَـلا یَبِعْـه حَتَّـى یَكْتَـالَه) نـەی فرۆشی هەتا ئەیكێشی.

٤٧٠- ن/٢١٩٧((عَـنْ عَلِـيٍ قَـالَ: أَمَرَنِـي رَسُـولُ اللهِ ﷺ أَنْ أَبِيـعَ غُلامَـيْنِ أَخَـوَيْنِ فَبَعَثْتُهُمَا، وَفَرَّقْتُ بَيْنَهُمَـا فَـذَكَرْتُ ذَلِـكَ لَـهُ فَقَـالَ: أَدْرِكْهُمَـا فَارْتَجِعْهُمَـا وَلا تَبِعْهُمَـا إِلاّ جَمِيعَـاً)). رواه الخمـسة الا النـسائي ورجـال إسـناده ثِقَـات. كمـا قالـه الحـافظ.

/احمد)١/١٢٦، ١٢٧ (وابوداود)٢٦٠٦ (والترمذي)١٢٨٤ (وابن ماجه)٢٢٤٩.

لە عەلیەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا فرمانی پێدام، کە دوگەنجی بەندە کە برابون بیانفرۆشم، منیش فرۆشتمن وجیام کردنەوە و ئەم ئیشەم باس کرد بۆی، فەرموی: بگە پێیان وبیانهێنەرەوە و نەیان فرۆشی، مەگەر بە یەکەوە، واتە دروست نیە ئەوپەیوەندیە ببچڕێت، بەڵام پاش بالغبون قەیناکە[1]، والله اعلم.

٤٧١- عَنْ إبْنُ عَبَاس قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: ((لا تَلقُوا الرُّكْبَانَ وَلايَبِعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ)). رواه الجماعة إلاّ الترمذي خ/ ٢١٥٨ (م/١٥٢١ (وابوداود) ٣٤٣٩ (والنسائی) ٢٥٧/٧ (وابن ماجه(٢١٧٧).

لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: نەچنە دەری شارەوە بەدەم کاروانەوە بۆ شت لێ کڕینیان، با بێنە شارەوە ونرخی شتەکانی خۆیان بزانن، با شاریی شت نەفرۆشێ بۆ غەیرە شاریی ونەبێ بە دەڵاڵ بۆی، ئەگەر برای باوك ودایکیشی بێ، با خۆی شتی خۆی بفرۆشێت وخەڵکی لە یەکتر سود وەربگرن.

٤٧٣- ن/٢٢٠٧ ((عَنْ إبْنُ عُمَرَﷺ قَالَ: ((نَهىَ النَّبِيُ ﷺ عَنِ النَجَشِ)) رواه الجماعة الا ابا داود والترمذي خ/٢١٤٢(م ١٥١٦، ١٣ (واحمد)٢/ ١٠٨ (والنسائي)٢٥٨/٧ (وابن ماجه)٢١٧٣.

لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە کە وتویەتی: پێغەمبەرﷺ بەرێگری کردوە لە مامەڵەی(نجش)واتە زیادکردن لەسەر شت، بێ ئەوەی مەبەستی کڕین بێ، تەنها بۆ فێڵ کردن بێ.

٤٧٣- ن/٢٢١٠ ((عَنْ أبِي هُرَيْرَة أنَّ النَّبِيَ ﷺ قَالَ: لا يخْطُبْ الرَّجُلَ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ وَلايَسُومُ (عَلَى سَوْمَةِ)). وفِي لَفْظٍ ((لا يَبِعُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْع أخِيهِ وَلايَخْطُبْ عَلَى

(١) تەماشای فەرمودەی ٢٢٠٠ لە سەرچاوەی پێشو بکە.

خِطْبَةِ أخِيهِ)). أخرجاه. خ/٥١٤٣(م/٥١/١٤١٣).

لە ئەبوهورەیرەوەؓ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی هیچ پیاوێك داخوازی ئافرەتێك نەكات، كە برایەكی داخوازی كردبێ، تا ئەو وازی لێ نەهێنێ، یان ماوەی پێ نەدات، هیچ شتێك نەكڕیت، كە برایەكت كڕیبێتی. واتە بە كابرا بڵێت: مەیفرۆشە بە ئەو بەمنی بفرۆشە زیاترت پێ ئەدەم. لە بێژێكی تردا بەم شێوە هاتوە، كە مامەڵەی نەكەیت بەسەر مامەڵەی برات داو، خوازبێنی نەكەیت بەسەر خوازبێنی برات دا))، لە ڕاستیدا ئەمانە هەمومایەی ئێشوئازار وناكۆكی نێوان موسوڵمانانە، بۆیە ئیسلام قەدەغەی كردوە.

٤٧٤- ن/٢٢١٣ ((عَنْ إبن عُمَرَ أنّ النَّبِيَّﷺ قال: ((مَنِ ابْتَاعَ نَخْلا بَعْدَ أنْ يُؤَبَّرَ فَثَمَرَتُهَا (لِلَّذِي بَاعَهَا إلا أنْ يُشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ وَمَنِ ابْتَاعَ عَبْداً فَمَا لَهُ لِلَذِي بَاعَهُ إلاّ أنْ يَشْتَرِطَ الْمُبتَاعُ)) رواه الجماعة الا احمد خ/٢٣٧٩(م/٧٧/١٥٤٣ أبو داود(٣٤٣٣)، والترمذي (١٢٤٤)، النسائي(٧/ ٢٩٧)، وإبن ماجة(٢٢١١).

لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوەؓ هاتوە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: كەسێ باغێكی خورما بكڕێ، پاش ئەوەی، كە تۆی نێرەكەی لە مێ كەی درابێ، ئەوە بەرو بومەكەی بۆ كابرای فرۆشندەیە، مەگەر لە كاتی كڕینەكەدا ئەومەرجەیان كردبێ، كە بۆ بكڕ بێ. هەر كەسێك بەندەیەك بكڕێ، ئەوەماڵەكەی بۆ فرۆشندەیە.

مەگەر لە كاتی مامەڵەكەدا ئەو مەرجەیان كردبێ، كە بۆ كڕیار بێ، ئەوە لەم دو حاڵەتەدا، ئەگەر مەرجكرا ئەدرێ بەكڕیار، ئەگینا هی خاوەنی ئەوەڵیەتی، بەڵام ئەگەر خورماكە هێشتا تۆی لێ نەبەشرابو ئەوە هی بكڕە.

٤٧٥- ن/ ٢٢١٩ ((عَنْ جابر قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ وَالْمُعَاوَمَةِ وَالْمُخَابَرَةِ، وَفِي لَفْظٍ بَدَلَ( الْمُعَاوَمَةِ)، وَعَنْ بَيْعِ السِّنِينَ رواه الجماعة خ(٢٣٨١) م ٨٥/ ١٥٣٦، أحمد (٣/ ٣٦٤)، وأبو داود(٣٤٤٠)، والترمذي (١٣١٣)، والنسائي(٧/ ٢٩٦)، وإبن ماجة. لە جابیرەوەؓ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی

(المحاقلة) و(المزابنـة)، كردوه، ئەم دوانـە لـە پێـشەوە لـە ژمـارە(٤٦٦)دا مانـا كـران و (معاومة) واتە: فرۆشتنی درەخت یان بەروبوم بۆ چەند ساڵ و، رێگری كردوه لـە(مخابرة) واتە: زەوی بەكرێ دان لە سەر نیوە یان سێ یەك، یان چواریەك یـان شـوێنێكی دیـاری زەویەكە وەكونزیك بەئاو، یان جێگای تەخت ئەمانە هەمویان رێگری لێكـراوەو، خـاوەن زەوی نابێ ئاوا بكا، بەڵكو پێویستە زەوییەكەی بەمیقدارێكی دیاری لە گەنم یـان جـۆ، یان هەر شتێ كە تیا دەروێنرێت، یان بە پارە ئەمەی ئاخر لە هەموی چاكترو بێ گومـان ترە، والله أعلم.

٤٧٦- ن/٢٢٢٢((وَ عَنْه قَـالَ: قَـالَ النَّبِـيﷺ إنْ بِعْـتَ مِـنْ أخِيـكَ ثَمَـراً فَأصَـابَتْها جائِحَةٌ فَلا تَحِلُّ لَكَ أَنْ تَأْخُذُ مِنْهُ شَيْأً بِمَ تَأْخُذ مَالَ أخِيكَ بِغَيْـرِ حَـقّ)) رواه مـسلم، وأبـو داود(٧/ ٢٦٤، ٢٦٥ )، وإبن ماجة(٢٢١٩).

لەوەوەرضي الله عنه هاتوە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ئەگـەر بـەروبومێكت فرۆشت بەبرایەكت، لە پاشان بەڵایەك لێیداو لە ناوی برد، بۆت نیە هیچ لـەو وەرگریـت، بەهۆی چیەوەماڵی برای خۆت بەناحەق وەرئەگریت ؟

٤٧٧- ن/ ٢٢٢٣ ((وَعنْهُ أَيْضَاً أَنهُ كَانَ يَسِيرُ عَلَى جَمَل لَهُ قَدْ أعْيَا فَأَرَادَ أَنْ يُسبَّبُ، قَالَ: وَلَحِقَنِي النَّبِيُﷺفَدَعَالِي، وَضَرَبَهُ فَسَارَ يَسراً لَمْ يَسِرْ مِثْلَهُ فَقَالَ: ((بِعَيْنِـهِ)) فَقُلْتُ: لا، ثُمّ ((بِعَيْنِهِ)) فَبَعَثَهُ وَاسْـتَثْنَيْتُ حُمْلانَـهُ إلى أهلـي)) متفـق عليـه، وفي لفـظ لأحمـد، والبخـاري: شَـرَطْتُ ظَهْـرَهُ إلى الَمدِينَـةِ. خ/(٢٧١٨) م (١٠٩/ ٧١٥)، وأحمـد(٣/ ٣٩٩/٣٩٢).

هەر لە ئەوەوە دوبارە هاتوە، كە بەڕاستی ئـەو بەوشـترێك بەرێـدا ئـەرۆی، كـە زۆر ماندوبو، ویستی بەرەڵای بكات و بە پێ بـڕوات، وتـی: پێغەمبـەرﷺ گەیـشت پـێم و دوعـای خێری بۆ كردم و، دای لەو وشترەكەی تر دەڕۆیشت بە شێوەیەك، كە هەرگیز ئـاوا نە ڕۆیشتبو، ئینجا فەرموی: ((پێم بفرۆشە)) وتم: نەخێر، لە پاشان جارێكی تر فەرموی:

((پێم بفرۆشە)) منیش پێم فرۆشت و مەرجم کرد، کە سواری ببم تا ئەگەمەوە ناو ماڵم. واتە: بە مەرجێ گونجاو بێت و ڕەزامەنی هەردوی لە سەر بێ لە مامەڵەدا دروستە، والله أعلم.

٤٧٨- ن/ ٢٢٢٤ ((عَنْ عَبداللهِ بنِ عُمَرﷺ أنَّ النَّبيَﷺ قَالَ: ((لا يَحِلُّ سَلَفٌ، وِلا بَيْعٌ وَلا شَرْطَانِ فِي البَيْعِ، وَلا رِبْحٌ مَالَمْ يَضْمِنْ وَلا بَيْعُ مَا لَيْسَ عِنْدَك)) رواه الخمسة إلا إبن ماجة. أحمد(٢/ ١٧٨، ١٧٩)، وأبو داود(٣٥٠٤)، والترمذي(١٢٣٤)، والنسائي(٢٨٨/٧).

لە عەبدڵای کوڕی عەمەرەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ڕەوانیە سەلەم و مامەڵە بە یەکەوە، واتە کابرا بڵێ ئەم کەل و پەلەت پێ ئەفرۆشم بە هەزار بەو مەرجەی، کە دو هەزارم پێ پدەیت بە سەلەم، دو مەرج لە یەك مامەڵە دا ڕەوانیە، ڕەوانیە سودی شتێك زامنی نەبێ وەکو ئەوەی ماڵێك لە کەسێك بکڕیت، بەڵام پێش ئەوەی وەری گریت بیفرۆشێت بەکەسێکی تر ــ هەروەها ــ ڕەوانیە فرۆشتنی ئەو شتەی لات نەبێ و نەتوانی تەسلیمی بکەیت.

٤٧٩- ن/٢٢٢٥ ((عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِي بُرَيدَةَ للعِتْق، فَاشْتَرطُوا وَلاَءَهَا؛ فَذَكَرتُ ذَلِكَ لرَّسُولُ اللهِﷺ فَقَالَ: إشْتَرِيهَا أوْ أَعْتِقِيهَا؛ فَإنَّمَا الْوَلاءُ لِمَن أعْتَقَ..)) رواه الجماعة، ولم يذكر الخباري لفظة(أعتقها)خ(خ/ ٢١٦٨)م (٨/ ١٥٠٤) أحمد(٨١/٦، ٨٢، ١٨٣، ٢٠٦، ٢١٣، ٢٨١، ٢٨٢)، وأبو داود(٣٩٢٩)، والترمذي(٢١٢٤)، والنسائي(١٦٤/٦)، وإبن ماجة(٢٥٢١).

لە دایکی ئیماندارانەوە خاتو عائیشەوە هاتوە، کە ویستی بەریرە بکڕێت بۆ ئازاد کردن، بەڵام خاوەنەکانی وتیان بەو مەرجە نەیفرۆشین، کە سەربەستایەتی لە دەست خۆماندا (الولاية) بمێنێتەوە، جا ئەمەی بۆپێغەمبەری خواﷺ، ئەویش فەرموی بیکڕەو ئازادی بکە، ولایەت نیە، مەگەر بۆ ئەو کەسەی، کە ئازادی ئەکات. واتە: هەرکەسێ بەندی ئازادکرد ولایەتەکەی بۆ هەمیشە بۆ ئەمێنێتەوە.

٤٨٠- ن/ ٢٢٢٩ ((عَنْ إبنِ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: ذَكَرَ رَجُلٌ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ يَخْدَعُ فِي البُيُوعِ فَقَالَ: مَنْ بَايَعْتَ فَقُلْ: لا خِلاَبَةَ)) متفق عليه (خ/٢١١٧/ ٢٤٠٧/ ٢٤١٤)، أحمد(٢/٤٤/ ٦١/ ٧٢/ ٧٢/ ٨٤/ ١٠٧).

له عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پیاوێك لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسی مامەڵەی خۆی کرد، کە ئەخەڵەتێت فەرموی: لە گەڵ هەرکەسێك مامەڵەت کرد بڵێ: بەو مەرجە خەڵەتاندنی تێدا نەبێت، جا ئەگەر دەرکەوت، کە خەڵەتاوە ئەیتوانی ماڵەکەی لە کابرا وەرگرێتەوە، چونکە هەوڵدان بۆ خەڵەتاندن هەمیشەیی خیانەتەو، ئەبێ ڕێگای لێ بگرێت، جامادام بزانن، کە نەزانە، نا بێ بیخەڵەتێنن.

٤٨١- ن/ ٢٢٣٣ ((عَنْ حَكِيمِ بِنُ حِزَام، أنّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: البَايِعَانِ بِالْخَيَارِ مَا لَمْ يَفتَرِقَا، (أوْقَالَ: حَتَّى يَفْتَرِقَا)، فَإِنْ صَدَقَا، وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَذَبَا وَكَتَمَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعَهُمَا)) متفق عليه خ (٢٠٧٩، ٢٠٨٢، ١٢٢٤)م (٤٧، ١٥٣٢٢)(٣/ ٤٠٢، ٤٠٣، ٤٣٤).

له حەکیمی کوڕی حیزامەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: فرۆشتندەو کڕیار بەکەیفی خۆیانە لە هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەکەیان مادام لە یەك جیا نەبنەوە(یان فەرموی: هەتا لە یەك جیانەبنەوە) جا ئەگەر بەڕاستی ڕەفتاریان کردو هەمو شتەکانی مامەڵەکەیان ڕۆشن کردەوە ئەو مامەڵە بۆیان پیرۆز ئەبێت ، ئەگەر درۆیان کردو ڕاستیەکانیان شاردەوە، خێری ئەو مامەڵەیە نامێنێ و لە ناو ئەچێت.

٤٨٢-ن/٢٢٣٧ ((عَنْ إبن مسعود: أن النَّبِيَّ ﷺ لَعَنَ آكلَ الرِّبَا، وَمُؤْكِلَهُ، وَشَاهَدَيْه، وَكَاتِبَهُ. رواه الخمسة، وصححه الترمذي غَيْرأَنَّ لَفْظُ النِّسائي (لَعَنَ آكلَ الرِّبَا، وَمُؤْكَلَهُ، وَشَاهِدَيْه، وَكَاتِبَهُ إذَا عَلِمُوا ذَلِكَ مَلْعُونٌ عَلَى لِسَانِ محمد ﷺ يَوْمَ القِيَامَةِ). . أحمد(١/٣٩٣، ٣٩٤، ٤٠٢، ٤٥٣)، وأبو داود(٣٣٣٣)، والترمذي (١٢٠٦)، وإبن ماجة(٢٢٧٧). له عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ نەفرینی

لەو کەسە کردوە، کە سو دەخوات و سـو ئـەدات و شـایەتەکانی و نوسـەرەکەی ... لـە ڕیوایەتی نەسائیدا هاتوە، سوخۆرو سودەروشایەتەکانی و نوسـەری، ئەگـەر بـزانن، کـە ئەوە سوخۆرییەی شایەتی بدەن و کابرا بینوسێت لە سەر زمانی محمـدﷺ نـەفرینیان لێ کراوە.

٤٨٣- ن/ ٢٢٤٥((عَنْ عبادة بِنِ الصَّامِتِرضي الله عنه عَنِ النَّبِيِﷺ قَالَ: ((الذَهَبُ بِالذَهَبِ، وَالْفِضَةُ بالْفِضَةِ، وَالبُرُ بِـالْبُرِّ، وَالـشَعِيرُ بِالـشَعِيرِ، وَالتَمْـرُ بـالتَّمْرِ، وَالْمِلْـحُ بِـالْمِلحِ، مِـثْلاً بِمِثْلٍ، سَوَاءٌ بِسَواءٍ يَداً بِيَدٍ فإذا إخْتَلَفَتْ هَذِهِ الاصْنَافُ فَبِعُوا كَيْـفَ شِـئْتُمْ؛ إذا كـانَ يَـداً بِيَدٍ)) رواه الجماعة إلا البخاري، ومسلم(٨٠/ ١٥٨٧) لە عوبادەی کوڕی صـامیتەوەرضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە،کە فەرمویەتی: زێڕ بەزێر و زیو بەزیو و گەنم بەگـەنم و جـۆ بەجۆ، خورما بە خورماو خوێ بە خوێ هاوچەشن بە هاوچەشن، وەکو یەك و دەست بـە دەست بێ، واتە: نابێ بە قەرز بێ، جا ئەگەرئەمانە بە ڕەگەز لـە یـەك جیـابون، وەکـو زێڕو زیو و گونم جۆ دروستە هەر چۆنێکی بفرۆشـن بەومەرجـەی قـەرز نـەبێت، بـەڵکو دەست بەدەست بێ.

٤٨٤- ن/٢٢٤٨ ((عن ابي سعيد وابي هريرة ان رسول الله ﷺ اسْتَعْمَلَ رَجُلاً عَلَى خَيْبَرَ فَجَاءَهُمْ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ فقال: (اَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا ؟قَالَ : انَّا لَنَأْخُذُ الـصَّاعَ مِـنْ هَـذَا بِالصَّاعَيْنِ وَ الصَّاعَيْنِ بِالثَّلاثَةِ فَقَالَ : (لاتَفْعَلْ ، بِعِ الْجَمْعَ بِالدَّراهِمِ ، ثُـمَّ ابْتَـعْ بِالـدّراهِمِ جَنِيبــاً))) رواه البخــاري ومــسلم والنــسائي. (خ / ٢٢٠١/ ٢٢٠٢م /٩٤ /١٥٩٣) والنسائي (٧ /٢٧١).

لە ئەبو سەعیدو ئەبو هوریرەوەرضي الله عنه هاتووە کە پێغەمبـەری خـواﷺ پیـاوێکی کـرد بەسەرپەرشتی خەیبەر، ئەویش هەندێ خورمای چاکی بۆ هێنان، فەرموی: ئایا خورمـای خەیبەر هەموی ئاوایە؟

وتی: ئێمە صاعێك لەمە وەرئەگرین بە دوو صاعو دوو صاع وەرئەگرین بە سێ، فەرموی: ((وانەكەیت، ئەو خورما خراپە بفرۆشەو بە پارەكەی خورمای چاك بكڕە. (جنیب) خورمای چاكە (سجمع) خورمایەكە، كە وشكەڵو پیسی زۆرەو لەو خراپترە، واتە مادام یەك رەگەزن، نابێ بە زیادو كەم بەیەك بفرۆشرێن، چونكە ئەو جۆرە خورما فرۆشتنە سووە (الربا).

## نەزانینی یەكسانی وەكو زانینی زیادە وایەو ڕەوا نیە

٤٨٥- ن/٢٢٤٩ ((عن جابر قال: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بيَعْ الصُّبْرَةِ مِنَ التمر لا يُعْلَمُ كَيْلُها بِالكيلِ الْمُسَمىَّ مِنَ التَّمْرِ)) رواه مسلم (١٥٣٠)، والنسائي (٧/٢٧٠).
لە جابیرەوە ﷺ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری كردوە لە فرۆشتنی كۆگایەك خورما بە خورمایەك، كە نەزانرێت پێوانەی بە پێوانەیەكی ناوبراو. واتە هەر چۆن خورمای زیادە بە خورما دروست نیە مادام نەزانی گەر یەكسانیشن هەم دروست نیە.

٤٨٦- ن/٢٢٥١ ((عن ابن عمر عَنِ النَبّيِّ ﷺ قَالَ: (اَلمِكْيَالُ مِكْيَالُ اَهْلِ الْمَدِينَةِ وَالْوَزْنُ وَزْنُ اَهْلِ مَكَّةَ))) رواه ٣٣٤٠/ ابوداود ٥ر٥٤ والنسائي.
لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە ﷺ هاتوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ، كە فەرمویەتی: پێوانە پێوانەی خەڵكی مەدینەیەو،كێشانە كێشانەی خەڵكی مەككەیە، واتە ئەو دوانە لەو سەردەمەدا رێكوپێكترین پێوانەو كێشانەیان هەبووە،ئێستایش چاو لەوان كردن چاكە.

٤٨٧- ن/٢٢٥٥((عنِ سَهْل بن ابي حثمة قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عن بَيْع الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ وَقَالَ ذَلكَ الرِّبَا تِلْكَ الْمُزابَنَةُ الاَّ اَنَّهُ رَخَّصَ فِي بَيْعِ العَرِيَّةِ، النَّخْلَةَ والنَّخْلَتَينْ يَأْخُذُهَا اَهْلُ الْبَيْتِ بِخَرْصِهَا تَمْراً يَأْكُلُونَهَا رُطَباً)) (خ/٢١٩١) م/٦٨/١٥٤٠) وابوداود (٣٦٦٣) والنسائي (٧/ ٢٦٨).

له سەهلی كوڕی ئەبو حەسمەوە هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ بەرگری كردوە لە فرۆشتنی بەروبومی تەڕ بە خورماوە، فەرمویەتی ئەوە سووەو ئەوەیە (مزابەنە) كە لە پێشەوە باسمان كردوە، بەڵام ماوەی داوە بە (مامەڵەی عەرایە) كە دار خورمایەك، یان دوو دار خورمان تا چوار خەروار خورمای تەڕ، لەبەر پێویستی بە خورمای وشك بفرۆشرێتو كابرا سوود لە تەڕەكە وەرگرێت، دیارە ئەو فرۆشتنە بە گوترەكاری ئەبێو لەبەر پێویستیو نیازی زۆری خەڵك ماوەی پێدراوە، ناكرێ بە قیاس بۆشتانی تر.

٤٨٨- ن/٢٢٥٩((عن جابر: اَنَّ النَّبِّـيﷺ اشْـتَرىَ عَبْـداً بِعَبْـدَيْنِ) رواه الخمسة احمد (٣٤٩/٣، ٣٥٠، ٣٧٢) وابوداود (٣٣٥٨) والترمذي (١٢٣٩) وابن ماجه(٢٨٦٩) الا النسائي وصححه الترمذي ومسلم (١٦٠٢/١٢٣) بمعناه.

له جابیرەوەرضي الله عنه هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ بەندەیەكی كڕیوە بە دوو بەندە. واتە دروستە حەیوانێك بفرۆشرێت بە دوو حەیوانو سووی تێدا نیە، ئەگەر دەست بە دەست بێ.

٤٨٩- ن/٢٢٦٦((عن ابن عمر ان النبّـي ﷺ قال: (اِذَا ضَنّ النَّاسُ بِالدِّينَارِ وَالْدِّرْهَمِ وَتَبَايَعُوا بِالْعِينَةِ واَتَّبَعُوا اَذْنَابَ الْبَقَرِ وَتَركُوا اْلجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللهِ، اَنْزَلَ اللهُ بِهِمْ بَلاَءً فَلاَ يَرْفَعُهُ حَتَّى يُراجِعُوا دِينَهُمْ) رواه احمد وابوداود (٣٤٦٢) بلفظ آخر وقال الحافظ رجاله ثقاة وعندي حسن لغيره والله اعلم)).

له عەبدوڵای كوڕی عومەرەوەرضي الله عنه هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی هەركاتێ خەڵكی رژدیان كرد لە دینارو درەمداوە مامەڵەی عینەیان كرد، واتە بازرگان ماڵی فرۆشت بە كابرا بە قەرزو، لە پاشان هەمان ماڵی لێ‌كڕیەوە بە حازر بە كەمتر لەو نرخەی پێی فرۆشتووە ـ بەداخەوە كە ئەمڕۆ ئەمە زۆر باوە لە ناو بەناو موسڵمانانداـــ دوای كلكی مانگا كەوتنو واتە دەستیان كرد بە تۆو چاندنو لە كاتی پێویستی جیهاددا وازیان لە جیهاد هێنا لە ڕێگای خوادا، خوا تەنگو چەڵەمەو گرفتارییەكی زۆرو گەورەیان ئەدا بەسەرداو لەسەریان لای نابات، هەتا نەگەڕێنەوە بۆ لای

ئایینەكەیان. ئەبو داود بە شێوەیەكی تر هەمان فەرمودەی گێڕاوەتەوە.

٤٩٠- ن/٢٢٧٤ (((عن ابي هريرة، اَنَّ النَبّـِيَّﷺ مَرَّ بِرَجُلٍ يَبِيعُ طَعَاماً، فَأَدْخَلَ يَـدَهُ فِيهِ فَاِذاً هُوَ مَبْلُوُلٌ، فَقَالَ (مَنْ غَـشَّنا فَلَـيْسَ مِنَّـا) رواه الجماعـة الا البخـاري والنـسائي م(١٦٤/١٠٢) احمـد (٢/٢٤٢) وابـوداود(٣٤٥٢) والترمـذي (١٣١٥) وابـن ماجـة (٢٢٢٤))).

لە ئەبو هورەیرەوەرضي الله عنه هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ دای بەلای كابرایەكدا، خواردەمـەنی ئەفرۆشت، جا دەستی كرد بەناویدا بینی كە لـەناوەوە تـەڕەو فـەرموی: (ئـەو كەسـەی گزیـمان لـێبكات لە ئێمە نیە). واتە گزی كردن لە فرۆشتندا ناڕەوایە.

٤٩١- ن/٢٢٧٦ (((عَـنْ عَائِـشَةَ: (اَنَّ النَبّـِيَّﷺ قَـضَى اَنَّ الْخَـرَاجَ بِالـضَّمَانِ) رواه الخمسة الا الترمـذي، وللحـديث عنـد احمـد (٤٩/٦، ١٦١، ٢٣٧,٢٠٨) والنـسائي (٧/ ٢٥٥,٢٥٤) وابن ماجه (٢٢٤٢) ابي داود ثلاث طـرق اثنتـان رجالهمـا رجـال الـصحيح والثالث قال ابوداود ليس بذلك)).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشەرضي الله عنها هاتوە، كـە پێغەمبـەرﷺ بڕیاریـدا كـە پەیدا بوو سوود لە باتی زەمانەت دایە. واتە: ئەگەر كەسـێك سـەیارە، یـان وڵاخێكـی كڕیو چەند ڕۆژێك ئیشی پێكردو سودێكی لـێ دەست كەوتو، پاشـان دەركـەوت، كـە عەیبدارەو بردیەوە بۆ خاوەنەكەی ئەوە هەر سەیارە، یان وڵاخەكـەی ئەكەوێتـەوە، نـەك ئەوەیش، كە لێی پەیدا كردوە، چونكە ئەو ماڵە لە زەمانەتی ئـەم دابـووە، ئەگـەر لـەو بەینەدا بفەوتایە نەیدەتوانی بیداتەوە بەسەر خاوەنەكەیدا، كەوابوو، ئەو سودە لـە بـاتی ئەو زیانە بەو دەدرێت. ئەمە یاسایەكی گەورەی فیقهی یەو گەلێك كێشەی پێ چارەسەر ئەكرێت. والله اعلم.

٤٩٢- ن/٢٢٧٧((عَن اَبي هُريرة، اَنَّ النبّـِيَّ ﷺ قـال: (لاتُـصَرّوا الأبِـلَ وَالْغَـنَمَ فَمَـن ابِتَاعَهَا بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ بِخَيرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَاَنْ يَحْلِبَهَا اِنْ رَضِيَهَا اَمْسَكَهَا وَاِنْ سَـخِطَهَا رَدّهَـا

وَصَاعاً مِنْ تَمْرٍ) متفق عليه، رواه الجماعة الا الترمذي وابن ماجة خ(٢١٥٠) م(١٥١٥/١١) (٢٦/ ١٥٢٤) احمد (٢/٢٤٢,٣٩٤, ٤١٠,٤٦٥) وابوداود (٣٤٤٣) والنسائي (٢٥٣/٧))).

(لاتَصُروا): واتە شیر لە گوانی شیرداراندا کۆ مەکەنەوە تا خەڵکی پێ بخەڵتێننو وابزانن شیریان زۆرە. ئینجا ئەچینە سەر فەرمودەکە:

لە ئەبوهورەیرەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: شیر لە گوانی وشترو مەڕەکاندا کۆنەکەنەوە — بۆ خەڵەتاندن، کە چەند ڕۆژێك نەیاندۆشن، ئینجا بیانبەنە بازاڕەوە — جا ئەو کەسەی کە ئەو جۆرە حەیوانانەی کڕی بۆ شیرو — دوایی بۆی دەرکەوت کە فێڵیان کردووە — دو ڕێگای بۆ هەیە دوای ئەوەی کە دۆشی، ئەگەر ڕازی بو وەریگرێت، ئەگەر ڕازی نەبو، بیگەڕێنێتەوەو بۆ هەر حەیوانێك، صاعێك خورماشی پێ بدات لە باتی شیرەکە.

٤٩٣- ن/٢٢٧٩((عن انس قال: غَلاَ السِّعْرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهﷺ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهﷺ لَوْ سَعَّرْت فَقَالَ: (إنَّ اللهَ هُوَ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الرَّازِقُ الْمُسعِّرُ وَإِنيِّ لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى الله — عزوجلّ — وَلاَ يَطْلُبُنِي أَحَدٌ بِمَظْلَمَةٍ ظَلَمْتُها إِيَّاهُ في دَمٍ وَلاَ مَالٍ) رواه الخمسة الا النسائي وصححه الترمذي، احمد (١٥٦/٣ ،٢٨٦) وابوداود (٣٤٥١) والترمذي (١٣١٤) وابن ماجة (٢٢٠٠))).

لە ئەنەسەوەﷺ هاتوە کەوتویەتی: شتەمەك لە سەردەمی پێغەمبەری خواداﷺ گرتبو وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! خۆزگە نرخی شتت دیاری بکردایە، فەرموی: هەر خوایە تەنگانەو فەرەحی دەرەو ڕۆزیدەرەو نرخ دیاریکەرەو، من هیوادارم بە خوای باڵادەستو گەورە بگەم — هیچ کەسێك داوای باجی ستەمێکم لێ نەکات، کە ستەمم لێ کردبێت، نە لە گیانو، نە لە ماڵدا، واتە نرخی کاڵاو خۆراك دیاری کردن لەلایەن دەسەڵاتدارەوە دروست نیە.

٤٩٤- ن/٢٢٨٠((عَنْ سَعيدِ بنِ الْمُسَيِّبِ عَنْ معمر بن عبدالله العدوى اَنَّ النبَّيَّﷺ قال: (لاَيَحْتِكَرُ الاّ خَاطِيءٌ) رواه احمد (٣/٣٥٤,٦٦/٤٠٠) ومسلم (١٢٩/١٦٠٥) وابوداود (٣٤٤٧) والترمذي (١٢٦٧) وابن ماجة (٢١٥٤) رواه الجماعة البخاري والنسائي)).

له سەعيدی كوڕی موسەيبەوه له مەعمەری كوڕی عەبدولاّی عەدەوييەوه هاتوه، كه پێغەمبەرﷺ فەرمويەتی: ئەوەی كه مادەی خۆراك هەڵگرێت لە كاتی پێويست بۆ گرانی، تاوانباره. واته حەرامو قەدەغەيه شت هەڵگرتن به مەبەستی گران كردنو به گران فرۆشتن (الاحتكار).

# بەشـــی ســـــەلەم

٤٩٥- ن /٢٢٨٦ ((عَنْ اِبْن عَبَّاسٍ قَالَ: قَـدِمَ النَبِّـيُّﷺ الْمَدِينَـةَ وَهُـمْ يُـسْلِفُونَ فِـي الثِّمَارِ السَّنة وَالسَّنَتَيْنِ فَقَالَ: مَنْ اَسْلَفَ فَلْيُسْلِفْ في كَيْـلٍ مَعْلُومٍ وَ وَزْنٍ مَعْلُـومٍ اِلى اَجَـلٍ مَعْلُومٍ))، رواه الجماعة.احمد (٢٨٢/١) خ (٢٢٤٠، ٢٢٤١) م (١٢٧/ ١٦٠٤) وابـوداود (٣٤٦٣) والترمذي (١٣١١) والنسائي (٢٩٠/٧) وابن ماجة (٢٢٨٠).

(سلف، واتە: سلم) هەردو يەكواتايان هەيەو بەوە دەوترێت، كە كابرا پارە ئەدات بـە كابرايەك بە شتێك، كە لەوكاتەدا نيەو پاش ماوەيـەك پەيـدا ئـەبێ، وەكـو ئـەوە بلّـێ فرۆشندە يان بكڕ — هەزار دينارم پێ بدە، كە ئێستا زستانە، هاوين دو تەن گـەنمت پـێ ئەدەمو هەردو ڕازی بێنو پارەكە وەرگرێت، جا بۆ ئەمە پێويـستە چـاو لـەم فەرمودەيـە بكەين، كە عەبدوڵای كوڕی عەباس وتويەتی: پێغەمبەرﷺ تەشريفی گەيشتە مەدينـە، خەڵكی مەدينە سەلەميان كرد لەسەر بەروبومی ساڵێكو دو ساڵ، فەرموی: هەركەسێك سەلەم ئەكات، با سەلەمەكەی بە پێوانەيـەكی ديـاری بـێ —ئەگـەر بـە پێوانـە بـو-وە كێشانەی ديار —ئەگەر كێشانە بو-وە بۆ ماوەی ديار.

٤٩٦- ن /٢٢٩٢ ((عَنْ اَبِي رَافِعٍ قَالَ: استلف النبّـيﷺ بكـراً فَجَائَتْـهُ اِبِـلُ الـصَّدَقَةِ فَأَمَرَنِي اَنْ اقضي الرَّجُلَ بِكْرَه فَقُلْتُ: اِنِيّ لَمْ اَجِدْ فِي الْاِبِلِ اِلاّ جَمَـلاً خيـاراً رُبَاعِيّـاً فَقَـالَ: (اَعْطِـهِ اِيَّـاهُ فَـاِنّ مِـنْ خَيـرِ النَّـاسِ اَحْـسَنُهُمْ قَـضاءً))) رواه الجماعـة الا البخـاري م (١٢٢٤/٣) و (١١٨/ ١٦٠٠) / احمد (٣٩٠/٦) وابـوداود (٣٣٤٦) والترمـذي (١٣١٨) والنسائي (٢٩١/٧) وابن ماجة (٢٢٨٥).

لە باوكی ڕافيعەوەرضي الله عنه هاتوە، كەوتويـەتی: پێغەمبـەرﷺ وشـترێكی وەرگـرت بـە سەلەم، ئينجا وشتری زەكاتی بۆ هات، فەرمانی پێكردم، كە هەمان ئەو وشترە بدەمەوە

بە کابرا، منیش وتم: وشتری وەکو هی ئەوە نیە، بەڵکو هەمویان لەو تەمەنە زیاترن‌و چاکترن. فەرموی ئەوەی باشترە پێی بدە، بە ڕاستی چاکترین خەڵك ئەو کەسەیە، کە بە جوانترین شێوە قەرز ئەداتەوە. واتە زیادەدانەوە لە قەرزدا مادام لە پێشەوە بڕیاری زیادە نەدرابێت چاکەو بەر سووخۆری ناکەوێت[1]، هەروەها لێرەوە دەرئەکەوێت، کە وەکیل گرتن دروستە.

---

(١) تەماشای فەرمودەی ٢٢٩٥، لە سەرچاوەی پێشو بکە—عن جابر...فقضانی و زادنی. متفق علیه.

## بەشـــی بارمتە (الرهـن)

٤٩٧- ن /٢٢٩٩ ((عن انس قال: رَهَنَ رَسَوْلُ اللهِﷺ دِرْعـاً عِنْـدَ يَهُـودِيٍّ بِالْمَدِينَـةِ وَاَخَذَ مِنْهُ شَعِيراً لأَهْلِهِ)) رواه الجماعة الا مسلماً وابي داود احمـد (١٣٣/٣) خ / ٢٠٦٩) والترمذي (١٢١٥) والنسائي (٢٨٨/٧) وابن ماجة (٢٤٣٧).

لە ئەنەسەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ زرێیەکی لەلای کابرایەکی جولەکە لە مەدینەدا بە بارمتە داناو، هەندێ جۆی لـێوەرگرت بـۆ دەسـتو دایرەکـەی خۆی.

٤٩٨- ن /٢٣٠١ ((عن ابي هريرة، عن النبّـيﷺ انه كان يقول: الظهر يُركبُ بِنَفَقَتِهِ اِذَاكَانَ مَرْهُوناً ،وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ بِنَفَقَتِـهِ اِذَا كَـانَ مَرْهُونـاً، وَعَلَـى الـذَّي يَرْكَـبُ وَيَـشْرَبُ النَّفَقَةُ)) رواه الجماعة الامسلما والنـسائي واحمـد (٢٢٨/٢ /٤٧٢) خ / ٢٥١٢ وابـوداود (٣٥٢) والترمذي (١٢٥٤) وابن ماجة /٢٤٤٠).

لە ئەبو هورێرەوەرضي الله عنه هاتوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە ئەیفەرمو: ولاخی سـواری لـە بارمتەدا سواربونی دروستە لەباتی خەرجیەکەیداو، شیری شیرداری ئەخورێتـەوە لـەباتی خەرجیەکەیدا، وە پێویستە لەسەر ئەوکەسەی، کە سواری ئەبێو شیری ئەخوات خـەرجی بدات.

## بەشی ڕەوانە کردنی خاوەن قەرز بۆ لای یەکێکی تر

٤٩٩-ن /٢٣٠٣ ((وعنه اَنَّ النَبِّـيَّ ﷺ قَـالَ: مَطْـلُ الْغَنِـيّ ظُلْـمٌ وَاِذَا أُتْبِـعَ اَحَـدُهُمْ عَلَـى مَلِـيءٍ فَلْيتْبَـعْ)) رواه الجماعـة خ /٢٢٨٧ احمـد (٢٤٥/٢) وابـوداود (٣٣٤٥) والترمذي (١٣٠٨) والنسائي (٣١٧/٧) وابن ماجة (٢٤٠٣) (م/٣٣/ ١٥٦٤).

هەر لەوەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: کەسێ قەرزی کەسێکی بە لاوە بێو، دەسەڵاتی هەبێ بیداتەوەو، نەیداتەوە، ئەوە ستەمی کردوە. هەر کاتێ یەکێك لە ئێوە ڕەوانەی لای کەسێکی دارا کرا، با بچێت. واتە کەسێ ئەگەر قەرزی بە لای کەسێکەوە بو وەختێ داوای کرد –یان بێ داوا- ناردی بۆ لای کابرایەك، کە پارەی لابووە، کابرا هەیبوو، کاتی دانەوەیشی بوو، ئەبێ بچێتو بەم چونە مافی نامێنێ لەسەر قەرزاری ئەوەڵ، مەگەر دوهەم ئینکاری بکاتو نەیداتەوە.

٥٠٠- ن /٢٣٠٥ ((عَنْ سَلَمة بنِ الأَكْوَع قَال: كُنَّا عِنْدَ النَّبِّيﷺ فأُتي بِجَنَازَةٍ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهﷺ صَلِّ عَلَيْهَا قَالَ: ((هَلْ تَرَكَ شَيْئاً؟) قالوا: لا..قَالَ: ((هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ ؟)) قالُوا: ثَلاَثَةُ دَنَانِيرَ ، قَالَ:((صَلُّوا عَلى صَاحِبِكُمْ )) فَقَالَ اَبُو قَتَادَة: صَلِّ عَلَيْهِ يَارَسُولَ اللهِ وَعَلَيَّ دَيْنُهُ . فَصَلَّى عَلَيْهِ) رواه احمد ٤/٤٧،٥٠ والبخاري (٢٢٨٩) والنسائي (٤/٦٥))).

لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەرداﷺ بوین مردویەکیان هێنا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ نوێژی لەسەر بکە، فەرموی هیچی لێ بەجێ ماوە –لەماڵو سامان-؟ وتیان: نەخێر، فەرموی: ئایا قەرزی بەلاوەیە؟ وتیان: بەڵێ سێ دیناری بەلاوەیە، فەرموی نوێژ بکەن لەسەر ڕەفیقەکەتان – واتە نوێژی لەسەر نەکرد- لەبەرئەوەی کە قەرزار بوو، باوکی قەتادە –یەکێك لە یاوەرانی پێغەمبەر بو-وتی قەرزەکەی لەسەر من بێ. ئینجا پێغەمبەرﷺ نوێژی لەسەر کرد. واتە پێویستە مسوڵمانان پارێزگاری لە ماڵی یەکتر بکەنو کەس ماڵی کەس بە ناڕەوا نەخواتو قەرز نەکات، هەتا زۆر پێویست نەبێو، کاتێ قەرزیشی کرد هەوڵ بدات هەرچی زوتر بیداتەوە، نەوەك بمرێتو کەس بۆی نەداتەوەو، دەبێ لە قیامەتا بە کردەوەی باشی بیداتەوە، ئەگەر هەیبو، ئەگینا لە تاوانی خاوەن قەرزەکەی بە ئەندازەی قەرزەکەی ئەخرێتە سەر ئەبێ سزا بچێژێ، مەگەر کەسێك لە شەڕی دەریادا لە ڕێگای خوادا شەهید بێت ئەوە خوا خۆی بۆی ئەبژێرێت لە قیامەتا.

جا ئەم نوێژ نەکردنە تەنها تایبەتی پێغەمبەر بوە، چونکە ئەو دوعای گیرا دەبـو بـۆ مردو ئەویش مـافی خـەڵکی بەسـەرەوە بـوو لەبەرئـەوە پێـشەکی نوێـژی لـە قـەرزدار نەدەکرد، بەڵام وەختێ سەروەتو سامان کەوتە بەردەستی بۆی ئەبژاردەوەو نوێژی لەسەر دەکردو زانایان بەلایانەوە وایە پێویستە لە بـەیتولمالْ قـەرزی مـردوی قـەرزار بدرێتـەوە مەگەر خەزێنەی موسڵمانان خاڵی بێ.

٥٠١- ن /٢٣٠٩ ((عن عمروبن الشريد عن أبيه عن النَبِّـيَﷺ قَالَ: لَيُّ الَواجِدِ ظُلْمٌ يَحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ)). رواه الخمسة الا الترمذي. . احمـد (٣٨٨/٤) وابـوداود (٣٦٢٨) والنسائي (٣١٦/٧) وابن ماجة (٢٤٢٧).

لە عەمری کوڕی شەرید لە باوکیەوە لە پێغەمبـەرەوەﷺ هـاتوە، کـە فەرمویـەتی: ماتەڵ کردنو نەدانەوەی قەرزی دەسەڵاتدار ستەمە ((وەکو فـەرمودەی ٤٩٩))وە ئەمـە ئەبێ بە هۆی — ناوبردنی بە خراپ لە کاتی سکاڵای خاوەن قەرزەکەو ئەبێ بـە هـۆی — تۆڵە لێ سەندنەوەی بە زیندانو شتی تر

٥٠٢-ن /٢٣١٠ ((عن ابي سعيد قال أُصِيبَ رَجُـلٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فـي ثِـمَارٍ ابْتَاعَهَـا فَكَثُـرَ دَيْنُـهُ فَقَـالَ: (تَـصَدَّقُوا عَلَيْـهِ))) رواه الجماعـة الا البخـاري (م/١٨/١٥٥٦). احمـد (٣٦/٣) وابـوداود (٣٤٦٩) والترمـذي (٦٥٥) والنـسائي (٢٦٥/٧) وابن ماجة (٢٣٥٦).

لە باوکی سەعیدەوە‌رضي الله عنه هـاتوە، کـە وتویـەتی: پیاوێـك لەسـەردەمی پێغەمبـەری خواداﷺ دوچاری قەرزاریەك هات بە هۆی بەروبومێکەوە، کە کڕی بویو لەناوچوبو. جا قەرزەکانی زۆر بو، پێغەمبەر فەرموی ((خێری پێ بکەن)) خەڵکی خێریان پێکرد، بەڵام نەگەیشتە تەواوی قەرزەکانی، ئینجا پێغەمبەری خواﷺ فەرموی بە خـاوەن قـەرزەکان: وەریبگرن ئەوەی دەستتان ئەکەوێتو بێجگە لەوە شتێکی ترتان بـۆ نیـە. واتـە ئەگـەر کەسێك قەرزار بوو هیچی نەبو لەباتی قەرزەکەیدا بیداتەوە ئەبێ خاوەن قەرزەکان، یـان ئازادی بکەن، یان لێی بوەستنو لەوە زیاتریان بۆ نیە.

٥٠٣- ن /٢٣١٢ (( عن ابي هريرة عَنِ النَبِّيّ ﷺ قَالَ: مَنْ اَدْرَكَ مَالَهُ بِعَيِنْهِ عَنْ رَجُلٍ اَفْلَسَ (اَوْ اِنْسَانٍ قَدْ اَفْلَسَ) فَهُو اَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ)) رواه الجماعة احمد (٢٢٨،٢٥٨/٢) (خ/٢٤٠٢) (م/١٥٥٩/٢٢) و ابوداود (٣٥١٩) والترمذي (١٢٦٢) والنسائي (٣١١/٧) وابن ماجة (٢٣٦٠).

له ئەبوهورەیرەوەﷺ له پێغەمبەرەوەﷺ هاتوه، که فەرمویەتی: هەرکەسێ ماڵی خۆی ــ بێ کەمو زیادی ــ له لای کابرای هیچ له دەست نەماو ((موفلیس)) دییەوە (یان مرۆڤێ که هیچی نەمابو) ئەوە شایستەترە بەو ماڵە تا بێجگە لەو.

# بەڵگــەی باڵــغ بوون

(٥٠٤/ن /٢٣١٨ ((عن ابن عمر قال: عُرِضْتُ عَلَى النَّبِّيﷺ يوم أُحُدٍ وَاَنَا ابْنُ اَرْبَعَ عَشَرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجزِنِي، وَعُرِضْتُ عَلَيْهِ يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَاَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشَرَةَ سَنَةً فَأَجَازَنِي)). رواه الجماعة الا النسائي خ/٤٠٩٧ م/١٨٦٨/٩١.

له عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ هاتوە، كە وتویەتی: ڕۆژی ئوحد برامە خزمەت پێغەمبەرﷺ، كە تەمەنم ١٤ ساڵ بوو ماوەی پیٚنەدام بچم بۆ غەزای ئوحود، لە ڕۆژی خەندەقدا برامە خزمەتی تەمەنم ١٥ ساڵ بوو، ماوەی پیٚدام، كە هاوكاری بكەم، واتە لە ١٥ ساڵیدا مرۆڤ بە باڵغ دائەنرێت، ئەگەر پێش ئەوەی نێرینە بو ئیحتلام نەبوبیٚ، یان شەرمگەی موی نەكردبیٚ، مێینە بوو نەكەوتبێتە عوزری شەرعییەوە, واتە بە ساڵ (١٥)پانزە ساڵە، لێرەش ئەوە دەر ئەكەوێت كەمناڵ نابیٚ ببرێن بۆ غەزا وئیشی جیهادیان بدریٚ بەسەردا، والله اعلم.

## سەرپەرشتی بیٚ نەوا بۆی هەیە لە ماڵی هەتیو بخوات

(٥٠٥/ن /٢٣٢١ ((عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها في قَوْلِهِ تَعَالَى (وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيراً فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ))) اخرجاه خ/٢٢١٢ (٤٥٧٥،٢٧٦٥) م(١٠،١١ /٣٠١٩) احمد (١٧/٢)وابو داود (٤٤٦٥) والترمذي (١٧١١) و ابن ماجة (٢٥٤٣).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە ﷺ هاتوە، لە بارەی فەرمودەی خوای باڵادەستەوە، كە ئەفەرموێت: ((هەر كەسێك دەوڵەمەندە با خۆی بگرێتەوە لە ماڵی هەتیوو، هەر كەسێكیش فەقیرە، با بە شێوەی عادەتیو چاكە لێی بخوات)) سورەتی

نیساء ئایەتی (٦) كە لەبارەی سەرپەرشتی هەتیوانەوەیە، ئەگەر فەقیر بن، ئەوە ئەتوانێ لەباتی ئەو سەرپەرشتیو خزمەتی هەتیوانە لە ماڵیان بە شێوەی عادەتی بخوات، لە بێژیەكی تردا هاتوە، كە: دابەزیوە لەبارەی سەرپەرشتی هەتیوەوە، كە بەسەریا ئەگەڕێتو ماڵەكەی بۆ چاك ئەكات، ئەگەر فەقیر بو لەو ماڵە بخوات بە شێوەی عورفو عادەتی سەردەم.

## ئاشتی كردن لەسەر شتی دیار و نا دیار دروستە

٥٠٦-ن /٢٣٢٦ ((عَنْ جَابِرٍ اَنَّ أَبَاهُ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ شَهِيداً ، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ ، فَاشْتَدَّ الْغُرَمَاءُ فِي حُقُوقِهِمْ ، قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلْتُهُمْ اَنْ يَقْبَلُوا ثَمَرَةَ حَائِطِي وَيُحَلِّلُوا أَبِي، فَأَبَوْا ، فَلَمْ يُعْطِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ حَائِطِي وَقَال : ((سَنَغْدُ عَلَيْكَ )) فَغَدا عَلَيْنَا حِينَ اَصْبَحَ فَطَافَ فِي النَّخْلِ ، وَدَعَا فِي ثَمَرِهَا بِالْبَرَكَةِ فَجَدَدْتُهَا فَقَضَيْتَهُمْ وَبَقِيَ لَنَا مِنْ ثَمَرِهَا . وَفِي لَفْظٍ : اَنَّ اَبَاهُ تُوفِّيَ وَتَرَكَ عَلَيْهِ ثَلاَثِينَ وَسْقًا لِرَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ . فَاسْتَنْظَرَهُ جَابِرٌ ، فَاَبَى اَنْ يُنْظِرَهُ ، فَكَلَّمَ جَابِرٌ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَشْفَعُ لَهُ اِلَيْهِ ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَكَلَّمَ الیَهُودِيَّ لِيَأْخُذَ ثَمَرَةَ نَخلِه بِالَّذِي لَهُ فَأَبَى ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ النَّخَلَ فَمَشَى فِيهَا ثُمَّ قَالَ لِجَابِرٍ : ((جُدَّ لَهُ فَأَوْفِ لَهُ الَّذِي لَهُ )) فَجَدَّهُ بَعْدَمَا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَوْفَاهُ ثَلاَثِينَ وَسْقاً وَفَضَلَتْ سَبْعَةَ عَشَرَ وَسْقاً)) رواهما البخاري خ/٢٧٨١،٤٠٥٣ والنسائي/٦ /٢٤٤)).

لە جابیرەوە ﷺ هاتوە، كە باوكی لە غەزای ئوحوددا شەهید كراو قەرزار بوو، خاوەن قەرزدەرەكان بۆ مافەكانیان لەسەر جابیر زۆر توندیان كرد ، وتی: هاتمە خزمەتی پێغەمبەرﷺ داوام لێكردن، كە بەروبومی باخەكەم لێ وەرگرنو باوكم ئازاد بكەن، نەیانكرد، پێغەمبەرﷺ باخەكەی پێ نەدانو فەرموی: ((بەیانی دێین بۆ لات))، بەیانی كە ڕۆژ بوویەوە هاتە لامانو گەڕا بەناو خورماكانداو داوای كرد، كە بەروبومەكەی بەرەكەتی تێكەوێت، منیش بڕیمو قەرزەكانیانم دایەوە،وە هەندێكیشی بۆمان مایەوە.

لـە بێژەیـەیێکی تـردا هـاتوە، کـە: بـاوکی وەفـاتی کـرد، سـێ خـەروار خورمـای جولەکەیەك قەرزار بوو، جا جابیر داوای ماوەی لێکرد، ئەویش ماوەی نـەدا، لـە پاشـان جابیر داوای لە پێغەمبەری خواﷺ کرد، کە تکای بۆ بکات لـەو کابرایـە، پێغەمبـەری خوایشﷺ هاتو قسەی لەگەڵ جولەکەکەدا کـرد، کـە بـەروبومی خورماکـەی لـەباتی مافی خۆیدا لـێ وەرگرێت ، ئەویشی نەکرد، جا پێغەمبەرﷺ چـووە نـاو خورماکانـەوە هاتوچۆیەکی تێدا کردو بە جابیری فەرمو ((برۆ بیبـڕەوەو حەقی خـۆی پـێ بـدەرەوە)). ئیتر جابیـر پاش ئەوەی کە پێغەمبەری خواﷺ گەڕایەوە بەری خورماکـەی بـڕیو سـێ خەروارەکەی داوە بە کابرا، حەڤدە خەرواریشی مایەوە وصلی الله علی حبیبنـا وشـفیعنا محمد واله واصحابه اجمعین وسلم تسلیما کثیرا.

٥٠٧-ن /٢٣٣٠ ((عـن ابـن عبـاس قـال: قـال رســول اللهﷺ: (لا ضَـرَر وَلا ضِـرارَ وَلِلرَّجُلِ اَنْ يَضَعَ خَشَبَةً فِي حَائِطِ جَارِهِ وَاِذَا اخْتَلَفْتُمْ فِي الطَّرِيـقِ فَـاجْعَلوهُ سَـبْعَةَ اَذْرُعٍ))). رواه احمد ٣١٣/١ وابن ماجة (٢٣٣٧).

له عـەبدوڵای کـوڕی عـەباسـەوە رضي الله عنه هـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمویەتی: نەزیان بەخۆت بگەیەنەو، نەزیان بەخەڵك. بۆ دراوسێ هەیە، کـە دار بخاتـە سەر دیواری هاوسێکەی خۆی، وە هەرکاتێ لەبارەی ڕێگاوە ناکۆکیتان بـو حـەوت گـەز دابنێن لە نێوانیاندا.

دیارە ئەمە بۆ ئەو کاتە بووە، کە بە وشـترو ئەسـپ وقـاترو گوێدرێـژ، ئـازو گویـاز ئەکراو بەلای یەکترا، بە بارەوە بچونایەو لەملاولایانەوە دو کەس بـە ئاسـانی هاتوچـۆی بکردایە، ئەمڕۆ ئەبێ دو سەیارەی باری لەبەرچاو بگریتو جێگای هاتوچـۆی ڕێبـواریش لەملاو لایانەوە، والله أعلم.

## پــارە تێکەڵاوکردن و هاوبەشــی دروســتە

٥٠٨-ن /٢٣٣٧ ((عن ابي المنهال اَنَّ زَّيدَ بْنَ ارقمَ والبَـرَّاء بْنَ عَـازِبٍ كَانَـا شَـرِيكَيْنِ فاشتريا فِضَّةً بِنَقْدٍ وَنَسِيئَةٍ فَبَلَغَ النَّبِـيّ ﷺ فَامَرَهُمَا: (اَنَّ مَا كَانَ بِنَقْدٍ فَأَجِيزُوهُ وَمَا كَـانَ نَسِيئَةٍ فَرُدُّوه))). رواه احمد ٣٧١/٤ والبخاري بـمعناه، خ (٢٤٩٧، ٢٤٩٨).

لە باوکی مینهالەوە هاتوە، کە زەیدی کوڕی ئەرقەمو بەرائی کوڕی عازب هاوبــەشو شەریك بون، بە یەکەوە هەندێ زیویان کڕی، هەندێکی بە حازرو هەندێکی بە قەرز، ئــەم ئیشە گەیشتە پێغەمبەرﷺو فرمانی پێـدان، کـە ((ئــەوەی بــە حــازر بــوە وەریگــرنو ئەوەیشی بە قەرز بوە بیگێڕنەوە –بۆ خاوەنەکەی-)). چونکە ئەو شتانەی، کـە ســوویان تێدایە ئەبێ دەست بە دەست بن، ئەگینا ئەبێ بە ســوو، بــە داخــەوە ئــەمڕۆ ئــەم کــارە ناپەسەندە لەناو مسوڵمانانـدا ڕەواجی پەیدا کردووە، حیــساب بــۆ پاشــەڕۆژوو حیــسابی ناکەن، مەبەستیان هەر دنیا دەستکەوتنە، خوا لە شەڕو فەرتەنــەی دنیــاو دنیاپەرســتان بــمان پارێزێت.

## کەســێ کرا بە وەکیل بۆ کڕینـــی شــتێ جا ئــەو بــەو پارەیــە زیاتر لەوەی کڕی دروســتە.

٥٠٩- ن /٢٣٥٠ ((عن عُروة بنِ اَبي الَجْعد الْبَـارِقي: اَنَّ النَّبِــيّ ﷺ أَعْطَـاهُ دينـاراً لِيَشْتَرِيَ بِهِ شَاةً، فَاشْتَرَى لَهُ بِهِ شَاتَيْنِ ، فَبَاعَ احْدَاهُمَا بِدِينَارٍ ، وَجَاءَهُ بِدِينَارٍ وَشَاةٍ، فَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ فِي بَيْعِهِ ، وَكَـانَ لَـو اشْـتَرَى التُّـرَابَ لَـرَبِحَ فِيـهِ . )) رواه الجماعـة الا مـسلما والنسائي واحمد (٣٧٥/٤) (خ/٣٦٤٢) وابـوداود (٣٣٨٤، ٣٣٨٥) والترمـذي (١٢٥٨) وابن ماجة (٢٤٠٢). لـە عومــەری کــوڕی ئــەبو جەعــدی باریقیــەوەﷺ هــاتوە، کــە

پێغەمبەرﷺ دینارێکی پێدا، کە حەیوانێکی بۆ بکڕێت، ئەویش بەوە دوو حەیوانی کڕی و، یەکێکیانی فرۆشتەوە بە دینارێك و، ئەوسا دینارێك و حەیوانێکی بۆی هێنایەوە، ئینجا پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ کرد، کە پیت و بەرەکەت بکەوێتە مامەڵەیەوە، ئیتر ئەو ئەگەر خاکی بکڕیبایە سوودی قازانجی دەکرد.

## باسی ئاودان و شینایی.

٥١٠-ن /٢٣٥٣ ((عَنْ عمر اَنَّ النَّبِيَّﷺ عَامَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَايَخْرُجُ مِنْ ثَمَرٍ اَوْ زَرْعٍ) رواه الجماعة احمد (٢٢,١٧/٢) خ (٢٣٢٩/٢٣٢٨) م/-٣/١٥٥١/ وابوداود (٣٤٠٨) والترمذي (١٤٠١) والنسائي (٥٣/٧) وابن ماجة (٣٤٦٧) وللبخاري (اَعْطَى يَهُودَ خَيْبَرَ أَنْ يعَمْلُوهَا وَيْزرَعُوهَا وَلَهمُ شَطْرُ مَايَخْرُجُ مِنْهَا)).

لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوەرضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا ڕێکەوت لەسەر نیوەی دەرامەدتی بەروبوم و شینایی. لە ڕێویەتێکی بوخاریدا هاتوە، کە: دەستکەوتی خەیبەریدا بە جولەکەی خەیبەر –باخ و زەوییەکان-ی لەسەر ئەوەی، کە ئەوان ئیشی تێدا بکەن بە خزمەت و ئاودان و تۆچاندن لەسەر نیوەییان – نیوەی بۆ جولەکەکان و، نیوەشی بۆ پێغەمبەر و موسڵمانان-. واتە ئاوا مامەڵەیەك دروستە.

٥١١- ن /٣٥٨) ((عَنْ رافع بن خَديج قَال كُنَّا اَكْثَرُ الأَنْصَارِ حَقْلاً فَكُنّا نُكْرِي الأَرْضَ عَلَى اَنَّ لَنَا هَذِهِ وَلَـهُمْ هَذِهِ فَرُبّما اَخْرَجَتْ هَذِهِ وَلَمْ تُخرِجْ هَذِه فَنَهَانَا عَنْ ذَلكَ فَاَمَّا الْوَرِقُ فَلَمْ يَنْهَنَا) أخرجاه خ/٢٣٢٧، م/١١٧/١٥٤٧.

لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: ئێمە زەوی و باخ و بێستانمان لە هەمو یاریدەدەرەکان زۆرتر بو، ئێمە زەویمان بەکرێ ئەدا لەسەر ئەوەی، کە ئێرە بۆ ئێمە بێ و، ئەوێ بۆ ئەوان ((واتە جێگای نزیك بە ئاو چاکیان هەڵئەبژارد بۆ خۆیان و، ئەویتریان ئەدا بە کابرا بۆ خۆی بیچێنێت، جا زۆرجار وائەبو ئەو بەشەی، کە چاك بووە

خاوەنی زەوی بۆ خوای دانا بو، دەغلّی چاکی ئەهێنا ئەوی تر، هیچی نەدەهێناو کابرای زەحمەتکێش هیچی دەست نەدەکەوت، لەبەرئەوە پێغەمبەرﷺ لەوە بەرگری کردین، بەلاّم بە پارە بەرگری نەکردین. واتە خاوەن زەوی ئەبێ بە پارەیەکی دیار، زەوییەکەی بدات ئیتر چی تێدا ئەبێ، یان نابێ لە مل خاوەن زەوی نیە، نابێ بە دە یەك، یان بە زیادو کەمتر بدرێت.

## باسی بەکرێدان و بەکرێ گرتن.

٥١٢-ن/ ٢٣٦٤((عن عائشة في حديث الهجرة، قَالَتْ: وَاسْتَأْجَرَ النَّبِيُّ وَأَبُوبَكْرٍ رَجُلاً مِنْ بَنَيَ الدِّيَلِ هَادِيَا خِرِّيتاً...(والخِرِّيتُ : اَلْماهِرُ بِالْهِدَايةِ) وَهُوَ عَلَى دِينِ كُفّارِ قُرَيْشٍ، وَاَمِنَّاهُ فَدَفَعَا اِلَيْهِ راحِلَتَهُمَا وَوَاعَدَاهُ غَارَ ثَوْرٍ بَعْدَ ثَلاَثِ لَيَالٍ ، فَأَتَاهُمَا بِرَاحِلَتِهِمَا صَبِيحَةَ لَيَالٍ ثَلاثٍ فَارْتَحَلاَ)، رواه احمد (١٩٨/٦) والبخاري (٢٢٦٣) وابوداود (٤٠٨٣).

لە دایکی باوەڕدارانەوە خاتون عایشە‌رضي الله عنها هاتوە، کە سەبارەت بە دەنگوباسی کۆچ کردن قسەی کردوە، کە وتویەتی: پێغەمبەرﷺو ئەبوبەکرﷺ کابرایەکیان لە تیرەی (بەنی دییەل)، کە ڕێگای دەزانیو شارەزا بو بەکرێ گرت، ئەو لەوکاتەدا لەسەر ئایینی قورەیش بو بەلاّم ئەوان بە ئەمینیان ئەزانیو دوو وشتریان پێدا، کە پاش سێ شەو بۆیان بێنێو، بەلێنی ئەشکەوتی (سەوریان) پێدا، ئەویش بەیانی شەوی سێهەم بۆی بردن. واتە دروستە مرۆڤی مسولّمان، ئەگەر مسولّمانی شارەزای دەستنەکەوت، بێباوەڕ بکات بە ڕێ پیشاندەرو چاوساغی، بەلاّم ئەگەر مسولّمان هەبو، نابێ ئەو کارە بکات، لەبەر ئەم فەرمودەیە، کە ئەفەرموێت: ((فَلَنْ اَسْتَعِيَن بِمُشرِكٍ/ مـن یارمەتی لە موشریکم ناوێ)) لە پاشدا دێت.

٥١٣-ن /٢٣٦٥ ((عن ابي هريرة، عَنْ النَّبِيِّﷺ قَالَ: مَا بَعَثَ اللهُ نَبِيّاً الاَّ رَعِيَ الْغَنَمَ) فقال اصحابهُ: وانْتَ؟ قال: نَعمْ، كُنْتُ أَرْعَاهَا عَلَى قَرَارِيطَ لأهْلِ مَكَّةَ) رواه احمد (٣٢٦/٣) والبخاري (٢٢٦٣) وابن ماجة (٢١٤٩).

لە ئـەبو هـورەیرەوەﷺ هـاتوە لـە پێغەمبـەرەوەﷺ، کـە فەرمویـەتی: خـوا هـەر پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردبێ شوانی مەڕیان کردوە.

یارەکانی وتیان تۆیش؟

فەرموی: بەڵـێ، منیش لەوەڕاندومە بۆ خەڵکی مەکە بە چەند قەراریتێك -پـارەی ئەو سەردەمە بوە. واتە: پێغەمبەری ئازیزمان شوانی کردوە، چونکە لە زۆر بوارەوە زۆر گرنگە بۆ مرۆڤ.

٥١٤-ن /٢٣٧١ ((عَنْ انس اَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ اِحْتَجَمَ، حَجَمَهُ اَبُو طَيْبَةَ وَاَعْطَاهُ صَـاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وكَلَّمَ مَوالِيَهُ فَخَـفَّفُوا عَنْه)، اخرجاه، خ/٢١٠٢) م (١٥٧٧/٦٢).

لە ئەنەسەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ کەڵەشاخی گرتوە کەڵەشاخ گرەکە ئـەبو تەیبە ـ کە ناوی نافیع بو-وە دوصاع خۆراکی بێداو قسەی لەگەڵ خاوەنەکەیدا کرد ـــ بۆ بار سوککردنی ئەویش - بۆیان سوك کرد جا ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ، کە پـارەی کەڵـە شاخ قەدەغە نیە، ئەگەرچی نەخواردنی چاکە، وەکو لە پێشەوە باسکرا.

## لەسـەر ڕاگەیاندنی قورئانو خەڵك شـارەزا کردن لێی نابـێ کرێ وەرگیـرێت.

٥١٥-ن/٢٣٧٣ ((عَنْ عبدِ الرحمن بن شِبْلٍ عَنِ النَّبـِيّﷺ قَـالَ: اقْـرءُوا القـُرْآنَ وَلاَ تَغْلُوُا فِيهِ وَلاَ تَجْفُوا عَنْهُ وَلاَ تَأْكُلُوا بِهِ وَلاَ تَسْتَكْثِرُوا بِهِ) رواه احمد (٤٤٤/٣).

لە عەبدوڕەحمانی کوڕی شیبلەوەﷺ هاتوە، لە پێغەمبـەرەوەﷺ، کـە فەرمویـەتی: قورئان بخوێننو زیادەڕۆیی تێدا مەکەنو، خۆتانی لـێ دورنەخەنـەوەو پێـی مـەخۆن، وە داوای سامان زۆرکردن نەکەن بەو.

## ئەگەر بۆ شیفا بەسەر نەخۆشدا خوێندرا دروستە کرێ وەرگیرێ و مەرجیش بکرێت.

٥١٦- ن /٢٣٧٧((عَن اَبي سَعيدٍ قَال: انْطَلَقَ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا حَتَّى نَزَلُوا عَلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ فَاسْتَضَافُوهُمْ فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمْ فَلُدِغَ سَيِّدُ ذَلِكَ الْحَيِّ ، فَسَعَوا لَهُ بِكُلِّ شَيءٍ لا يَنْفَعُهُ شَيْءٌ ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ : لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلاءِ الرَّهْطَ الَّذِينَ نَزَلُوا، لَعَلَّهُمْ أَنْ يَكُونَ عِنْدَهُمْ بَعْضُ شَيْءٍ، فَأَتَوْهُمْ ، فَقَالُوا : يَأَيُّهَا الرَّهْطُ إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ وَسَعَيْنَا لَهُ بكُلِّ شَيْءٍ لا يَنْفَعُهُ ، فَهَلْ عِنْدَ اَحَدٍ مِنْكُمْ مِنْ شَيْءٍ ؟ قَالَ بَعْضُهُمْ : إِنِّي وَاللهِ لأَرْقِي ، وَلَكِنْ وَاللهِ لَقَدْ اسْتَضَفْنَاكُمْ ، فَلَمْ تُضَيِّفُونَا، فَمَا أَنَا بِرَاقٍ لَكُمْ ، حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلاً، فَصَالَحُوهُمْ عَلَى قَطِيعٍ مِنْ غَنَمٍ فَانْطَلَقَ يَتْفُلُ عَلَيْهِ وَيَقْرَأُ : (( اَلْحَمْدُ للّه رَبِّ الْعَالَمِينَ)) فَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ ، فَانْطَلَقَ يَمْشِي وَمَا بِهِ قَلَبَةٌ، قَالَ: فَأَوْفُوهُمْ جُعْلَهُمْ الَّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اقْتَسِمُوا ، فَقَالَ الَّذِي رُقِيَ : لاتَفْعَلُوا حَتَّى نَأْتِيَ النَّبِيَّ ﷺ فَنَذْكُرُ لَهُ الَّذِي كَانَ ، فَنَنْظُرَ الَّذِي يَأْمُرُنَا ، فَقَدِمُوا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذكَرُوا لَهُ ذَلِكَ ، فَقَالَ: ((وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ)) ثُمَّ قَالَ: ((قَدْ أَصَبْتُمْ اقْتَسِمُوا ، وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْماً وَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ) رواه الجماعة الا النسائي، وهذا لفظ البخاري وهو أتم احمد (٤٤,١٠/٣)، خ/٢٢٧٦) (م/٢٢٠١/٦٥) وابوداود (٣٩٠٠) والترمذي (٢٠٦٤) وابن ماجة (٢١٥٦).

لە باوکی سەعیدەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: چەند کەسێك لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێك لە سەفەرەکانیاندا چون، تا گەیشتنە دێهاتێك لە دێهاتەکانی عەرەب، داوای میوانداریان لێکردن، وەریان نەگرتن، جا لەوکاتەدا گەورەی ئەو دێیە شتێك پێوەیدا بو، هەرچی شت بو بۆیان هێنا سودی نەبو، لەبەرئەوە هەندێکیان وتیان:

ئای خۆزگە بچونایە لای ئەو تاقمە ڕێبوارە بەڵكو لەلای ئەوان شتێك هەبێ، جا چونە لایانو وتیان ئەی تاقمەكە! گەورەكەمان شتێك پێوەیداوە هەمو شتێكمان بۆ كردوە هیچ سودی نەبوە، ئایا لەلای ئێوە شتێك نیە؟ هەندێكیان وتیان: بەڕاستی من دوعا ئەكەم بەڵام بە خوا ئێمە داوای مێوانداریمان كرد لە ئێوە، ئێوە میوانداریتان نەكردین، منیش دوعا تان بۆ ناكەم هەتا ئێوە شتێكمان بۆ بڕیار نەدەن، ڕێككەوتن لەسەر پارچەیە مەڕ ــ كە سی سەر بون ــ جا ئەو مسوڵمانەیش ڕۆیو فوی كرد بەسەریاو (الحمد لله رب العالمين)ی خوێند بەسەریا، هەروەكو ئەوە لە پەت بەربو بێت هەستایەوەو ئەڕۆیشتو هیچ ئازارێكی پێوە نەما، وتی: ئەوەی بەڵێنتان پێداوە پێیان بدەن ــ ئەوانیش پێیاندان ــ هەندێكیان وتیان بەشی بكەن، ئەوەی كە دوعاكەی كردبو وتی: وا نەكەن هەتا نەچینەوە لای پێغەمبەرﷺو ئەوەی، كە بوو بۆی باس ئەكەین.

جا تەماشا كەین بزانین چ فرمانێكمان بەسەرا ئەدات، هاتنەوە خزمەتی پێغەمبەرﷺو ئەوەیان بۆ باسكرد، فەرموی: (چۆن زانیت كە ئەوە دوعایە؟) لە پاشان فەرموی ((پێكاوتانە، بەشی بكەنو، لەگەڵ خۆتان بەشێكیش بۆ من دانێن)) پێغەمبەرﷺ پێكەنی، واتە لەسەر زەحمەتی دوعا بۆ خەڵك، ئەتوانی پارە وەرگریت.

## دروستە بخوازرێتەوە شت

٥١٧-ن /٢٣٩٢((عَنْ اَنسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ فَزَعٌ بِالْمَدِينَةِ فَاسْتَعَارَ النَّبِيُّﷺ فرساً مِنْ اَبِي طَلْحَةَ يُقَالُ لَهُ: الْمَنْدُوبُ فَرِكَبَهُ فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ: (مَا رَأَيْنَا مِنْ شَيْءٍ وَاِنْ وَجَدْنَاهُ، لَبَحْراً) رواه الجماعة الا النسائي خ/ ٢٨٢٧,٢٨٢٠,٢٨٥٧,٢٨٦٢,٢٨٦٧,٢٨٦٨,٢٨٦٩,٦٢١٢)، م/٤٩ /٢٣٠٧, وابو داود ٤٩٨٨) والترمذي (١٦٨٥-١٦٨٦-١٦٨٧) (وابن ماجة ٢٧٧٢) واحمد (١٤٧/٣, ١٨٠ ,٢٧١ ,٢٧٤ ,٢٩١،١٨٥))).

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: نائارامییەك لە مەدینەدا

ڕویدا، لەبەرئەوە پێغەمبەرﷺ بە ئەمانەت داوای ئەسپێکی لـە ئـەبو تەلحـە کـرد کـە پێیان ئەوت (مەندوب)و سواری بو، کاتێ گەڕایەوە فەرموی: بەڕاستی هیـچمان نـەدی، وەکو دەریایە ــ ئەم ئەسپە ـ واتە دروستە شت بە ئەمانەت لە خەڵکی تر بخوازرێت.

٥١٨-ن /٢٣٩٤((عَنْ عَائِشة أَنَّهَا قَالَتْ ــ عليهادِرْعٌ قطْرِيٌّ ثَمَنَه خَمْسَةَ دَرَاهِمَ كَـانَ لِي مِنْهُنَّ دِرْعٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَمَا كَانَتِ امْرَأَةٌ تَقَـيَّنَ بِالْمدِينَـةِ اِلاّ اَرْسَـلَتْ اِلَـيَّ تَسْتَعِيرَهُ) رواه البخاري. خ/٢٦٢٨))).

لە دایکی باوەڕدارانەوە خـاتون عائیـشە رضي الله عنها هـاتوە، کـە وتویـەتی: - لەوکاتـەدا کراسێکی لە لۆکە دروستکراوی لەبەردا بو بایی پێنج درەم بو ــ من لـەناو خێزانـەکانی پێغەمبەردا ــ یان لەناو ئافرەتانی ئـەو سـەردەمەدا ــــ کراسـێکم هـەبو لەسـەردەمی پێغەمبەری خوادا هیچ ئافرەتێك نەبو، کە خۆی جوان بکردایە ــ بۆ گواستنەوە ــ لـە مەدینەدا مەگەر بیناردایە لامو ئەو کراسەی بە ئەمانەت لەلام ببـردایە. واتە ئەمڕۆ وا خەڵکی شتی زۆری هەیەو ئەم پۆشاکەی منیان ئێستە لەلا بێنرخە ئەوکاتە ئـاوا بـووە، ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە پۆشاك وەرگرتن بە ئەمانەت بۆ بوك نە عەیبەو نە خراپە.

# هەر کەسێ زەویـیەك زیندو بکاتەوە

٥١٩-ن /٢٣٩٦ ((عَنْ جَابِرٍ اَنَّ النَّبِيَّﷺ قَالَ: مَنْ أحيَا أَرْضاً مَيِّتَةً فَهِيَ لَـهُ)) رواه أحمد (٣/٣٥٦)و الترمذي ١٣٧٩ وصححه.

له جابیرەوەﷺ هاتوه، که پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێ زەوییەکی مردو، که هی کەس نەبێ زیندو بکاتەوە، ئەوە هی خۆیەتی. واتە بۆ کەس نیە لێی بسێنێتەوە.

٥٢٠- ن /٢٤٠٠((عَنْ اَبي هُريرة عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تَمْنَعُوا فَضْلَ اَلْمَاءِ لِتَمْنَعُوا بِه الْكَلأَ) رواه اجماعة الا ابا داود والنسائي/ احمد (٢/٢٤٤) خ/٢٣٥٣) م (١٥٦٦/٣٦) والترمذي (١٢٧٢) وابن ماجة (٢٤٧٨))).

له ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوه له پێغەمبەرەوەﷺ، که فەرمویەتی: رێگری مەکەن له ئاوی زیادە، که هۆیەوە لەوەڕی پێ نەکرێت. واتە نابێ ئاوی زیادەو لەوەڕ له کەس رێگری بکرێت.

٥٢١-ن /٢٤٠٩ ((عَنِ الصَّعْبْ بْنِ جَثَّامَةَ اَنَّ النَّبِيَّﷺ حَمَى النَّقِيعَ، وَقَالَ: (لاَ حِمَى الاّ لِلّه وَلِرَسُوله) رواه احمد ٤/٣٧، ٣٨، ٧١ وابو داود ٣٠٨٣، ٣٠٨٤ وللبخاري منه (٢٣٧٠): لاَ حِمَى اِلاّ لِلهِ وَلِرَسُولِهِ وَقَالَ: بلغَنَا اَنَّ النَّبِيَّﷺ حَمَى النَّقِيع وَانّ عُمَرَ حَمَى الشَرَفَ والرَّبْذَةَ)).

له سەعبی کوڕی جەسامەوەﷺ هاتوه، که پێغەمبەرﷺ پارێز گاری لەوەڕی (نەقیع)ی کردوە بۆ وشتری زەکات، فەرمویەتی: پارێزگاری له لەوەڕ بۆ کەسی تر نیە، مەگەر بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەیﷺ. له لای بوخاریش هاتوه هەر لەوەوە، که پارێزگاری نیە، مەگەر بۆ خواو پێغەمبەرەکەیﷺ، ئەڵێ پێمان گەیشتووە، که پێغەمبەرﷺ - نەقیع - که ناوچەیەکە له لای مەدینە ــــ ی پاراستووە عومەر ــــ شەرەفو رەبەزە - که دو جێگان پاراستونی بۆ لەوەڕی وشتری زەکاتو دەستکەوتەکان، تا دابەش دەکرێت.

# دابڕینی زەوی لە لایەن دەسەڵاتی شەرعیەوە بۆ ئەندامانی گەل

٥٢٢-ن /٢٤١٤((عَنْ اَسْمَاءِ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ فِي حَدِيثٍ ذَكَرَتْهُ، قَالَتْ: (كُنْتُ اَنْقُلُ النَّوىَ مِنْ اَرضْ الزُّبَيْرِ الَّتِي اَقْطَعَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى رَأْسِي وَهُوَ مِنيِّ عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ)) (ارجاه خ/٣١٥١،٥٢٢٤ م/٢١٨٢).

لە ئەسمای كچی ئەبوبەكرەوەرضي الله عنها لە قسەیەكدا، كە كردویەتی وتویەتی: مـن ناوكـە خورمام ـــ ناوكی خورما بۆ ناشتن ـــ لە زەوی زوبەیرەوە، كە پێغەمبەری خـواﷺ بـۆی دابڕیبو دەگوازستەوە ئەو دووبەش لە سێ بەشی، كە فرسەخێك لە منەوە دور بو.

## داگیـر كردن

٥٢٣-ن /٢٤٢٤((عَنْ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ عَنْ اَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لاَ يَأْخُذَنَّ اَحَدُكُمْ متاعَ اَخيهِ جاداً وَلاَ لاَعِباً واذا اَخذ احدكم عَصا اَخِيهِ فَلْيَرُدَّهَا عَلَيْهِ) رواه احمد (٢٢١/٤) وابو داود (٥٠٠٣) والترمذي(٢١٦٠) والبخاري في الادب المفرد برقم (٢٤١))).

لە سائیبی كوڕی یەزیدەوە لـە باوكیـەوە رضي الله عنه هـاتوە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خواﷺ فەرمویەتی: ((با هیچكام لە ئێوە كەلوپەلی برای خۆی نەبات، چ بە ڕاستیو چ بە گاڵتەوە، هەركاتێ یەكێك لە ئێوە عەسای براكەی برد، بابیگەڕێنێتەوە بۆی)). واتـە ماڵی كەس بۆ كەس حەڵاڵ نیە، مەگەر بەو ڕێگایانەی، كـە لـە شـەریعەتی ئیـسلامدا ڕێگای پێدراوە.

٥٢٤-ن /٢٤٢٧ ((عَنْ عَائِشَةَ اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَال: مَنْ ظَلَمَ شِبْراً مِنَ الأَرْضِ طَوَّقَهُ اللهُ مِنْ سَبْعِ اَرْضِينَ)) متفق عليه (خ/٢٤٥٣) (م/١٦١٢) احمد (٦/٢٥٢،٧٩)).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە رضي الله عنها هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەركەسێك بستێ زەوی بە ستەم لە كەسێك وەرگرێت، خوا هەتا حەوت قاتی زەوی ئەكات بە تەوق و ئەیكاتە ملیەوە ــ یان بەناو هەر حەوت قاتی زەویدا ئەیباتە خوارەوە ــ ڕیوایەتی هەردو هاتوەو ئەگونجێ سزای ئەو جۆرە كەسانە جیا جیا بێت یان بە هەردو شێوە سزا بدرێن. والله اعلم.

٥٢٥-ن /٢٤٣٥ ((عَنْ اَنَسٍ قَالَ: اَهْدَتْ بَعْضُ اَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اِلَيْهِ طَعَاماً فِي قَصْعَةَ فَضَرَبَتْ عَائِشَةُ الْقَصْعَةَ بِيَدِهَا فَأَلقَتْ مَا فِيهَا فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: طَعَامٌ بِطَعَامٍ وَاِنَاءٌ بِأَنَاءٍ) رواه الترمذي وصححه وهو بمعناه لسائر الجماعة الا مسلماً) احمد (٣/ ١٠٥)، خ/٥٢٢٥) وابو داود(٣٥٦٧) والترمذي (١٣٥٩) والنسائي (٧/٧٠) وابن ماجة (٢٣٣٤))).

لە ئەنەسەوە رضي الله عنه هاتوە، كە هەندێ لە خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ خواردنێكی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ لە قاپێكدا ــ لەوكاتەدا پێغەمبەر ﷺ لە لای عائیشە بو رضي الله عنها ــ عائیشە دەستێكیدا لە قاپەكەو ئەوەی كە تێیدا بو ڕژاوو ــ قاپەكەیش شكا ــ جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خواردنێك لە باتی خواردنەكەداو قاپێك لەباتی قاپەكەدا، واتە خواردنێكی وەكو ئەم خواردنەمان بۆ دروست بكەو قاپێكی ساقی وەكو ئەم قاپەی، كە شكاندت بیدەرەوە بەوەی، كە ئەم شیوەی بۆ ناردوین. درودی خوات لێبێ ئەی پێغەمبەری ئازیز بۆ ئەو دڵە گەورەو حەوسەڵەو خۆ گریتە.

٥٢٦-ن /٢٤٤١((عَنْ اَبِي هُرِيرة قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ، أَرَأَيْتَ اِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ اَخْذَ مَالِي قَالَ: (فَلاَ تُعْطِهِ مَالَكَ) قَالَ أَرَاَيْت اِنْ قَاتَلَني؟قَالَ: ((قَاتِلْهُ)) قَالَ: أَرَأَيْتَ اِنْ قَتَلنِي ؟ قَالَ :((فَأَنْتَ شَهِيدٌ)) قَالَ: أَرَأَيْتَ اِنْ قَتَلْتَهُ ؟ قَالَ : (( هُوَ فِي

النَّارِ))، قالَ :( رواه مسلم (٢٢٥/١٤٠) واحمد(٢/١٦٠) وفي لفظه، يا رسول الله ﷺ أَرَأَيْتَ اِنْ عَدَا عَلَى مَالِي؟ قَالَ (اَنْشد اللهَ) قَالَ فَإِنْ اَبْوا عَلَيَّ؟ قَالَ :((اَنْشِدِ اللهَ)) قال : فَإِنْ اَبْوا عَلَيَّ ؟ قَالَ : ((قَاتِلْ، فَإِنْ قُتِلْتَ فَفي الْجَنَّةِ وَاِنْ قَتَلْتَ فَفِي النَّارِ.)).

لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ووتی: تۆ بە لاتەوە چۆنە، ئەگەر کابرایەك هاتو ویستیماڵم ببات فەرمووی: (ماڵەکەتی نەدەیتێ)، وتی: ئەی پێت چۆنە ئەگەر شەڕی لەگەڵما کرد؟ فەرمووی (شەڕی لەگەڵدا بکە)، وتی: ئەی پێت چۆنە ئەگەر کوشتمی؟ فەرمووی (تۆ شەهیدیت)، وتی: ئەی پێت چۆنە ئەگەر کوشتم؟ فەرمووی (ئەو لەناو ئاگردایە)، لە وشەی لای ئیمامی ئەحمەددا هاتوە، کە: ئەی پێغەمبەر خوا ﷺ پێت چۆنە، ئەگەر کەسێ دەستدرێژی کردە سەر ماڵم؟ فەرمووی (داوای لێ بکە لەبەر خاتری خوا ئەو ئیشە نەکات)، وتی: ئەی ئەگەر گوێی پێنەدام؟ فەرمووی:( داوای لێ بکە لەبەر خاتری خوا ئەو ئیشە نەکات) وتی: ئەی ئەگەر گوێی پێ نەدام ؟ فەرمووی (شەڕی لەگەڵ بکە) جا ئەگەر تۆ کوژرایت، ئەوە تۆ لە بەهەشتدایتو، ئەگەر تۆ ئەوت کوشت، لە ناو ئاگردایە، لێرەوە ئەوە دەردەکەوێت، کە بەربەرەکانی پەلامادەر پێویستە، چاك وایە پێشەکی لە ئاسانەکانەوە دەست پێ بکات.

٥٢٧- ن /٢٤٤٣((عَنْ سَعيد بْنِ زَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ وَمَنْ قُتِلَ دُونَ اَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ) رواه الخمسة وصححه الترمذي, احمد (١/١٨٧) وابو داود (٢٧٧٢) والترمذي (١٤٢١) والنسائي (٧/١١٥,١١٦) وابن ماجة (٢٥٨٠))).

لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی گوێبیستی لە پێغەمبەر بوم ﷺ، کە ئەیفەرمو: هەرکەسێ لەسەر ئایینی بکوژرێ شەهیدە، هەرکەسێ لەسەر پاراستنی گیانی بکوژرێ شەهیدە، هەرکەسێك بکوژرێت لەسەر ماڵی شەهیدە، هەر کەسێك لەسەر خاوخێزانی بکوژرێت شەهیدە، و لله الحمد والمنة.

**تێبینی:** ئەم پاراستنە لەسەر گیانی خۆی پێویست نیە لەسەری، بەڵام لەسەر پاراستنی خاوخێزانیو هەر ستەم لێكراوێكی تر، مادام توانای هەبێ پێویستە لەسەری.[1]

٥٢٨- ن /٢٤٤٨ (((عَنْ اَنَسٍ عَنْ اَبِي طَلْحَةَ اَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ ، اِنِّي إشْتَرَيْتُ خَمْراً لأَيْتَامٍ فِي حِجْرِي؟ فَقَالَ (اَهْرِقْ الْخَمْرَ وَاكْسِرْ الدِّنَانَ) رواه احمد (٣/١١٩,١٨٠,٢٦٠) وابوداود (٣٦٧٥) والترمذي وصله عن مسلم (١١/١٩٨٣))).

له ئەنەسەوەﷺ لە ئەبو تەلحەوەﷺ هاتوە، كە ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺمن هەندێ عەرەقم كڕیوە بۆ ئەو هەتیوانەی، كە بەخێویان ئەكەم؟ فەرموی: ئەو عەرەقە بڕژێنەو گۆزەكەیش بشكێنە. واتە شتی حەرام، نابێ بە موڵكو لەناوبردنی تۆڵەی نیە.

٥٢٩-ن /٢٤٥١((عَنْ جَابِرٍ اَنَّ النَّبِيَّﷺ قَضَى بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ فَاذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ وَصُرِفَتِ الطُّرُقُ فَلاَ شُفْعَةَ)). أحمد (٣/ ٢٩٦) والبخاري (٢٢٥٧) وعند غيرهما بالفاظٍ مختلفة. رواه الجماعة الا مسلماً والنسائي، ابوداود (٣٥١٤) والترمذي (١٣٧٠) وابن ماجة (٢٤٩٩).

له جابیرەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ بڕیاری هاوجوتی (الشفعة) داوە لە هەر شتێكدا، كە بەش نەكرابێت، جا هەركاتێ جیا كرایەوەو سنوریان دیاریكراو ڕێگای چونە ناویان گۆڕا، ئیتر مافی هاوجوتی نامێنێ. واتە ئەگەر دو كەس یان زیاتر لە شتێكدا هاوبەش بون لە پاشا یەكێك، یان زیاتر لەوان بەشی خۆی فرۆشت مادام بەش نەكرابێ، ئەوانی تر مافیان هەیە بەو نرخەی، كە فرۆشراوە ئەو بەشە هەڵگرنەوە، نابێ بە بێ پرسی ئەوان بیفرۆشێت، مادام بەش نەكرابێت، بەڵام وەختێ بەشكراو سنوری

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٢٤٤٤، ٢٤٤٥، ٢٤٤٦، ٢٤٤٧)، لە نیل الاوطار، بكە.

بەشەکان دیاری کرا، ئیتر هەر کامیان بۆیان نیە بڵێن ئێمە هەڵیئەگرینەوە، بەڵام باش وایە پرسیان پێ بکات لەبەر فەرمودەی بەردەم.

٥٣٠-ن /٢٤٥٥ ((عَنْ سَمُرَةَ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (جَارُ الدَّارِ اَحَقَّ بِالدَّار مِنْ غَيْرِهِ) رواه احمد (١٢,٨/٥) وابوداود (٣٥١٧) والترمذي (١٣٦٨) وصححه)).

لە سەمورەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: دراوسێی خانوو شایستەترە بەو خانووە، بێجگە لەو ئەگەر دوو شتی جیا لە یەکن و سنوریان دیارییەو ڕێگاشیان جیاوازە، بەڵام هێشتا مافی هاوسێیەتی ئەمێنێ و چاك وایە پێشەکی لەو کڕین و فرۆشتنەی ئەو خانوە ئاگادار بکرێت، جا ئەگەر ویستی، با بەو بیفرۆشێت ئەوە چاکترە.

## هەڵگرتنی شتی کەم نرخ و سەرف کردن، یان خواردنی بە تاوان ناژمێردرێت.

٥٣١- ن /٢٤٦٠ ((عَنْ اَنَس اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِتَمْرَةٍ فِي الطَّرِيقِ فَقَالَ: (لَوْلاَ اَنّي اَخاف اَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لأَكَلْتُهَا) متفق عليه. خ (٢٤٣١) م(١٠٧١/١٦٥) وابوداود (١٦٥١) واحمد٣/١٩٣,١٨٤,٢٥٨)).

لە ئەنەسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە بە ڕاستی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگادا دای بەلای دەنکە خورمایەکدا فەرموی: ئەگەر نەترسامایە کە ئەو خورما هی زەکاتەو — کەوتوە — ئەم خوارد.

## باسی شتە گومبوەکان

٥٣٢-ن /٢٤٦٢((عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: (لاَ يَأْوِي الضَّالَّةِ اِلاَّ ضَالٌ مَا لَمْ يَعْرِّفْهَا) رواه احمد (١١٧/٤) ومسلم (١٧٢٥/١٢))).

لە زەیدی کوڕی خالیدەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: گومبویەك هەڵناگرێتەوە، مەگەر گومڕاهێك مادام باسی نەکات و جاڕی بۆ نەدات.

**٥٣٣**-ن /٢٤٦٣ ((عَنْهُ قَالَ سُئِلَ رَسُولُ اللهِﷺ عَنِ اللُّقَطَةِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ؟ فَقَالَ: اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا ثُمَّ عرفْهَا سَنَةً فَإنْ لَمْ تَعُرْفْ فاسْتَنْفِقهْا وَلْتَكُنْ وَدِيعَةً عِنْدَكَ فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا يَوْماً مِنَ الدَّهْرِ فَادِّهَا إلَيْه وَسَأَلَهُ عَنْ ضَالَّةِ الأبِلِ؟ فَقالَ :(مَالَكَ وَلَهَا ؟ دَعْهَا فَإِنَّ مَعَهَا حِذاءَهَا وَسِقَاءَهَا، تَرِدُ الْمَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ حَتَّى يَجِدَهَا رَبُّهَا وَسَأَلَهُ عَنْ الشَّاةِ؟ فَقَالَ: (خُذْهَا فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ اَو لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ) رواه الجماعة الا النسائي خ/٢٤٢٩) م (١٣٤٦/٣))).

هەر لەوەوەﷺ هاتوە، كە پرسیار لە پێغەمبەری خوا كراﷺ لەبارەی هەڵگرتنەوەی زێڕو زیو - پارەی سەردەم- فەرموی: (با ئەو شتەی كە تێیدایەو قەپاچەكەی بناسێت، پاشان تا ساڵێك ناونیشانی بكات لە جێگا گشتییەكان، وەكو قاپی مزگەوتو جێگای كۆبونەوەی خەڵك ــ پێشەكی بەیانیانو ئێواران، پاشان ڕۆژی جارێك، پاشان حەفتەی جارێك ــ جا ئەگەر نەناسراوە خەرجی بكە ئەوە ئەمانەتێكە لەلات هەتا ماوی، ئەگەر خاوەنی پەیدا بو هاتە لات بیدەرەوە)، لەبارەی وشتری گومبوەوە پرسیاری لێكرد؟

فەرموی: "تۆ چیت داوە لەو"وازی لێبێنە بە ڕاستی پێڵاوەكەیو كونەی ئاوەكەی لەگەڵ ئەودایە ، واتە پێویستی بە هێنانەوە ناكاتو وازی لێبهێنە -چونكە ئەو ئەچێتە سەر ئاوو، گژو گیاو درەخت ئەخوات، هەتا خاوەنەكەی ئەیدۆزێتەوە، لەبارەی مەڕی گومبویماڵەوە پرسیاری لێكرد؟

فەرموی: لای خۆت هەڵیگرە ، چونكە ئەو یان هی تۆیە، یان هی براكەتە - خاوەنەكەی - یان هی گورگە، واتە گورگ ئەیخوات. لەم دوو فەرمودەدا پێناسەی هەڵگری گومبووە جۆری گومبوەكانی بۆ باس كردین.

**تێبینی:** ئەو شتە گومبوانەی، كە خراپ ئەبن وەكو میوەو گۆشتو سەوزە هەڵئەگیرێنو ئەخورێنو نرخەكەی بۆ خاوەنەكەی دائەنرێت.

# باسی بەخشین و سەوقات

٥٣٤-ن /٢٤٦٦((عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ( لَوْ دُعِيتُ اِلَى ذِرَاعٍ لأَجَبْتُ وَلَوُ أُهْدِيَ اِلَيَّ ذِرَاعٌ اَوْ كُرَاعٌ لَقَبِلْتُ) رواه البخاري (٥١٧٨))).

له ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوە، له پێغەمبەرەوە ﷺ، كه دەفەرموێت: ئەگەر دەعوەت بكرێم بۆ خواردنی سەری قاچێكی حەیوان، یان دەستێك دەچم. واته به كەمی نازانم، وه ئەگەر به سەوقاتی دەستێ، یان سەری قاچێكی حەیوانم بۆ ڕەوانه بكرێت وەری ئـەگرم. واته نابێ شتی كەم به بێنرخو بـێ ڕێـز تەماشـا بكرێـت، لـه ڕاسـتیدا ئـەو بەخـشینو سەخاوەتی یه، بەڵگەی خۆشەویستیو سۆزه، بۆیه نابێ بەكەم سەیر بكرێت. والله اعلم.

٥٣٥-ن/٢٤٧٥ ((عَنْ اَسْمَاءَ بِنْتِ اَبي بَكْـرٍ، قَالَـتْ: اَتَـتَني أُمِّـي رَاغِبَـةً فِـي عَهْـدِ قُرَيْشٍ وَهِيَ مُشْـرِكَةٌ فسألتُ النَّبِـيِّ ﷺ اصلها ؟ قال: ((نعـم )) متفـق عليـه)) احــمد (٦/٣٤٤,٣٤٧,٣٣٥) م(٢/٦٩٦) خ(٥٩٧٩) وابو داود (١٦٦٨)(وزاد: قـال ابـن عُينـة فأنزل الله فِيهَا((لا يَنْهَاكُمُ اللهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَـاتِلُوكُمْ فِـي الـدِّينِ)) الممتحنـة /٨ وَمَعْنَـى رَاغِبَةً، اَيْ طَامِعَةً تَسْأَلُنِي شَيْئاً).

له خاتون ئەسمای كچی ئەبوبەكرەوە رضي الله عنها هاتوە، كه وتویەتی: دایكـم لـه سـەردەمی پەیمانی قوڕەیشدا هاته لام، كه ئەو بت پەرست بـو، لەبەرئـەوە پرسـیارم لـه پێغەمبـەر كرد ﷺ ئایا پەیوەندیم لەگەڵی هەبێ؟

فەرموی: بەڵێ. له ریوایەتی ئیمامی بوخاریدا هاتوه، كه: كوڕی عویەینـه وتویـەتی لەمبارەوە ئەم ئایەته دابەزی (خوا بەرگریتان ناكات — له پەیوەندیتان بـەو كافرانـەی — كه شەڕیان لەگەڵتان نەكردووه لەبارەی ئایینتانەوه) وشەی راغبه: واته بەتـەمابو داوای شتم لـێ بكات.

٥٣٦-ن/٢٤٧٨ ((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا)). رواه احمد (٦/٩٠) والبخاري (٢٥٨٥) وابوداود (٣٥٣٦) والترمذي (١٩٥٣) في الشمائل)).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە رضي الله عنها هاتوە، كە وتویەتی: (پێغەمبەر ﷺ دیاری وەرگرتوەو پاداشتی داوەتەوە. واتە پاداشت دانەوەی دیاری سوننەتە).

(٥٣٧/ن /٢٤٨٢) ((عَنْ نُعمانِ بْنِ بَشِيرٍ اَنَّ اَبَاهُ اَتَى بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: اِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلاَماً كَانَ لِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (اَكُلُّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ مِثْلَ هَذَا؟) فَقَالَ: لاَ. فَقَالَ: (فَارْجِعْهُ) رواه الجماعة الا ابداود) خ(٢٥٨٦)م (٩/١٦٢٣) احمد (٤/٢٨٦) والترمذي (١٣٦٧) والنسائي (٦/٢٥٨،٢٥٩) وَلَفْظُ مُسْلِمٍ: قَالَ: تَصَدَّقَ عَلَيَّ اَبِي بِبَعْضِ مَالِهِ فَقَالَتْ أُمِّي عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لا أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَانْطَلَقَ اَبِي اِلَيْهِ يُشْهِدُهُ عَلَى صَدَقَتِي ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((اَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ ؟)) قَالَ : لا ، فَقَالَ : ((اتَّقُوا اللهَ وَاعْدِلُوا فِي اَوْلادِكُمْ)) فَرَجَعَ اَبِي فِي تِلْكَ الصَّدَقَةِ ، وَلِلْبُخَارِيّ مِثْلُهُ، لكِنْ ذَكَرَهُ بِلَفْظِ العَطِّيةِ لا بِلَفْظِ الصَّدَقَةِ)).

لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە هاتوە، باوكی بردویەتیە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتویەتی: من ئەو خزمەتكارەم — بەندەی بوە — بەخشیوە بەم كوڕەم؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئایا بە هەمو منالێكت شتیوات بەخشیوە؟

وتی: نەخێر.

فەرموی: (بیگەڕێنەوە).

لە بێژەی ئیمامی موسلیمدا هاتوە، كە وتویەتی: باوكم هەندێ ماڵی بە چاكە بە من دا، جا دایكم (عەمرەی كچی ڕەواحە) وتی من ڕازی نیم، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ بە شایەت نەگریت، لەبەرئەوە باوكم بردمیە لای بۆ ئەوەی، شایەتی بدات لەسەر ئەو چاكەی، كە بەمن درا بو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەمەت كردوە لەگەڵ هەمو منالەكانتدا؟

وتی: نەخێر.

فەرموی: لە خوا بترسەو لە نێوان مناڵەکانتدا دادپەروەربە.

لەبەرئەوە باوکم لەو چاکەیە پەشیمان بویەوە. لە لای ئیمامی بوخاریش بەم شێوە هەیە، بەڵام لەباتی (چاکە- الصدقة) بەخشینی وتوە (الهدية).

٥٣٨- ن /٢٤٨٤ ((عن طاوس ابن عُمْر وَابن عباس, رَفَعَاهُ اِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لاَ يَحلُّ لِلرَّجُلِ اَنْ يُعْطِيَ الْعَطِيَّةَ فَيَرْجِعَ فِيهَا اِلاَّ الوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ وَمَثَلُ الرَّجُلِ يُعْطِي الْعِطيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا كَمَثَلِ الْكَلْبِ اَكَلَ حَتَّى اِذَا شَبِعَ قَاءَ ثُمَّ رَجَعَ فِي قَيْئِهِ) رواه الخمسة وصححه الترمذي, احمد (٢/٢٧) وابوداود (٣٥٣٨) والترمذي (٢١٣٢) والنسائي (٦/٢٦٧) وابن ماجة (٢٣٧٧))).

لە تاووسەوە رحمه الله هاتوە، کە عەبدوڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵای کوڕی عەباس، گەیاندوویانەتە پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: ڕەوا نیە بۆ هیچ کەسێك کە شتێ ببەخشێتو لە پاشدا لێی پەشیمان ببێتەوە ــ پاش وەرگرتن ــ بێجگە لە بەخشینی باوك لەوەی، کە ئەیدات بە ڕۆڵەکانی، وێنەی ئەو کەسەی، کە شتێك ئەبەخشێتو لە پاشدا پەشیمان دەبێتەوەز وەری ئەگرێتەوە، وەکو سەگێك وایە، کە بخوات، هەتا تێر ئەخوات، ئینجا ئەرشێتەوە، لە پاشدا ڕشانەوەکەی خۆی بخوات.

٥٣٩-ن /٢٤٨٦ (((عَنْ جَابِرٍ، اَنَّ رَجُلاً قَالَ: يارَسُولُ اللهِ ﷺ اِنَّ لِي مَالاً وَوَلَداً وَاِنَّ اَبِي يُرِيدُ اَنْ يَجْتَاحَ مَالِي؟! فَقَالَ: اَنْتَ وَمَالُكَ لأَبِيكَ) رواه ابن ماجة (٢٢٩١).

لە جابیرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ماڵو منالم هەیەو، باوکم ئەیەوێ هەمو ماڵەکەم ببات؟! فەرموی خۆتو ماڵەکەشت هی باوکتە، واتە ئەتوانێ بیبات.

٥٤٠- ن /٢٤٨٩ (((عَنْ زَيدِ بنْ ثَابتٍ قَالَ :قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ اَعْمَرَ عَمْرىَ فِهِي لُعمَّرِهِ مَحْيَاهُ وَمَمَاتُهُ ولاتُرْقِبُوا فَمَنْ اَرْقَبَ شَيْئاً فَهُو سَبِيل الْمِيرَاثِ) رواه الخمسة الاّ

الترمذي. احمد (١٨٩/٥) وابوداود (٣٥٥٩) والنسائي (٢٧٢/٦) وابن ماجة (٢٣٨١))).

له زەیدی کوڕی سابیتەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێ ماڵێکی بەخشی بە کابرایەك، تا ماوە. واتە وتی: ئەو ماڵە بۆ تۆ تائەوماوەیە، لە پاشدا بێتەوە بۆ خۆم، ئەوە پێی بەخشراوە، لە ژیانیشداو پاش مردنیشی. واتە بۆ واریسەکانی ئەو ئەبن. ماڵ نەبەخشن بە چاوەڕوانی مردن، واتە کابرا بە کەسێکی تر بڵێ ئەو ماڵەم بۆ تۆ، ئەگەر پێش تۆ مردم، بۆخۆم بێ ئەگەر پاش تۆ مردم، هەر کەسێك ئاوەهای کرد، ئەویش پێ بەخشراو ئەبێو، بەرەو میرات گرانی ئەو ئەچێت، واتە ناگەڕێتەوە بۆ بەخشندە.واتە ئەو ئیشە مەکەن، وە ئەگەر واتان کرد ئەوە ئەبێ، ئا بەو شێوە بێتو ناگەڕێتەوە بۆ کابرای بەخشندە.

## دەستکاری ئافرەت لە ماڵی مێردیدا

٥٤١-ن /٢٤٩٤ (((عَنْ عَائشَـةَ رضي الله عنها قَالَـتْ: قَالَ : رَسُـولُ اللهﷺ: اذَا اَنْفَقَتِ الْمَرْاَةُ مِنْ طَعَامِ زَوْجِهَا غَيْرَ مُفسدَةٍ كَانَ لَهَا اَجْرُهَا بِمَا اَنْفَقَـتْ وِلزَوْجِهَا اَجْرَهُ بِمَا كَسَبَ وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ لاَيَنْقُصُ بَعْضُهُمْ مِنْ اَجْرِ بَعْضٍ شَيْئاً) رواه الجماعة خ(٢٠٦٥) م(١٢٠٣/٧٩) احمد (٤٤/٦، ٢٧٨، ١٤٢، ١٤١، ١٣٩) وابوداود (١٦٨٥) والترمذي (٢٧٢، ٦٧١) والنسائي (٦٥/٥) وابن ماجة (٢٢٩٤))).

لە دایکی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە‌ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێ ئافرەت لە خواردنی مێردەکەی بەخشیو، مەبەستی زیان لێدانی مێردەکەی نەبو، ئەوە پاداشتی بەخشینەکەی پێ ئەدرێتو، مێردەکەشی پاداشتی وەدەستهێنانی هەیەو خەزێنەداریش هەر ئاوایە، هیچکامیان پاداشتی هیچکامیان کەم ناکەنەوە، بەڵێ هەرکاتێ ئافرەت مێردەکەی ماوەی پێدا، یان شتێکی کەم بو وای ئەزانی کە مێردەکەی بەوە نارازی نیە پاداشی تەواو وەرئەگرێت، بەڵام

ئه‌گـه‌ر مێرده‌كـه‌ی مـاوه‌ی پێنـه‌دابوو شـته‌كه‌یش زۆر گـرنگ بـوو ئه‌مـه بـۆی نیـه بیبه‌خشێت‌و، ئه‌و فه‌رمودانه‌ی، كه ماوه‌ی نه‌داوه به به‌خشینی ئافره‌ت له ماڵی مێردی، وه‌به‌ر ئه‌م به‌شه ئه‌كه‌وێت، ئه‌گه‌ر مێرده‌كه‌ی خواردن‌و شته‌كه به‌وی دابو، به‌ڵام ئـه‌و بـه بـێ ئیجـازه‌ی مێـردی به‌خـشی، لێـره‌دا نیـوه چـاكه‌ی بـۆ ئه‌نوسـرێت، واتـه پاداشـی به‌خشینه‌كه‌ی هه‌یه، نه‌ك شته به‌خشراوه‌كه. جا ئه‌م فه‌رموده‌و ئه‌و فه‌رموده ڕاسته‌ی، كه ئه‌ڵێ نیوه چاكه‌ی بۆ هه‌یه، بۆ ئه‌و به‌شه‌یه، ته‌نانه‌ت ئافره‌تی هه‌ڵه خه‌رج بـۆی نیـه لـه ماڵی تایبه‌تی خۆیدا خه‌رج بكات به بێ ئیجازه‌ی مێردی به‌ڵام ئه‌گه‌ر لێزان بـو ژیـر بـو ئه‌وه له ماڵی تایبه‌تی خۆیـدا ئـه‌توانێ خـه‌رج بكـات‌و ئه‌مانـه هـه‌مویان فـه‌رموده‌یان له‌سه‌ره[1].وه به‌نده‌یش(العبد) له ماڵی گه‌وره‌كه‌یدا هه‌روه‌كو ئافره‌ت وایه. والله اعلم.

---

(١) ته‌ماشای فه‌رموده‌ی ژماره (٢٤٩٥ تا ٢٥٠٠) له سه‌رچاوه‌ی پێشو، بكه .

# باسـی گـیردان ( الوقف )

٥٤٢-ن /٢٥٠٥ (((عَنْ ابْنِ عُمَرَ اَنَّ عُمَرَ اَصَابَ اَرْضاً مِنْ اَرْضِ خَيْبَـرَ فَقَـالَ يَارَسُـولَ اللّهِﷺ اَصَبْتُ اَرَضاً بِخَيْبَرَ لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ اَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ فَمَا تَـأْمُرُنِي ؟ فَقَـالَ:ﷺ :(اِنْ شِئْتَ حَبَّسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا)) فَتَصَدَّقَ بِهَـا عُمَـرُ عَلَـى الاّتْبَـاعَ وَلاَ تُوهَـبَ وَلاَ تُورَثَ فِي الفُقَرَاءِ وذوِي الْقُرْبى وَالرِّقَابِ وَالضَّيْفِ وَابْنِ السَّبِيلِ ، لاَجُنَاحَ عَلَى مَـنْ وَلِيَهَـا أَنْ يَأْكُـلَ مِنْهَـا بِـالْمَعرُوْفِ وَيُطْعِـمَ ، غَيْـرِ مُتَمَـوِّلٍ) رواه الجماعـة احمـد (١٢٥/٥٥/٢) خ (٢٧٣٧) م(١٦٣٢/١٥،١٦٣٣))).

له عەبدولاّی كوڕی عومەرەوەﷺ هاتوه، كه عومــەر ـــ بـاوكی ـــ لـه خەیبـەردا زەوییەكی بۆ بوەو وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ له خەیبەردا زەوییەكەم بـۆ بـووە، كه هەرگیز ماڵی ئەوەندە به نرخم نەبوە، جـا فـەرمانی چـیم پـێ دەكـەیت؟ پێغەمبـەر فەرموی: ئەگـەر پێـت خۆشـه ڕاگـیری بكـه (الوقـف)وە بەروبومەكـەی ببەخـشە، جـا عومەریش كردی به چاكه لەسەر ئەو بناغەیـە، كـه نـه بیفرۆشـرێتو، نـه بـه خـەلاّت بدرێتو، نه به ئیرس بڕوات، ئەو زەویـەی بـۆ فـەقیرانو خزمـانیو ئـازادكردنی بەنـدەو میوانو ڕێبوار، هیچ تاوانێك لەسەر ئەو كەسەنیه، كه سەرپەرشتی ئەكات، بـه گـوێرەی باوی خەڵك لێی بخواتو بیدات به ماڵو منالّیو بـه میـوان، بـەو مەرجـەی هیـچی لێ هەڵنەگرێتو بیكات به ماڵی خۆی.

٥٤٣- ن /٢٥٠٨ (((عَنْ اَبِي هُرَيرَة قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللّهِﷺ: مَـنْ اَحْتَـبَسَ فَرَسـاً فِـي سَبِيلِ اللهِ اِيمَاناً وَاحْتِسَاباً فَاِنَّ شَبِعَهُ وَرَوْثَهُ وَبَوْلُهُ فِـي مِيزَانِـهِ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ حَسَنَاتٌ) رواه احمد (٣٧٤/٢) والبخاري (٢٨٥٣) والنسائي (٢٢٥/٦)))

لــه ئــەبوهورەیرەوەﷺ هــاتوه، كــه وتویــەتی: پێغەمبــەری خــواﷺ فەرمویــەتی: هەركەسێك ئەسپێك بەخێو بكات بۆ ئەوەی غەزای پـێ بكرێـتو، بـاوەڕی بـەوە ببـێو چاوەڕێی پاداش بكات، ئەوە تێربونیو تەرسو میـزی لـه كێـشانەی كـابرادا، لـه ڕۆژی

قیامەتا بە چاكەو خێر دائەنرێت.

٥٤٤-ن /٢٥١٠ ((عَنْ اَنسٍ اَنَّ اَبَا طَلْحَةَ قَالَ يارَسُولُ الله اِنَّ اللهَ يَقُولُ: ((لَن تَنَالُوا آلبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ...)) (آل عمران-٩٢) وانَّ اَحَبَّ اَمْوالي بَيْرَحَاءُ وَاَنَّهَا صَدَقَةٌ لِلّه، اَرْجُو بِرَّهَا وَ ذخْرَهَا عِنْدَ الله فَضَعْها يَارَسُولَ الله حَيْثُ اَراكَ اللهُ. فَقَالَ: ((بَخ بَخْ ذَلِكَ مَالٌ رابِحٌ (مَرَّتَينِ) وَقَدْ سَمِعْتُ (مَاقُلْتَ فِيهَا) اَرَى اَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأقْربينَ)) فَقَالَ اَبُو طَلْحَةَ: اَفْعَلُ يَارَسُولُ الله فَقَسَمَهَا اَبُو طَلْحَةَ فِي اَقَارِبِه وَبَنِي عَمِّه. مُتَّفَقٌ عَلَيْه) خ/١٤٦١) م/ ٤٣/٩٩٨) وفي رواية لَمَّا نَزَلَتْ هَذه الآيَةُ ((لَن تَنَالُوا آلبِرَّ)) قَالَ اَبُو طَلْحَةَ: يَارَسُولُ الله ، اَرَىَ رَبّنا يَسْأَلُنا مِن اَمْوالِنَا فأُشْهِدُكَ أَنّي جَعَلْتُ اَرْضِي بَيْرَحَاءَ لِلّهِ ((فَقَالَ: اجْعَلْهَا فِي قَرابَتِكَ)) قَالَ: فَجَعَلَهَا فِي حَسَّانِ بْنِ ثابِتٍ وَاُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رواه احمد (١٤١/٣) ومسلم.

لە ئەنەسەوەﷺ هاتوە كە باوكی تەلحەﷺوتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ خوا ئەفەرموێت: (ناگەن بە چاكە، هەتا نەبەخشن لەوەی، كە خۆشتان ئەویٚ) آل عیمران٩٢، بەڕاستی خۆشەویسترینی ماڵم لە دڵی خۆمدا (بەیرەحایە) ـــ ناوی جێگایەك بو ـــ ئەوە چاكەو سەدەقە بیٚ بۆ خوا، چاوەڕوانی چاكەكەیو پاداشتی لە خوا ئەكەم، جا تۆیش ئەی پێغەمبەری خواﷺ چۆن خوا پێی خۆشە ئاوەهای لێبكە؟

فەرموی: بەهـ، بەهـ، ئەوە ماڵێكی سوود دەرە (دووجار ئەمەی فەرموو) بیستم (ئەوەی لەوبارەوە وتت) من وای بەچاك ئەزانم، كە لەناو خزمەكانتا دایبنێیت ، جا باوكی تەلحەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وا ئەكەم باوكی تەلحە ماڵەكەی لە نێوان خزمەكانی كوڕانی مامیدا بەخشی.. لە ریوایەتێكی تردا هاتوە، كە لەكاتێكدا، كە ئەم ئایەتە ((لَن تَنَالُوا آلبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا...)) هاتە خوارەوە باوكی تەلحە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: من ئەبینم پەروەردگارمان داوای ماڵمان لیٚ ئەكات، جا من تۆ بەشایەت ئەگرم، كە زەوی (بەیرەحا)م دا بە خوا، فەرموی: بیدە بە خزمەكانت، ئەویش دای بە حەسسانی كوڕی سابیتو ئوبەیەی كوڕی كەعب، كە خزمی بوون.

## بەستنەوە بەناو منداڵەوە منداڵی منداڵیش ئەگرێتەوە

٥٤٥-ن /٢٥١٦ ((قَالَ الْبَرَّاءُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: اَنَا النَّبِيُّ لاكَذِبِ اَنَا ابْنُ عَبْدِالْمُطَّلِبْ) (وهو فى حديث متفق عليه) احمد (٢٨١/٤) خ/٢٨٦٤) م/١٧٧٦) والترمذي (١٦٨٨).

بەراء وتی: لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە، کە فەرمویەتی (من پێغەمبەرم بێ درۆ، من کوڕی عەبدولموتەلیبم). جا ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ، کە ئەولادی ئەولاد، وەکو ئەولادی خۆی وایە، پێغەمبەرمان کوڕی عەبدولڵایە، عبدولڵا کوڕی عەبدولموتەلیبە.

## زیادەی سامانی کەعبە چی لێبکرێت

٥٤٦- ن/٢٥١٩ ((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لَوْلاَ اَنَّ قَوْمَكِ حَديثُو عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ (اَوْ قَالَ: بِكُفْرٍ) لاَنْفَقْتُ كَنْزَ الْكَعْبَةِ فِي سَبِيلِ اللهِ وَجَعَلْتُ بَابَهَا بِالأَرْضِ وَلاَ دْخَلْتُ فِيهَا مِنَ الْحِجْرِ) رواه مسلم. خ (٤٤٨٤) م(١٣٣٣/٣٩٩) والنسائي (٢١٥/٥،٢١٤)).

لە دایکی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی گوێبیستی پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەیفەرمو: ئەگەر گەلەکەت نزیك نەبونایە لە نەفامیەوە (یان فەرموی لە کوفرەوە) هەرچی لەناو کەعبەدا هەیە هەموم ئەبەخشی لە ڕێگای خواداو دەرگاکەی -کە ئێستا بەرزە- لەگەڵ زەویدا تەختم دەکردو ئەو بەشەی حیجریشم ئەخستە سەر کەعبەوەو گەورەترم ئەکرد -چونکە کاتی خۆی ئەویش هەر لەسەر کەعبە بووە، بەڵام لەبەر کەم دەستی قوڕەیش کاتی دروستکردنەوەی لێیان کەم کردۆتەوە، واتە هەندێ جار واز لە ئیشی دروستو ڕاست ئەهێنرێ لەبەر پەیدانەبوونی کێشەو دەردەسەری گەورەتر وەکو بناغە فیقهیەکە ئەڵێ (يُتَحَمَّلُ اَخَفَّ الضَرَرَيْنِ - سوکترینی دو زیانەکان وەرئەگیرێت).

# ئامۆژگاری بۆ پاش مەرگ ( الوصية )

٥٤٧- ن /٢٥٢٠ ((عَنْ ابْنِ عُمَرَ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: (مَا حَقُّ امْرِيءٍ مُسْلِمٍ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ شَيْءٌ يُرِيدُ اَنْ يُوصِيَ فِيهِ اِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَ رَأْسِهِ) رواه الجماعة (خ/٢٧٣٨) (م/١ــ٣/ ١٦٢٧) احمد (٢/١٠، ٥٠، ٥٧، ٨٠) وابوداود (٢٨٦٢) والترمذي (٢١١٨) والنسائي (٦/٢٣٨، ٢٣٩) وابن ماجة (٢٧٠٢))).

له عەبدولاّی کوڕی عومەرەوەﷺ هاتوه، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ڕەوا نیە بۆ هیچ مرۆڤێکی موسلّمان، کە شتێکی هەبێ وەسیەتی تێدا بکاتو دوو شەوی بەسەردا هاتبێ، مەگەر وەسیەتەکەی نووسرابێو لەلای سەریدا بێ، لێرە ئەمە ئەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی، کە خەتی ناسراو بەڵگەیەو شتی پێ سابت ئەبێت.

٥٤٨-ن /٢٥٢٣ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَوْ اَنَّ النَّاسَ غَضُّوا مِنَ الثُّلُثِ اِلَى الرُّبعِ فَأَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ)) اخرجاه (خ/ ٢٧٤٣) م (١٠/١٦٢٩).

له عەبدولاّی کوڕی عەباسەوەﷺ هاتوه، کە وتویەتی: ئای خەڵك لە وەسیەتکردندا سێیەکەوە ئەچون بۆ چوار یەك، واتە چواریەکی پێ باش بووە، لەبەرئەوەی، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: سێیەك، سێیەکیش زۆریشە.

٥٤٩-ن /٢٥٢٧ ((عَنْ اَبِي اُمَامَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّﷺ يَقُولُ: اِنَّ اللهَ قَدْ اَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ)) رواه الخمسة الا النسائي. (٥/ ٢٧٦) وابوداود(٢٨٧٠) والترمذي (٢١٢٠) وابن ماجة (٢٧١٣).

لە باوکی ئومامەوەﷺ هاتوه، کە وتویەتی گوێبیستی پێغەمبەر بوم ﷺ ئەیفەرمو: (بە ڕاستی خوا بەشی هەمو خاوەن مافێکی داوە). کەواتە وەسیەت نابێ بۆ میراتبەر بکرێت، چونکە ئەوەی، کە خودا دایناوە راستترو دروسترە.

## بەخشینی نەخۆش لە سێیەك دائەمەزرێت

٥٥٠-ن/٢٥٣٠ ((عَنْ اَبِي زَيدْ الأَنْصَارِيِّ: اَنَّ رَجُلاً اَعْتَقَ سِتَّةَ اَعْبُدٍ عِنْدَ مَوْتِهِ لَيْسَ لَهُ مَالٌ غيرُهُمْ، (فَأَقْرَعَ بَيْنَهُمْ رَسُولُ اللهِ فَأَعْتَقَ اثْنَينْ وَاَرقَّ اَرْبَعَةً) رواه احمد (٥/ ٣٤١) وابوداود (٣٩٦٠) بِمَعْنَاهُ وَقَالَ فِيهِ: (لَوْ شَهِدْتَهُ قَبْلَ اَنْ يُدْفَنَ لَمْ يُدْفَنْ فِي مَقَابِرِ الْمُسْلمِينَ))).

لە باوکی زەیدی ئەنسارییەوەﷺ هاتوە کە پیاوێك لە سەرەمەرگیا شەش بەندەی ئازاد کردوە و، بێجگە لەو شەش بەندەیەشماڵی تری نەبووە، جا پێغەمبەری خواﷺ تیرو پشکی بۆ کردنو دوویانی ئازاد کردوەوە چواریان بە بەندە هێڵاوەتەوە، ئەبو داودویش هەر لەم مانایەدا ئەم فەرمودەی گێڕاوەتەوەو ئەمەی تێدا هاتوە: ((ئەگەر لێرە بوومایە، پێش شاردنەوەی نەم ئەهێشت لە گۆڕستانی موسڵماناندا بشارێتەوە)).

## کافرێکی شەڕکەر ئەگەر واریسەکانی موسڵمان بوون ئایا دەتوانن سپاردەکەی بۆجێبەجێی بکەن؟

٥٥١- ن /٢٥٣٢ ((عَنْ عُمْرِ بْنِ شُعَيبْ عَنْ اَبِيه عَنْ جَدِّه: (اَنَّ الْعَاصَ بْنَ وَائِلٍ اَوْصَى اَنْ يُعْتَقَ عَنْهُ مائَةَ رَقَبَةٍ فَأَعْتَقَ ابْنُهُ هُشَامٌ خَمْسِينَ رَقَبَةً فَارَادَ عَمْرُو اَنْ يَعْتَقَ عَنْهُ الْخَمْسِينَ الْباقَيةَ ، فَقَالَ: يَارَسُولَ اللهِ اِنَّ اَبِي اَوْصى بِعِتْقِ مِائَةِ رَقَبَةٍ وَاِنَّ هِشَاماً أَعْتَقَ عَنْهُ خَمْسِينَ رَقَبَةً، وَبَقِيَتْ خَمْسُونَ رَقَبَةً أَفَأَعْتِقُ عَنْهُ؟ فَقَالَ : رَسُولُ اللهِﷺ:(لَوْ كَانَ مُسْلِماً فَاَعْتَقْتُمْ عَنْهُ اَوْ تَصَدَّقْتُمْ عَنْهُ أوْ حَجَجْتُمْ عَنْهُ- بَلَغَهُ ذَلِكَ)) رواه ابوداود (٢٨٨٣) واحمد (٢/١٨١).

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هاتوە، کە عاسی کوڕی وائیل وەسیەتی کرد، کە سەد بەندەی بۆ ئازاد بکرێت، جا هیشامی کوڕی پەنجای ئازاد

کرد، ئینجا کوڕەکەی تری (عەمر)ویستی پەنجاکەی تر ئازاد بکات وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ باوکم وەسیەتی کردووە بە ئازادکردنی سەد بەندە، بەڵام هیشام لەباتی ئەودا پەنجای ئازاد کردووەو، پەنجای تری ماوە، ئایا منیش بۆی ئازاد کەم؟

پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ئەگەر موسڵمان بوایە لەباتی ئەودا بەندەتان ئازاد کردایە، یان چاکەتان بۆ بکردایە، یان حەجتان بۆ بکردایە - پێی دەگەشت، واتە پێی ناگات، بەڵام بەرێگری نەکرد لە کردنی. واتە وەسییەتەکەی بۆ جێبەجێ بکەن قەیناکە، بەڵام هیچی پێ‌ناگات، تەنها لەبەر دڵی وارسەکانی بەرگری نەکراوەو، خێرەکە بۆخۆیان ئەگەڕێتەوە، والله اعلم.

## باســـی میرات، یان فەرزە دیاری کراوەکان ( الفرائض )

٥٥٢- ن /٢٥٤٢ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ النَّبِـيِّﷺ قَالَ اَلْحِقُوا الْفَرائِضِ بِأَهْلِهَا فَمَا بَقِيَ فَهُو لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ)) رواه الجماعة الا النسائيَّ (خ/ ٦٧٤٦) (م/٢/١٦١٥) احمد (٣١٣/١) وابوداود (٢٨٩٨) والترمذي (٢٠٩٨) وابن ماجة (٢٧٤٠).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە رضي الله عنهما هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: بەشە دیاریکراوەکانی میرات بدەن بە خاوەنەکانیانو هەرچی مایەوە بیدەن بە نزیکترین نێرینەی مردوەکە.

بەڵێ خوای گەورە لە سورەتی (( النساء))دا باسی دابەشکردنی میراتی کردە زۆربەی هەرە زۆری میراتگرانی باسکردووەو، بەشیشی بۆ دیاریکردون، پێویستە موسڵمانان بە چاکی شارەزای بنو بەوشێوەیە بیدەن بە خاوەن مافەکانیان، سوپاس بۆ خوا من هەم لە تەفسیرەداو هەم لەسەر رەحەبیە باسی ئەوکەسانەو بەشەکانیانو چۆن دابەشکردنیانم کردوەو پێویست بە دوبارەکردنەوە ناکات، هەرکەس دەیەوێت، با دەستی خۆی بخات.

٥٥٣- ن /٢٥٤٤ ((عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ اَنَّهُ سُئِلَ عَنْ زَوْجٍ وَأُخْتٍ لابوين، فَاَعْطَى الزَّوْجَ النِّصْفَ وَالأُخْتَ النِّصْفَ، وَقَالَ (حضرْتُ رَسُولَ اللهِﷺ قَضَى بِذَلِكَ))) رواه احمد

(١٨٨/٥). لە زەیدی کوڕی سابیتەوە﷛ هاتوە، کە پرسیاری لێکرا لەبارەی مێـــــردو خوشکی باوكو دایکیەوە، جا ئەویش بە مێردەکەی نیوەی ماڵی - ژنە مردوەکەی پێداو بە خوشکەکەشی نیوەی دا، واتە ماڵەکەی کرد بە دوو بەشەوە، هەر یەکەی نیوەی پێدان، چونکە ئەو ئافرەتە مردوە، جگە لەو دوانە کەسی تری نەبووە، وتی (لە خزمەتی پێغەمبەری خواداﷺ بووم ئاوای بڕیاردا).

## خوشـك لەگەڵ کچاندا عەسـەبەیە، واتە بەشی دیاری نابێ

٥٥٤-ن/٢٥٤٧ ((عَنْ هُزَيل بِنْ شَرَحْبِيلَ قَالَ سُئِلَ اَبُومُوسَى عَنْ ابْنَةٍ وَابْنَة ابْنِ وَاُخْتٍ فَقَالَ: للاَبْنَةِ النِّصْفُ وِللأُخْتِ النِّصْفُ، وَأتِ ابْنَ مَسْعُودٍ فَسُئِلَ ابْنُ مَسْعُودٍ، وَأُخْبِرَ بِقَوْلِ اَبي مُوسى، فَقَالَ : لَقَدْ ضَلَلْتُ اِذَنْ وما اَنا مِنَ الْمُهْتَدِينَ اَقْضِي فِيهَا بِمَا قَضَى النَّبِيﷺ: لِلْبِنْتِ النِّصْفُ، وَلاِبْنَةِ الاِبْنِ السُّدُسُ تَكْمِلَةُ الثُّلَثَيْنِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأُخْتِ. رواه الجماعة الا مسلماً والنسائي. خ/ ٦٧٣٦ احمد (٣٨٩/١) وابوداود (٢٨٩٠) والترمذي (٢٠٩٣) وابن ماجة (٢٧٢١) وزاد احمد والبخاري: فَآتِينا اَبوُ مُوسى فَاَخْبَرنَاهُ بِقَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ فَقَالَ: لاَ تَسْألُونُي مَادَامَ هَذَا الْحَبْرُ فِيكُمْ)).

لە هوزەیلی کوڕی شەرەحبیلەوە هاتوە، کە وتی. پرسیارلە ئەبوموسا کرا لەبارەی کچ و کچی براو خوشکەوە ، جاوتی: کچەکەی نیوەی هەیەو خوشکەکەیشی نیوەی هەیە،وە بچن بۆ لای کوڕی مسعود، پرسیار لەو کراو قسەی ئەبو موسایان بۆ باسکرد، جا وتی بە ڕاستی ئەگەر وابێ من سەر لێشێواوم لە ڕێ پیشاندراوان نیم، بڕیار ئەدەم بەو شێوەیەی، کە پێغەمبەرﷺ بڕیاری داوە بۆ کچی - مردوەکە- نیوەی ماڵەکەی بۆ هەیەو، بۆ کچی کوڕەکەیشی شەش یەکی بۆ هەیە، کە تەواوکەری دووبەش لە سێ بەشەو باقی هی خوشەکەکەیەتی.

لە ڕیوایەتی ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی بوخاریدا ئەمەی زیادکراوە: جا هاتینەوە لای ئەبوموساو قسەی کوڕی مەسعودمان بۆ باسکرد، وتی: لەمن پرسیار مەکەن، هەتا ئەو زانا گەورەیە لەناو ئێوەدایە. ڕەحمەتی خوا بڕژێ بەسەر گیانی پێغەمبەری

ئازیزمـــــاندا، چۆن مرۆڤێكی پەروەردە كردوە، ئەمرۆ هەر، كە وترا، فلانەكەس زانایــە ئەوی تر هەر بە پەلە دێتە سەر چۆكو، ئەیەوێ بەهـــەر نرخێك بــێ ئــەو كەســە بــێنرخ بكات، ئەوەندە حەسادەتێكی گەورە هەیە لەناو بەناو زانایانی ئەم چـەرخانەی دواییـدا. (اللهم اني اعوذ بك من الجهل والحسد والرياء والغيبة).

٥٥٥-ن /٢٥٥٧ ((عَنْ اَبِي اُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ اَنَّ رَجُلاً رَمَى رَجُلاً بِسَهْمٍ فَقَتَلَهُ وَلَيْسَ لَـهُ وارِثٌ الاّ خالٌ فَكَتَبَ فِي ذَلكَ اَبُوعُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ الَى عُمَـرَ، فَكَتَـبَ عُمَـرُ اَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ قَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ مَوْلَى مَنْ لاَ مَوْلَى لَهُ وَالْخَـالُ وَارِثُ مَـنْ لاَ وَارِثَ لَـهُ)). رواه احمد (١/ ٢٨، ٤٦) وابن ماجة (٢٧٣٧) والترمذي (٢١٠٣) وحسنه.

لە باوكی ئومامەی كوڕی سـەهلەوە هـاتوە كـە پیاوێـك تیرێكـی لـە پیاوێـك داو كوشتی، هیچ كەس نەبوو میراتی ببات، بێجگـە لـە خـاڵی، جـا ئـەبو عوبەیـدە ئـەم ڕووداوەی نووسی بۆ عومەر رضي الله عنهما، عومەریش نوسی پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: خواو پێغەمبەرەكەی یارمەتیدەرو سەرپەرشتی ئەو كەسەن، كە سەرپەرشتی نـەبێو بێكـەس بێ، خاڵ میراتگری ئەو كەسەیە، كە كەسی تری نەبێ، كە میراتەكەی ببات.

٥٥٦-ن /٢٥٦٣((فِي حَدِيثِ الْمُتَلاَعِنَـيْنِ الَّـذِي يَرْوِيـهِ سَـهْلُ بْـنُ سَـعْدٍ قَـالَ: وَكَانَـتْ حَامِلاً وَكَانَ ابْنُهَا يُنَسبُ اِلَى اُمِّهِ فَجَرَتِ السُّنَّةُ اَنَّـهُ يَرِثُهَـا مِنْـهُ مَـا فَـرضَ اللهُ لَهَـا) رواه الجماعة الا الترمذي وابن ماجة خ(٥٣١٢) م(١٤٩٣/٥))).

لە فەرمودەی ئەو دوو كەسەدا -ژنو مێرد-، كە نەفرینیان لەیەكتـر كردوە سـەهلی كوڕی سەعد هێناویەتی، وتی: ئەو ئافرەتە دو گیان بوەو كوڕەكـەی بـەناو ئـەوەوە نـاو ئەبراو سوننەتی ــ ئیسلامیش ــ بەو شێوەیە هاتوە، كە ئەو لە دایكی میرات ئـەباتو دایكیشی لەو میرات دەبات بەو شێوەی، كە خوا بـۆی دانـاوە، كـە سـێیەكە ١/٣ یـان شەش یەكە ١/٦.

٥٥٧-ن /٢٥٦٧ (( عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النّبِـيِّ ﷺ قَـالَ: (اذا اسْـتَهَلَّ الْمَوْلُـودُ وَرِثَ) رواه ابوداود (٢٩٢٠) وابن حبـانُ صـححه)). لـە ئـەبی هـورەیرەوە رضي الله عنهما هـاتوە، لـە پێغەمەرەوە ﷺ، كە فەرمویەتی: منالّ بە زیندویی لەدایك بو میرات ئەبات.

## ڕێگری كراوه له كڕین و فرۆشــتن و بەخــشینی سەرپەرشــتی و بەرەڵاكردنی بەبێ ســەرپەرشــتی (الولاء).

٥٥٨- ن /٢٥٧٢((عَنْ ابْنَ عُمَرَ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ: اَنَّهُ نَهَى عَنْ بِيْعِ الْوَلاَءِ وَهِبَتِهِ) رواه الجماعة خ (٢٥٣٥) م(١٥٠٦/١٦) احمد (٧٩/٩/٢) وابوداود (٢٩١٩) والترمذي (٣٠٦/٧) ابن ماجة (٢٧٤٧))).

له عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە رضي الله عنهما هاتوه، كه پێغەمبەر ﷺ ڕێگری كردوه له فرۆشتنی ولایەتو بەخشینی، له ڕیوایەتی تردا هاتوه، كه ئەهلی ئیسلام كەسێكیان ئازاد كرد ویلایەتەكه لەسەر خۆیان لانابەن، كابرا بەرەڵا ناكەن بێ سەرپەرشتیار بەڵام خەڵكی نەفام ئەوەیان ئەكرد[1].

٥٥٩- ن /٢٥٧٧ ((عَنْ اُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لاَيَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ وَلاَ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ) رواه الجماعة الا النسائي احمد(٢٠٠/٥) م(١٦١٤/١) وابوداود (٢٩٠٩) والترمذي (٢١٠٧) وابن ماجة (٢٧٢٩))).

له ئوسامەی كوڕی زەیدەوە رضي الله عنهما هاتوه، له پێغەمبەرەوە ﷺ كه فەرمویەتی ((موسڵمان له كافر میرات نابات، كافر له موسڵمان میرات نابات)) جا كافری ئەسڵی بێ، یان پاشگەزبووەوە، جیاوازی نیه لەنێوان دوو ئاییندا میرات بردن نیه.

٥٦٠- ن /٢٥٨١ ((عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ اَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لاَيَرِثُ الْقَاتِلُ شَيْئاً) رواه ابو داود (٤٥٦٤) والنسائي (٧٩/٤))).

له عەمری كوڕی شوعەیبەوە له باوكیەوە له باپیریەوە رضي الله عنهما هاتوه له پێغەمبەرەوە ﷺ، كه فەرمویەتی ((بكوژ هیچ ــ میراتی لەكوژراو ــ نابات)).

---

(١) تەماشای فەرمودەی ژماره (٢٥٧٤)، له سەرچاوەی پێشو، بكه.

## ئافرەت لە خوێنـــی مێردەكەی میرات ئەبات

٥٦١- ن /٢٥٨٣ ((عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمَسَيِّبِ اَنَّ عُمَرَ قَالَ: الدِّيَةُ لِلْعَاقِلَةِ لاَ تَـرِثُ الْمَـرْأَةُ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا حَتَّى اَخْبَرَهُ الضَّحَّاكُ بْـنُ سُـفْيَانَ الْكِلاَبِـيُّ (اَنَّ النَّبِـيَّ كَتَـبَ الَـيّ اَن اُوَرِثَ امْرأَةَ اَشْيَمَ الضَّبَابِيُّ مِنْ دِيةِ زَوْجِهَا) رواه الخمسة الا النسائي وصححه الترمذي، احمد (٤٥٢/٣) وابوداود (٢٩٢٧) والترمذي (١٤١٥، ٢١١٠) وابن ماجة (٢٦٤٢))).

لە سەعیدی كوڕی موسەیبەوە هاتوە، كە عومەر وتویەتی: پارەی خوێن بۆ خزمانی كابرایەو، خێزانی هیچی نابات، تا زەحاكی كوڕی سوفیانی كیلابی وتی: (پێغەمبەرﷺ نوسی بۆم، كە میرات بدەم بە خێزانی ئەشیەمی زەبابی لـە خـوێنی مێردەكـەی)، واتـە ئافرەت لە پارەی خوێنی مێردیدا بەشی دیاریكراوی خۆی ئەبات، كە چوار یەك ١/٤ یان هەشت یەكە ١/٨.

## پێغەمبەران میراتیان لیّ ناگیرێت

٥٦٢- ن /٢٥٨٦((عَنْ اَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقُ عَـنِ النَّبِـيِّﷺ قَـالَ: (لاَنُـورَثُ مَـا تَرَكْنَـاهُ صَدَقَةٌ) اخرجاه خ(٦٧٢٥،٦٧٢٦) م(١٧٥٨/٥٣))).

لە ئەبوبەكری سدیقەوە رضي الله عنه هاتوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ، كە فەرمویـەتی: میراتمان لــێ ناگرێـت، ئـەوەی بـەجێی ئـەهێڵین خێـرو سـەدەقەیە. واتـە ئـەدرێ بـەو مسوڵمانانەی نەدارن، پاش خەرجی خێزانەكانیو پێویـستی ئیـشكەرەكانی، وەكـو لـەم ڕیوایەتەی بەردەمدا هاتوە.

٥٦٣- ن /٢٥٨٩ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللهِﷺ: لاَ تَقْتَّـسِمُ وَرَثَتِـي دِينَـاراً مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقِـة نِـسَائِي وَمؤْنَـةِ عَـامِلِي فَهُـوَ صَـدَقَةٌ) خ(٦٧٢٧،٦٧٣) م(١٧٥/٥١) احمد (٤٦٤/٢،٣٧٦،٢٤٢) وابـو داود(٢٩٧٤))). لە ئەبو هـورەیرەوە رضي الله عنه هـاتوە، كـە

وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی میرات بەرانی من یەك دینار دابەش ناکەن، ئەوەی لێم بەجێ ئەمێنێ پاش خەرجی خێزانەکانم و خەرجی ئیشکەرەکانم خێرو سەدەقەیە، واتە ئەدرێ بە هەژارانی مسولمانان.

٥٦٤- ن /٢٥٩١ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِـيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ اَعْتَقَ رَقَبَةً مُسْلِمَةً اَعْتَقَ اللّٰهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْواً مِنَ النَّارِ حَتَّى فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ) رواه الجماعة الا اباداود وابن ماجة خ (٦٧١٥) م (١٥٠٩/٢٣) احمد (٥٢٩,٤٢٢,٤٢٠/٢) والترمذي (١٥٤١) والنسائي في الكبرى (١٦٨/٣),(٤٨٧٥)))

لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ، کە فەرمویەتی: هەرکەسێك بەندەیەکی موسلمان ئازاد بکات -خوای بالادەستو گەورە- لەبەر هەر ئەندامێکی ئەو بەندەیە، ئەندامێکی ئەو کابرایە دەپارێزێت لە ئاگر، هەتا لەباتی عەیبیدا، عەیبی ئەو ئەپارێزێت.

بەم شێوەیە ئایینی بەرزی ئیسلام خەلکی هەلئەنێ لەسەر ئازادکردنی بەندەکانو کۆیلەکان[1] جالەباتی ڕێزلێنان و سوپاس کردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، کەچی نەزانانو دوژمنانی ئایین ڕەخنە لە ئیسلام ئەگرن لەسەر بەندایەتی، کە شتێکی پێش ئیسلام بووەو ئیسلام دەیان ڕێگای داناوە بۆ ئازادکردنیانو نزیك بە بنبڕ بوون چو، بەلام ئێستایش لە ولاتە بەناو خاوەن شارستانیو پێشکەوتوەکاندا، هێشتا بنیادەم بە کڕینو فرۆشتن ئەڕوات و، لە هەندێ جێگایش وەکو ئاژەل سەر ئەبڕینو گۆشتەکانیان ئەفرۆشرێت؟؟!! کە سیش ئەوە بەکاری ناپەسەندو نامرۆڤایەتی باس ناکات وەکو ئەوەی، کە هیچ ڕوی نەدابێت، چونکە کاری خۆیانە؟!

بەداخەوە شەیتان لایەنگرو دۆستانی زۆری لەبەرەی ئادەمیزاد بۆخۆی دروستکردوەو، ڕۆژی دوایش حاشایان لێ ئەکات.

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٢٥٩٢-٢٥٩٣)، لە سەرچاوەی پێشو، بکە.

## هەر كەسێ بەندەیەكی مەحرەمی خۆی كڕی لەسەری ئازاد ئەبێ

٥٦٥- ن /٢٥٩٧ ((وعَنْهُ قَالَ قَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَيْجزي وَلَدٌ عَنْ وَالِدِهِ الاَّ اَنْ يجِدَهُ مَمْلُوكاً فَيَشْتَرِيهُ فَيُعْتِقَهُ) رواه الجماعة الا البخاري لكن اخرجه في الادب المفرد الحديث (١٠)م (٢٥/١٥١٠) احمد (٢/٢٣٠) وابوداود (٥١٣٧) والترمذي (١٩٠٦) والنسائي في الْكُبريَ (٣/١٧٣) وابن ماجة (٣٦٥٩))).

هەر لەوەوە رضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: منالّ پاداشی باوكی خۆی ناداتەوە، مەگەر باوكی بەندە بێو بیكڕێتەوەو ئازادی بكات، وەكو لە ڕیوایەتی تردا هاتوە، كە هەركەسێك بو بەخاوەنی خزمێكی مەحرەمی خۆی، ئەوە ئەو خزمە ئازادە، واتە هەر بە كڕینەكەی ئازاد ئەبێ، والله اعلم.

٥٦٦-ن /٢٦٠٠ ((عَنْ ابْنِ عُمَرَ اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ اَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ وَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ قُوِّم اَلْعَبْدُ عَلَيْهِ قِيمَةَ عَدْلٍ فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُوَ اِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ عَلَيْهِ مَاعَتَقَ) رواه الجماعة الا النسائي والترمذي خ(٢٥٢٢) م(١/١٥٠١))).

لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە رضي الله عنهما هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەركەسێك بەندەیەكی، هاوبەشی ئازاد بكاتو، ئەو كەسەماڵی هەبێت، كە بگات بە نرخی ئەو بەندەیە ئەوە بەندەكە نرخێكی دادپەروەرانەی لەسەر دائەنرێتو ئەیدا بە هاوبەشەكانی — هەركەس بەشی خۆی —و بەندەكەی پێ ئازاد ئەكرێ، ئەگینا بە ئەندازەی بەشەكەی ئەوی لێ ئازاد ئەبێو بەس.

٥٦٧-ن /٢٦٠٥ ((عَنْ جَابِرٍ اَنَّ رَجُلاً اَعْتَقَ غُلاَماً لَهُ عَنْ دُبُرٍ فَاحْتَاجَ فَأَخَذَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: (مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي؟ فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدُ اللهِ بِكَذَا وَكَذَا فَدَفَعَهُ اِلَيْهِ)

رواه الجماعة الا احمد خ (٢١٤١) م (٩٧٩/٥٨) وابو داود (٣٩٥٥-٣٩٥٧) والترمذيُّ (١٢١٩) والنسائيُّ (٧/ ٣٠٤) –وابن ماجه ( ٢٥١٢-٢٥١٣))).

له جابیرەوە هاتوە، كە پیاوێك بەندەیەكی ئازاد كرد بۆ پاش مەرگی. واتە وتی: هەركاتێ مردم تۆ ئازادیت، جا ئەم كابرایە كەمدەستو موحتاج بو، لەبەرئەوە پێغەمبەرﷺ وەریگرت وفەرموی: كێ ئەم بەندەیەم لێ ئەكڕێ؟، نوعەیمی كوڕی عەبدولا لێی كڕی بە ئەوەندەو ئەوەندە، پێغەمبەریشﷺ پێیفرۆشت. واتە ئەو جۆرە ئازادكردنە كابرا ئەتوانێت، ئەگەر ویستی بیفرۆشێت، ئەوانەی، كە ووتویانە دروست نیە، بەم فەرمودەیە بەرپەرچ ئەدرێنەوە.

٥٦٨-ن /٢٦١٢ ((عَنْ مُوسَى بْنِ اَنَسٍ اَنَّ (سِيرِينَ سَأَلَ اَنَسَ بْنَ مَالِكٍ الْمُكَاتَبَةَ وَكَانَ كَثِيرِ الْمَالِ فَأَبَى فَانْطَلَقَ اِلَى عُمَرَ فَقَالَ: كَاتِبْهُ فَأَبَى فَضَرَبَ عُمَرَ بِالدُّرَّةِ وَتَلاَ عُمَرَ (فَكَاتِبُوهُمْ اِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيراً) (النور) اخرجه البخاري (٤٩٤/٥) معلقا ووصله عبدالرزاق (٣٧١/٨) رقم (١٥٥٧٦))).

له موسای كوڕی ئەنەسەوە هاتوە، كە سیرین داوای لە ئەنەسی كوڕی مالیك كرد (نووسینی لەگەڵدا بكات)، واتە نرخی لەسەر دابنێو بیكات بە چەند بەشەوەو، هەر مانگێك شتێكی بدات، تا تەواو ئەبێو ئازاد بێ، ئەو مالی زۆری هەبووە، بەلام ئەنەس نەیكردوە، ئینجا چوونە لای عومەرو ئەویش وتویەتی: ئازادی بكە، هەر نەیكردوە، جا عومەر بە عەسا لێی داوەو ئەم ئایەتەی بۆ خوێندوەتەوە، كە ئەفەرموێ: (نوسینیان لەگەڵ بكەن، ئەگەر ئەتانزانی لەناو ئەواندا ماڵ هەیە) . واتە، مادام ترسی ماتەڵكردنتان نەبێو بزانن ئەتوانن ماڵ پەیداكەن، یان ماڵیان هەیە بەو شێوەیەی، كە لە سەرەوە باسمان كرد ئازادیان بكەن.

# بەشـی ژن و ژنخـوازی (النكاح).

٥٦٩-ن /٢٦٢١ ((عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ اَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَاَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ)) رواه الجماعة الا الترمذي خ (٥٠٦٥/١٩٠٥) م(١٤٠٠/١).

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە رضي الله عنهما هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ئەی کۆمەڵی لاوان! هەر کام لە ئێوە توانای هاوسەرگیری هەیە (لەبواری جنسیو دارایيو جەستەيی)، با ژن بهێنێ، بەڕاستی بەمە چاکتر چاوتان لەڕاست ئافرەتانی نامەحرەم دادەخرێو پارێزگاریترە بۆ داوێنتان، هەرکەسێکیش دەسەڵاتی نیە، با ڕۆژوو بگرێت، بە ڕاستی ئەو ڕۆژووە بۆ ئەو قەڵغانە.

٥٧٠-ن /٢٦٣٠((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّﷺ قَالَ: تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَا لَهَا وَلِحَسَبِهَا وِلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ)) رواه الجماعة الاّ الترمذي والنسائي خ (٢٠٩٧) م (٧١٥/٥٤) احمد (٤٢٨/٢) وابوداود (٢٠٤٧) وابن ماجة (١٨٥٨).

لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە فەرمویەتی: ئافرەت لەبەر چوار شت ئەخوازرێت: لەبەر ماڵی، لەبەر پلەو مەقامی، لەبەر جوانی، لەبەر ئایینی، دە زاڵ بە بەسەر ئایینداره‌کەدا دەستت لە خۆڵ درێت ((وشەیەکە بۆ هەڵنان ئەوترێت)). واتە تەنها ئايينە، کە جێگای دڵخۆشيو پشت پێ بەستنە، ئەوانیتر لەوانەیە ببنە مایەی زیانو جیابوونەوەو شتانێکی کاتین.

٥٧١-ن /٢٦٣٥((وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّﷺ قَالَ: لاَ يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَنْكِحَ اَوْ يَتْرُكَ)) رواه احمد(٤٦٢/٢) والبخاري (٥١٤٤) والنسائي (٧٣/٦).

هەر لەوەوە رضي الله عنه هاتوە،کە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:باهیچ پیاوێك خوازبێنی ئافرەتێك نەکات، کە برایەکی خوازبێنی کردبێ، تا مارەی دەکات، یان وازی لێ دەهێنێ.

# تەماشا كردنی ئەو ئافرەتەی كە داخوازی ئەكەیت

٥٧٢- ن /٢٦٤٠ ((عَنْ ا لْمُغَيْرَةَ بِنْ شُعْبَةَ أَنَّهُ خَطَبَ امْـرَأَةً فَقـالَ النّبـِيُّ ﷺ (اُنْظُـرْ الَيْهَـا اَحْـرَى اَنْ يُـؤْدَمَ بَيْنَكُمَـا))) رواه الخمـسة الا ابـا داود. احمـد (٤/ ٢٤٤/ ٢٤٥) والترمذي (١٠٨٧) والنسائي (٦/٦٩) وابن ماجة (١٨٦٦).

لە موغـەیرەی كوڕی شـوعبەوە رضي الله عنهما هـاتوە، كـە خـوازبێنی ئـافرەتێكی كـردوە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: تەماشای بكە بەڕاستی ئـەوە شايـستەترە بـۆ ڕێكـەوتنتانو بەيەكەوە گونجانتان. واتە تەماشاكردن لەوكاتەدا بە تاوان دانانرێـت، بـەڵكو سـوننەتەو پێویستە، تا لە پاشدا گەیشتنە یەك، بە هۆی دیمەنو ڕەنگیەوە پەشیمان نەبنەوە ، دیارە بۆ ئەم مەبەستە دەموچاوو دەست بینین بەسەو، نابێ لەوە زیـاتر تەماشـای بكـات، جـا ئافرەتەكە بزانێ یان نەزانێ قەیناكا. والله اعلم.

٥٧٣- ن /٢٦٥٠ ((عَنْ عُقْبَةَ بِنْ عامر اَنّ رَسُولُ اللهِﷺ قـالَ: اِيَّـاكُمْ وَالـدُّخُولَ عَلَـى النِّساءِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يَارَسُولُ اللهِ أَفَرَاَيْتَ الْحَمْوَ قَالَ: الْحَمْوُ الْمَـوْتُ)) رواه احمـد (٤/ ١٤٩/١٥٣) والبخاري (٥٢٣٢) ومسلم (٢١٧٢) والترمذي(١١٧١) وصححه.

لە عوقبەی كوڕی عـامیرەوە رضي الله عنهما هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویـەتی: وریـا بن، خۆتان بپارێزن لە چوونە لای ئافرەتان -ئەگـەر مـەحرەم نـەبوون- جـا پیاوێـك لـە یاریدەدەرەكان (الانصار)، وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ پـێم بڵـێ ئـەی بـرای مێـردی ئافرەت؟

فەرموی: ئەوە مردنە. واتە زۆر خراپـە بەیەكـەوە لەیـەك ژووردا دانیـشنو كەسـیان لەگەڵدا نەبێ، باقی قەدەغەكراوەكان لـە سـورەتی نـوردا هـاتونو لێـرەدا لەبارەیانـەوە نانووسینو بچن لەوێ تەماشای بكەن. وشەی (حَمْوُ) بە خزمـانی ژن لەلایـەن مێردیـەوە ئەوترێت، وەكو برای مێردیو ئامۆزایو..و..هتد.

٥٧٤- ن /٢٦٥٨ ((عَنْ اَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ نِكَاحَ اِلاَّ بِوَلِيٍّ)) رواه الخمسة احمد (٤/٣٩٤/٤١٣) وابوداود (٢٠٨٠) والترمذي (١١٠١) وابن ماجة (١٨٨١) الاّ النسائي وحسنه الترمذي وصححه ابن حبان.

له باوکی موساوه رضي الله عنه هاتوه، له پێغەمبەرەوە ﷺ، کە فەرمویەتی: مارەبڕیی ئافرەت بەبێ سەرپەرشت دروست نیە. هەروەها بەبێ دوو شایەتی دادپەروەریش، ئەگەرچی بەڵگەی ڕاستو دروست لەبارەی شایەتەکانەوە نیە، بەڵام کۆی ریوایەتەکان کراوە بە بەڵگە[1].

٥٧٥- ن /٢٦٦٤ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ وَلاَ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، قَالَ يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ وَكَيْفَ اِذْنُهَا؟ قَالَ: (اَنْ تَسْكُتَ))) رواه الجماعة الا احمد خ(٥١٣٦) م(٦٤/١٤١٩).

له ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوه، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((بێوەژن نیکاح ناکرێت تا پرسی پێ نەکرێتو ڕەزامەندی خۆی دەرنەبڕێت، وە کچیش هەتا ماوە نەدات))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە ماوەدانی؟ فەرموی ئەوەیە کە بێدەنگ بێ.

(١) هەروەها ابن حبان لە سەحیحی خۆیدا فەرمودەیەکی هێناوە بە ژمارەی (٤٠٧٥) کە دەفەرموێ: ( لاَ نِكَاحَ اِلاّ بِوَلِيٍّ وَ شَاهِدَي عْدَلٍ ...) عن عائشة. مارەبڕیی دروست نیە مەگەر بەسەرپەرشتو بە دو شایەتی دادپەروەر.

# ڕێگریکردنی ئافرەت لە گەڕانەوە بۆ لای مێردی

# پاش نەمانی عیدە

٥٧٦-ن /٢٦٧٢ ((عَنْ مَعْقِلِ بنْ يَسَارٍ قَالَ: كَانَتْ لِي أُخْتٌ تُخْطَبُ الَيَّ، فَأَتَانِي ابْنُ عَمٍّ لِي فَأَنْكَحْتُهَا اِيَّاهُ ثُمَّ طَلَّقَهَا طَلاَقاً لَـهُ رَجْعَـةً ثُـمَّ تَرَكَهَا حَتَّـى انْقَضَتْ عِـدَّتُهَا فَلَمَّا خُطِبَتْ الَيَّ اَتَانِي يَخْطُبُهَا ، فَقُلْتُ : لا وَاللهِ لا أُنْكحُكَهَا اَبَداً.قَالَ : فَفيَّ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَـةُ : وَاِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكحْنَ أَزواجَهُنَّ...) الآيـة ( البقـرة: ٢٣٢. قَـالَ: فَكَفَّـرْتُ عَـنْ يَمِينِـي وَاَنْكَحْتُهَـا اِيَّـاهُ)) رواه البخـاري (٤٥٢٩) وابـوداود (٢٠٨٧) والترمذي (٢٩٨١) وصححه ولم يـذكر الـتَكْفيرَ، فيـه في روايـة البخـاري: وَكَانَ رَجُلاً لاَ بَأْسَ بِهِ وَكَانَتِ الْمَرْأَةُ تُرِيُدُ انّ تَرْجِعَ اِلَيْهِ، وَهُوَ حُجَّةٌ فِي اِعْتَبارِ الْوَلِيِّ)).

لە مەعقیلی کـوڕی یەسـارەوە رضي الله عنهما هـاتوە، کـە وتویـەتی: خوشـکێکم بـو لـەمن خوازبێنی دەکرا، جا ئامۆزایـەکم هاتـە لامو لێـیم مـارەبڕ کـرد، لـە پاشـدا تـەڵاقی، کەئەیتوانی بیباتەوە، بەڵام وازی لێهێنا تا عیدەی بەسەرچو، جا کاتێ خوازبێنیم لێکـرا هاتە لامو داخوازی کردەوە، وتم، نەخێر، بەخوا هەرگیز لەتۆی مارەبڕ ناکەم، جالـەبارەی منەوە ئەم ئایەتە دابەزی ﴿وَاِذَا طَلَّقْتُمُ النِّساءَ...﴾ ئایەتی (٢٣٢) سورەتی بەقەرە. واتە : هەرکاتێ ژنەکانتان تەڵاقدان- تـەڵاقی سـێهەم نـەبو- عیـدەیان بەسەرچـو، رێگریـان مەکەن لە مێرکردنەوەیان.

وتی: لەبەرئەوە کەفارەتی سـوێندەکەم داو لێـیم مـارە کـردەوە...تورمـوزی باسـی کەفارەتەکەی نەکردوە، لەم فەرمودەدا هاتوە لە ریوایەتی بوخاریدا، کە ئەو پیاوێك بـوو کە هیچ خراپەیەکی تێدا نەبوو، ئافرەتەکـەش ئەیویـست بگەڕێتـەوە بـۆ لای. ئەمـەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە وەلی حیـسابی بـۆ کـراوە، ئـەگینا ئافرەتەکـە بێـوەژن بـوو ئەیتوانی هیچ حسابێ بۆ براکەی نەکات، ئەمە پاڵپـشتێکی چـاکە بـۆ فـەرمودەی ((لا نِكَاحَ اِلاَّ بِوَلِيٍّ)) ژمارە (٥٧٤).

# لەبەر چاو گرتنی هاوشانیەتی چاکە

٥٧٧- ن /٢٦٧٦ ((عَنْ عَبْدِ اللهِ بِنْ بُرَيْدَةَ عَنْ اَبِيهِ قَالَ: جَاءَتْ فَتَاةٌ اِلَى رَسُولُ اللهﷺ فَقَالَتْ: اَنَّ اَبِي زَوَّجَنِي ابْنَ اَخِيهِ لِيْرفَعَ بِهِ خَسِيسَتُهُ، قَالَ: (فَجعلْ الاَمْرَ اِلَيْهَا) فَقَالَتْ: قَدْ اَجَزْتُ مَا صَنَعَ اَبِي وَلَكَنْ اَرَدْتُ اَنْ اُعْلِمَ النِّسَاءِ اَنَّ لَيْسَ اِلَى الآبَاءِ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ)). رواه ابن ماجة (١٨٧٤) واحمد والنسائي من حديث ابْنِ بُرَيْدةُ عَنْ عائشة قال :النِّسائِيُّ هَذا الْحَديِث: يُوثقونه ، في الكبرى (٢٤٨/٣) رقم (٥٣٩٠).

لە عەبدوڵلای کوڕی بورەیدەوە لە باوکیەوە هاتوە، کە وتویەتی: کچێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺو وتی: بەڕاستی باوکم منی داوە بە برازایەکیو ئەیەوێ بەهۆی منەوە بێنرخی خۆی بە لەسەر خۆی هەڵگری، وتی: پێغەمبەرﷺ (بڕیاری ئەو ئیشەی دایە دەستی خۆی -و ئافرەتەکەی کردە سەرپشك لە کردنو نەکردندا)، وتی: من ئەوەی باوکم کردویەتی دانم پێدا نا، بەڵام ویستم ئافرەتان تێبگەیەنم، کە باوکان لەمبارەوە هیچیان بۆ نیە. واتە تا ئافرەتەکە ڕازی نەبێ، باوك مافی زۆرکاری نیە.

# دوعایەك بۆ ژنو مێرد کە یەکە مجار بە یەك ئەگەن

٥٧٨- ن /٢٦٨٣ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ اَنَّ النَّبِيَّﷺ: (اِذَا رَفَّأَ اِنْسَاناً اِذَا تَزَوَّجَ قَالَ: بَارَكَ اللهُ لَكَ وَبَارَكَ اللهُ عَلَيْكَ وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا بِخَيْرٍ) رواه الخمسة وصححه الترمذي والنسائي في عمل اليوم والليلة (٢٥٩) احمد (٣٨١/٢) وابوداود (٢١٣٠) والترمذي (١٠٩١) وابن ماجة (١٩٠٥))).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە هەرکاتێ دوعای بکردایە بۆ ئینسانێك، کە ژنی بگواستایەوە دەیفەرمو: خوا لێت پیرۆزکاو فەڕت بەسەردا بڕێژێو بەچاکە کۆتان بکاتەوە.

## نیکاحی لـەزەت وەرگرتن ( المتعــه ) حەرامە

٥٧٩-ن /٢٦٨٩ ((عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ وَعَنْ لُحُومِ الْحمُرِ الأَهْلِيَّةِ زَمَنَ خَيْبَرَ) رواه الجماعة الا ابـاداود احمـد(٧٩/١) خ(٤٦١٥،٥٠٧١) م(١٤٠٤) والترمذي (١١٢١) والنسائي (١٢٥/٦،١٢٦) وابن ماجة (١٩٦١))).

لە عەلیەوەؓ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ لە زەمانی خەیبەردا رێگری کرد لـە نیکاحی لەزەتوەرگرتن ــ نیکاح کردنی ئافرەت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ــ لە گۆشتی کەری ماڵی. لە ریوایەتی تردا هاتوە، کە لە حەجی مـاڵ ئاواییـدا چـەند رۆژێ مـاوەی پێداوەو پاشان قەدەغەی کردوە[1].

## تـاوانی نیکاح کردن بۆچاك کردنەوەی نیکاح( نكاح المُحَلِّل )

٥٨٠ -ن /٢٦٩٢ ((عَنْ اَبِنْ مَسْعُودْ قَالَ لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ المُحَلِّلْ و المُحَلَّلْ له) رواه احمد (٤٤٨/١) والنسائي (١٤٩/٦) والترمـذي (١١٢٠) وصـححه والخمـسة الاالنـسائي من حديث عَلِيٍّ مِثْلَهُ)).

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ؓ هـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەفرینی کردوە لە حەڵاڵکەرو حەڵاڵ بۆکراو. لە عائیشەوەؓ بە هەمان شێوە هـاتوە، چوارکەس لە پێنج ریوایەتکەرەکان هێناویانە، مەبەست ئەو ئافرەتەیە، کـە بـە تـەواوی تەڵاقی ئەکەوێتو هیچ رێگایەك نیە بۆ گەڕانەوەی، هەنـدێ دێـن ئـەو ئافرەتـە نیکـاح ئەکەن لە کابرایەك، لە پاشدا تەڵاقی بداتەوەو مێردی پێشوو بیهێنێتەوە، ئەمە تاوانـەو حەرامەو فێڵ کردنەو بەر نیکاحی لە(متعە) ئەکەوێت، چونکە ئەمەی، کە ئێستا ئـەو

(١) تەماشای فەرمودەی (٢٦٩١)، لە سەرچاوەی پێشوو، بکە.

ئافرەتە نیكاح ئەكات تەنها ئەوەیە كە بچێتە لایو پاشـان تـەڵاقی بـدات، لـە ڕیواتـدا هاتوە بە ساوڕێنی خوازراو ناوبراوە. (اَلتَّيْسَ الْمُسْتَعَارُ)[1].

## باسی مارەپڕیتی ئافرەت بەئافرەت بەبێ مارەیی

٥٨١-ن /٢٦٩٦ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ اَنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ الـشِّغارِ، وَالـشِّغارُ اَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ: زَوِّجْنِي ابْنَتَكَ وَأُزَوِّجُكَ ابْنَتِي، اَوْ زَوِّجْنِي اُخْتُكَ أُزَوِّجُكَ اُخْتِي) رواه احمد (٤٣٩/٢) ومسلم (١٤١٦/٦١) والنسائی (١١٢/٦) وابن ماجه (١٨٨٤))).

لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هاتوە، كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بریگـــــری كـردوە لـە شیغار، شیغار ئەوەیە كە پیاوێك بڵێ: كچی خۆتم لـێ مارە بكەو، منیش كچی خۆمـت لـی مارە ئەكەم، یان خوشكەكەتم لێ مارە بكەو منـیش خوشـكی خۆمـت لـێ مـارە ئەكەم.

## جێبەجێ كردنی مەرجەكانی مارەبڕین

٥٨٢ - ن /٢٦٩٩ ((عَنْ عُقْبَةَ بِنْ عَامِرٍ قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ: اَحَـقُّ الـشُّروطِ اَنْ يُوَفىَّ بِهِ ما اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الفُرُوجَ) رواه الجماعـة احمـد (١٥٢/٤، ١٥٠، ١٤٤) خ(٢٧٢١) م (١٤١٨) وابـوداود (٢١٣٩) والترمـذي (١١٢٧) والنـسائي (٩٢،٩٣/٦) وابـن ماجـة (١٩٥٤))).

لە عوقبەی كـوڕی عـامیرەوە رضي الله عنه هـاتوە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمویەتی: شایستەترین مەرج بۆ ئەوەی جێبەجێ بكرێت ئـەو مەرجەیـە، كـە داوێنـی ئافرەتتان پێ حەڵاڵ كردوە. واتە پێویستە ئەو مەرجانە جێبەجێ بكرێن، وەكـو پێـدانی مارەییو شتی تر، مادام ئەو مەرجە قەدەغە نەكرابێ، وەك ئەوەی كـە ئافرەتەكـە بڵـێ

---

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٢٦٩٣)، لە سەرچاوەی پێشوو، بكە.

بەو مەرجە من خۆت لـی مارە ئەبڕم، کە ئەو ژنەی ئێستەت تەڵاق بەیت، ئـەو مەرجـە حەرامەو بە گوێی ناکرێت، وەکو لە فەرمودەی تردا هاتوە[1].

٥٨٣ - ن/٢٧٠٢ (( عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ: الزَّانِي الْمَجْلُودُ لاَ يَـنْكِحُ الاّ مِثْلَهُ) رواه احمد (٣٢٤/٢) وابوداود(٢٠٢٥)))

لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه هـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمویـەتی: زیناکاری دارلێدراو نابێ نیکاح بکات، مەگەر وەکـو خـۆی بـێ. زۆربـەی زانایـان ئـەم ڕێگریە بۆ هەڕەشەو سەختگیری حیساب ئەکەنو، بە حەرامی نازانن، کە جگە لەوان بـە قەدەغەو حەرامی ئەزانن، جگە لەو ئافرەتە زیناکارانە بخوازێت.

٥٨٤-ن /٢٧٠٥((وَعَنْـهُ قَـالَ: (نَهَـى النَّبِــيُّ ﷺ ان تُـنكَحَ الْمَـرأَةُ عَلَـى عَمِتَّهَـا اَوْ خَالَتِهَا) رواه الجماعة الاّ مسلما وابن ماجة احمد (٢٦/٢) خ (٥١٠٨) وابوداود (٢٠٦٥) والترمذي (١١٢٦) والنسائي (٩٨/٦))).

وە هەر لەوەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبـەر ﷺ ڕێگـری کـردوە لـەوەی، کـە ئافرەت بەسەر پوریدا -خوشکی باوکی یا دایکی-.

## نابێ بەندە ( العبد ) ژن بهێنێ بە بێ ماوە پێدانی گەورەکەی

٥٨٥-ن/٢٧١١ ((عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُّـمَا عَبْدٍ تَزَوَّجَ بِغَيرْ اِذْنِ سَـيدِّهِ فَهُوَ عَاهِرٌ) رواه احمد (٣٨٢/٣،٣٠١) وابو داود (٢٠٧٨) والترمذي (١١١١) وحسنه)).

لـە جـابیرەوە رضي الله عنه هـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمویـەتی: هــەر بەندەیەك بەبێ پرسی گەورەکەی ژن بخوازێ، ئەوە زیناکارە.

٥٨٦- ن/٢٧١٣ ((عَنْ قَاسِمٍ عَـنْ عَائِـشَةَ رضي الله عنها : اَنَّ بَرِيــرَةَ خَيَّرَهَـا النَّبِــيُّ ﷺ وَكَـانَ زَوْجُهَا عَبْداً) رواه مسلم (١٥٠٤/١٠،١١) وابوداود(٢٢٣٤) والنـسائي (١٦٢/٦) وابـن

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارەی (٢٧٠٠)، لە نیل الأوطار، بکە.

ماجة (٢٠٧٦))).

لە قاسمەوە لە عائیشەوە رضي الله عنها هاتوە، كە بەریرە -كاتێ ئازاد بوو- پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەڵبژاردن سەر پشكی كرد، یان لە نەویستنی مێردەكەیدا، كە بەندە بوو. واتە ئازادو بەندە هاوشانی یەكتر نین ئەتوانن نیكاح هەڵبوەشێننەوە.

## دوو خوشك دروست نیە هاوسەری یەك پیاو بن

٥٨٧-ن /٢٧٢٣ ((عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ: اَنَّهَا عُرِضَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ اَنْ يَنْكِحَ اُخْتَهَا فَقَالَ: (لاَ تَحِلُّ لِي) اخرجاه خ (٥١٠٧،٥١٠٦) م (١٦،١٥-١٤٤٩)))[1].

لە دایكی باوەڕدارانەوە ئومو حەبیبەوە رضي الله عنها هاتوە، كە: خوشكی خۆی باسكرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، كە بیخوازێت فەرموی: مارەكردنیان بۆم حەڵاڵ نیە، ئەمەش لە سورەتی نیساء دا لەباسی ئەو ئافرەتانە داهاتوە، كە مارەكردنیان رەوانیە، كە ئەفەرموێت ﴿...تَجْمَعُواْ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ ...﴾(٢٣).

واتە كۆ كردنەوەی دوخوشك بۆیەك پیاو رەوانیە .

## پیاو و ئافرەتی كافر، كەیەكێكیان بەر لە ئەویتریان موسڵمان بێت

٥٨٨-ن /٢٧٢٤ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ردَّ ابْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى زَوْجِهَا اَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ بِالنِّكَاحِ الاَوَّلِ لَمْ يَحْدَثْ شَيْئاً)) رواه الخمسة وقال ابْنُ كَثِيرٍ في الارشاد: هو حديث جيدّ. احمد (٢١٧/١) وابو داود (٢٢٤٠) والترمذي (١١٤٣) وابن ماجة (٢٠٠٩).

---

(١) ئەم فەرموده لەراقەی فەرمودەی هەمان ژمارە دایە ، نیل الاوطار ج٤ /ل/ ٢٤٢.

له عەبدوڵای كوڕی عەباسەوە رضي الله عنهما هاتوە، كە: پێغەمبەر ﷺ زەینەبی كچی دایەوە بە مێردەكەی، كە (ابوالعاصی كوڕی رەبیع بو) هەر بە مارەی پێشوو، هیچ شتێكی تازە پەیدا نەبوو.

بەڵێ بەڕاستی لەم فەرمودانەو لە واقیعی یارەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ وا دەرئەكەوێت، كە بە مسوڵمان بونی یەكێك لە ژنو مێرد نیكاح هەڵناوەشێتەوە، تا یەكێكیان هەوڵی جیابونەوە نەدات، واتە ئەو بینایە ناڕوخێت، تا یەكێكیان دەستكاری نەكات. والله اعلم.

٥٨٩-ن /٢٧٢٨ ((عَنْ اَبِي سَعِيدٍ: اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ بَعَثَ جَيْشاً اِلَى اَوْطَاسَ فَلقِيَ عَدواًّ فَقَاتَلُوهُمْ فَظَهَروُا عَلَيْهِمْ وَاَصَابُوا لَهُمْ سَبَايَا فَكَأَنَّ نَاساً مِنْ اَصْحَابِ النَّبِيِّ تَحرَّجُوا مِنْ غِشْيَا نِهِنَّ مِنْ اَجْلِ اَزْواجِهِنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعالَى فِي ذَلِكَ (وَالْمُحَصنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ الاَّ مَا مَلَكَتْ اَيْمَانُكُمْ: اَيْ فهُنَّ لَكُمْ حَلاَلٌ اِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهُنَّ)) رواه الجماعة الاّ البخاري وابن ماجة. رواه مسلم (٣٣/ ١٤٥٦) والنسائي (٦/ ١١٠) وابوداود (٣١٥٥) وكذلك احمد (٣/ ٨٤) وليس عِنْدَهُ الزِيَادَةُ فِي آخِرِهِ بَعْدَ الآيَةِ، والترمذي (١١٣٢، ٣٠١٦) مختصراً.

له باوكی سەعیدەوە رضي الله عنه هاتوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی حونەین كۆمەڵێك لە یارەكانی نارد بۆ ئەوتاس، لەوێ گەیشتنە دوژمنو شەڕیان كردو سەركەوتن بەسەریانداو لەوانە هەندێ ئافرەتیان دەستكەوت، جا چوون هەندێ لە یارەكانی پێغەمبەر ﷺ پێیان ناخۆش بوو بچنە لای ئەو ئافرەتانە لەبەر مێردەكانیان، خوای باڵادەست ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە كە ئەفەرموێ: (قەدەغەیە لێتان ئافرەتانی مێرددار، جگە لەوانەی كە ئەبن بە موڵكتان)، واتە ئەوانە حەڵاڵە بۆتان، وە گوێ نادرێ بەوەی كە مێردی كافریان هەیە. واتە: بەوهە لۆێستە خراپەیان و بەو بەرە نگاریەی ئیسلام وموسڵمانان كردویانە ئەو حورمەتەیان نامێنێ، والله اعلم

# مارەیــی ئافــرەت

٥٩٠ -ن /٢٧٣٢ ((عَنْ اَنَسٍ اَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ رَأَى عَلَى عَبدِالْرَّحمنِ بِنْ عَوْفٍ اَثَرَ صُـفْرَةٍ فَقَالَ: (مَا هَذَا؟) قَالَ تَزَوَّجْتُ امْرأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: بَارَكَ اللهُ لَكَ، أَوْ لَمْ وَلَوْ بِـــشَاةٍ) رواه الجماعـــة خ(٥١٥٣) م(٨١/١٤٢٧) احمـــد (٣/١٩٠،٢٠٤، ٢٧١،٢٠٥) وابوداود (٢٠١٩) والترمذي (١٩٣٣) النسائي (١٣٧/٦) وابن ماجة (١٩٠٧))).

لە ئەنەسەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ چاوی بـە عەبـدورەحمانی كـوڕی عـەوف كەوت، بینی شوێنەواری زەردایی‌یەكی پێوەیە، فەرمووی: ئەمە چیە؟

وتی: ژنم هێناوە لەسەر ناوكێك زێڕ -شتێكی كەم بوە-

فەرموی (خوا پیرۆزی كات لێت، دەعوەتێ بكە، ئەگەر بە یەك مەڕیش بێ). واتە:

١- مارەیی ئەگەر كەمیش بێت قەیناكە.

٢- دەعوەتی نان خواردن بۆ ژن گواستنەوە سوننەتە.

## فێر كردنی قورئان ئەكرێ بە مارەیی ئافرەت

٥٩١-ن /٢٧٣٩ ((عَنْ سَهْلِ ابْنِ سَعْدٍ: اَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ جَاءَتْـهُ امْـرَأَةٌ فَقَالَـتْ: يَارَسُـولَ اللهِ انِيِّ قَدْ وَهَبْتُ نَفْسِي لَكَ فَقَامَتْ قِياماً طَويلاً، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَـالَ يَارَسُـولَ اللهِ زَوّجَنيِهَـا انْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةً فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: ((هَلْ عِنْـدَكَ مِـنْ شَـيْءٍ تُـصْدِقُهَا اِيَّـاهُ ؟)) فَقَالَ : مَاعِنْدِي الاّ اِزَارِي هَذَا، فَقَالَ: النَّبِـيَّ ﷺ (( اِنْ اَعْطَيْتَهَا اِزَارَكَ جَلَسْتَ لاَ اِزارَ لَـكَ فَالْتَمِسْ شَيْئاً)) فَقَالَ : مَا اَجِدُ شَيْئاً فَقَالَ: ((الْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ)) فَالْتَمَسَ فَلَـمْ يَجَدْ شَيْئاً، فَقَالَ لَهُ النَّبِـيَّ ﷺ: ((هَلْ مَعَـكَ مِـنَ القُـرْآنِ شَـيْءٌ؟)) قَـالَ: نَعَـمْ سُـورَةُ كَـذَا وَسُورَة كذا لِسُوَرٍ يُسَمِّيهَا. فَقَالَ لَهُ النَّبِـيَّ ﷺ: (( قَدْ زَوَّجْتَكَهَـا بِمَـا مَعَـكَ مِـنْ القُـرْآن))

مُتفقُ عليه ، وَفِي رِوَايَةٍ مُتَّفقٍ عَلَيْهَا: قَدْ مَلَّكْتَكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنْ القُرآن) وَفِي رِوَايَةٍ مُتَّفَقٍ عَلَيْهَا (فَصَعَّدَ فِيهَا النَّظَرَ وَصَوَّبَهُ) خ (٥١٣٠، ٥٠٣٠، ٥١٢١، ٥٠٨٧، ٢٣١٠، ٥١٣٢) احمد (٥/٣٣٠) وابوداود م(١٤٢٥) (٢١١١) والترمذي (١١١٤) النسائي (٦/١١٣) وابن ماجة (١٨٨٩))).

له سەهلی كوڕی سەعدەوە رضي الله عنهما هاتوە، كە ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من خۆم بەتۆ بەخشیوە، جا زۆر بە پێوە وەستا، ئینجا كابرایەك هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەگەر تۆ پێویستت پێی نیە لەمنی مارەبكە، پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: هیچ هەیە لەلات، كە بیكەی بە مارەیی بۆی؟

وتی: هیچم لانیە بێجگە لەم كراسەم.

پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەگەر كراسەكەتی پێ بدەیت خۆت بێ‌كراس دائەنیشیت، بگەڕێ بۆ شتێكی تر، كە بیدەیتێ.

وتی هیچم دەست ناكەوێت، فەرموی: بگەڕێ -شتێ پەیدا بكە- ئەگەرچی ئەنگوستیلەیەكی ئاسنیش بێ، گەڕاو هیچی دەستنەكەوت.

ئینجا پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: هیچ لە قورئان لەبەرە؟

وتی: بەڵێ: سورەتی فلاڵنو سورەتی فلاڵنو چەند سورەتێكی ناوبرد.

جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەوە مارەم بڕی لێت لەسەر فێركردنی ئەو ئەندازە قورئانەی كە ئەیزانی.

لە ڕیوایەتێكی تردا هاتوە، كە كردم بە موڵكت لەسەر ئەو قورئانەی، كە لەبەرتە.
لە ڕیوایەتی تردا هاتوە، كە چاوێكی پێدا خشان لە خوارەوە بۆ سەرو سەری داخست.

٥٩٢-ن /٢٧٤١ (( عَنْ عَلَقَمَةَ فِي امْرَأَةٍ تَزَوَّجَهَا رَجُلٌ ثُمَّ مَاتَ عَنْهَا وَلَمْ يُفْرِضْ لَهَا صِدَاقاً وَلَمْ يَكُنْ دَخَلَ بِهَا قَالَ: فَاخْتَلَفُوا اِلَيْهِ فَقَالَ: اَرَىَ لَهَا مِثْلَ مَهْرِنسَائِهَا وَلَها الْمِيرَاثُ وَعَلَيْها الْعِدَّةُ فَشَهِدَ مَعْقِلُ بِنْ سِنَانٍ الاَشْجَعَيَّ (اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى فِي بَرْوَعٍ ابْنَةَ وَاَشِقٍ بِمِثْلِ مَا قَضَى، رواه الخمسة وصححه الترمذي))) احمد (٣/٤٨٠) وابوداود (٢١١٥)

والترمذي (١١٤٥) والنسائي (٦/ ١٢١، ١٢٢) وابن ماجة (١٨٩١).

له عەلقەمەوە هاتوە، کە وتویەتی: لە باسی ئافرەتێ، کە پیاوێك خواستبوی، لە پاشا مردبوو مارەیی بۆ دانەنراو بوو کابرا نەیگواستبۆوە ــ جیماعی لەگەڵ نەکردبوو ــ، وتی: ناکۆکیەکەیان هێنایە لای، وتی: من‌وای بۆ دەچم، کە بە وێنەی ئافرەتانی خزمی مارەیی بۆ هەیەو میرات وەرئەگرێو، ئەبێ عیدەی ــ وەفاتیش ــ تەواو بکات. لەوکاتەدا مەعقەلی کوڕی سەنانی ئەشجەعی شایەتیدا، کە: پێغەمبەرﷺ بڕیاریدا بۆ بەروەعی کچی واشیق بەو شێوەیەی، کە تۆ بڕیارتدا.

٥٩٣-ن /٢٧٤٤ ((عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ اَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ اَيُّمَا امْرَأَةٍ نُكَحَتْ عَلَى صَدَاقٍ اَوْ حِباءٍ أَوْ عِدَةٍ قَبْلَ عِصْمَةِ النِّكَاحِ فَهُوَ لَهَا وَمَا كَانَ بَعْدَ عِصْمَةِ النِّكَاحِ فَهُوَ لِمنْ أُعْطِيَهُ، وَاَحَقُّ مَا يُكَرَمُ عَلَيْهِ اَلرّجُلُ ابْنَتَهُ وَأُخْتَهُ، رواه الخمسة الا الترمذي/ احمد (١٨٢/٢) وابوداود (٢١٢٩) والنسائي (٦/ ١٢٠) وابن ماجة (١٩٥٥))).

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەر ئافرەتێك لەسەر مارەییەك مارەکرا، یان بە هەر شتێك، یان بەڵێنی شتێکی پێدرا پێش ئەوەی مارە بکرێت، ئەوە هی ئەو ــ ئافرەتەیە ــ ئەوەی پاش نیکاحەکە بڕیار درا بۆ ئەو کەسەیە، کە بڕیاری بۆ ئەدرێت. شایەستەترین شت، کە پاداشتی پیاو بدرێتەوەو ڕێزی بۆ دابنرێت کچیو خوشکیەتی، واتە پاش مارەبڕین، ئەگەر کابرای زاوا هەرچی ببەخشێ بە باوکی بوك، یان برای، شتێکی چاکەو حەڵاڵەو بۆ خۆی دەبێ، بەڵام پێش مارەبڕینی هەرچی وترا، هی ئەو ئافرەتەیەو باوكو برا مافیان تێدا نیە، ئەگەر بەناوی ئەوانیشەوە بێ، چونکە لەباتی کچەکەدا هاتوەو کابرا ناچار، یان روگیر بووە ناوی باوك، یان کەس‌وکاری ئافرەتەکەی بردوە، ماڵەکە بەبێ هیچ هۆیەك ئەخورێتو بەر فەرمودەی (بِمَ أَكَلَ مَالَ اَخِيكَ؟) بەچی ماڵ براکەت ئەخۆی ، ئەکەوێت.

# دەعوەتی ژن گواستنەوە

٥٩٤- ن /٢٧٤٦ (( عَنْ اَنَسٍ قَالَ: مَا اَوْ لَمْ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى شَيْءٍ مِنْ نِسَائِهِ مَا اَوْلَمْ عَلَى زَيْنَبَ، اَوْ لَمَ بِشَاةٍ )) متفق عليه احمد (٣/ ٢٢٧) (خ/ ٥١٦٨) (م/٩٠/١٤٢٨) وابوداود (٣٧٤٣))).

لە ئەنەسەوە ﷺ هاتوە، کە وتویەتی پێغەمبەر ﷺ خواردنی دروست نەکردوە بۆ ژن گواستنەوە، وەکو ئەو دەعوەتکردنەی کردی بۆ زەینەب، مەڕێکی سەربڕی، هەروەها لە حەدیسی عەبدورەحمانی کوڕی عەوفیشدا پێغەمبەرمان ﷺ فەرموی دەعوەت بکەن، ئەگەر بەمەڕێکیش بووە.

٥٩٥ -ن /٢٧٥٠ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: (شَرُّ الطَّعَام طَعَامُ الْوَلِيمَةِ تُدْعَى لَهَا الأَغْنِيَاءُ وَتُتْرَكَ الْفُقَرَاءُ وَمَنْ لَمْ يُجِب الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللهَ وَرَسُولَهُ) رواه البخاري (٥١٧٧) ومسلم (١٤٣٢) وابوداود (٣٧٤٢) وابن ماجة (١٩١٣))).

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: خراپترین خواردن خواردنی ژن گواستنەوەیەکە دەوڵەمەند بانگ کرابێ و، واز لە فەقیر هێنرابێ، هەرکەسێك وەڵامی بانگکردنی ژن گواستنەوە نەداتەوە، بەڕاستی نافەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە. ئەمە بە مەرجێك وایە، کە لەو جێگادا شتی بێ شەرعی وەکو تێکەڵاوی ئافرەتو پیاوو بونی وێنەو مۆسیقاو گۆرانی نەبێ، یان ئەگەر ببێت بەو لەناو ببرێت[1].

٥٩٦ -ن /٢٧٥٣((وعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اِذَا دُعِيَ اَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ فَاِنْ كَانَ صَائِماً فَلْيُصَلِّ وَاِنْ كَانَ مُفْطِراً فَلْيُطْعِمْ، رواه احمد (٥٠٧/٢) ومسلم (١٠٥/١٤٣٠) وابوداود (٢٤٦٠) والترمذي (٧٨٠))). هەر لەوەوە ﷺ هاتوە، کە وتویەتی:

---

(١) با تەماشای ئاخری باسی (ولیمە لە مغنی موحتاجدا) بکرێت زۆر بەسودە بۆ ئەم دەعوەتەو شێوەکانی، تەماشای فەرمودەی (٥٩٨) بکە.

پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رمویه‌تی: هه‌ركاتێ یه‌كێك له‌ ئێوه‌ بانگ كرا، باوه‌ڵام بداته‌وه‌، جا ئه‌گه‌ر به‌ ڕۆژو بوو دوعای خه‌یری بۆ بكات، ئه‌گه‌ر به‌ ڕۆژو نه‌بوو، با خواردن بخوات.

٥٩٧-ن /٢٧٥٦ ((عَنْ عَائِشَةَ اَنَّهَا سَأَلَتِ النَّبِيَّﷺ فَقَالَتْ: انَّ لِي جَارَيْنِ فَأَليَ اَيِّهِمَا اُهْدِيَ؟ فَقَالَ: الَى اَقْرَبِهِمَا مِنْكَ بَابَاً)) رواه احمد (٦/ ١٧٥، ١٨٧) والبخاري (٦٠٢٠).

له‌ دایكی باوه‌ڕدارانه‌وه‌ خاتون عایشه‌ رضي الله عنها هاتوه‌، كه‌ ئه‌و پرسیاری كرد له‌ پێغه‌مبه‌رﷺ، وتی: من دوو هاوسێم هه‌یه‌، بۆ كامیان دیاری به‌رم؟

فه‌رموی: بۆ ئه‌وه‌یان، كه‌ ده‌رگاكه‌ی لێته‌وه‌ نزیكه‌. هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر دوو بانگكه‌ر بانگیان كرد به‌یه‌كه‌وه‌، بابچێت بۆ لای ئه‌وه‌یان، كه‌ ده‌رگاكه‌یان له‌ تۆوه‌ نزیكه‌، ئه‌گینا كامیان له‌ پێشه‌وه‌ بوو، پێویسته‌وه‌ڵامی ئه‌وه‌ بدرێته‌وه‌[1].

٥٩٨-ن /٢٧٦٠ ((عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ صَنَعْتُ طَعَاماً فَدَعَوْتُ رَسُولَ اللهِﷺ فَجَاءَ فَرَأَي فِي الْبَيْتِ تَصَاوِيَر فَرَجَعَ)) رواه ابن ماجة (٣٣٥٩) والنسائي (٢١٣/٨).

له‌ عه‌لیه‌وه‌ رضي الله عنه هاتوه‌ كه‌وتویه‌تی: خواردنێكم دروست كردو بانگی پێغه‌مبه‌ری خواﷺ كرد ئه‌ویش هات بۆ لام، به‌ڵام كاتێ چاوی به‌ چه‌ند وێنه‌یه‌ك كه‌وت له‌ناو ماڵدا گه‌ڕایه‌وه‌. واته‌ ئه‌گه‌ر له‌وشوێنه‌دا شتی بێ‌شه‌رعی هه‌بوو، ئه‌توانێ وه‌ڵامی بانگكه‌ره‌كه‌ نه‌داته‌وه‌. ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێ، كه‌ وێنه‌ چه‌نده‌ نادروستو ناڕه‌وایه‌، خۆزگه‌ موسڵمانان خواپه‌رست بوونایه‌، نه‌ك خۆپه‌رستو ئاره‌زووپه‌رست، هه‌رماڵێك ده‌بینی ئه‌ڵێیت عه‌نتیكه‌ خانه‌یه‌؟؟!!

---

(١) ته‌ماشای فه‌رموده‌ی ژماره‌ (٢٧٥٥)، له‌ نیل الاوطار، بكه‌.

# دەف لێـدان و ئالەتی گەمـە بۆ ژن گواسـتنەوە

٥٩٩-ن /٢٧٦٩ ((عَـنْ عَائِـشَةَ أَنَّهَـا زَفَّـتِ امْـرأَةً اِلَـى رَجُـلٍ مِـنَ الأَنْـصَارِ، فَقَـالَ النَّبِـيُّ ﷺ يَاعَائِشَةُ، مَا كَـانَ مَعَكُـمْ مِـنْ لَهْـوٍ فَـاِنَّ الأَنْـصَارَ يُعْجِـبُهُمُ اللَّهْـوُ، رواه احمـد (٢٦٩/٦) والبخاري (٥١٦٢))).

لە دایکی باوەڕدارانەوە خاتون عایشە هاتوە، کە ئافرەتێکی گواستەوە بۆ پیـاوێکی یاریـدەدەر، پێغەمبـەرﷺ فـەرموی: عایـشە! شـتێکتان نـەبوو سـەرگەرمکەر پێـت؟ بەڕاستی یاریدەرەکان سەرگەرمکەریان پێخۆشە .(لهو) سەرگەرمکەر -گاڵتەو گەمە.

بەڵی دەف لێدان بۆ ئەو شتانە باشە، نەك بۆ یادی خوا، چونکە یـادی خـوا شـتێکی راستو دروستەو، دەف لێدان گاڵتەو گەمەیە، دەی موسڵمانان کەی ڕەوایە ئەو دوانە بە یەکەوە بن؟!

٦٠٠-ن /٢٧٧٤ ((عَنْ عَمروْ بِنْ شُعَيْبٍ عَنْ اَبِيه عَنْ جدِّه عَـنْ النَّبِـيِّ ﷺ قَـالَ: (اِذَا اَفَادَ اَحدُكُمُ امْرَأَةً اَوْ خَادِماً اَوْ دَابَّةً - فَلْيَأْخُذْ بِنَاصِـيَتَها وَلْيَقُـلْ: اللّهُـمَّ اِنـيِّ أَسْـأَلُكَ مِـنْ خَيْرِهَا وَخَيْرِ مَاجَبَلْتَهَا عَلَيْه وَاَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَـرِّمَا جَبَلْتَهَـا عَلَيْـهِ) رواه ابـن ماجـة (١٩١٨) وابوداود (٢١٦٠) بمعناه)).

لە عەمری کوڕی شـوعەیبەوە لـە باوکیـەوە لـە باپیریـەوە، لـە پێغەمبـەرەوەﷺ هاتوە، کە فەرمویەتی: هەرکام لە ئێوە ئەگەر ژنی خواست، یان خزمە تکارێکی دەسـت کەوت، یان وڵاخێکی کڕی، جاهەرکاتێ ویستی دوعایان بۆ بکات، با ناوچاوانی بگـرێو بڵێ: (ئەی خوایە داوات لێ ئەکەم لـە خەیرەکـەیو خـەیری ئـەوەیش، کـە ئەمـەت بـۆ دروست کردوەو، پەنا ئەگرم لە شـەڕیو لـە شـەڕی ئـەوەیش، کـە ئـەمت بـۆ دروسـت کردووە).

٦٠١-ن /٢٧٧٧ ((عَنْ اِبِـنْ مَـسْعُودٍ اَنَّـهُ قَـالَ: لَعَـنَ اللهُ الوَاشِـمَاتِ وَالْمُـسْتَوْشِمَاتِ

وَالْمُتَنَمِّصاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللهِ تَعَالَى وَقَالَ: مَالِي لاَ اَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللهِﷺ)). رواه البخاري (٥٩٣٩) ومسلم (٢١٢٤) والنسائي (١٢٦/٨) والترمذي (٢٧٨٢))).

له عەبدوڵای كوڕی مەسعودەوە‌رضي الله عنهما هاتوه، كە وتويەتی (نەفرينی خوا لەو ئافرەتانەی، كە خاڵ ئەكوتن‌و ئەوانەی داوای خاڵ كوتان دەكەن ئەوانەی كە بڕۆيان باريك دەكەنەوەو ئەوانەی، كە ددانيان باريك ئەكەن بۆ جوانی‌و تێكدەرانی دروستكراوەكانی خوای باڵادەستن،وتی چيە بۆمن نەفرين نەكەم لەو كەسەی كە پێغەمبەری خوا نەفرينی لێكردوە. بەداخەوە سەرەڕای ئەم فەرمودەيەو دەيان فەرمودەی ڕاستی تر، هێشتا دەبينين، ئارەزووبازان فتوای حەڵاڵبونی ئەدەن‌و هيچ گوێيان لەو فەرموودانە نيە؟! لەباتی ئيجتيهاد، بە ئيشتيهاوە خەريكن؟؟!!.

٦٠٢-ن /٢٧٨٥ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ اَنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: لَوْ اَنَّ اَحَدَكُمْ اِذَا اَتَى اَهْلَهُ قَالَ: بِسمِ اللهِ، اَللّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَأنْ قُدِّرَ بَيْنَهُمَا فِي ذَلِكَ وَلَدٌ لَنْ يَضُرَّ ذَلِكَ الْوَلَدَ الشَّيْطَانُ اَبَداً(( رواه الجماعة (خ/١٤١) (م/١٤٣٤) والنسائي في عمل اليوم والليلة (١٤٤) احمد (٢١٧/١، ٢٢٠، ٢٤٣، ٢٨٣) وابوداود (٢١٦١) والترمذي (١٠٩٢) وابن ماجة (١٩١٩).

له عەبدوڵای كوڕی عەباسەوە (رضي الله عنهما) هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرمويەتی: ئەگەر هەر كام لە ئێوە ويستی بچێتە لای خێزانەكەی خۆی، با بڵێ: بەناوی خوا ئەی خوايە دورمان بخەرەوە لە شەيتان‌و، شەيتانيش دور بخەرەوە لەوەی، كە پێمان دەدەيت. جا ئەگەر بڕيار بێ لەوجارەدا منداڵيان ببێ، ئەوە شەيتان هەرگيز زيان بەو منداڵە ناگەيەنێ...

٦٠٣-ن /٢٧٩٤ ((عَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وهْبٍ الاَسَدِيَّةِ قَالَتْ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللهِﷺ فِي النَّاسِ وَهُوَ يَقُولُ: (لَقَدْ هَمَمْتُ اَنْ اَنْهَى عَنْ الْغَيْلَةِ فَنَظَرْتُ فِي الرُّومِ وَفَارِسَ فَاذا هُمْ يَغيلُونَ اَوْلاَدَهُمْ فَلاَ يَضُرُّ اَوْلاَدَهُمْ شَيْئاً ثُمَّ سَأَلُوهُ عَنِ الْعَزْلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ ذَلِكَ الْوَأْدُ

الْخَفِيُّ وَهَـيَ ((وَإِذَا ٱلْمَـوْءُدَةُ سُـئِلَتْ)) (التكـوير- ٨) رواه الجماعـة الاّ البخـاري، احمـد (٣٦١/٦، ٤٣٤) (م/١٤٠/١٤٤٢) وابــوداود (٣٨٨٢) والترمــذي (٢٠٧٦) والنــسائي (١٠٦/٦، ١٠٧) وابن ماجة (٢٠١١))).

لــە جوزامــەی كــچی وەهبــەی ئەســەدییەوە هــاتوە، كــە وتویــەتی: لــە خزمــەتی پێغەمبەری خوادا بووم لەگەڵ كۆمەڵێ خەڵكاو ئەیفــەرمو: بــە ڕاســتی ویــستم ڕێگــری بكەم لە (غەیلە) -چوونە لای ئافرەت لەكاتی حەملداو لەكاتی شیرداندا ـ تەماشام كرد ڕۆمو فارس وا ئەكەن بە منداڵەكانیان-، واتــە ئەچــنە لای دایكــی منداڵــەكانیان ـ هــیچ زیانێك ناكەوێت لە منداڵەكانیان - لە پاشدا پرسیاری عەزلیان لێكرد، واتە: پیــاو ئــاوی نەكاتە ناو ڕەحمی خێزانیەوە بۆ ئەوەی منداڵی نەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەوە زیندە بەچاڵكردنێكی شاراوەیە،و ئەوە ئەم ئایەتەیە، كە ئەفەرموێ: (وە هەركاتێ زیندە بەچاڵكراوەكان پرسیاریان لێكرا) تەكویر ـ ٨لێرەدا وادەرئەكەوێ، كە ئەو لادانــە(عــزل) شتێكی خراپەو شێوەی زیندەبە چاڵی هەیە، بەڵام زیندەبە چاڵ نیــە، واتــە: بــەو شــێوە تاوانەكەی گەورە نیەو، لە فەرمودەی تردا هــاتوە، كــە ئەگــەر نەیكــەن چــاكە، چــونكە ئەگەر خوا بیەوێ كەسێ دروست بكات، كەس ناتوانێت ڕێگای پێ بگرێت..[1]*.

(١) بۆ زیاتر ڕوونبوونەوە با تەماشای ژمارە (٢٧٨٨-٧٩٥)، لە سەرچاوەی پێشوو، بكەن.

* ـــ هەروەها چەند بەڵگەیەكی دیكە هەیە، كە ڕێگە بە(عزل) دەدەن:

١- جابر گویەتی: (كنا نعزل علی عهـد رسـول الله والقـرآن ینـزل) رواه البخــاری ومــسلم واتــە: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (عزل) مان دەكردو قورئانیش دادەبەزی- ڕێگری لێ نەدەكردین.

٢- هەر لەجابرەوە هاتوە، كە گوتویەتی: (كنا نعزل علی عهد رسول الله، فبلغ ذلك، رسول الله، فلم ینهنــا) رواه مــسلم . واتــە: لەســەردەمی پێغەمبــەرﷺ (عــزل)مــان دەكــردو، ئەمــەش بــە پێغەمبەری خوا ڕاگەیەنرا، بەڵام ئەو ڕێگری لێ نەكردین.

هەروەهاصەحابەش ڕێیان پێداوە، وەك: سەعدی كوڕی ئەبی وەقاسو ئــەبی ئەیوبیئەنــساریو، زەیدی كوڕی سابتو، ئیبنو عەبباسو.. كەسانی دیكەش. ئەمە مەزهەبی مالــكو شــافعییە. (فقــه السنة- سید سابق- م٢، ص٤٥٨). نوسینگەی تەفسیر.

## ڕێگـری ژن ومێرد لە باسـکردنی ئەو شـتەی، کە لە نێوانیاندا لە کاتی جیماع دا ڕوئەدات.

٦٠٤-ن /٢٧٩٦ ((عَنْ اَبِي سَعِيدٍ اَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ قَالَ: (انَّ شَرَّ النَّـاسِ عِنْـدَ اللهِ مَنْزِلَـةً يَومْ اَلْقِيَامَةِ الرَّجُلُ يُفْضِي اِلَى الْمَرْأَةِ وَتُفْـضِي اِلَيْـهِ ثُـمَّ يُنْـشِرِ سِرَّهَا) رواه احمـد (٦٩/٣) ومسلم (١٢٣/١٢٤ـ١٤٣٧) وابوداود (٤٨٧٠))).

لە باوکی سەعیدەوە ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: بـە ڕاسـتی خـراپترین خەڵك لە پلەوپایەدا لەلای خوا لەڕۆژی قیامەتـدا، ئـا ئـەو پیاوەیـە، کـە ئەچـێتە لای خێزانی خۆیو، لە پاشان نهێنییەکانی بڵاوئەکاتەوە.

## جیماع لە پاش ئافرەتەوە قەدەغەیە

٦٠٥-ن /٢٨٠١ ((عَنْ اَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عَلِّي بْنِ اَبِي طَالِبٍ ﷺ اَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ قَالَ: (لاَ تَأْتُوا النِّـسَاءَ فِـي اَعْجَـازِهِنَّ اَوْ قَـالَ - فِـي اَدْبَـارِهِنَّ. رواه احمـد (٨٦/١) قـال (في مجمـع الزوائد) رجاله ثقاة (٣٠٣/٤))).

لە ئەمیری باوەڕدارانەوە عەلی کوڕی ئەبو تالبەوە ﷺ هاتوە، لـە پێغەمبــەرەوە ﷺ، کە فەرمویەتی: نەچنە لای ژنانەوە لە دوایانەوە. واتە: تەنها جێگای مناڵ بوون ڕەوایــەو بەس. جا بۆئەو جێگا ڕەوایە بەهەر شێوەیەك ببێت دروستە، وەکو ئەم فـەرمودەی دادێ ڕونی ئەکاتەوە.

٦٠٦-ن /٢٨٠٥ ((عَنْ جَابِرٍ اَنَّ يَهُـودَ كَانَـتْ تَقُـولَ: اِذَا اُتِيَـتِ الْمَـرْأَةُ مِـنْ دُبُرِهَـا ثُـمَّ حَمَلَـتْ كَـانَ وَلَـدُهَا اَحْـوَلُ. قَـالَ فَنَزَلَـتْ ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ...﴾ (البقـرة- ٢٢٣) رواه الجماعــة الا احمــد، غــير ان النــسائي في الكــبرى كمــا في التحفــة

(٣٦٣/٢) خ (٤٥٢٨) (م/١٤٣٥) وابـوداود (٢١٦٣) والترمـذي (٢٩٧٨) وابـن ماجـة (١٩٢٥))).

له جابیرەوەﷺ هاتوه، که جولەکه وتویانـه: ئەگـەر ئـافرەت لـه پاشـەوه جیمـاعی لەگەڵدا بکرێتو، لەپاشا دوگیان ببیّ، منالەکەی خێل دەبیّ، وتـی: ئـەم ئایەتـه هاتـه خوارەوە (ئافرەتەکانتان کێڵگەی خۆتانن بچنه لایان چـۆنتان پـیّ خۆشـه) بـەم شـێوەیه بەدرۆی خستنەوه، بەلاّم جێگای بەروبووم یـەك شـوێنه لـه قـسەی جولـه کەکانیـشەوه دەرئەکەویّ، که هەر ئەو شوێنه مەبەسته، چونکه تەنها لەو شـوێنەوه ئـافرەت دوگیـان دەبیّ.

٦٠٧-ن / ٢٨١٠ ((عَـنْ اَبِـي هُرَيْـرَةَ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِﷺ: اَنَّ الْمَـرْأَةَ كَالـضِّلَعِ اِنْ ذَهَبْـتَ تُقِيمُهَـا كَـسَرْتَهَا وَاِنْ تَرَكْتَهَـا اسْـتَمْتَعْتَ بِهَـا عَلَـى عِـوَجٍ (وَفِـي لَفْـظٍ (اسْتَوْصَـوْا بِالنِّسَاءِ فَاِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ وَاَنَّ اَعْوَجَ شَيْءٍ فِـي الـضِّلَعِ اَعْـلاَهُ فَـاِنْ ذَهَبْـتَ تُقِيمُـهُ كَسَرْتَهُ وَاِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَـزَلْ اَعْـوَجَ فَاَسْتَوْصَـوُا بِالنِّـسَاءِ)). متفـق عليـه خ(٣٣٣١،٥١٨٤) م(٥٩،٦٠/١٤٦٨) احمد (٤٤٩/٢،٤٩٧، ٥٣٠).

له ئەبو هـورەیرەوەﷺ هـاتوه، کـه وتویـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی: ئافرەت وەکو پەراسو وایه —لارە- ئەگەر بچی ڕاسـتی بکەیتـەوه، ئەیـشکێنی-، واتـه ئەبیّ تەلاّقی بدەیت، ئەگەر وازی لێبهێنی لەزەتی لـیّوەرئەگریت لەسـەر ئـەو لارییـه. لەبێژەیەکی تردا هاتوه، که ئامۆژگاری وەرگرن لـەبارەی ئافرەتانـەوه -بـاش ڕەفتاریـان لەگەڵدا بکەن-، چونکه ئافرەت له پەراسـو دروسـت بـووه - ئـەو لـه پەراسـوی ئـادەم دروست کراوه - لارترین شت له پەراسودا لای سەریەتی -که حەوای لـیّ دروست بـووه، یان مەبەستی لارترین شوێن له ئافرەتان لای سەریەتی، که زمانی تێدایه لەو زمانەیـەوه هەمو لارییەکەی دەرئەکەوێت، جا ئەگەر بـچی ڕاسـتی بکەیتـەوه ئەیـشکێنی، ئەگـەر وازی لـیّبهێنی هەروا لار ئەبیّ. واته هەرگیز ڕاست نابێتەوه، دەی ئامۆژگـاری -خـواو پێغەمبەرو خەڵکانی چاك- سەبارەت به ئافرەت وەرگرەو بـاش بجـولێرەوه لەگـەڵیا، لـه

ڕیوایەتی تردا هاتوە، کە (ئەگەر لەو دا ڕەوشتێکی ناحەز هەبێت ڕەوشتێکی باشیشی تێدایە[١] - پێویستە باشەکەی بنرخێنیو چاوپۆشی بکەی لە خراپەکەی، تا ژیانێکی خۆشبەختانە ببەیتە سەر.

٦٠٨-ن /٢٨١٦ ((وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ اِذَا دَعَا الرَّجُلُ أَمْرَأَتَهُ اِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ اَنْ تجِئَ، فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا – لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِح) اخرجاه خ(٣٢٣٧) م(١٤٣٦/١٢٢)))

هەر لەوەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکاتێ پیاو داوای لەخێزانی کرد بۆسەر جێی و، ئەو بەگوێی نەکرد، ئەو شەوە لێی توڕەبێ، فریشتەکان هەتا ڕۆژ ئەبێتەوە، نەفرینی لێ ئەکەن.

٦٠٩-ن /٢٨٢١ ((عَنْ عَمْرِوْ بِنْ الأَحْوَص اَنَّهُ شَهِدَ حَجَّةَ الْوَداعِ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَحَمِدَ اللّٰهَ وَاَثْنَى عَلَيْهِ وَذكَّرَ وَوَعَظَ ثُمَّ قَالَ: اسْتَوْصَوْا بِالنِّسَاءِ خَيْراً فَاِنَّمَا هُنَّ عِنْدكُمْ عَوَانٌ، لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئاً غَيْرَ ذَلِكَ، اِلاّ اَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ فَاِنْ فَعَلْنَ فَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْباً غَيْرَ مُبرِّحٍ فَاِنْ اَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْتَغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً، اِنَّ لَكُمْ مِنْ نِسَائِكُمْ حَقًّا ، وَلِنِسائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا ، فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ فَلا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ وَلا يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ، اَلاَ وحَقُّهُنَّ عَلَيْكُمْ اَنْ تُحْسِنُوا اِلَيْهِنَّ فِي وَطَعَامِهِنَّ )). رواه ابن ماجة (٣٠٨٧،١١٩٣) والترمذي وصححه (٣٠٥٥،٢٦٦٩،١٨٥١).

لە عەمری کوڕی ئەحوەسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە ئەو بۆ حەجی ماڵ ئاوایی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بووە، کە - سوپاسی خوای کردووەو ستایشی کردوەو، بیری خستۆتەوە ئامۆژگاری کردووە، لەپاشا فەرمویەتی: ئامۆژگاری چاكوەرگرن لەبارەی ئافرەتانەوەو ـ ئامۆژگاری چاکیشیان بکەن ـ بەڕاستی ئەوان لەلای ئێوە دیلن، بۆ ئێوە هیچ مافێك نیە

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٢٨١١)، لە سەرچاوەی پێشوو، بکە.

بەسەر ئەوانەوە بێجگە لەوە ـ جیماع ـ مەگەر بەئاشكرا دەست بدەنە داوێن پیسی ــ ، واتە ئەوە مافی ئێوەیەو خیانەتتان پێ ئەكەنو لەمبارەوە بۆتان هەیە لێپرسینەوەو تەلاقدان بەم شێوەیەیە، كەـ ئەگەر وایان كرد لە جێگای خەوتندا وازیان لێبهێننو لەگەڵیاندا مەخەونو لێیان بدەن بە لێدانێك كە شوێنی نەشكێتو برینیدار نەبێ، جا ئەگەر پەیڕەوییان كرد ئیتر ئێوە بۆتان نیە ئازاریان بدەن، بەڕاستی ئێوە مافتان هەیە بەسەر ئافرەتانەوەو بۆ ئافرەتانیش مافیان هەیە بەسەر ئێوەوە، جا مافی ئێوە بەسەر ئافرەتانەوە ئەوەیە كە كەسێك نەهێننە سەر جێگاكانتان كە ئێوە خۆشتان لێیان نەبێو، ماوە نەدەن بۆ ماڵەكانتان بەكەسێك، كە ئێوە رقتان لێیان بێ، ئاگادار بن مافی ئەوانیش بەسەر ئێوەوە ئەوەیە، كە بەجوانی رەفتاریان لەگەڵدا بكەن لەبارەی پۆشاكو خۆراكەوە.

١٠-ن /٢٨٢٦ ((عَنْ جَابِرٍ اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: قَالَ اِذَا طَالَ اَحدُكُمُ الغَيْبَةَ فَلاَ يُطْرُقْ اَهْلَهُ لَيْلاً)). رواه الجماعة الاّ النسائي وابن ماجة خ (٥٢٤٣) م(٧١٥/١٨٤) احمد (٣٠٢،٢٩٩/٣) وابوداود (٢٧٧٦) والترمذي (٢٧١٢).

لە جابیرەوە ﷺ هاتوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ، كە فەرمویەتی: هەركاتێ یەكێك لە ئێوە ماوەیەكی زۆر لەماڵ نەبو, با بەشەو نەچێتەوە ناوخێزانی.

# باسی دابەشکردنی شەو مانەوە بۆ کچ و پێوەژنی تازە هێنراو بەسەر خێزانی کۆندا

٦١١-ن /٢٨٣٠((عَنْ اَبِي قِلاَبة عَنْ اَنَسٍ قَالَ: من السَّنَةِ اِذَا تَزَوّجَ اَلْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ اَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعاً وَاِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ اَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثاً، ثُمَّ قَسَمَ، قَالَ اَبُو قِلاَبَةَ: لَوْ شِئْتُ لَقُلْتُ: اِنَّ اَنَساً رَفَعَهُ اِلَى رَسُولُ اللهِ ﷺ) اخرجاه خ/٥٢١٣،٥٢١٤) م/١٤١٦/٤٤))).

له باوکی قیلابەوە لە ئەنەسەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: بەشێکە لەسوننەت هەرکاتێ کچی بەسەر بێوە ژندا هێنا، حەوت ڕۆژ لەلای بمێنێتەوە، هەرکاتێ بێوە ژنی هێنا سێ ڕۆژلەلای بمێنێتەوە، لەپاشدا - بەیەکسانی شەوەکان دابەش بکات بەسەر خێزانەکانیا، باوکی قیلابە وتویەتی: ئەگەر ئارەزوم لێبێ ئەڵێم: ئەنەس ئەمەی گەیاندوەتە پێغەمبەری خواﷺ، واتە فەرمودەکە بەرزکراوەیە (المرفوع)و نەوەستێنراوە (الموقوف)و ڕاستە.

# له چیدا پێویستە یەکسانی هەبێ لەنێوان خێزانەکاندا و لەچیدا پێویست نیە.

٦١٢-ن /٢٨٣٤ ((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ مَا مِنْ يَوْمٍ اِلاَّ وَهُوَ يَطُوفُ عَلَيْنَا جَمِيعاً امْرَأَةً امْرَأَةً فَيَدنُوُ وَيَلْمَسُ مِنْ غَيْرِ مَسِيسٍ حَتَّى يُفْضِيَ اِلَى الَّتي هُوَ يَوْمُهَا فَيَبِيتُ عِنْدَهَا)ى رواه احمد (١٠٧/٩) وابوداود (٢١٣٥) بنحوه. وَفِي لَفْظٍ: كَانَ اِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلاَةِ الْعَصْرِ دَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ فَيَدْنُو اِحَداهُنّ) اخرجاه خ/٥٢١٦) م/١٤٧٤/٢١))). له دایکی باوەر دارانەوە خاتون عائیشەرضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی:

پێغەمبەری خواﷺ هیچ ڕۆژێ نەبووە - کە لە ماڵدا بێ - مەگەر سوڕاوە بەسەر هەمو خێزانەکانیدا -کە نۆ خێزان بوون- ئافرەت بە ئافرەتو نزیـك ئـەبوەوە لێیـانو دەسـتی لـێئەدان بەڵام — جیماعی نەدەکرد - هەتا ئەگەیشتە ئەو ئافرەتەی، کـە ئەبوایـە ئـەو شەوە لای بوایە شەو لەوێ دەمایەوە..لەبێژەیەکی تردا هاتوە، کە: کاتێ کـە لـە نوێـژی عەسر ئەگەڕایەوە، ئەچووە لای خێزانەکانیو لە یەکێك لەوانەوە نزیك ئەبووەوە.

٦١٣-ن /٢٨٣٥ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِـيِّﷺ قَالَ: مَنْ كَانَـتْ لَـهُ اَمْرَأَتَـانِ يَـمِيلُ لاِحْدَاهُمَا عَلَى اْلأُخْرى، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَجُرُّ أَحَدَ شِقّيْهِ سَاقِطاً) اَوْ (مَائِلاً) رواه الخمسة. احمـد(٤٧١/٢) وابـوداود(٢١٣٣) والترمـذي(١١٤١) والنـسائي(٦٣/٧) وابـن ماجـة (١٩٦٩))).

لە ئەبو هورەیرەوەؓ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویـەتی: هەرکەسـێك دوو ژنـی هەبێو ئارەزوی لای یەکێکیانی هەبێو گوێ بەوی تریـان نـەدات، ڕۆژی قیامـەت، کـە دێتە مەیدانی مەحشەر لایەکی بەشوێن خۆیدا ئەکێشێ بەزەویدا، یـان (لایـەکی بـەرەو زەوی لاربووەتەوە). واتە: ئەبێ لەشەو جێگەو خۆراکو پۆشاك فـەرقیان نـەخات، بـەڵام مەسئەلەی خۆشەویـستی دڵـی، ئـەوە لەدەسـت کەسـدا نیـەو تـاوانی ناگـات، ئەگـەر یەکێکیانی لەوی تر یان زیاتر خۆشبوێت، وەکو لەم ڕیوایەتەی بەردەمدا دەرئەکەوێت.

٦١٤- ن /٢٨٣٦((عَنْ عَائِشَـةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله ﷺ يَقْسِمُ فَيَعْدِلُ وَيَقُـولُ: اللّهُـمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا اَمْلِكُ فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَـا تَمْلِـكُ وَلاَ أَمْلِـكُ) رواه الخمسة. احمـد (١٤٤/٦) وابوداود (٢١٣٤) والترمذي (١١٤١) والنسائي (٦٣/٧) وابن ماجة (١٩٧١))).

لە دایکی باوەڕدارانـەوە خـاتون عائیـشەؓ هـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خواﷺ شەوەکانو خۆراکو پۆشاکی دابەش ئـەکردو دادپـەروەر بـوو، ئەیفـەرمو: ئـەی خوایە ئەمە دابەشکردنی منە لەو شتەدا، کە موڵکی منە، لۆمـەم مەکـە لەسـەر ئـەو شتەی،کە لەدەسەڵاتی تۆدایەو توانای منی تێدا نیە،واتە:خۆشەویستیو موحیبەتی دڵ.

٦١٥- ن / ٢٨٣٩ ((وَعَنْهَا: اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: كَانَ اِذَا اَرَادَ اَنْ يَخْرُجَ سَفَراً اَقْرَعَ بَيْنَ اَزْوَاجِهِ فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ) متفق عليه. خ /٢٦٦١) م/٢٧٧٠) احمد (١٩٧/٦))).

هەر لەوەوە ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێ بیویستایە بۆ سەفەر دەرچێ، تیرو پشکی دەکرد لەناو خێزانەکانیا، کامیان بۆی دەرچوایە، لەگەڵ خۆیدا دەیبرد.

## باسی بەخشینی ئافرەت شەوی خۆی بە هەوێکەی

٦١٦- ن /٢٨٤٠ ((وَعَنْهَا اَيضاً: اَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا لِعَائِشَةَ وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُقْسِمُ لِعَائِشَةَ يَوْمَهَا وَيَوْمَ سَوْدَةَ) رواه البخاري (٥٢١٢) ومسلم (١٤٦٣) وابوداود(٢١٣٥) وابن ماجة (١٩٧٢)))

هەر لەوەوە ﷺ هاتوە، کە سەودەی کچی زەمعەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی خۆی بەخشی بە عائیشە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ ڕۆژ خۆیو ڕۆژ سەودەی پێ دەدا. واتە عائیشە لە نۆ ڕۆژدا دوو ڕۆژی هەبوو لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەمە دروستە.

## باسی تەڵاقی ئافرەت

٦١٧- ن /٢٨٤٣ ((عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ طَلَّقَ حَفْصَةَ ثُمَّ رَاجَعَهَا)) رواه الخمسة الا احمد والترمذي ابوداود والنسائي وابن ماجة وابوداود (٢٢٨٣) والنسائي (٢١٣/٦) ابن ماجة (٢٠١٦) ولاحمد من حديث عاصم بن عمر)).

لە ئەمیری باوەڕدارانەوە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ حەفسەی خێزانی -کە کچی عومەر بوو- تەڵاقیدا لەپاشدا هێنایەوە. واتە تەڵاقدان بۆ ناچاری دروستەو چاك وایە بەوشێوەیەبێ، کە بتوانێ ئەگەر پەشیمان بوونەوە بیهێنێتەوە، وەکو لەم فەرمودەی بەردەمدا بەچاکی ڕوون ئەبێتەوە.

٦١٨- ن /٢٨٤٧ ((عَنْ ابَنَ عُمَرَ قَالَ: كَانَتْ تَحْتي امْرَأَةٌ أُحِبُّهَا وَكَانَ أَبِي يَكْرَهُهَا فَأمَرني انْ أُطَلِّقَهَا فَأبَيْتُ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيﷺ فَقَالَ: يَا عَبْدَاللهِ بْنَ عُمَرَ طَلِّقِ امْرَأتَكَ رواه الخمسة الاّ النسائي وصححه الترمذي والحاكمُ وافقه الذهبي (٣٢٢/٧) احمد (٢٠/٢) وابوداود (٥١٣٨) والترمذي (١١٨٩) وابن ماجة (٢٠٨٨))).

له‌ عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ره‌وه‌ رضي الله عنه هاتوه‌، كه‌ وتویه‌تی: ژنێكم هه‌بوو خۆشم ده‌ویستو باوكم به‌لایه‌وه‌ ناحه‌ز بوو، فرمانی پێدام، كه‌ ته‌ڵاقی بده‌م، منیش نه‌مكرد، جا ئه‌وه‌ بۆ پێغه‌مبه‌رﷺ باسكرا فه‌رموی: ئه‌ی عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ر ژنه‌كه‌ت ته‌ڵاق بده‌، واته‌ په‌یڕه‌وی باوكت شایسته‌ تره‌، له‌ خۆشه‌ویستی ئافره‌تێك.

## ڕێگریكراوه‌ له‌ ته‌ڵاقدانی ئافره‌تێك، كه‌ له‌ حه‌یزدابێ، یا پاك بێ و جیماعی له‌گه‌ڵ دا كرابێ.

٦١٩- ن / ٢٨٤٨ ((وَعَنْهُ، انَّهُ طَلَّقَ امْرأَةً وَهِيَ حَائِضٌ فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِلنَّبِيﷺ فَقَالَ: مَره فَلْيُرَاجِعْهَا اَوْ لِيُطَلِّقْهَا طَاهِراً اَوْ حَامِلاً)) رواه الجماعة الاّ البخاري احمد (٢٦/٢، ٥٨) (م/٥/١٤٧١) وابوداود (٢١٨١) والترمذي (١١٧٦) والنسائي (١٤١/٦) وابن ماجة (٢٠٢٣).

له‌ عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ره‌وه‌ رضي الله عنه هاتوه‌، كه‌ خێزانی خۆی ته‌ڵاقداوه‌و له‌ حه‌یزا بووه‌، عومه‌ر رضي الله عنه بۆ پێغه‌مبه‌ری باسكردوه‌، پێغه‌مبه‌ریشﷺو فه‌رمویه‌تی: فرمانی پێ بده‌، با بیهێنێته‌وه‌، یان ته‌ڵاقی بدات، كه‌ پاك بێ -و جیماعی له‌گه‌ڵدا نه‌كردبێ - یان با دو گیان بێ.[1]

٦٢٠- ن / ٢٨٦١ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الطَّلاَقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ وَابَي بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خَلاَفَةِ عُمَرَ: طَلاَقُ الثَّلاثِ وَاحِدَةٌ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: انَّ النَّاسَ قَدِ

(١) ته‌ماشای فه‌رموده‌ی ژماره‌ ( ٢٨٤٨ ) بكه‌ له‌سه‌رچاوه‌ی پێشوو.

إسْتَعْجَلوُا فِي أَمْرٍ كَانَتْ لَـهُمْ أَنَاةٌ فَلَـوْ اَمْـضَيْنَاهُمْ عَلَـيْهِمْ، فَأَمْـضَاهُ عَلَـيْهِمْ)) رواه احمـد (٣١٤/١) ومسلم (١٤٧٢/١٥).

له عەبـدوڵڵای کـوڕی عەباسـەوەﷺ هـاتوە، کـە وتویـەتی: تـەڵاق لـە سـەردەمی پێغەمبەری خوداﷺو ئەبوبەکرو دوو ساڵی جێنشینی عومەر -سێ تەڵاقە یـەك بـووە، واتە بەیەك تەڵاق دائەنرا - جا عومەری کوڕی خەتابﷺ وتی: بەڕاسـتی خـەڵك پەلـە ئەکەن لە شتێکدا، کە ئەتوانن لەسەرخۆو ئارام بن، جا با ئێمەیش بۆیـان بڕیـار بـدەین، ئیتـر بڕیاردرا لەسەریان. واتە هەرکەسێ سـێ تـەڵاقی وت بەتـەواوی هیـچی نامێنـێ، بەگوێرەی ئەم فەرمودەیە پەلەی خەڵك وای لە عومەرﷺ کرد کە ئـەو بڕیـارە بـداتو، پەیرەوی کردنیشی دروستە، چونکە یەکێکـە لـە خەلیفـە راشـیدەکان و، پێغەمبـەرﷺ فەرمویەتی: ((عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَـاءِ الَراشِـدينَ... ڕێوشـوێنی مـنو ڕێوشـوێنی خەلیفە ڕاشیدەکان بگرن)).

## بەکارهێنانی وشـەی تەڵاق بەگاڵتە، یان بەزۆر، یان بـەهۆی سەرخۆشیەوە.

٦٢١- ن /٢٨٦٢ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ ثَلاَثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَـزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَـاحُ وَالطَّـلاقُ وَالرِّجْعَـةُ)). رواه الخمـسة الا احمـد والنـسائي وقـال حَـسَنٌ غَرِيـبٌ وابوداود (٢١٩٤) والترمذي (١١٨٤) وابن ماجة (٢٠٣٩).

له ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـواﷺ فەرمویـەتی: سـێ شت جدیان جدیەو گاڵتەیشیان هـەر جدیـە ئـەمانیش بـریتین لـە: نیکـاحو تـەڵاقو ژن گەڕاندنەوە. تەڵاق بەزۆرو ناچارکردن ناکەوێو چەندین ڕیوایەت لەمبارە هەیە.[1]

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٢٨٦٤-٢٨٦٥) بکە، لە سەرچاوەی پێشوو.

٦٢٢- ن / ٢٨٦٨ ((عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ اَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ نَذْرَ لاِبْنِ آدَمَ فِيمَا لاَ يَمْلَكُ وَلاَ عِتقَ لَهُ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ وَلاَ طَلاَقَ فِيمَا لاَيَمْلِكُ)) رواه الخمسة الا النسائي احمد (١٨٥/٢) وابوداود (٢١٩٠) والترمذي (١١٩٢) وابن ماجة (٢٠٤٧) وقال حديث حسن وهو احسن شيء في هذا الباب.

له عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لەباپیریەوە هاتوە، کە وتویەتی: ئادەمیزاد- نەزری لەسەر نیە لە شتێکا، کە مولْکی خۆی نەبێ‌و ئازادکردن نیە لە شتێکا کە مولْکی خۆی نەبێ‌و تەلاّقدان نیە لە کاتێکا کە مولْکی نیە. واتە کابرا بەر لە ژنهێنانی هەرچی تەلاّق بدات، بابیشلێت: هەرکاتێ ژنم هێنا تەلاّقی کەوتبێ، ئەوا تەلاّقی ناکەوێت، چونکە لەکاتی وتنەکەی خاوەنی تەلاّق نیە.

## بە وشەی کینایە تەلاّق ناکەوێ ئەگەر نیەتی نەبێ

٦٢٣- ن /٢٨٧٠ ((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: خَيَرَّنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَاخْتَرْنَاهُ فَلَمْ يَعُدَّهَا شَيْئاً)، رواه الجماعة خ/٥٢٦٣،٥٢٦٣)م/١٤٧٧/٢٧) احمد (٣٩/٦) وابوداود (٢٢٠٣) والترمذي (١١٨٩) والنسائي (١٦١/٦) وابن ماجة (٢٠٥٢))).

لەدایکی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی کرد سەرپشك کرد، ئێمەیش ئەومان هەلْبژاردو، ئەمەی بە هیچ دانەنا. واتە بەتەلاّقی حیساب نەکرد.

٦٢٤- ن /٢٨٧١ ((وَعَنْهَا اَنَّ ابْنَةَ الجَوْنِ لَمُّا اُدْخِلَتْ عَلَى رَسُولُ اللهِ ﷺ وَدَنَا مِنْهَا، قَالَتْ: اَعُوذُ بِاللهِ مِنْكَ فَقَالَ لَهَا: (لَقَدْ عُذْتِ بِعَظِيمٍ الْحَقِي بِأَهْلِكِ) رواه البخاري (٥٢٥٤) وابن ماجة (٢٠٥٠) والنسائي (١٥٠/٦) وقال (الكِلاَبِيَّةُ) بدل (الْجَوْنِ))).

هەرلەوەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وەختێ کچی جەون بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێناو لێی نزیك بوویەوە کچی جەون وتی: بەخوا پەنا ئەگرم لەتۆ، پێغەمبەریش پێی فەرمو:

بەڕاستی پەنات بەشتێکی گەورە گرت، بچۆرەوە بۆناو خانەوادەی خۆت. نەسائی لـەباتی کچی جەون، وتویەتی: کیلابیە. ئەمە بەڵگەیەکە، کـە تـەلاق بەکینایـە ئـەبێ، وشـەی (اَلْحقِي بِأَهْلِكِ/ بگەڕێوە ناو خانەوادەی خۆت) سێ تەلاق نیە، چـونکە لەشـوێنی تـردا، سەرزەنشتی سێ بەسێی کردووە، ناگونجێ خۆی ئەنجامی بدات،والله أعلم. لە ناوی ئـەو ئافرەتە دانارێکی هەیـەو وتـراوە: (فاتیمـەی کـچی زەحـاك ، عالیـەی کـچی زیبیـان، عەمرەی کچی یەزید. ئیبنو حەجەر لەفەتح دائەڵێ : ڕاست ئەوەیە، کە ناوی ئومەیمـەی کچی نوعمانی کوڕی شەراحیلە).

## تەڵاق هاتن بەدڵدا تا نەیەتە زارەوە ناکەوێت

٦٢٥-ن/٢٨٧٧ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: اَنَّ اللهَ تَجَاوَزَ لأُمَّتِي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسُهَامَالَمْ تَعْمَلْ بِهِ اَوَ تَكَلَّمْ بِهِ) اخرجاه خ/٦٦٦٤) م/١٢٧/٢٠١)).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـواﷺ فەرمویـەتی: خـوا چاوپۆشی لەئوممەتەکەم کردووە لەوەی، کە ئەوەی بەدڵیا دێت، هەتا ئیشی پـێ نـەکات، یان بەقسە نەیلێت، تەلاقیش یەکێکە لەوشتانە کە چاوپۆشی لێ کراوە تالە ناودڵدا بێت، بەڵام کاتێ کەوتە سەرزار بەڕاستیو بەگاڵتە هەر بەڕاستی دادەنرێت.

## داڕنینـی تەڵاق (اَلْخُلْعُ)

٦٢٦- ن /٢٨٧٨ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ جَاءَت امْرَأَةُ ثَابِت بْنِ قَيْسٍ بْنِ شَمَّاسٍ اِلَى رَسُولُ اللهِﷺ فَقَالَتْ يَا رَسُولُ اللهِﷺ، انيِّ مَا اَعْتُبُ عَلَيْهِ فِي خُلُقٍ وَلاَ دِينٍ وَلَكِنْ اَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي الأَسْلاَمِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: اَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَه؟) قَالَتْ، نَعَمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: اقْبِلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْها تَطلِيقَةً) رواه البخارى (٥٢٧٣) والنسائي(١٦٩/٦) وابن ماجة (٢٠٥٦))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: خێزانی سابتی کوڕی قەیسی

کوڕی شەماس هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺوتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺمن هیچ ڕەخنەم لەڕەوشتو ئایینی ئەو نیە، بەڵام پێم ناخۆشە کافربوون پاش ئیسلام - یان کوفری نیعمەت پاش مسوڵمان بوونم - جا پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ئایا باخچەکەی - کە کردبووی بەمارەیی بۆی- دەدەیتەوە؟)) وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: - بە سابت - باخچەکەی لێوەرگرەوەو یەك تەڵاقی بدە)).

**تێبینی:** هەرکاتێ ئافرەت لە مێردی خۆی کڕیەوە ، ئەوە داڕنینی پێ ئەڵێن (الخلع) واتە کاتێ خۆی، یان کەسێكوتی ئەوەندەت پێ ئەدەم تەڵاقم بدە، کە وتی باشەو تەڵاقی دا، تازە ئەو پیاوە توانای گەڕانەوەی ئەو ئافرەتەی نامێنێو چاکیشوایە یەك تەڵاقی بدات.لەبەر دو هۆ: یەکەم: تا ئەگەر لەپاشدا هەردو پەشیمان بوونەوە بتوانرێت نیکاح بکرێتەوە بۆی. دوهەم: تا دوچاری ئەو حەڵاڵە بێزراوەوواتە تەڵاقی سێ بەسێ نەبێت.

## باسی گەڕانەوە (الرجعة)

٦٢٧- ن /٢٨٨٧((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَاءَتْ امْـرَأَةُ رِفَاعَـةَ الْقُرَظِـيِّ اِلَـى النَّبِـيِّﷺ فَقَالَتْ: كُنْتُ عِنْدَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلاَقِي فَتَزَوّجْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الـزَّبِيرِ وَاِنَّمـا مَعَهُ مِثْلُ هَدْبَةِ الثَّوْبِ فَقَالَ: اتريدينَ اَنْ تَرْجَعَ اِلَى رِفَاعَةَ، لاَ، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ وَيذُوقَ عُـسيْلَتَكِ) رواه الجماعة لكن لابى داود معناه من غير تسمية الزوجين) خ/٢٦٣٩)م/١٤٣٣/١١١) احمد (٢٢٦/٦) والترمذي (١١١٨) والنسائي (١٤٨/٦) وابن ماجة (١٩٣٢))).

لە دایکی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: خێزانی ریفاعەی قورەزی هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ، وتی: من خێزانی ریفاعە بوومو بەتەواوی تەڵاقی دام ، دوای ئەو شووم کرد بە عبدورەحمانی کوڕی زەبیر، ئەوەی ئەو لایەتیوەکو ریشکی پۆشاكو خاوو سستە. فەرموی ئەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆلای ریفاعە، نەخەیر، هەتا لەزەت لەیەکتروەرنەگرن، نابێ. (عُسیلة) واتە جماع کردن، ئەبێ ئافرەت لە مێردی دووهەمی

چێژ وه‌ربگرێ، واته ئاله‌تی كابرا ته‌واو بێ بۆجماع خاوو پەك كەوتو نەبێ. كەواته به‌ مارەبڕین له‌ منالْ، یان كابرا ئاله‌تی هێزی تێدا نه‌بێ، گەڕانەوه بۆ مێردی یەكەم نابێت. باسی -سوێند خواردن (الایـلاء)[1] له سوره‌تی به‌قره ئایه‌تی ٢٢٦ هاتوه‌و تا ئه‌گاته چوار مانگ به‌سوێند خواردن دانانرێت‌و، كابرا ئه‌بێ سوێندی خۆی بباته سه‌رو له چوار مانگ تێپه‌ڕی ئیلایه، یا ئه‌بێ به‌ته‌واوی ته‌ڵاقی بدات، یا ئه‌بێ بچێته لای خێزانی‌و سوێنده‌كه‌ی بشكێنێ‌و كه‌فاره‌تی بدات.

٦٢٨- ن /٢٨٩٥ ((عَنْ سَلَمَةِ بْنِ صَخْرٍ عَنْ النَّبِـيِّ ﷺ فِـي الْمُظَـاهِرِ يُوَاقِـعُ قَبْـلَ اَنْ يُكَفِّرَ، قَالَ: كَفَّارَةٌ وَاحِـدَةٌ) رواه ابن ماجة والترمذي وحسنه (١١٩٨))).

له سه‌له‌مه‌ی كوڕی سه‌خره‌وه له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ هاتوه سه‌باره‌ت به‌وكه‌سه‌ی، كه به خێزانی خۆی ئه‌ڵێ تۆ وه‌كو پشتی دایكم وایت، به‌رله‌وه‌ی كه‌فاره‌ت بدات بچێته لای خێزانی، كه فه‌رمویه‌تی: (یه‌ك كه‌فاره‌تی له‌سه‌ره)، واته به‌جوتبونه‌كه تاوانی كردوو، به‌ڵام كه‌فاره‌ته‌كه هه‌ریه‌كه[2]. چۆنیه‌تی كه‌فاره‌ته‌كه‌ی له‌سوره‌تی (المجادلة)دا باسكراوه. به‌كورتی پێش چونه‌لای، ئه‌بێ به‌نده‌یه‌ك ئازاد بكات، ئه‌گه‌ر نه‌یبو دو مانگ له‌سه‌ر یه‌ك ڕۆژ بگرێت، ئه‌گه‌ر نه‌یتوانی خواردنی شه‌ست فه‌قیر بدات.

٦٢٩-ن /٢٨٩٩ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: اَذَا حَرَّمُ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فَهِيَ يَمِينٌ يُكَفِّرهُا وَقَـالَ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ ﷺ اُسْوَةٌ حَسَنَةٌ) اخرجاه خ/٤٩١١) م/١٨،١٩/١٤٧٣))).

له عه‌بدوڵڵای كوڕی عه‌باسه‌وه رضي الله عنه هاتوه، كه وتویه‌تی: هه‌ركاتێ پیاو خێزانی خۆی له‌سه‌رخۆی حه‌رام بكات، ئه‌وه سوێنده‌و ده‌بێ كه‌فاره‌تی بدات، وتی: بۆ ئێوه هه‌یه له پێغه‌مبه‌ری خوادا ﷺ پێشه‌وایه‌تی جوان، مه‌به‌ستی ڕوداوی سوره‌تی - ته‌حریمه - كه

---

(١) واته كابرایه‌ك، كه سوێند له ژنه‌كه‌ی بخوات، كه جیماعی له‌گه‌ڵدا نه‌كات بۆماوه‌ی زیاتر له چوار مانگ.

(٢) ته‌ماشای فه‌رموده‌ی ژماره (٢٨٩٧) له‌سه‌رچاوه‌ی پێشوو بكه.

پێغەمبەرﷺ جارییەکی خۆی لەخۆی قەدەغە کرد، قورئـان دابـەزیو فـەرموی: بۆچـی ئەوەی کەخوا بۆی حەڵاڵ کردویت حەرامی ئەکەیت. بـۆ زیـاتر ڕوون بوونـەوە تەماشـای تەفسیری سورەتی تەحریم بکە.

## باســی نەفــرین (اللـعان)

٦٣٠- ن /٢٩٠١ ((عَنْ نَافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ اَنَّ رَجُلاً لاَعَنَ امْرَأَتَهُ وَانْتفَـىَ مِـنْ وَلَـدِهَا، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللهِﷺ بَيْنَهُمَا وَاَلْحَقَ الْوَلَـدَ بِـالْمَرْأَةِ) رواه الجماعـة خ/٥٣١٥) م/١٤٩٤/٨) احمـد (٧/٢،٣٨،٦٤،٧١) وابـوداود (٢٢٥٩) والترمـذي (١٢٠٣) والنـسائي (١٧٨/٦) وابن ماجة (٢٠٦٩))).

لـە نافیعــەوە لــە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومــەرەوەرضي الله عنه هــاتوە، کـە پیاوێـك لەگـەڵ خێزانەکەیدا لەیەکتر نەفرینیانکرد، چـونکە پیاوێـك خێزانەکـەی بەزیناکاردایـە قەڵــەمو منالەکەی بەهی خۆی دانەنا، (جا پێغەمبەری خواﷺلەیەکی جیاکردنـەوەو منالەکـەی دا بەئافرەتەکە).

٦٣١- ن /٢٩٠٥ ((وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللهِﷺلِلْمُتَلاَعِنَـيْنِ: (حِـسَابُكُمَا عَلَـى اللهِ اَحَدُكُمَا كَاذِبٌ لاَسَبِيلَ لَـكَ عَلَيْهَـا) قَـالَ: يَارَسُـولُ اللهِ مَـالِي؟ قَـالَ: لاَمَـالَ لَـكَ اِنْ كُنْـتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا فَهُوَ بِمَا اسْـتَحْلَلَتَ مِـنْ فَرجْهَـا، وَاِنْ كُنْـتَ كَـذَبَتْ عَلَيْهَـا فَـذَلِكَ اَبْعَـدُ لَـكَ مِنْهَـا) رواه الجماعــة الا الترمــذي وابــن ماجــة خ/٥٣١٢،٥٣٥٠) م/١٤٩٣/٥) احمــد (١١/٢) وابوداود(٢٢٥٧) والنسائي (١٧٧/٦))).

هەرلەوەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویـەتی: پێغەمبــەری خـواﷺبـەدوو نـەفرین کارەکـەی فەرموو: حیسابتان لەلای خوایەو یەکێکیان درۆ ئەکەن —بە پیاوەکەی فەرموو- تۆ ئـیتر هیچت بەسەر ئەوەوە نیە، وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ،ماڵەکەم؟ فەرموی: مـاڵ بـۆ تۆ نیە بۆتۆ ئەگەر راست ئەکەیت لەبارەی ئەو ئافرەتـەوە ئـەوە - ماڵەکـەت - لـەباتی

ئەوەی، كە ئەو بەینە بەحەلاڵی سودت لیٚوەرگرتووە، ئەگەر درۆیشی بۆ بكەیت، ئەوە - ماڵەكەت - زیاتر لەتۆوە دورەو ئەكەویٚتەو بۆ ئافرەتەكە ئەبیٚ.

٦٣٢- ن /٢٩٠٦ ((عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ فِي خَبَرِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ قَالَ: فَطَلَّقَهَا ثَلاَثَ تَطْلِيقَاتٍ فَأَنْفَذَهُ رَسُولُ اللهِﷺوَكَانَ مَا صَنَعَ عَنْ النَّبِيِّﷺسُنَّةً، قَالَ سَهْلٌ: حَضَرْتُ هَذَا عَنْدَ النَبِيِّﷺ فَمَضَتِ السُّنَّةُ بَعْدُ فِي الْمُتَلاَعِنَيْنِ اَنْ يُفَرَّقَ بَيْنَهُمَا ثُمَّ لاَيَجْتَمِعَانِ اَبَداً) رواه ابوداود (٢٢٥٠))).

له سەهلی كوڕی سەعدەوەﷺ لەهەواڵی دوو نەفرین كارەكان هاتوە، كەوتویەتی: جا سیٚ تەلاقی داو، پیٚغەمبەری خوایش بەڕیٚوەی برد، ئەوەی، كە كردی لەلای پیٚغەمبەرﷺ سوننەتە، سەهلوتی: بۆ ئەمە لەخزمەتی پیٚغەمبەرداﷺ بووم، جا پاش ئەوە نەرینی نەفرین كاران دامەزرا لەسەر ئەوەی، كە لەیەكتری جیابكریٚتەوە ، لەپاشدا بۆ هەمیشە نابیٚ كۆ ببنەوە بەناوی ژنو میٚردییەوە. واتە تەلاقیٚكی بدات، یان، سیان جیاوازی نیە.

٦٣٣-ن /٢٩١١ ((عَنْ اَبْنِ عَبَّاسٍ اَنَّ هَلاَلَ بْنَ اُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّﷺ بِشَرِيكِ بْنِ سَمْحَاءَ فَقَالَ النَّبِيُّﷺ الْبَيِّنَةَ اَوْ حَدٌّ عَلَى ظَهْرِكَ) فَقَالَ يَارَسُولُ اللهِ، اذَا رأى اَحَدُنَا عَلَى امْرَأَتِهِ رَجُلاً يَنْطَلِقُ يَلْتَمِسُ الْبَيِّنَةَ؟! فَجَعَلَ النَّبِيُّﷺ يَقُولُ : ((الْبَيِّنَةُ وَالاَّحَدٌّ فِي ظَهْرِكَ)) فَقَالَ هِلاَلٌ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ اِنِّي لَصَادِقٌ وَلَيُنْزِلَنَّ اللهُ مَا يُبَرِّيءُ ظَهْرِي مِنَ الْحَدِّ فَنَزَلَ جِبرْيِلُ وَاَنْزَلَ عَلَيْهِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ (النور-٦) فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ ﴿إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ (النور-٩) فَانْصَرَفَ النَّبِيُّﷺ فَأَرْسَلَ اِلَيْهِمَا فَجَاءَ هِلاَلٌ فَشَهِدُوا النَّبِيُّﷺ يَقُولُ : ((اِنَّ اللهَ يَعْلَمُ اَنَّ أَحَدَكُما كَاذِبٌ ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟)) ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ، فَلَّمَا كَانَ عِنْدَ الْخَامِسَةِ وَقَفُوهَا فَقَالُوا : اِنَّهَا مُوجِبَةٌ فَتَلَكَّأتْ وَ نَكَصَتْ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهَا تَرْجِعُ ثُمَّ قَالَتْ: لا أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ فَمَضَتْ ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ : ((أَنْظِرُوهَا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ اَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ، سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ، خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ يشَرِيكَ بْن

سَمْحَاءَ فَجاءَتْ بِهِ كَذلِكَ، فَقالَ النبَّـيُّ ﷺ : ((لَولا مَا مَضى مِـنْ كِتـابِ اللهِ لَكَـانَ لِـي وَلَهَا شَأْنٌ)) رواه احمد (٢٣٨/١، ٢٣٩) والبخاري (٤٧٤٧) وابوداود(٢٢٥٦))).

له عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە ﷺ هـاتوە، کـە هـیلالی کـوڕی ئومەیـە نیـسبەتی ژنەکەی خـۆی دا لـەزینا لەخزمـەت پێغەمبـەرداﷺ بەشـەریکی کـوڕی سـەمحاء جـا پێغەمبەرﷺ فەرموی: (شایەت یان حەد لەپـشتت) وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـواﷺ کەسێ پیاوێکی دی بەسەر خێزانی خۆیەوە بچێ شایەت پەیدا بکات؟! پێغەمبەرﷺهەر ئەیفەرمو (شایەت یان حەد لە پشتت) جا هیلال وتـی: بەوکەسـەی کـە تـۆی بەڕاسـتی ناردووە، راست ئەکەم، دڵنیام، کـەخوا فرمانێـك ڕەوانـە ئەکاتـە خـوارو پـشتم لەحـەد ئەپارێزێت، جا جبرەئیل هاتو ئەم ئایەتی -سورەتی نوری بۆ هێنا (٦) کە ئەفـەرموێت ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ ..... ﴾و بۆی خوێندەوە تا گەیشتە ((ان كان من الصادقين، واتـە: ئەوانەی کەنیسبەتی خێزانی خۆیان لەزینا ئەدەنو، بێجگە لەخۆی شایەتێکی تـری نیـە، ئەوە شایەتی هەر یـەکێك لەوانـە. بـەم شـێوە ئـەبێ پـاش ئامۆژگـاریو پـاش عەسـر لەمزگەوتا کە پیاوەکە - بڵێ ئەشهەدوبیلا من لەم قـسەمدا، کـە ئـەڵێم فـلان کەسـی خێزانی - ناوی ببات - زینای کردووە راست ئەکەم، جائەمشەیە چـوار جـار بڵێتـەوە - پاشان ئامۆژگاری بکرێت، ئەگەر هەرسوور بوو - جاری پێنجەم بڵێت: نەفرینی خـوام لێ بێ، ئەگەر درۆم بکەم - بەم شێوەیە حەد لەسەر کـابرا لادەچـێو، پێویـستە ئافرەتەکـە بەرد باران بکرێت، ئەگەر دانی پێدانا، یان ئاماد نـەبوووەڵامی بداتـەوە، بـەڵام ئەگـەر ئامادە بوو، وەڵامی بداتەوە ئەویش بەم شێوەی، کە دێت بڵێ - حەدی لەسەر لائەچێت، چوار جار بڵـێ بـەخوا فـلان کەسـی مێـردم - نـاوی ببـات - لـەو قـسەیەدا، کـەمنی بەزیناکارداناوە درۆ ئەکات - پاشان ئامۆژگاری بکرێتو سزای قیامەتی بۆباس بکرێت، جا ئەگەر هەر سوور بوو لەسەر قسەی خۆی - جاری پێنجەم بڵێ: رقو توڕەیی خـوا بـۆ من، ئەگەر ئەو مێردەم ڕاست بکات. بـەم شـێوەیە ئـەویش لەحـەد دەربـاز ئـەبێو بـۆ هەمیشە لەیەکتر حەڕام ئـەبن. لێـرەش ئەفـەرموێت: پێغەمبـەرﷺ گەڕایـەوەو نـاردی

بەشوێن هیلال دا، جا هاتنە خزمەتی پێغەمبەرﷺ کە ئەیفەرمو: خوا ئەزانێ، کە یەکێکتان درۆئەکەن، ئایا کەسێك هەیە لەهەردووکتان تەوبە بکات؟)) لەپاشدا ئافرەتەکە هەستاو شایەتی دا، کاتێ گەیشتە پێنجەم جار، وەستانیان وتیان: بەڕاستی ئیتر ئەمە سزات بۆ پێویست ئەکات، جا کەمێ زمانی گیری کردو بەرەوپشت کەمێ هاتەوەو وامانزانی، کە پەشیمان ئەبێتەوە لەپاشداوتی: من تیرەی خۆم سەرشۆر ناکەمو جاری پێنجەمیشیەوەکو لە سەرەوەوتمان ئەنجامداو ڕۆیشت، جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: چاوەڕوانی ئەوە بکەن ئەگەر منالەکە چاو ڕەشو سمت قەڵەو قاچ لار بوو، ئەوە هی شەریکی کوڕی سەحمایە، واتە هیلال راستی کردووە، جا ئافرەتەکە منالێکی بەوشێوەی بوو، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەگەر نەچوایە ئەوەی کەلەکیتابەکەی خودابوو، من دەربارەی ئەو بڕیارێکی ترم ئەدا، واتە، سەنگسارم ئەکرد، چونکە درۆی کردوەو زیناکاربووە.

## نابێ ئافرەت ناشرین بکرێت بەوەی، کە منالەکەی لەخۆی و مێردەکەی ناکات.

٦٣٤- ن /٢٩١٩((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنَي فَزَارةَ الَى رَسُولُ اللهﷺ - فَقَالَ: وَلَدَتِ امْرَأَتِي غُلاَماً اَسْوَدَ وَهُوَ حِينَئذٍ يُعَرِّضُ بِأَنْ ينَفْيَهُ، فَقَالَ لَهُ النبَّيُّﷺ: هَلْ لَكَ مِنْ اِبلٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ (فَمَا اَلْوَانُهَا؟ قَالَ: حُمْرٌ ، قَالَ : ((هَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ؟)) قال : انّ فِيها لَوْرقاً قَال: ((فَأَنَّى أتَاهَا ذَلِكَ؟)) قَال: عَسَى اَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ ، قَالَ : ((فَهذا عَسى اَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ)) وَلَمْ يُرَخِّصْ لَهُ فِي اْلأنْتِفَاءِ مِنْهُ) رواه الجماعة خ/٥٣٠٥،٦٨٤٧،٧٣١٤) م/١٨-٢٠/١٥٠٠) احمد (٢٣٩/٢) وابوداود (٢٢٦٠،٢٢٦٢) والترمذي (٢١٢٨) والنسائي (١٧٨/٦،١٧٩) وابن ماجة (٢٠٠٢))).

لەئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ

له تیرەی فەزارە وتی: خێزانەکەم منالێکی ڕەشی بووەوە ئەو لەوکاتەدا ئەیویست لەخۆی دووربخاتەوە - بلّێ ئافرەتەکەم زینای کردووە-.

جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: وشترت هەیە؟

وتی: بەڵێ، فەرموی چ رەنگن؟

وتی: سورن.

فەرموی: خۆڵەمێشیشی تێدایە؟

وتی بەڵێ: خۆڵەمێشیان تێدایە.

فەرموی: ئەوە لەکوێوە هێناویەتی؟

وتی: نزیکە لەئەسڵدا لەو ڕەنگە بووبێت.

فەرموی: ئەمیش نزیکە- هەروا — لە ئەسڵێکەوە هێنـابێتی، مـاوەی پێنـەدا، کـە لەخۆی دورخاتەوە. چونکە هەرخوا خۆی دەزانێ مرۆڤ تاگەیشتۆتە خـۆی لـە بناغەیـدا چەند ڕەنگ بووەو، لەوانەیە پاش چەندین پشت مرۆڤ بـچێتەوە سـەر ئـەو بناغەیـە،وە ئەوە ناکرێ بەعەیب بۆ ئافرەتو، نابێ گومانی لێ بکرێت.

٦٣٥- ن /٢٩٢٠((وَعَنْهُ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ) رواه الجماعـة خ/٦٨١٨،٦٧٥٠)م/١٤٥٨) احمـد (٣٨٦/٢، ٢٣٩،٢٨٠) والترمـذي (١١٥٧) والنسائي (١٨٠/٦) وابن ماجة(١٠٠٦))).

هەر لەوەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: منالّ هی ئـەو کەسەیە، کە کەنیزەکەکەی لایەو، زیناکار تەنها بەردی بـۆ هەیەواتـە هـیچ یـان ئەگـەر نیکاحی حەلاڵی دیبێو، دان بەوە دابنێ یان چوار شایەتی هەبێ لەسەر زیناکەی، کـابرا سەنگسار ئەکرێت. لەوانەیە مەبەست ئەوەبێ، -والله أعلم-.

## قیافەناس باوەڕی پێ ئەکرێت

٦٣٦- ن /٢٩٢٤((عَـنْ عَائِـشَةَ قَالَـتْ: اَنَّ رَسُـولُ اللهِﷺ دَخَـلَ عَلَـيَّ مَـسْرُوراً تَبْـرُقُ اَسَارِيَرَ وَجْهِهِ فَقَالَ: اَلَمْ تَرَىْ اَنَّ مُجَزِّزاً نَظَرَ آنِفاً اِلَى زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ وَاُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ فَقَـالَ: اِنَّ هَذِهِ الأَقْدَامُ بَعْضُها مِنْ بَعْضٍ!) رواه الجماعـة خ/٦٧٧٠) م/١٤٥٩/٣٨) ولفـظ ابـى داود وابن ماجه ورواية لمسلم والنـسائي والترمـذي ( اَلَـمْ تَـرَىْ اَنَّ مُجَـزِّزاً الْمُـدْلَجِيِّ رَأى زيْـداً وأُسامَةَ قَدْ غَطَّيا رُؤُسَهُمَا بِقَطِيفَةٍ وَبَدَتْ أقْدَامَهُمَا ، فَقَـالَ : اِنَّ هـذهِ الْأَقْـدامِ بَعْـضُهَا مِـنْ بَعْـضٍ !)) احمـد (٢٢٦/٦) وابـوداود (٢٢٦٧) والترمـذي (١٢١٩) والنـسائي(١٨٤/٦) وابن ماجة (٢٣٤٩))).

له دایکی باوەڕدارانەوە خـاتون عائیـشەڕەزی‌الله‌عنها هـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خواﷺ هاتە لام زۆر شادمان بوو، لەخۆشیاناوچاوی بریقەی ئەدایەوە و فـەرموی (نـەت دی بەڕاستی قیافە ناسێك کەمێ لەمەو پێش تەماشای زەیدی کوڕی حاریسو ئوسامەی کوڕی زەیدی کردو وتی: ئەم قاچانە لەیەك دەچن..لە بێـژەی ئـەبو داودو ئیـبین ماجـەو ریوایەتێکی ئیمامی موسلیمو نەسائیو تورمزی بەم شێوەیە هاتوە، کە: نەتدی بەڕاستی ئێستا قیافەشناسی مودلەجی، چاوی بەزەیدو ئوسامە کەوت، کە سـەریان بەپارچـەیەك داپۆشی بوو قاچیان دەرکەوت وتی: ئەم قاچانە یەکێکن - لەیەك دەچـن - ئـەڵێن زەیـد زۆر سپی بوو - ئوسامە رەش بوو خەڵکی گومانی لێ هەبوو، بۆیە پێغەمبەرمانﷺ بە قسەی ئەو قیافەناسە ئەوەندە کەیف خۆش بووە، چونکە زۆری خۆش ئەویستن.

## باسی ئافرەتانی تەڵاقدراو ومێرد مردو

٦٣٧- ن /٢٩٢٩((عَنْ أُمُّ سَلَمَةَ اَنَّ امْرَأَةً مِنْ اَسْـلَمَ يُقـالَ لَهَـا سُـبَيْعَةَ ، كَانَـتْ تَحْـتَ زَوْجَها فَتُوفِّيَ عَنْهَا وَهَي حُبلى فَخَطَبَهَا ابَوُ السَّنَابِلِ بْنِ بَعْكَكٍ، فَأَبَـتْ اَنْ تَنْكِحَـهُ، فَقَـالَ:

وَاللهِ مَا يَصْلُحُ اَنْ تَنْكحي حَتَّى تَعْتَدّي آخِرَ الاَجَلَيْنِ فَمَكَثَتْ قَرَيباً مِنْ عَشْرِ لَيَالٍ نُفِسَتْ، ثُمَّ جَاءَتْ اِلَى النبَّـيِّ ﷺ فَقَالَ: (انْكحِي) رواه الجماعة الا اباداود وابن ماجة خ/٤٩٠٩) م/١٤٨٥/٥٧) احمد (٣٤٢/٦) والترمذي (١١٩٤) والنسائي (١٩٢/٦،١٩١))).

لە خاتون ئومو سەلەمەوە رضي الله عنها هاتوە، كە ئافرەتێك لە تیرەی ئەسلەمە، كـە پێیـان ئەوت: سوبەیعە كەلای مێردی بوو، مێردەكەی مردو ئەو دو گیان بوو، ئەبو سـەنابیلی كوڕی بەعكەك خوازبێنی كرد، ئەو ئافرەتە پێـی ڕازی نـەبوو، جـا پێـیووت: نابـێ تـۆ شووبكەیت هەتا دواتـرین مـاوە تـەواو نەكـەیت — مـاوەی وەفـات، كـە چـوارمانگو دەشەوەو، ماوەی دوگیان، كەدانانی سكەكەیە - تا هەردوكیان دوایان بێـت.واتـە پێـی ناخۆشبوو شوو بكات، چونكە بۆخۆی نەبوو، بـەڵێ - ئافرەتەكـە دوای نزیكـەی دەشـەو منالّی بوو، لەپاشدا هاتە خزمەتی پێغەمبەروﷺ فەرموی: شوو بكـە -واتـە ئـافرەتی حامیلە چ تەڵاقدرابێو چ مێردی مردبێ، بەدانانی حەملەكەی عیدەكەی دوایی دێت.

**تێبـینی:** عیدەكانی ئافرەت هەمویان لەقورئاندا هـاتوون لێـرەدا باسـیان ناكـەین. تەماشـای سـورەتی بەقـەرە ئایـەتی(٢٢٨و ٢٣٤)و سـورەتی الاحـزاب ئایـەتی(٤٩)و سورەتی تەلاق ئایەتی (٤) بكە. ئەوەی كە لەمەودوا باس ئەكرێت بۆ ئەو شتانەیە، كـە پەیوەندی پێوە هەیە.

٦٣٨- ن /٢٩٤٠((عَنْ اُمِّ عَطِيَّةٍ قَالَتْ: كُنَّا نُنْهَى اَنْ نُحِدَّ عَلَى مَيِّـتٍ فَـوْقَ ثَـلاَثٍ اِلاَّ عَلَى زَوْجٍ اَرْبَعَةَ اَشْهُرٍ وَعَشْراً وَلاَ نَكْتَحِلُ وَلاَ نَتَطَيَّـبُ وَلاَ نَلْـبَسُ ثَوْبـاً مَـصْبُوغاً اِلاَّ ثَـوْبَ عَصْبٍ وَقَدْ رُخِّصَ لَنَا عِنْدَ الطُّهْرِ اِذَا اغْتَسَلَتْ اِحْدَانَا مِنْ مَحِيضِهَا فِي نُبْذَةٍ مِـن كُـسْتِ اظفار: اخرجاه خ/٥١٤١،٣١٣) م/٩٣٨/٦٧))).

لەدایكی عـەتیەوە رضي الله عنها هاتوە، كەوتویەتی: ئێمە ڕێگری كراین لەوەی، كـە بـۆمردو زیاتر لەسێ شەو تازیە بگرین، مەگەر بۆ مێرد، كە چوار مانگو دەشـەوە، هـەروا چـاو نەڕەژێنو خۆ بۆن خۆش نەكەینو پۆشاكی ڕەنگ كراو نەكەینەبەر، مەگەر ئەو ڕەنگـەی،

کە لە بنەڕەتا بە داوەکانیەوە بێت ، هەروا ماوەمان پێیدرا لەکاتی پاك بوونەوەدا هەرکاتێ یەکێك لەئێمە خۆی لەبێ نوێژی شۆرد -و ئازیەتی هەبوو - هەندێ بخور بەکاربهێنێ‌و بەبۆن خۆشکردن دانانرێت. بەڵێ، ئافرەتانی خاوەن باوەڕ ئەبێ ئاوابن‌و لە هەموو بوارەکانی لەیاسای ئیسلام پارێزگاری بکەن، وەکو پێشوەکانیان.

٦٣٩- ن /٢٩٤٥ ((عَنْ فُرَيْعَةَ بِنْتِ مَالِكٍ قَالَتْ: خَرَجَ زَوْجِي فِي طَلْبِ اَعْلاَجٍ لَهُ فَاَدْرَكَهُمْ فِي طَرَفِ القُدُومِ فَقَتَلُوهُ، فَأَتىَ نَعْيُهُ وَاَنَا فِي دَارٍ شَاسِعَةٍ مِنْ دُورِ اَهْلِي، فَأَتَيْتُ النبَّيِّﷺ فَذَكَرْتُ ذلِكَ لَهُ ، فَقُلْتُ : اِنَّ نَعِيَ زَوْجِي اَتَاتِي فِي دارٍ شَاسِعَةٍ مِنْ دُورِ اَهْلِي وَلَمْ يَدَعْ نَفَقَةً وَلا مَالاً وَرِثْتُهُ ، وَلَيْسَ الْمَسكَنُ لَهُ ، فَلَو تَحَوَّلْتُ اِلَى اَهْلِي ، وَاِخْوَتِي لَكَانَ اَرْفَقُ لِي فِي بَعْض شَأْنِي؟ قال: ((تَحَوَّلِي)) فَلَّمَا خَرَجْتُ اِلَى الْمَسْجِدِ (اَوْ الى الْحُجْرَةِ) دَعَانِي ( اَوْ اَمَرَ بِي فَدُعِيتُ) فَقَالَ: ((امْكُثِي فِي بَيْتِكِ الَّذي اَتَاكِ فِيِهِ نَعِيُّ زَوْجِكِ حَتَّى يَبْلَغَ الْكِتابُ أجَلَهُ، قالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ اَرْبَعَةَ اَشْهُرٍ وعَشْراً. قالَتْ: وَاَرْسَلَ اِلَيَّ عُثْمانُ فَاَخْبَرْتُهُ فَأَخَذَ بِهِ )). رواه الخمسة وصححه الترمذي ولم يذكر النسائي وابن ماجة (ارسال عثمان) احمد (٦/٣٧٠،٤٢٠،٤٢١) وابوداود(٢٣٠٠) والترمذي (١٢٠٤) والنسائي (٦/١٩٩،٢٠٠) وابن ماجة (٢٠٣١))).

لە خاتون فورەیعەی کچی مالیکەوە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: مێردەکەم چوو بەشوێن چەند بەندەیەکی کافریدا -کە هەڵهاتبوون- لە ناوچەی قەدوم پێیان گەیشتو ئەوانیش کوشتیان، من لە ماڵێك دابووم دوور بوو لەماڵی خزمانم هەواڵی کوشتنیم پێ گەیشت ، کە جا هاتمە خزمەت پێغەمبەرﷺ ئەوەم بۆ باسکردو وتم: من هەواڵی نەمانی مێردەکەم پێگەیشت لەماڵێکدا، کە دوورە لەماڵی خزمانمەوەو، هیچ خەرجیەکی بەجێ نەهێشتووەو سامان ماڵی نیە، تا بە بەکەلەپور بیبەم خانوەکەیش هی ئەو نیە، پێم خۆشە بگەڕێمەوە ناوخانەوادەی خۆم،وە لەهەندێ کاروبارما براکانم بۆم باشترن پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((بگوێزەرەوە)) کاتێ لەمزگەوت دەرچووم (یان لەحوجرە) بانگی کردم (یان فەرمانی دا بانگ کرام) فەرموی: ((هەر لەوماڵەی، کە

هەواڵی مردنی مێردەكەتت پێگەیشتووە بمێنەرەوە، تا عیدەتی تەواو دەبێ)). ئەڵێ: چوار مانگو دەشەو لەوشوێنەدا مامەوە، ئەڵێ: عوسمان خەلیفەی مسوڵمانان پاش‌وەفاتی پێغەمبەرﷺ بۆ هەمان مەبەست ناردیە لامو ئەم هەواڵەم پێداو ئەویش بەوشێوەی كردواتە: پێویستە ئافرەت لە عیدەی‌وەفاتی مێردەكەیدا لەوماڵەدا بمێنێتەوە، كە هەواڵی مەرگی پێگەیشتووە، تا عیدەی تەواو ئەبێ))، مەگەر شوێنەكە چۆڵ ومەترسیداربێ، حەدیسی فاتمەی كچی قەیس لەسەر ئەوەیە بە قسەی خاتون عائیشە رضي الله عنها [1].

٦٤٠- ن /٢٩٥٣ ((عَنْ اَبِي سَعِيدٍ اَنَّ النَّبِىَّ ﷺ قَالَ فِي سبى اَوْطَاسَ:(لاَ تُوطَأُ حَامِلٌ حَتَّى تَضَعَ وَلاَ غَيْرَ حَامِلٍ حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً) احمد(٣/٢٨،٦٢،٨٧) وابوداود(٢١٥٧))).

لە باوكی سەعیدەوەرضي الله عنه هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: سەبارەت بە ئافرەتەكانی ئەوطاس: جیماع لەگەڵ هیچ دوگیانێك نەكرێت، تا سكەكەی دائەنێ‌و ئەوانەی، كە دووگیان نین، تا دەفعەیەك لەعوزر پاك نەبنەوە، واتە بۆ تێكەڵاوو نەبونی نەسەب دڵنیا بون لە خاڵی بونی مناڵدان پێویستە. ئا بەو شێوەیە بكرێت، تا دڵنیایی پەیدا ئەبێت.

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٢٩٤٨)ی (نیل الاوطار) بكە.

# باسی شیر خواردن

٦٤١- ن /٢٩٥٧ ((عَنْ عَائِشَةَ اَنَّ النبِّيَّ ﷺ قَالَ: (لاَ تُحَرِّمُ الَمصَّةُ وَلاَ الْمَصَّتَانِ) رواه الجماعة الاّ البخاري /م/١٧/١٤٥٠) احمد(٦/٣١،٩٥،٩٦) وابوداود (٢٠٦٣) والترمذي (١١٥٠) والنسائي (٦/١٠١) وابن ماجة (١٩٤٠))).

له دایکی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە ﵂ هاتوە، کە جارێك‌و دووجار شیر خواردن ئافرەت حەرام ناکات، لەسەر پیاو وای لێوەرئەگیرێ، کە سێ جار ئەبێ بەهۆی حەرام بوون، هەندێ لەزانایان بەم شێوە ڕەئیان داوە، هەندێکیش ئەڵێن بەپێنج جار لەبەر فەرمودەی (خَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ) کە ئیمامی موسلم ریوایەتی کردووە. بەو مەرجەیش منالەکە لە دوو ساڵ گەورەتر نەبێ، قەزیەی سالم - کە بە گەورەیی شیری پێداوە - بەتایبەتی دانراوە، بۆ کەسی تر نیە بێجگە، لەخاتون عائیشە ﵂ [1].

٦٤٢- ن /٢٩٦٧ ((عَنْ عَبَّاسٍ اَنَّ النبِّيَّ ﷺ اُرِيدَ عَلَى ابْنَةِ حَمْزَةَ فَقَالَ: (إِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِي، إِنَّهَا ابْنَةُ اَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ وَيَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ الرَّحِمُ) في لفظ (من النسب) اخرجاه خ/٥١٠٠)م/١٢/١٤٤٧)))

لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە ﵁ هاتوە، کە باسی کچی حەمزە کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، **ئەویش** فەرموی: بۆمن ڕەوا نییە، چونکە کچی برای شیریمە، ئەوەی بەخزمایەتی ونەسەب قەدەغەیە بەشیر پێدانیش قەدەغەو حەرام دەبێت، دیارەوترا سێ یان زیاتر ئەبێ بەهۆی قەدەغەبوون، بەڵام خۆپاراستن چاکە [2].

(١) تەماشای فەرمودەی (٢٩٦٢ و٢٩٦٦) لە سەرچاوەی پێشو، بکە.
(٢) تەماشای (٢٩٧١) لە سەرچاوەی پێشو، بکە.

## باسی خەرجی مرۆڤ بۆخۆی و ماڵ و منداڵی پێش خزمانی

٦٤٣- ن /٢٩٧٤ ((عَنْ جَابِرٍ اَنَّ النبَّـيَّﷺ قَالَ لِرَجُلٍ: (ابْدَء بِنَفْسِكَ فَتَـصَدَّقْ عَلَيْهَـا فَأِنْ فَضَلَ شَيْءٌ فَلأَهْلِكَ فَاِنْ فَضَلَ عَنْ اَهْلِكَ شَئٌ فَلِذي قَرَابَتِكَ، فَأِنْ فَضَلَ عَنْ ذِي قَرَابَتِكَ شَـيْءٌ فَهَكَـذَا وَهَكَـذَا) احمـد (٣٦٩/٣) ومـسلم (٩٩٧) وابـوداود (٣٩٥٧) والنـسائي (٣٠٤/٧)))

لە جابیرەوەرضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ بە پیاوێکی فەرمووە: پێـشەکی چـاکەو خێر لەگەڵ نەفسی خۆتا بکە، جا ئەگەر شتێك زیاد بوو بیدە بەخێزانو منالـّت، ئەگـەر لەوانیش زیاد دەرچوو بیدە بەوانەی، کە خزمایەتیان لەگەڵتا هەیە، ئەگەر لـەویش زیـاد هات، ئیتر بەملاو بەولادا بیبەخشە.

## ئافرەت بۆی هەیە لەماڵی مێردی بەبێ ئاگاداری مێردی خەرج بکات ئەگەر بەئەندازەی خۆی پێی نەدەدا.

٦٤٤- ن /٢٩٧٧ ((عَنْ عَائِشَةَ اَنَّ هِنداً قَالَتْ يَا رَسُـولُ اللهِﷺ، انَّ اَبَـا سُـفْيَانَ رَجُـلٌ شَحِيحٌ، وَلَيْسَ يُعْطِيِني مَا يَكْفِيِني وَوَلَدِي الاَّ مَا اَخَذْتُ مِنْهُ وَهُوَ لاَيَعْلَمُ فَقَالَ: (خُذِي مَـا يَكْفِيـكِ وَوَلَـدَكِ بِـالْمَعْرُوفِ) رواه الجماعـة الاالترمـذي خ/٢٢١١) م/١٧١٤/٧) احمـد (٥٠/٦) وابوداود (٣٥٣٢) والنسائي (٢٤٦/٨) وابن ماجة (٢٢٩٣))).

لە دایکی بـاوەڕ دارانـەوە خـاتوون عائیـشەرضي الله عنها هـاتوە، کـەوا هینـد وتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا، ئەبو سوفیان ڕەزیلەو ئەوەندەم پێ نادات، کە بەشی خـۆمو منالّەکـەم بکات، مەگەر بەدزی خۆیەوە شتی لێ ببەمو ئـەو نـەزانێ؟ فـەرموی: ((بەشـی خـۆتو منالّەکەت بەگوێرەی باوی خەڵك هەڵگرە)).

## كێ شایستە ترە بۆ بەخێوكردنی منالْ؟

٦٤٥- ن /٢٩٨٤ ((عَنْ الْبَراءِ بْنِ عَازِبٍ اَنَّ ابْنَةَ حَمْزَةَ اخْتَصَمَ فِيْهَا عَلِيٌّ وَجَعْفَرٌ وَزَيْدٌ فَقَالَ عَلِيٌّ اَنَا اَحَقُّ بِهَا هِيَ ابْنَةَ عَمِيّ. وَقَالَ جَعْفَرٌ: بِنْتَ عَمِيّ وَخَالَتُهَا تَحْتِي. وَقَالَ زَيْدٌ: ابْنَةَ اَخِي، فَقَضَيَ بِهَا رَسُولُ اللهِﷺ لِخَالَتِهَا، وَقَالَ: (الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ) اخرجاه (خ/٢٦٩٩) (م/١٧٨٣) دون موضع شاهد)).

لەبەرائی كوڕی عازیبەوەﷺ، كە لەسەر كچی حەمزە، عەلیو جەعفەرو زەید كێشەیان بووە، عەلیوتویەتی: من شایستە ترم بەو، چونكە كچی ماممە. جەعفەروتی: كچی مامەو پوری لەلای منە (خوشكی دایكی). زەیدوتی: كچی برامە، جا پێغەمبەری خوا دای بەپورەكەی، واتە لەلای جەعفەری داناو فەرموی: (خوشكی دایكوەكو دایكوایە).

٦٤٦-ن/٢٩٨٥((عَنْ عَبدْ اللهِ بْنِ عَمْرو بْنِ الْعَاصِ، اَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ اِنَّ ابْنِي هَذَا كَانَ بَطْنِي لَهُ وِعَاءٌ وَحِجْرِي لَهُ حِوَاءٌ وَثَدْيِ لَهُ سِقَاءٌ وَزَعَمَ اَبُوهُ اَنَّهُ يَنْزَعُهُ مِنّي، فَقَالَ: اَنْتِ اَحَقُّ بِهِ مَالَمْ تَنْكِحِي رواه احمد (١٨٢/٢) وابوداود (٢٢٧٦) بلفظ قريب منه)).

لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاسەوە هاتوە، كە ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ، ئەم كوڕەم سكی من زەرفی بووەو كۆشم كۆی كردوەتەوەو مەمكم كونەی ئاوی بووە، باوكی كە لەمنیوەرئەگرێتەوە، پێغەمبەر فەرموی: تۆ شایستەتری بەو، مادەم شونەكەیت.واتە ئافرەت تا شوو نەكات ئەو شایستە ترە بەسەرپەرشتیو بەخێوكردنی منالْ، ئەگەر منالْەكە پێ ڕەوكەو نان خۆر نەبێ، ئەگەر گەورە بوو، یان بەتیرو پشك ئەدرێ بەیەكێكیان، یان تەماشای بەرژەوەندی منالْەكە ئەكرێت، لەلای كامیان بەرژەوەندی ئەپارێزرا، بەو ئەدرێت بەگوێرەی ئەو ڕیوایەتانەی، كە هاتون[1].

---

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٢٩٨٦، ٢٩٨٧) لە سەرچاوەی پێشو، بكە.

# خەرجی بەندەو حەیوانات

٦٤٧- ن /٢٩٨٨ ((عَنْ عَبدْاللهِ بْنِ عَمْرو اَنَّهُ قَالَ لِقُهْرَمان لَهُ: هَلْ اَعْطَيْتَ الرَّقِيقَ قُوتَهُمْ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ فأْنطَلِقْ فَأَعْطِهِمْ، فَأِنَّ رَسُولَ اللهِﷺقَالَ: كَفَى بِالْمَرْءِ اِثْماً اَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ)) رواه مسلم (٩٩٦).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی بە خزمەتکارێکی - قەهرەمان - ئایا بەشی بەندەکانت داوە؟ وتی: نەخێر، وتی: بچۆو بەشی خۆیانیان پێ بدە، چونکە پێغەمبەری خواﷺفەرمویەتی: بەسەبۆ مرۆڤ ئەو تاوانەی، کە ڕۆزی بشارێتەوە لەوەی، کە ڕۆزی لەلای ئەوە). واتە تاوانێکی زۆر گەورەیە، کە مرۆڤ سەرپەرشتو داشتیاری شتێبێ - مرۆڤ یان حەیوان -و ڕۆزی بەدەست ئەوبێت، کەچی ئەو بیگرێتەوە لێیو لەکاتی خۆیدا پێی نەدات.

٦٤٨- ن /٢٩٩٠ ((عَنْ اَبِي ذَرٍّ، عَنْ النبَّيِّﷺ قَالَ: هُمْ اِخْوَانُكُمْ وَخَوَلُكُمْ جَعَلَهُمْ اللهُ تَحْتَ اَيْدِيكُمْ فَمَنْ كَانَ اَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ ، فَلْيُطعِمْهُ مِمّا يَأْكُلُ ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمّا يَلْبَسُ ، وَلا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ عَلَيْهِ)) رواه الجماعة الا النسائي (خ/٣٠) (م/٣٠ـ٤٠، ١٦٦١))) احمد (١٥٨/٥) وابوداود (٥١٥٨) والترمذي (١٩٤٥) وابن ماجة (٣٦٩٠).

لە ئەبو زەڕەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی ئەوان - بەندەکان - براتانو خوا لەژێر دەستی ئێوەی داناوە، جا هەرکەسێك براکەی لەژێر دەست دایە باخواردنی پێ بدات لەو خواردنەی، کەخۆی ئەیخواتو، پۆشاکی بۆ بکات لەوەی، کە خۆی ئەیپۆشێتو داوای شتێکیان لێ نەکەن، کە لەتوانایاندا نەبێ، ئە گەرداوای کردنی ئیشێکتان لێ کردن، کە لەتوانا یاندا نەبو، یارمەتیان بدەن. بەم شێوەیە دەرئەکەوێت، کە ئایینی مرۆڤ پەروەری ئیسلام، چۆن هەوڵی یەکسانی مرۆڤو مافیان ئەدات، بەڵام

دوژمنانوەكو شەمشەمە كوێرە ئەم هەمو ڕاستیانە نابینن، اَللَّهُمَّ اهْدِ قَوْمِي فَاِنَّهُمْ لاَيَعْلَمُونَ وَالْهِمْنِي وَاِيَّاهُم والصَّوَابَ وُالرُّشْدَ - آمین.

٦٤٩- ن /٢٩٩٤ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ فَوَجَدَ بِئْراً فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ فَاِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ فَقَالَ الرَّجُلُ لَقَدْ بَلَغَ هذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذي كَانَ بَلَغَ مِنيِّ ، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ مَاءً ، ثُمَّ اَمْسَكَهُ بِفِيهِ حَتَّى رَقِيَ فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ )) قَالُوا يَارسُولَ الله ، وَاِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ اَجْراً؟! فَقَالَ : (( فِي كُلِّ كبِدٍ رَطْبَةٍ اَجْرٌ)) )) متفق عليه احمد (١٧٥/٤) (خ/٢٣٦٣، ٢٤٦٦، ٦٠٠٩/م/٢٢٤٤) وابوداود (٢٥٥٠).

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: لەكاتێكا پیاوێك ئەچوو بەڕێگایەكدا زۆر تینوی بوو، بیرێكی دەستكەوتو چووە خوارەوەو ئاوی لێخواردو هاتە دەرەوە، بینی سەگێك زمانی دەرهێناوەو لە تینویەتیدا خۆڵ ئەخوات ، پیاوەكە وتی: بەڕاستی ئەو سەگە لە تینویەتیدا وەكو منی لێهاتوە، جا ئەچێتە ناو بیرەكەوەو پڕی خوفەكەی خۆی دەكاتو بەدەمیەوە ئەیگرێت، تا سەرئەكەوێتو سەگەكە ئاو ئەدات، جا خوا سوپاسی كردو لێی خۆش بوو) وتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئایا لەسەر حەواناتیش پاداش هەیە؟! فەرموی: هەمو دڵێكی تەڕ - كە خزمەتی بكەیت - پاداشتی هەیە. بە لێ سزا دانیشی هەربەو شێوەیە تۆڵەی هەیە.[(١)]

## باسی خوێنەكان (الدِّمَاءُ)

٦٥٠- ن /٢٩٩٧ ((عَنْ عَائِشَةَ: لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِءٍ مُسْلِمٍ الاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ: الاَّ مَنْ زَنَى بَعْدَ مَا اُحْصِنَ اَوْ كَفَرَ بَعْدَ مَا اَسْلَمَ اَوْ قَتَلَ نَفْساً فَقُتِلَ بِهَا)) رواه احمد (٢١٤/٦) والنسائي (١٠١/٧، ١٠٢) ومسلم بمعناه (١٦٧٦/٢٦) وابوداود (٤٣٥٣).

لەدایكی باوەڕ دارانەوە خاتون عائیشە ﷺ هاتوە، كە: ((ڕەوا نیە ڕشتنی خوێنی

---

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٢٩٩٣) لە نیل الاوطار دابكە.

هیچ مرۆڤێکی مسوڵمان حەڵاڵ نیە، مەگەر لە یەکێك لە سێ ڕێگەوە بێت، مەگەر زینا بکات پاش ئەوەی، کە خاوەن ژنی بێ، یان کافر ببێ پاش ئەوەی، کـە مـسوڵمان بـووە، یان مسوڵمانێك بەدەستی ئەنقەس[1] بکوژێت بەوە ئەکوژرێتەوە.

٦٥١- ن /٢٩٩٨ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ اَنَّ النبَّـيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيـلٌ فَهُـوَ بِخَيْـرِ النَّظَرَيْنِ: اِمَّا اَنْ يَفْتَدِيَ وَاِمّا اَنْ يَقْتُلَ)) رواه الجماعة لكن لفظ الترمـذي: ((اِمَّـا اَنْ يَعْفُـوَ وَاِمَّـا اَنْ يَقْتُـلَ)). احمـد (٢٣٨/٢) خ (٢٤٣٤) م (١٣٥٥/٤٤٧) وابـوداود (٤٥٠٥) والترمذي (١٤٠٥، ٢٦٦٧) والنسائي (٣٨/٨) وابن ماجة (٢٦٢٤).

لە ئەبو هورەیرەوە — خوا لێی ڕازی بـێ- هـاتوە، کـە پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: هەرکەسێ کەسێکی لـێکوژرا ئەوە بۆ ئەو دوو ڕێگا هەیە، یان خـوێن بـایی وەرگرێـت، یان لەباتی کـوژراوی خۆیـدا بیکوژێـت.... لەبێـژەی تورمزیـدا هـاتوە (ببەخـشێ یـان بیکوژێت).

**تێبینی:** لەبارەی برینەکانیشەوە هەمان سێ شت هەیە، ئەگەر برینەکـە ئـەکراوەکو خۆی بریندار بکرێت، ئەگینا هەردوو ڕێگا هەیە، یان بەخـشین، یـان وەرگرتنـی خـوێنی برینەکە، کە ئەویش هەندێکیان دیـاریکراونو هەندێکیـشیان(حـاکم یـان قـازی)دیـاری ئەکات، ئەتوانرێت لەوەش، کە دیاریکراوە کەمتر بکرێتەوە، ئەگـەر خـاوەن مـاف ڕازی بوو.

٦٥٢- ن /٣٠٠٢ ((عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه اَنَّ النبَّـيَّ ﷺ قَالَ: الْمُؤْمِنُونَ تَتَكَافَأُ دِمَـاؤُهُمْ وَهُـمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ اَدْنَاهُمْ. اَلاَ، لاَ يُقْتَـلُ مُـؤْمِنٌ بِكَـافِرٍ وَلاَ ذُوعَهْـدٍ فِـي عَهْدِهِ)) رواه احمد وابوداود والنسائي.

لە عەلیـەوە رضي الله عنه هـاتوە، کـە پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: بـاوەڕداران خوێنـەکانیان یەکسانەو، یەك دەستن بەرامبەر بەبێجگـە لـەخۆیانو ئەکەوێتـە گـەردەنی هەمویانـەوە

(١) لە فەرمودەی ژمارە (٢٩٩٧) لە ریوایەتی نەسائی لە سەرچاوەی پێشودا، هاتوە.

ئەوەی، کە لەگەردنی کەمترینیانەوە بێ. واتە: ئەگەر کەمترینی مسوڵمانان لە پلەوپایەو ناو شۆرەتەوە پەنای کافرێکی دا لە وولاتی ئیسلام دا، پێویستە هەمویان بیپارێزن، ئاگادار بن، باوەڕدار بەکافر ناکوژرێتو کافرێ، کەلەناو عەهدو پەیمانی مسوڵماندا بێ، بەکافرێکی دەرەوەی عەهدو پەیمان ناکوژرێتەوە.

٦٥٣- ن /٣٠٠٤ ((عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرِو عَنِ النبِّيِّﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ مُعَاهِداً لَمْ يَرِحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ وَاِنّ رِيحَهَا يُوجَدُ مِنْ مَسِيرةِ اَرْبَعِينَ عَاماً)) رواه احمد (٢/١٨٦) والبخاري (٣١٦٦) والنسائي (٨/٢٥) وابن ماجة (٢٦٨٦).

له عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە ﷺ هاتوە لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە فەرمویەتی: هەرکەسێ کافرێکی عەهدو پەیماندار لەگەڵ مسوڵمانان دا بکوژێت، بۆنی بەهەشتی پێ ناگات، کە بۆنی بەهەشت لەدوری چڵ ساڵ ڕێگەوە دەست ئەکەوێت. واتە زیاتر لە چل ساڵ ڕێگا لە بەهەشتەوە دوور ئەخرێتەوە.

٦٥٤- ن /٣٠٠٦ ((عَنْ الْحَسَنِ عَنْ سَمُرَةَ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ وَمَنْ جَدَعَ عَبْدَهُ جَدَعْنَاهُ)) رواه الخمسة وقال الترمذي: حديث حسن غريب.

له حەسەنەوە، لە سەمورەوە ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێ بەندەی خۆی بکوژێ دەیکوژین، هەرکەسێك بەندەی خۆی لووت هەڵدڕێ لوتی هەڵئەدرین لە ڕیوایەتی: ئەبو داودو نەسائیدا هاتوە کە: (وَمَنْ خَصَى عَبْدَهُ خَصَيْنَاهُ/وە هەرکەسێك بەندەی خۆی بخەسێنێ ئەیخەسێنین)، جا هەندێ لەزانایان ئەم فەرمودەیە مانا دەکەن هەرکەسێ، کە کاتی خۆی بەندەی بووە ، واتە بەندە بوونی کۆنی نابێ بەهۆی تۆڵە لێ نەسەندنی، بەم شێوەیە ڕێك ئەکەوێت لەگەڵ ئەو فەرمودانەدا، کە ئەڵێ: ئازاد بەبەندە ناکوژرێ، ئەگەر بەندەی خۆی بێ، کۆی دەنگی لەسەرە، بێجگە لە نەخەعی، کە ئەڵێ ئەکوژرێ. ئەو ڕواڵەتی ئەو فەرمودەیەو مانای گشتی ئایەتی (النَّفْسُ بِالنَّفْسِ/ گیان بەگیان) ئەکات بەبەڵگە، ئەگەر بەندەی خۆی نەبێ، نارێکیەکە

زۆرترە. هەندێكیش ئەڵێن: لەنێوان ئازادو بەندەدا - تۆڵەسەندن نییە نەلەگیان داو نە لە ئەندام دا، هەركەس بۆخۆی شتێكی هەیەو كاتی ڕوودانی پیاوی خۆی بۆ هەر سەردەمێك، دەبێ یەكلای كاتەوەو پێویست بەكێشەی ئەمڕۆ ناكات.

## باسی كوشتنی پیاو بە كوشتنی ئافرەت وە ئایا بكوژ دەشێوێنرێ ئەگەر كوژراوی شێواندبو؟

٦٥٥- ن /٣٠٠٧ ((عَنْ اَنَسٍ (( اَنَّ يَهُودِيًّا رَضَّ رَأْسَ جَارِيَةٍ بَيْنَ حَجَرَيْنِ فَقِيلَ لَهَا: مَنْ فَعَلَ بِكِ هَذَا؟ فَلانٌ؟ اَوْ فَلانٌ ؟ حَتَّى سُمِيَّ الْيَهُودِيُّ، فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا فَجِيءَ بِهِ فَاعْتَرَفَ فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَرُضَّ رَأْسُهُ بِحَجَرَيْنِ) رواه الجماعة خ (٢٤١٣) م (١٦٧٢/١٧) احمد (١٩٣،١٨٣/٣) وابوداود (٤٥٢٧) والترمذي (١٩٣٤) والنسائي (٢٢/٨) وابن ماجة (٢٦٦٥))).

لە ئەنەسەوەرضي الله عنه هاتوە، كە جولەكەیەك سەری كەنیزەكێكی شكاند لەنێوان دوو بەرددا، پێی ووترا كێ‌وای لێكردیت؟ فلاَن یان فلاَن -ناوی چەند كەسیان بۆ برد- تا گەیشتە ناوی جولەكەیەك، كە بەسەری هێمای بۆ كردو هێنراو دانی پێدانا، جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێدا، كە سەری ئەویش لەنێوان دوو بەردا والێ بكەن.

٦٥٦- ن /٣٠٠٩ ((وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَحُثُّ فِي خُطْبَتِهِ عَلَى الصَّدَقَةِ وَيَنْهَى عَنْ الْمُثْلَةِ) رواه النسائي (١٠١/٧))).

هەر لەوەوەرضي الله عنه هاتوە، كە: پێغەمبەری خواﷺ لە خوتبەكەیدا -خەڵكی - هان ئەدا لەسەر چاكە كردنو ڕێگری كردن لە شێواندنی كوژراو،واتە نابێ كوژراو بشێوێندرێ.

٦٥٧- ن /٣٠١٢ ((عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرٍو اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: اَلاَ اِنَّ قَتِيلَ الْخَطَأ شِبْهُ الْعَمْدِ قَتِيلُ السُّوطُ اَوْ اَلعَصَا فِيهِ مِأَةٌ مِنَ الْإِبِلِ، مِنْهَا اَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا اَوْلاَدُهَا) رواه الخمسة الا الترمذي) احمد(١٦٤/٢) وابوداود(٤٥٤٧) والنسائي(٢٢/٨) وابن ماجة

(٢٦٢٧))). لــە عەبــدوڵڵای كــوڕی عــەمرەوەﷺ هــاتوە، كــە پێغەمبــەری خــواﷺ فەرمویەتی: ئاگاداربن، كوژراوی هەڵەی لە دەستیانقەسـچو، كـوژراوی تـۆڵ‌و عەسـایە، لەوەدا سەدوشتر هەیە، كە چلیان بەچكەیان لەسك دابێ.

## كەسێ كەسێك بگرێ و كەسێكی تر بیكوژێت

٦٥٨-ن/٣٠١٣ (( عَنْ ابْنِ عُمَرَ عَنْ النبَّـيِّﷺ قَالَ: اِذَا اَمْسَكَ الرَّجُلُ الرَّجُلَ وَقَتَلَهُ الآخَرُ يُقْتَلُ الَّذِي قَتَلَ وَيُحْبَسُ الَّذِي اَمْسَكَ) رواه الدار قطنی (١٣٩/٣،١٤٠) والبیهقی (٥٠/٨))).

لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، لـە پێغەمبـەرەوەﷺ، كـە فەرمویـەتی: هەركاتێ پیاوێـك پیـاوێكی گـرت‌و یـەكێكی تـر كوشـتی، ئەكوژرێتـەوە، ئـەوەی كـە كوشتویەتی زیندان ئەكرێت ئەوەی، كە گرتوویەتی، ئەمە لەوە نیە، كە كۆمەڵێك لەبـەر یەك كەس ئەكوژرێت، ئەو زیندانیەش ماوەكەی بەدەست ئیمام یان جێنشینیەتی، مەرج نیە، تا مردن بێ، ئەگەر چی هەندێ ووتویانە مەرگە، لەوانە رەبیعەیە.

# تۆڵـــەی شـكاندنی دان

٦٥٩- ن /٣٠١٥ ((عَنْ اَنَسٍ اَنَّ الرُّبَيِّعْ عَمَّتَهُ كَسَرَتْ ثَنِيَّةَ جَارِيَةٍ فَطَلَبُوا اِلَيْهَا الْعَفْو فَأَبْوا فَعَرَضُوا الأَرْشَ فَأَبَوا فَأَتواْ رَسُولَ اللهِﷺ فَاَبَوا الاَ الْقِصَاصَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِﷺبِالْقِصَاصِ فَقَالَ اَنَسُ بْنِ النَّضر: يَا رَسُولَ الله اَتَكْسرُ ثَنِيَّةَ الرُّبَيِّع، لاَ وَالَّذي بَعَثَكَ بِالْحَقّ لاَتُكْسَرُ ثَنِيَّتُهَا! فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ (يَا اَنَسُ! كِتَابَ اللهِ الْقِصَاص) فَرَضِيَ الْقَوْمُ فَعَفَوا فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ اِنَّ مِنْ عِبَادِ اللهِ مَنْ لَوْ قْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ) رواه الجماعة الا مسلماً والترمذي خ (٤٥٠٠) احمد (١٢٨/٣) وابوداود (٤٥٩٥) (١٩٣٤) والنسائي (٢٦،٢٧/٨) وابن ماجة (٢٦٤٩))).

له ئەنەسەوەﷺ هاتوه، كه روبەیعی پوری ددانه دوانیەكەی كچێكی شكاند، جا خزمەكانی داوایان لێكرد ببەخشێت، خزمەكانی ددان شكاو نەیانكرد، جاوتیان خوێنەكەی ئەدەین، نەیانكرد، ئینجا هاتنه خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان بێجگه لەتۆڵه هیچمان ناوێ، بۆیه پێغەمبەری خواشﷺ فرمانی تۆڵەیدا - كه ددانی بشكێنێ -جا ئەنەسی كوڕی نەزر- كه برای بوو-، وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ددانی روبەییع ئەشكێنیت؟ نەخێر، سوێند بەو كەسەی، كه تۆی بەڕاستی ڕەوانە كردووە، دوانیەكەی (ثنیة) روبەییع ناشكێت!

جا پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ئەی ئەنەس، كیتابەكەی خوا تۆڵەی داناوە - مەبەست ئایەتی (وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ/ برینەكان تۆڵەیان هەیە) سورەتی مائیدە ئایەتی ٤٥ بوو -جا خزمانی كچە هاتنو چاوپۆشیان كردواتە قسەكەی ئەنەس ڕاست دەرچوو دانی رووبەییع نەشكێنرا، ئەوەبوو پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: بەڕاستی لەناو بەندەكانی خوادا كەسانێ هەن، كه ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخۆن، خوا سوێندەكەیان ناخات.

## کەسێ قەپ لەدەستی کەسێك بگرێت و دەستی ڕاکێشێت دانی ددەربێت.

٦٦٠- ن /٣٠١٦ ((عَنْ عِمْرَانِ بْنِ حُصَيْنٍ اَنَّ رَجُلاً عَضَّ يَدَ رَجُلٍ فَنَزَعَ يَدَهُ مِنْ فِيهِ فَو قَعَتْ ثَنِيَّتَاهُ فَاخْتَصَمُوا اِلَى النبِّيِّﷺ فَقَالَ: يَعَضُّ اَحدُكُمْ يَدَ اَخِيهِ كَمَا يَعَضُّ الْفَحْلُ! لاَ دِيَةَ لَكَ) رواه الجماعة الا ابـاداود خ (٦٨٩٢) م (١٦٧٣) احمد (٤/٤٢٧،٤٣٥) والترمذي (١٤١٦) وابن ماجة (٢٦٥٧))).

له عمرانی کوڕی حوسەینەوەرضي الله عنه هاتوه، که پیاوێك قەپی کرد بەدەستی پیاوێکن، جا ئەویش دەستی لەدەمی راکێشاو هەردوو ددانە دوانیەکەی (الثنایاه) کەوتن‌و، کێشەکەیان برده لای پێغەمبەرﷺ، **پێغەمبەریش** فەرموی: هەندێ لە ئێوە قەپ ئەکات بەدەستی کەسێك لە ئێوەداوەکو چۆن وشتر قەپی پێدا دەکات، هیچ خوێنت نیە. واتە: تازە ددانەکانت بەزایە چووەو، نابێ داوای تۆڵەیشی بکەیت.

## کەسێك بەدزیەوە بنوارێتە ماڵێکەوە کە گیرابێ

٦٦١- ن /٣٠٢٠ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ اَنَّ رَسُولَ اللهﷺ قَالَ: لَوْ اَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ اِذْنٍ فَحَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ مَا كَانَ عَلَيْكَ جُنَاحٌ) رواه الجماعة الاالترمذي وابن ماجة خ (٦٩٠٢) م (٢١٥٨) احمد (٢/٢٣٤) وابوداود (٥١٧٢) والنسائي (٨/٦١))).

لەئەبو هورەیرەوەرضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ئەگەر پیاوێك بەبێ مۆڵەت لەماڵەکەت تەماشای کردی، تۆش بەردێکت بۆ هاویشت‌و چاویت کوێر کرد، هیچ تاوانێکت لەسەر نیە.

٦٦٢- ن /٣٠٢٦ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ اَنَّ النبِّيَّﷺ قَالَ: (مَا عَفَا رَجُلٌ عَنْ مَظْلَمَةٍ اِلاَّ زَادَهُ اللهُ بِهَا عِزّاً) رواه احمد ومسلم (٣٠٢٦) والترمذي (٢٠٢٩) وصححه)). لە ئەبو

هورەیرەوەﷺ هاتوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە فەرمویەتی: هەر پیاوێك چاوپۆشی لەستەمێك بکات، مەگەر خوا زیاتر بەوە بەهێزو تواناتری دەکات. واتە خوا بەخشین‌و چاوپۆشی لەتۆڵەکردنەوەی پێ خۆشترە.

## باسی سوێند خواردنی زۆر – القسامة –

٦٦٣- ن /٣٠٣٤ ((عَنْ سَهْلِ بْنِ اَبِي حَثْمَةَ قَالَ: انْطَلَق عَبْدُاللهِ بْنُ سَهْلٍ وَمُحَيَّصَةُ بْنُ مَسْعُودٍ اِلَى خَيْبَرَ -وَهُوَ يَوْمَئِذٍ صُلحٌ- فَتَفرَّقَا، فَأَتَي مُحيِّصَةُ اِلَى عَبْدُاللهِ بْنِ سَهْلٍ وَهُوَ يَتَشَحَّطُ فِي دَمِهِ قَتِيلاً فَدَفَنَهُ، ثُمَّ قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَانْطَلَقَ عَبْدُالرَّحْمنِ بْنُ سَهْلٍ وَمُحيِّصَةُ وَحُويّصَةُ ابْنَا مَسْعُودٍ اِلَى النبِّيَّﷺ فَذَهَبَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ يَتَكلَمُ فَقَالَ : ((كَبِّرْ كَبِّرْ )) وَهُوَ اَحْدثُ الْقَومِ فَسَكَتَ فَتَكَلَّمَا ، قَالَ: (( أتَحْلِفُونَ وَتَسْتَقُّونَ قَاتِلَكُمْ (اَو صَاحِبَكُمْ) ؟)) فَقَالُوا : وَكَيْفَ نُحْلفُ وَلَمْ نَشْهَدْ وَلَمْ نَرَ ؟! قَالَ : ((فَتُبَرِّئُكُمْ يَهُودُ بِخَمْسِينَ يَميناً ؟))، فَقَالُوا : كَيْفَ نَأْخُذُ اَيْمَانَ قَومٍ كُفَّارٍ ؟! فَعَقَلَهُ النبِّيَّﷺ مِنْ عِنْدِهِ)) رواه الجماعة (خ/٧١٩٢) (م/٩/١٦٦٠/١، ٣،٦) احمد (٣/٤) ابوداود (٤٥٢٠) الترمذي (١٤٢٢) النسائي (٨/٧ـ١١) ابن ماجة (٢٦٧٧))).

لە سەهلی کوڕی ئەبو حەسمەوەﷺ هاتوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل‌و موحەییسەی کوڕی مەسعود چوون بۆ خەیبەر - ئەوەش لە کاتی ئاشتە وا بیدا بو- جا لەوێ لەیەك جیابوونەوە، پاشان موحەییسە هاتەوە لای عەبدوڵڵای کوڕی سەهل، تەماشای کرد ئەو زۆر تلاوە لەناو خوێنی خۆیدا گەوزیوەو کوژراوە، جا ئەویش شاردییەوە، لەپاشان هاتەوە مەدینە، ئینجا عبدورەحمانی کوڕی سەهل -برای کوژراو-و موحییسەو حوەییسەی کوڕانی مەسعود چونە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ، عەبدورەحمان دەستی کرد بە قسەکردن‌و فەرموی: (قسە بدە بە گەورە، بیدە بە گەورە)، واتە با تەمەن گەورەکەتان قسە بکات، چونکە ئەو بچووکترینی ئەو کۆمەڵە بوو، جا بێدەنگ بوو، ئەو دوانەکەی تر قسەیان کرد.

فەرمووی: ئایا سوێند ئەخۆن، تا ببن بەخاوەن حەق بەسەر بکوژەکەتانەوە (یان، رەفیقەکەتانەوە)؟

وتیان: چۆن سوێند بخۆین، نەلەوێ بووین‌و نەبینیومانە؟!

فەرمووی: دەی جولەکە خۆیان بە پەنجا سوێند دەرباز ئەکەن ؟

وتیان: چۆن باوەڕ بەسوێندی کافران بکەین ؟!

جا پێغەمبەرﷺ خۆی خوێنەکەی پێدان. لێرەدا ئەمانە وەرئەگرین:

١ـ کەسێ کوژراو، بکوژ دیار نەبوو ئەگەر خاوەنەکەی گومانی لە کەسێ کردو ڕێی تێدەچوو ئەوە ئەتوانێ پەنجا سوێند بخوات‌و ببێ بە خاوەنی مافی خۆی ئەگەر نەیخوارد گومان لێکراو، پەنجا سوێند ئەخوات‌و لەوتاوانە رزگاری ئەبێ.

٢ـ ئەکرێ سوێندی کافر باوەڕی پێ بکرێ.

٣ـ لە قسەو باسدا گەورەترین کەس مافی پێش خستنی هەیە، واتە تەمەن ڕێزی خۆی هەیە.

٤ـ ئیمام ئەتوانێ لەماڵی خۆی، یا لە بەیتولمال بۆ بەرژەوەندی‌و ئاشتی نێوان خەڵك - پارەی خوێن بدات.

٥ـ خوێن بەفیڕۆ ناچێت‌و ئەبێ چارەی بکرێت.

٦٦٤- ن /٣٠٤٢ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: انَّ هَذَا الْبَلَدَ حَرَامٌ حَرَّمَهُ اللهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فَهُوَ حرَامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ الَى يَوْمِ القِيَامَةِ، وَانَّهُ لَمْ يَحِلَّ الْقِتَالَ فِيهِ لأَحَدٍ قَبْلِي ، وَلَمْ يَحِلَّ لِي الاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ ، فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ الَى يَوْمِ الْقِيامَةِ)) رواه الجماعة الا ابن ماجة (خ/١٥٨٧، ١٨٣٤، ٢٧٨٣، ٢٨٢٥، ٣١٨٩) (م/١٣٥٣/٤٤٥) احمد (١/٢٢٦، ٢٥٩، ٣١٥، ٣٥٥) وابوداود (٢٠١٨، ٢٤٨٠) الترمذي (١٥٩٠) النسائي (٥/٢٠٣ـ٢٠٤))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوەؓ هاتوە، کە وتویەتی پێغەمبەری خواﷺ لەڕۆژی سەرکەوتنی لەشاری مەکەدا، فەرمویەتی: ئەم شارە قەدەغەیە، خوا قەدەغەی کردووە

ئەوكاتەی كە ئاسمانو زەوی دروست كرد. كەواتە قەدەغەیە بە قەدەغەكردنی خوایی هەتا ڕۆژی قیامەت، وەبەڕاستی حەڵاڵ نیە شەڕی تێدا بكرێت، بۆ هیچ كەسێك پێش منیش حەڵاڵ نەكراوە، هەروا بۆ منیش، مەگەر كاتێك لە ڕۆژێكا، ئێستا ئەو قەدەغەیە بە قەدەغەكردنی خوایی یە، هەتا ڕۆژی قیامەت، بەڵام پێویستە ئەوەش بزانرێت، كە مەككە پەنای تاوانبارو بكوژو دزو داوێن پیس نادات‌و فەرمودەی ڕاستیان لەسەرە[١].

## گەورەیی تاوانی كوشتن

٦٦٥- ن /٣٠٤٤ ((عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ عَنِ النبَّـيِّ ﷺ قَالَ: اَوَّلُ مَا يُقْضى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ) رواه الجماعة الاّ ابـاداود (خ/٦٥٣٣،٦٨٦٤) (م/١٦٧٨/٢٨) احمد (١/٤٤٠،٤٤٢) الترمذي (١٣٩٦،١٣٩٧) النسائي (٨٣/٧) وابن ماجة (٢٦١٥))).

لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: یەكەم شت لەڕۆژی قیامەتدا، كە لەبارەی مافەكان حوكم لەنێوان خەڵك دەكرێت دەربارەی خوێنە.

٦٦٦-ن/٣٠٥٠ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: (مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَده يَتَوَجَّأُ بِهَا فِي بَطْنِه فِي نَارِ جَهَنَّمَ، خالداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً. وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِسُمٍّ فَسُمُّهُ فِي يَده يَتَحَسَّاهُ فِي نارِ جَهَنَّمَ خَالداً مُخَلَّداً فِيهَا اَبَداً ، وَمَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ مُتَرَدٍّ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً) رواه الجماعة الاّ النسائي وابـاداود (خ/٥٧٧٨) (م/١٠٩/١٧٥) احمد (٢/٢٥٤،٤٧٨،٤٨٨) الترمذي (٢٠٣٤،٢٠٤٤) ابن ماجة (٤٣٦٠))).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەر كەسێك بە ئاسنێك خۆی بكوژێ ئەوە ئاسنەكەی بەدەستەوەیە دەیكا بەسكی خۆیدا

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٠٣٩ تا ٣٠٤٣)، لە نیل الاوطار، بكە.

هەمیشەییەو هەمیشەیش لەناو ئاگری دۆزەخدا، دەکرێت لـەناو ئـاگردا هـەتا هەتایـە، هەرکەسێك خۆی بکوژێ بەژەهر ئەوە ژەهرەکەی لەدەست دایـە هـەر خەریکـە ئـەیخوات لەناو ئاگری دۆزەخدا، هەمیشەییەو هەمیشەیش دەکرێت لەناو ئەو ئاگرەدا هەرکەسـێك لە چیایەك خۆی بخاتە خوارەوەو، خۆی بکوژێت، ئەوە فڕێ ئەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، هەمیشەییەو هەمیشەیش دەکرێـت لـەناویا هـەتا هەتایـە، فـەرمودە لـەمبارەوە زۆرە ئەوەندە بەسە، لە عاقلان ئیشارەتێك.

٦٦٧- ن /٣٠٥١ ((عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ اَنَّهُ قَالَ: يَارَسُولَ اللهِ أَرَأَيْتَ اِنْ لَقِيتُ رَجُـلاً مِنَ الْكُفَّارِ فَقَاتَلَنِي فَـضَرَبَ اِحْدَى يَـدَيَّ بِالـسَّيْفِ فَقَطَعَهَـا ثُـمَّ لاذَ مِنِّـي بِـشَجَرَةٍ فَقَـالَ : أَسْلَمْتُ للهِ ، اَفَأَقْتُلَهُ يَارسُولَ اللهِ بَعْدَ أَنْ قَالَهَا ؟ قَالَ ((لا تَقْتُلْهُ))، قَالَ: فَقُلْتُ يَارَسُولَ اللهِ إِنَّهُ قَطَعَ يَدِي ، ثُمَّ قَـالَ ذَلِـكَ بَعْـدَ اَنْ قَطَعَهَـا اَفَأَقْتُلُـهُ؟ قَـالَ: ((لا تَقْتُلْـهُ فَـإِنْ قتَلْتَـهُ فَإِنَّـهُ بِمَنْزِلَتِـكَ قَبْـلَ أَنْ تَقْتُلَـهُ، وَاِنَّـكَ بِمنْزِلَتِـهِ قَبْـلَ اَنْ يَقُـولَ كَلِمتَـهُ الَّـتي قَـالَ) متفـق عليـه خ/٤٠١٩، ٦٨٦٥) م/٩٥، ١٥٥) احمد (٣/٦، ٤، ٥)))

لە میقدادی کوڕی ئەسوەدەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ پـێم بڵێ، ئەگەر بە پیاوێك لـە کـافران بگـەمو شـەڕم لەگەڵـدا بکـات بەشمـشێر بـدات لـە دەستێکمو بیبڕێت لە پاش دا بەهۆی درەختێکەوە خۆی لەمن بپـارێزێ و بڵـێ: گـەردن کەچم بۆ خواو - مسوڵمان ببێ - ئایا بیکوژم ئەی پێغەمبـەری خـواﷺ پـاش ئـەوەی کەوای ووت؟

فەرموی (نەیکوژیت).

وتی:وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەو دەستی منی بڕیوە لەپاشـدا ئـەوە بڵـێ پـاش ئەوەی، کە بڕیویەتی ئایا بیکوژم؟

فەرموی ((نەیکوژیت، جا ئەگەر کوشتت بەڕاستی ئەو دێتە جێگای تـۆپێش ئـەوەی، کە بیکوژێت -واتە مسوڵمانە -وە تۆ ئەچیتە جێگای ئەو پێش ئەوەی، کە ئەو قـسەیە بکات واتە: کافربون، یان تاوانباربون)).

٦٦٨- ن /٣٠٥٣ ((عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ اَصْحَابِهِ (بَايِعُونِي عَلَى اَلاّتُشْرِكُوا بِاللهِ شَيْئاً وَلاَتَسْرِقُوا وَلاَتَزْنُوا وَلاَتَقْتُلُوا اَوْلاَدَكُمْ وَلاَتَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَاَرْجُلِكُمْ وَلاَ تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَيَ مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، وَمَنْ أصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً فَعُوقِبَ بِهِ فِي الدُّنْيا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً ثُمَّ سَتَرَهُ اللهُ فَهُوَ اِلَى اللهِ إنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ وَاِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ)) فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ. وَفِي لَفْظٍ: ((فَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ الاّ بالْحَقِّ)) متفق عليه خ/٦٧٨٤،٦٨٠١) م/٩/١٧٠٩-٤٣/٤١) احمد(٥/٣١٤،٣٢٠)))

له عوبادەی كوڕی سامیتەوەﷺ هاتوە، كە بە پێغەمبەری خواﷺ كۆمەڵێك لە یارەكانی لە چواردەور بوو فەرمووی: پەیمانم پێ بدەن، كە هیچ هاوبەشییەك بۆ خوا دانەنێن،وە دزی نەكەن، وە زینا نەكەن، وە منالّی خۆتان نەكوژن، نە ئێستاو نە لەپاشدا بوختان بۆ یەكتر نەكەن ، بێ فەرمانی لە چاكەدا نەكەن ، جا هەركەس لە ئێوە پەیمانی خۆی بردە سەر، ئەوە پاداشتی لەلای خوایە، هەركەسێك لە یەكێك لەوانە كۆتا هاتو ئەو كارەی ئەنجام داو لە دونیادا تۆڵەی لێسەنرا، ئەوە ئیتر داپۆشەری تاوانەكەیەتی هەركەسێك ئەوەی ئەنجام داو لەپاشا خوا شاردییەوە، ئەوە ئیتر بەدەست خوایە، ئەگەر ئارەزوی لێ بوو چاو پۆشی لێ ئەكات، ئەگەر ئارەزوی لێ بوو تۆڵەی لێوەرئەگرێت، جا ئێمەیش پەیمانمان لەسەر ئەوە پێدا، لە بێژەیەكی تردا هاتوە، كە: ((ئەو گیانە نەكوژن ، كە خوا قەدەغەی كردووە لێتان، مەگەر بەحەق نەبێ، وەكو پاشگەزبوونەوە، یا كوشتنی نا حەق، یا ژنی هێنا بێ زینا بكات، یان هێرش بكاتە سەر گیانوماڵی مسوڵمانێكو..وە.....)).

٦٦٩- ن /٣٠٥٥((عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ قَالَ: اَتَيْنَا رَسُولَ اللهِﷺ فِي صَاحِبٍ لَنَا اَوْجَبَ – يَعْنِي النَّارَ- بِالْقَتلِ فَقَالَ: (أَعْتِقُوا عَنْهُ يُعْتِقِ اللهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عَضْواً مِنْهُ مِنَ النَّارِ) رواه احمد(٣/٤٩٠،٤٩١) وابوداود(٣٩٦٤)))

له واسیلەی كوڕی ئەسقەعەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: هاتینە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ دەربارەی رەفیقێكمان، كە پێویست بوو -واتە ئاگر بۆی - بەهۆی كوشتن،

فەرموی: (لەباتی ئەودا بەندە ئازاد بکەن، خوا بەهۆی هەر ئەندامێکیەوە، ئەندامێکی لەئاگر ئازاد ئەکات). واتە خێرو چاکە ئەبێ بەهۆی ڕەزامەندی خواو داپۆشینی تاوانەکەی. ئەمەش ڕێگایەکی ترە بۆ ئازاد کردنی عەبدەکان..

٦٧٠- ن /٣٠٥٨((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النبَّـيِّ ﷺ قَالَ: (هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ) يَعْنِي الْخِنْصَرُ وَالْبِنْصَرُ وَالأبْهَامُ) رواه الجماعة الامسلماً. وَفي رواية قَالَ: دِيَةُ أَصَابِعِ الْيَدَيْنِ وَالرَّجْلَيْنِ سَوَاءٌ عَشْرُ مِنَ الأبِلِ لِكُلِّ أُصْبَعٍ) رواه الترمذي وصححه (١٣١٩) اللفظ الاول (خ/٦٨٩٥) احمد (١/٢٢٧،٣٣٩،٣٤٥) وابوداود(٤٥٥٨) والترمذي (١٣٩٢) والنسائي (٥٦/٨) ابن ماجة (٢٦٥٢))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە، کە فەرمویەتی: (ئەمەو ئەمەوەکو یەکن)، واتە پەنجە بچکۆڵەکەو پاڵ ئەوو پەنجە گەورەکە لە خوێنداوەکو یەکن... لە ڕیوایەتێکی تردا، کە تورمزی هێناویەتیو بەڕاستی دانـاوە هاتوە، کە فەرمویەتی: خوێن بایی پەنجەکانی دەستەکانو پێیەکان وەکو یەکنو، هەر پەنجەیەك ئەگەر بڕا دە وشتر خوێنیەتی.

٦٧١- ن /٣٠٥٩ ((وَعَنْهُ اَنَّ النبَّـيَّ ﷺ قَالَ: (الأَسْنَانُ سَوَاءٌ. الثَّنِيَّةُ وَالضِّرْسُ سَوَاءٌ) رواه ابوداود (٤٥٥٩)وابن ماجه (٢٦٥٠))).

هەرلەوەوە ﷺو لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە، کە فەرمویەتی: ددانەکان وەکو یەکن، دوانیەکانو خڕێ وەکو یەکن.

٦٧٢- ن /٣٠٥٩((عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ اَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ اَنَّ النبَّـيَّ ﷺ قَضَى فِي الْعَيْنِ الْعَوْراءِ السَّادَّةِ لِمَكَانِهَا اذَا طُمِسَتْ بِثُلثِ دِيَتِهَا وَفِي الْيَدِ الشَّلاَّءِ اذَا قُطِعَتْ بِثُلُثِ دِيَتِها وَفِي السِّنِّ السَّوْداءَ اذَا نُزِعَتْ بِثُلُثِ دِيَتِهَا)). رواه النسائي (٥٥/٨) ولابى داود (٤٥٦٧) منه (قَضَى فِي الْعَيْنِ الْقَائِمَةِ السَّادَّةِ لِمَكَانِهَا بِثُلثِ الدِّيَةِ).

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری داوە لە چاوێکی کوێرو چەموش، کە لە جێگای خۆیدا بێ، هەرکاتێ لابرا

بەتەواوی سێ یەکی خوێنی هەیە. واتە نزیکەی ١٧وشتر خوێنیەتی، سەبارەت بە دەستێکی وشك بوو هەرکاتێ برا، سێیەکی خوێنیەتی، سەبارەت بەددانی رەشۆ بوو، هەرکاتێ هەڵکەنرا، سێیەکی خوێنیەتی... بڕیاری داوە بۆ ئەو چاوەی، کە لە شوێنی خۆیدا مابێتو بەسێیەکی خوێنەکەی. واتە: ئەگەر بینینی لەدەست دابو، والله أعلم.

٦٧٣- ن /٣٠٦٥ ((عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ اَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ اَنَّ النَّبِيَّﷺ قَالَ: (عَقْلُ الْكَافِرِ نِصْفُ دِيَةِ الْمُسْلِمِ) احمد (١٨٢،١٧٨/٢) والترمذي (١٤١٣) والنسائي (٤٥/٨))).

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باوەیەوەﷺ هاتوە کە بەڕاستی پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: نرخی خوێنی کافر نیوەی نرخی خوێنی مسوڵمانە.

## خوێنی بەچکە

٦٧٤- ن /٣٠٦٩ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: اقْتَتَلَتْ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ فَرَمَتْ اِحْدَاهُمَا الأُخْرَىَ بِحَجَرٍ فَقَتَلَتْهَا وَمَا فِي بَطْنِهَا، فَاخْتَصَمُوا اِلَى رَسُولِ اللهِﷺ فَقَضَى: اَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ عبد اَوْ وَلِيَدَة وَقَضَى بِدِيَةِ الْمَرأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا)(. متفق عليه خ/٥٧٥٩ م/١٦٨١/٣٤ احمد(٢٣٦/٢).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: دوو ئافرەت لە تیرەی هوزەیل شەڕیان بوو، یەکێکیان بەردێکی دا لەکێکیانو کوشتیو ئەوەیش، کە لەسکیابوو - کوژراو دوگیان بو - جاکێشەکەیان گەیاندە پێغەمبەری خواﷺو ئەویش بڕیاریدا، کە: خوێنی کۆرپەکەی، غوڕەیەکە - کەبایی — عەبدێك، یان جارییە کە خوێنی ئافرەتەکەیش لەسەر خزمانی بکوژە، واتە خوێنی - لەدەستیانقەس چوو (شبه العمد) لەسەر خزمانی بکوژە. تێبینی: کوشتن سێ جۆرە:-

١- کوشتنی بەهەڵە (الخطأ).

٢-کوشتنێك وەکو دەستیانقاس وایە (شبه العمد).

٣- كوشتنی دەستیانقەس (العمد).

٦٧٥- ن /٣٠٧٣ ((عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ قَالَ: اخْتَلَفَتْ سُيُوفُ الْمُسْلِمِينَ عَلَى الْيَمَانِ اَبِى حُذَيْفَةَ يَوْمَ أُحُدٍ وَلاَيَعْرِفُونَهُ فَقَتَلُوهُ، فَأَرَادَ رَسُولَ اللهِﷺ اَنْ يَدِيَهُ فَتَصَدَّقَ حُذَيْفَةُ بِدِيَتِهِ عَلَى الْمُسْلِمِينَ)). رواه احمد (٤٢٩/٥).

له مه‌حمودی كوڕی لەبیدەوەﷺ هاتوه، كه وتویه‌تی: شمشێری مسوڵمانانله غه‌زای ئوحوددا داباریه سه‌ر (یه‌مان)، جا باوكی حوزه‌یفه یان نه‌ناسیو كوشتیان، پێغه‌مبه‌ری خواشﷺویستی خوێنه‌كه‌ی بدات، حوزه‌یفه خوێنه‌كه‌ی به‌خشی به مسوڵمانان. واته ئه‌گه‌ر له غه‌زادا كه‌سێ كه‌سێكی نه‌ناسیو كوشتیو به‌كافری زانی، له‌پاشدا ده‌ركه‌وت، كه مسوڵمانه، پێویسته له‌سه‌ر پێشه‌وای مسوڵمانان له به‌یتولماڵ خوێنه‌كه‌ی بدات.

٦٧٦- ن /٣٠٧٨ ((عَنْ حَجَّاجِ بْنِ اَرْطَاةَ عَنْ زَيدْ بْنِ جُبَيْرِ عَنْ خَشْفِ بْنِ مَالِكٍ الطَّائِي عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (فِي دِيَةِ الْخَطَأ عِشْرُونَ حِقَّةً وَعِشْرُونَ جَذَعَةً وَعِشْرُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ وَعِشْرُون بِنْتَ لَبُونٍ وَعِشْرُونَ ابْنَ مَخَاضٍ ذَكَراً) رواه الخمسة احمد (٣٨٤/١، ٤٥٠) وابوداود (٤٥٤٥) والترمذي (١٣٨٦) والنسائي (٤٣/٨) ابن ماجة (٢٦٣١))).

له حه‌جاجی كوڕی ئه‌رتائه‌وه، له زه‌یدی كوڕی جوبه‌یره‌وه، له خه‌شفی كوڕی مالیكی تائیه‌وه، له عه‌بدوڵلای كوڕی مه‌سعوده‌وهﷺ هاتوه، كه وتویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رمویه‌تی: نرخی خوێنیكوشتنی به‌هه‌ڵه بیستوشتری پێ له‌پێنج ساڵو بیستوشتری پێ له چوارو بیستوشتری پێ له دوو ساڵو بیستوشتری پێ له سێ ساڵ (ئه‌مانه‌ئه‌بێ مێ بن)وه بیست وشتری نێری پێ له‌دوو ساڵ. واته‌وشتره‌كان له‌تۆڵه‌ی كوشتنی هه‌ڵه‌دا ، بیست بیست ئه‌كرێ به پێنج به‌شه‌وه.تێبینی: شێوه‌ی تریش هاتوه له‌باره‌ی به‌های خوێنی كوشتنی هه‌ڵه‌ی روته‌وه له‌به‌ر ئه‌وه زانایان له‌وباره‌وه بۆچونیان جیاوازه.[1]

---

(١) ته‌ماشای ڕاڤه‌ی هه‌مان فه‌رموده له (نیل الأوطار)دا بكه، به‌سوده.

٦٧٧- ن /٣٠٨٦)- ((عَنْ عِمْرَانِ بْنِ حُصَيْنٍ، أَنَّ غُلاَمَاً لأُنَاسٍ فُقَرَاءَ قَطَعَ أُذُنَ غُلاَمٍ لأُنَاسٍ اَغْنِيَاءَ فَأَتَى اَهْلَهُ اِلَى النبَّيِّ ﷺ فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللهِ، اِنَّا أُنَاسٌ فُقَرَاءُ. فَلَمْ يَجْعَلْ عَلَيْهِ شَيْئاً) رواه احمد (٤٣٨/٤) وابوداود (٤٥٩٠) والنسائي (٢٥/٨))).

له عیمرانی کوڕی حوسەینەوە‌ﷺ هاتوە، کە بەندەیەکی کۆمەڵـە خـەڵکێکی فـەقیر گوێی بەندەیەکی کۆمەڵە خەڵکێکی دەوەڵەمەندی بڕی، جا خاوەنی بەندەکە - کە فەقیر بوون - هاتنە خزمەتی پێغەمبەروﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، بەڕاستی ئێمـە کۆمەڵە خەڵکێکی فەقیرین هیچی لەسەر دائەنا. واتە ئەگـەر هـەڵگر، یـان هـەڵگرانی خوێن فەقیر بوون خوێنیان ناکەوێتە سەر چونکە بەرئەم قاعیدە گشتی یە دەکەوێت، کـە لەم ئایەتەوەوەرگیراوە (لاَ يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً إِلاَوُسْعَهَا).

٦٧٨- ن /٣٠٨٨ ((عَنِ الْخَشْخَاشِ الْعَنْبَرِيِّ قَالَ: اَتَيْتُ النبَّيَّﷺ وَمَعِي ابْنٌ لِي فَقَالَ: ابْنُكَ هَذَا ؟) فَقُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: لاَيَجْنِي عَلَيْكَ وَلاَ تَجنِي عَلَيْهِ) رواه احمد(٣٤٤/٤، ٣٤٥)(٨١/٥) وابن ماجة (٢٦٧١))).

له خەشخاشی عەنبەرییەوە‌ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: هاتمـە خزمـەت پێغەمبـەرﷺ کوڕێکی خۆمم لەگەڵ دا بوو، فەرمووی ئەمە کوڕتە؟

وتم: بەڵێ.

فەرمووی: (تاوانی ئەو لەسەر تۆ نییەو تاوانی تۆیش لەسەر ئەو نییە). ئـەم فـەرمودە بە قەسامە تایبەت ئەبێ، واتە لە قەسامەدا سوێندی تاوانێ، کـە تاوانکـار دیارنـەبێ، لەسەر خزمانیەتی، لەڕۆژی قیامەتیشدا تاوانی هەرکەس لەسەرشـانی خۆیـەتی. تـاوانی خێڵ و تیرەش هەروایە، وەکو لەم فەرمودەی بەردەمدا دێ.

٦٧٩- ن /٣٠٩١ ((عَنْ رَجُلٍ مِنَ بَنَي يَرْبُوعٍ قَالَ: اَتَيْنَا رَسُولُ اللهِﷺ وَهُوَ يُكَلِّمُ النَّاسَ فَقَامَ اِلَيْهِ النَّاسُ فَقَالُوا يَارَسُولَ اللهِﷺ هَؤُلاَءِ بَنُو فُلاَنِ الَّذِينَ قَتَلُوا فُلاَناً. فَقَالَ: رَسُولُ اللهِﷺ: (لاَ تَجَنِيْ نَفْسٌ عَلَى نَفْسٍ) رواه احمد(٣٧٧/٥) والنسائي (٥٤/٨) وذكره في الصحيحة (٩٨٨))).

لە پیاوێكەوە لەتیرەی یەربوعەوە هاتوە، كە وتویەتی: چوینە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ ئەو - لەوكاتەدا - قسەی ئەكرد بۆ خەڵك، كۆمەڵێك خەڵك هەستانو وتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوە تیرەی فلانن كە فلان كەسیان كوشتووە، جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: تاوانی هیچ كەسێك ناخرێتە سەر كەسێكی تر. ئەم فەرمودەیە گشتیو فراوانترەو هەمو كەس ئەگرێتەوە.

## باسی سنور - الحدود - و بەشی سەنگسار كردنی زیناكەرێك ژنداربێو زینای ئەوانەی ژنیان نەهێناوەو ئاوارەكردنیان.

(٦٨٠/ ن /٣٠٩٣ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ أَنَّهُمَا قَالاَ: اِنَّ رَجُلاً مِنَ الأَعْرَابِ اَتَى رَسُولَ اللهِﷺ فَقَالَ: يَارَسُولَ اللهِﷺ اَنْشُدُكَ اللهَ! الاَّ قَضَيْتَ لِي بِكِتَابِ اللهِ. وَقَالَ الْخَصْمُ الآخَرُ وَهُوَ اَفْقَهَ مِنْهُ: نَعَمْ، فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ وَائْذَنْ لِي فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ (قُلْ) قَالَ اِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفاً عَلَى هَذَا فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ وَاِنِّي اُخْبِرْتُ اَنَّ عَلى ابْنِي الرَّجْمُ فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ، فَسَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ فأَخْبَرُونِي اَنَّ عَلى ابْنِي جَلْدَ مِائَةٍ وَتَغَرْيبَ عَامٍ ، وَاَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمُ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (( وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللهِ: الْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَاَغْدُ يَااُنَيْسُ- لِرَجُلٍ مِنْ اَسْلَمَ- اِلَى امْرَأَةِ هَذَا ، فَاِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا)) قَالَ : فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ، فَاَمَرَ بِهَا رَسُولَ اللهِﷺ فَرُجِمَتْ)). رواه الجماعة احمد (١١٥/٤) وابوداود (٤٤٤٥) والترمذي (٢٤٠/٨، ٢٤١) وفي الكبرى (٢٨٥/٤) وابن ماجة (٢٥٤٩) (خ/٦٨٤٢، ٦٨٤٣) (م/١٦٩٧، ١٦٩٨))).

لە ئەبو هورەیرەوەو زەیدی كوڕی خالیدەوە ﷺ هاتوە، كە ووتویانە: پیاوێك لەعەرەبە دەشتەكییەكان هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ سوێندت ئەدەم بەخوا، هەر بە كیتابەكەی خوا بڕیارم بۆ بدە.وە هاوكێشەكەی تریان، كە ئەو لەم، تێگەیشتوو تر بوو لەو، وتی: بەڵێ، بەكیتابەكەی خوا فرمان بدە لە

نێوانمانداو ماوەم پێ بدە، فەرموی: بڵێ وتی: كوڕی من لەلای ئەمەمزور بووە زینای لەگەڵ ژنی ئەودا كردوە، هەواڵیشم پێدرا، كە كوڕی من ئەبێ سەنگسار بكرێت، لەبەر ئەوە من سەد مەڕو كەنیزەكێكم لەباتی ئەودا، لەپاشا پرسیارم لە زانایایەی كرد، وتی: كوڕی تۆ سەد تازییانەی لێ ئەدەرێتو ساڵێك ئاوارە ئەكرێت، وە لەسەر خێزانی ئەمە سەنگسار كردن هەیە، جا پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ((سوێند بەو كەسەی كەگیانی منی بەدەستە، بە كتابەكەی خوا بڕیارتان لەنێوانتاندا دەدەم، كەنیزەكەكەو مەڕەكان ئەگەڕێننەوە، لەسەر كوڕی تۆ سەد تازیانە هەیەو ساڵێك دوور ئەخرێتەوە، ئەی ئەنەسە بچكۆل بەیانی بڕۆ -پیاوێكی تیرەی ئەسلەم بوو- بۆلای خێزانی ئەو پیاوە، جا ئەگەر ئیعترافی كرد سەنگساری بكە، وتی: بەیانی چوو ئافرەتەكە دانی پێدانا، جا پێغەمبەری خوا فرمانیدا سەنگسار بكرێت، جا سەنگسار كرا، واتە ئەوەی هاوسەری هەبێ، زینا بكات ئەبێ سەنگسار بكرێت جا پیاو بێ، یان ئافرەت.

٦٨١- ن /٣١٠٠ ((عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللهِ قَالَ: رَجَمَ النبِّيُّ رَجُلاً مِنْ اَسْلَمَ وَرَجُلاً مِنْ الْيَهُودِ وَامْرَأَةً. رواه احمد (٣٢١/٣) ومسلم (١٧٠١/١) وابوداود (٤٤٥٥))).

لەجابیری كوڕی عەبدوڵڵاوە رضي الله عنهما هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەرﷺ پیاوێكی تیرەی ئەسلەمو جولەكەیەكو ئافرەتێكی سەنگسار كردووە.

## دانپێدانانی زینا بەچوارجار دەبێ

٦٨٢/ن/٣١٠٢- ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: اَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللهِﷺ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَنَادَاهُ فَقَالَ: يَارَسُولَ اللهِ ! اِنِّي زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ حَتَّى رَدَّدَ عَلَيْهِ اَرْبَعَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ اَرْبَعَ شَهَادَاتٍ، دَعَاهُ النبِّيُّ ﷺ فَقَالَ: (اَبِكَ جُنُونٌ؟) قَالَ: (لاَ) قَالَ: (فَهَلْ اَحْصَنْتَ؟) قَالَ: (نَعَمْ) فَقَالَ النبِّيُّ ﷺ: (اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ) قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ جَابِرِ بْنَ عَبْدِاللهِ قَالَ: كُنْتُ فِيمَنْ رَجَمَهُ فَرَجَمْنَاهُ بِالْمُصَلَّى، فَلَمّا اَذْلَقَتْهُ الْحِجَارَةُ هَرَبَ، فَاَدْرَكْنَاهُ بِالْحَرَّةِ فَرَجَمْنَاهُ. متفق عليه (خ/ ٥٢٧١، ٦٨١٥، ٦٨٢٥، ٧١٦٧)

(م/١٦٩١/١٦) احمد (٤٥٣/٢))). لە ئەبوهورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ، کە ئەو تەشریفی لە مزگەوتا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ: بەڕاستی من زینام کردووە، پێغەمبەر پشتی تێکرد، تا چوارجار ئەوەی ووتەوە، جا کاتێ چوارجار شایەتی لەسەرخۆیدا، پێغەمبەرﷺبانگی کردو فەرمویی: ((تۆ شێت نیت؟

وتی: نەخێر.

فەرموی: ژنت هێناوە؟

وتی: بەڵێ، جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((بیبەنو بەردبارانی بکەن)) کوڕی شەهاب ئەڵێ: ئەوەی لەجابیری کوڕی عەبدوڵڵای بیستبو پێیوتم، وتی: من یەکێك بووم لەناو ئەوانەی، کە سەنگساریان کرد، جا کرد لەجێگای نوێژدا بەردبارانمان - شوێنێك بوو لە دەرەوەی شار، کاتی جەژنانو نوێژی بارانەیان لەوێ دەکرد - جا کاتێ ئێشی بەردەکانی پێگەیشت، رایکردو لەناو بەردەڵانەکەدا پێی گەیشتینو سەنگسارمان کرد. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کە داننان بەژن هێناندا یەکجار بەسەو بەوشەی بەڵێ، دان پێدانانە.

## کەسێ بڵێ حەدم لەسەرەو ناوی شتەکە نەبات، حەدی لێنادرێت

٦٨٣- ن / ٣١١٠ ((عَنْ اَنس، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النبِّيِﷺ فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَارَسُولَ الله، اِنِّي اُصبْتُ حَدّاً فَاَقِمْهُ عَلَيَّ وَلَمْ يَسْئَلَهُ. قَالَ: وَحَضَرت الصَّلاَةُ فَصَلَّى النَّبِيُّ فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّﷺ قَامَ اِلَيْهِ الرَّجُلُ فَقَالَ: يَارَسُولَ الله اِنِّي اُصبْتُ حَدّاً فَاَقِمْ فِيّ كِتَاب الله قَالَ : (( اَلَيْسَ قَدْ صَلَّيْتَ مَعَنَا ؟)) قَالَ: نَعَمْ . قَالَ : ((فَاِنَّ اللهَ قَدْ غَفَر لَكَ ذَنْبَكَ )) اَوْ ((حَدَّكَ)) احرجاه (خ/٦٨٢٣) (م/٢٧٦٤))). لە ئەنەسەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: من لای پێغەمبەرداﷺ بووم، پیاوێك هاتە لای وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من دوچاری

حەد بووم، لەسەرم جێبەجێی بکە، جا هیچ پرسیاری لـێنەکرد، ئەڵێ: کاتی نوێژ هات، جا پێغەمبەرﷺ نوێژی کرد، کاتێ لە نوێژ بویەوە، هەمان پیاو هەستاییەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بەڕاستی دوچاری حەد بووم، دەی کیتابەکەی خوام لەسەر جێبـەجێ بکە.

فەرموی: ئایا لەگەڵ ئێمەدا نوێژت کرد؟

وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ.

فەرموی: بەڕاستی خوا لەتاوانت خۆش بوو (یان لەحەدەکەت). لێرەدا پێغەمبـەرمان پرسیاری لـێ نەکرد لەسەرچیو چی کردووە، بەڵکو بێ دەنگی لێکرد، جا ئەگەر کەسـێ هەروای ووت چاك وایـە داوای باسـکردنی لێ نـەکرێت، کـە باسـی تاوانەکـە نـەکاتو پەشـیمان ببێتـەوە، خـوا بەڕەحمـە بـۆ بەنـدەکانی، لێـرەوە ئـەوە دەرئەکـەوێت، کـە بڵاوکردنـەوەی تـاوانی خـەڵك، چـەند خـراپو ناشـرینە لەڕوانگـەی ئـایینی پـیرۆزی ئیسلامەوە.

## حـــەد بەگومان دروســت نیە

٦٨٤- ن /٣١١٣ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، اَنَّ رَسُولَ اللهﷺ لاَعَـنَ بَـيْنَ الْعَجَلاَنِـيِّ وَامْرَأَتِـهِ فَقَالَ شَدّادُ بْنُ الْهادِ: هِيَ الْمَرَأَةُ الَّتِي قَالَ رَسُولُ اللهﷺ (لَوْ كُنْتُ راجِماً اَحَداً بِغَيْـرِ بَيِّنَـةٍ لَرَجَمْتُهَا) قَالَ: لاَ، تِلْكَ امْرَأَةٌ كَانَـتْ قَـدْ أَعْلَنَـتَ فِـي الإِسْلاَمِ. متفـق عليـه (خ/٥٣١٠، ٥٣١٦، ٦٨٥٥، ٦٨٥٦، ٧٢٣٨) (م/١٤٩٧) كـذا رواه النـسائي (١٧١/٦) احمـد (٣٣٥/١، ٣٣٦، ٣٣٧، ٣٦٥))).

لە عـەبدوڵڵای کوڕی عـەباسەوەرضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ نەفرینکردنی دانـا لەنێوان عـەجلانیو خێزانەکەیدا، جا شەداد وتی: ئەوە ئەو ئافرەتە بوو کـە پێغەمبـەری خواﷺ فەرموی: (ئەگەر من بەبێ شایەتو بەڵگـە کەسـێکم سەنگـسار بکردایـە ئـەو ئافرەتەم سەنگسار ئەکرد) وتی: نەخێر، ئەوە ئافرەتێك بوو لەناو مسوڵمانان دیـار بـوو،

بەداوێن پیسی ئەناسرا، بەلاّم نە شایەتی لەسەر بوو نەخۆیشی دانی پێدائەنا. واتە: حەد بەگومان لەسەر خەڵك سابت نابێت.

٦٨٥- ن /٣١١٧ ((وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّاب: كَانَ فِيمَا اَنْزَلَ اللهُ آيَةَ الرَّجْمِ فَقَرَأْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا وَرَجَمَ رَسُولُ اللهِ وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ فَأَخْشَى اِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ اَنْ يَقُولَ قائِلٌ : وَاللهِ مَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتابِ اللهِ تَعَالى، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ اَنْزَلَهَا اللهُ تَعالى ، وَالرَّجْمُ فِي كِتابِ اللهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أَحْصَنَ مِنَ الرَّجَالِ والنِّساء، اِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ اَوْ كَانَ الْحَبْلُ اَوِ الْأعْتِرافُ .رواه الجماعة احمد (١/٢٣، ٢٤، ٤٠، ٤٧، ٥٥) وابوداود (٤٤١٨) والترمذي (١٤٣٢) ابن ماجة (٢٥٥٣) الا النسائي (خ/٦٨٢٩) (م/١٦٩١))).

هەر لەوەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: عومەری كوڕی خەتاب وتویەتی: لەوانەی كەخوا ڕەوانەی كردووە ئایەتی سەنگساركردنە، جا ئێمە خوێندمانەوەو لێی تێگەیشتینو پاراستمان، پێغەمبەری خواﷺ سەنگساری كردووە، ئێمەش پاش ئەو، سەنگسارمان كردووە، جا ئەترسم ئەگەر زەمان زۆر درێژەی كێشا، یەكێك بڵێ: بەخوا لە قورئانی خوادا ڕەجم نییە، جا گومرا بن بە هۆی وازهێنان لە پێویستیەك، كە خوای بالاّدەست دایبەزاندووەوەسەنگساركردن لە قورئانەكەی خوادا، سابتەو ڕاستە لەسەر ئەو كەسەی، ژنی هەبێ، یان شوی كردبێ، هەركاتێ شایەت هەبوو یان دانی پێداهێنا.

٦٨٦- ن /٣١٢٧ ((عَنْ عِمْرَ ان بْنِ حُصَيْنٍ اَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ اَتَتْ رَسُولَ اللهِﷺ وَهِيَ حُبْلَى مِنَ الزِّنَى فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ اَصَبْتُ حَدّاً فَأَقِمْهُ عَلَيَّ فَدَعَا نَبِيُّ اللهِﷺ وَلِيَّهَا فَقَالَ: اَحْسِنْ اِلَيْهَا فَإِذَا وَضَعَتْ فَأْتِني )) فَفَعَلَ ، فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَشُدَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُها ، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ ثُمَّ صَلَّى عَلَيْها ، فَقَالَ عُمَرُ : تُصَلِّي عَلَيْها ، يارسُولَ اللهِ وَقَدْ زَنَتْ؟! قَالَ: ((لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ اَهْلِ الْمَدِينَةِ لَوَ سِعَتْهُمْ، وَهَلْ وَجَدْتَ أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِها للهِ؟! رواه الجماعة احمد (٤/٤٢٩، ٤٣٠، ٤٣٥، ٤٣٦، ٤٣٧، ٤٤٠) النسائي (٤/٦٣ـ ٦٤) الاّ البخاري وابن ماجة (م/١٦٩٦)

(وابـوداود/٤٤٤١) والترمـذي (١٤٣٥))). لـه عيمرانـی کـوڕی حوسـەینەوەﷺ هـاتو ئافرەتێك لەتیرەی جوهەینیه هاتە خزمەت پێغەمبـەری خـواﷺ ، کـه بـەهۆی زینـاوە دوگیان بو وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ دوچاری حەد بووم لەسـەرم جێبـەجێی بکـه ، جا پێغەمبەری خواﷺ بانگی سەرپەرشتەکەی کردو فەرموی: ((چاك ڕەفتـاری لەگەڵـدا بکە، هەرکاتێ منالّەکەی بوو، بۆم بهێنەوە)) ئەویش وایکرد، جا پێغەمبـەری خـواﷺ سەبارەت بەو فرمانی داو پۆشاکەکەی چاك پێچرا پێیەوە ئەوسا فرمـانی داو سەنگـسار کرا، لەپاشان نوێژی لەسەر کرد، عومەر پێی وت: ئەی پێغەمبـەری خـواﷺ ئـەو ژنـه زینای کردوە چۆن نوێژی لەسەردەکەی؟! فەرموی بەڕاستی تەوبەیەکی وایکـردووە، کـه ئەگەر بەسەر حەفتا نەفەر له خەلّکی مەدینەدا دابەش بکرێت، بەشی هـەمویان دەکـات ئایا بەرێزتر لەوکەسەت دەستکەوتوە که گیانی خۆی بەخشیوە لەبەر خوا؟

## باسی دواخسـتنی حـەد لەوانـەی کە بەهانەیـەکیان هــەبێ وەکو دوگیـان و نەخۆشــی.

٦٨٧- ن /٣١٢٨ ((عَنْ عَلِيٍّ ، قَالَ: اَنَّ اَمَةً لِرَسُولِ اللهِﷺ زَنَـتْ فَـأَمَرَنِي اَنْ اَجْلِـدَهَا فَأَتَيْتُهَا فَاِذَا هِيَ حَدِيثَةُ عَهْـدٍ بِنِفَـاسٍ فَخَـشِيتُ اِنْ اَنَـا جَلَـدْتُّهَا اَنْ اَقْتُلَهَـا، فَـذَكَرْتُ ذَلِـكَ لِلنبِّـيِﷺ فَقَالَ: (اَحْسَنْتَ) اتْرُكْهَا حَتَّى تَمَاثَلَ)). رواه احمد (١/١٥٦) ومـسلم (١٧٠٥) والترمذي (١٤٤١) وصححه.

له عەلییەوەﷺ هاتوە، که وتویەتی: کەنیزەکێکی پێغەمبەری خواﷺ زینای کـردو فرمانی پێدام، که جەڵدەی لێبدەم، منـیش هاتمـه لای، کەچـی لەوکاتـەدا تــــازە لــه زەیستان پاك بوەوە، منیش ترســــام گەر تازیانەی لێ بدەم - چونکه کەم خوێن بـووە- بـمرێت، جا ئەوەم بۆ پێغەمبەرﷺ باسکرد، فەرموی: ((چاکت کـردووە وازی لــێبێنە تا بەباشی دێتەوە سەر حالّ)).

## باسی ئەوانەی زینا لەگـەڵ مەحرەمیـان دەكـەن یان نێر بازی دەكەن.

٦٨٨- ن /٣١٣١ ((عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: لَقِيتُ خَالِي وَمَعَهُ الرَّايَةُ فَقُلْتُ اَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِﷺ اِلَى رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبِيهِ مِنْ بَعْدِهِ اَنْ اَضْرِبَ عُنُقَهُ وآخُذَ مَالَهُ. رواه الخمسة وَلَمْ يَذْكُرِ ابْنُ ماجَه والترمذيُّ اَخْذَ الْمَالِ احمد (٤/٢٩٠،٢٩٢،٢٩٥،٢٩٧) ابوداود (٤٤٥٧) وابن ماجة (٢٦٠٧) والترمذي (١٣٦٢))).

لەبەرائی كوڕی عازیبەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: گەیشتمە خاڵم ئاڵایەكی بەدەستەوە بوو وتم: بۆ كوێ؟

وتی: پێغەمبەری خواﷺ منی ناردووە لەگەردنی پیاوێك بدەموماڵەكەی وەرگرم، كە لەدوای باوكیەوە، زڕدایكی ماره كردووەو هێناویەتی..

٦٨٩- ن /٣١٣٤ش ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (مَنْ اَتَى بَهِيمَةً فَلاَ حَدَّ عَلَيْهِ) رواه الترمذي (٤/٥٧) عقب الحديث (١٤٥٥) وابوداود(٤٤٦٥) والنسائي (٤/٣٢٣)))

له عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوەﷺ هاتوە، كە هەركەسێ بچێتە لای ئاژەڵێ، ئەوا حەددی لەسەر نییە.

لەمبارەوە فەرمودەی دژی ئەمە هاتوە، بەڵام ئەم فەرمودەیە دروستترە. هەروەها دەربارەی ئەوانەی، كە نیربازی ئەكەن، تاوانێكی گەورەیەو، زانایان دووبەشن، بەشێكیان ئەڵێ: بكوژرێنو، بەشێكیان ئەڵێ وەكو زینا وایە، جا ئەوەی، كە ژنی هەبێ، سەنگسار ئەكرێت، ئەگینا سەد تازیانەی لێ ئەدرێت، لەمبارەوە فەرمودە هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی سەنەدەكانیان لاواز بوو نەم نووسین، بەسە، كە بزانین گەلی پێغەمبەرێك لەبەرئەو ڕەوشتە پیسە لەناوبران.

٦٩٠-ن/٣١٣٨ ((عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ عَنْ النبِّـيِّﷺ قَـالَ: اذَا زَنَـتْ اَمَـةُ اَحـدِكُمْ فَتَبَيَّـنَ زِنَاهَا فَلْيَجْلِدْهَا الْحَدَّ وَلاَيُثَرِّبْ عَلَيْهَا ثُمَّ اِنْ زَنَتْ فَلْيَجْلِـدْهَا الْحَـدَّ وَلاَيُثَـرِّبْ عَلَيْهَـا ثُـمَّ اِنْ زَنَتْ فَلْيَبِعْهَا وَلَوْ بِحْبلٍ مِنْ شَعْرٍ) متفق عليه ورواه احمد في روايَةٍ وابوداود وذكـرا فِيـه في الرَّابِعَةِ الْحَدَّ وَالْبَيْـعَ (خ/٢٢٣٢، ٢٢٤٣، ٦٨٣٧، ٦٨٣٩، ١١٥٣، ٢١٥٢) (م/١٧٠٣) احمد (٤/١١٦،١١٧))).

له ئـەبو هـورەیرەوەﷺ هـاتوە، لـە پێغەمبـەرەوەﷺ کـە فەرمویـەتی: هـەرکاتێ کەنیزەکێکی یەکێ لەئێوە زینای کردو ئاشکرا بوو، بـا تازیانـەی لـێ بـداتو لۆمـەی نەکات ئینجا، ئەگەر هەر زینای کرد، باتازیانەی لـێ بداتەوەو لۆمەی نەکات، لە پاشان ئەگەر بۆجاری سێهەم زینای کردەوە، ئەگەر بەگوریسێکی موو بـووە بابیفرۆشـێت.. لـە ڕیوایەتی ئیمام ئەحمەدو ئەبوداودا هـاتوە: لـەجاری چـوارەمدا (حـەد لێـدانو فرۆشـتن) هاتوە.

# دەستی دز ئەبڕێت

٦٩١- ن /٣١٤٢ ((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَقْطَعُ يَدَ السَّارِقِ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً)). رواه الجماعة (خ/٦٧٩٨، ٦٧٩٧) (م/١٦٨٦) احمد (٦/٣٦) وابوداود (٤٣٨٣) والترمذي (١٤٤٥) النسائي (٨/٧٨،٧٩).

لە دایکی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە (رضي الله عنها)هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لەسەر روبعە دینارێكو زیاتر، دەستی دزی بڕیوە.

٦٩٢- ن /٣١٤٤ ((عَنْ رَافِعِ بْنَ خَدِيجٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: لاَ قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلاَ كَثَرٍ)). رواه الخمسة احمد (٣/٤٦٣،٤٦٤)، (٥/١٤٠،١٤١) وابوداود (٤٣٨٨) والترمذي (١٤٤٩) النسائي (٨/٨٧-٨٨) وابن ماجة (م/٢٥٩٣))).

لە رافیعی کوڕی خەدیجەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: گوێبیستی لە پێغەمبەری خوا بومﷺ کە ئەیفەرمو: دەست بڕین لە بەروبوومو شەکری ناو نمامی خورمادا نییە.

٦٩٣- ن /٣١٤٩ ((عَنْ جَابِرٍ عَن النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لَيْسَ خَائِنٍ وَلاَمُنْتَهِبٍ وَلاَمُخْتَلِسٍ قَطْعٌ)). رواه الخمسة وصححه احمد (٣/٣٨٠) وابوداود(٤٣٩١،٤٣٩٢) والترمذي (١٤٤٨) النسائي (٨/٨٩/٨٨) وابن ماجة (٢٥٩١).

لە جابیرەوە ﷺ هاتوە لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە فەرمویەتی: بۆ خیانەت کردنی خائینانو تالاّنکردنی تالاّنچیانو شت فڕاندنی فڕێنەران دەست بڕین نییە، چونکە ئاشکرانو خاوەن ماڵ دەتوانێ پارێزگاری لەخۆی بکات، یان بەناسینی ئەوانە لەپاشدا هەوڵی وەرگرتنەوەی بدات.

٦٩٤- ن /٣١٥٠ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَتْ مَخْزُومِيَّةٌ تَسْتَعِيرُ الْمَتَاعَ وَتَجحَدُهُ فَأَمَرَ النَّبِيُّ بِقَطْعِ يَدِهَا)). رواه احمد (٢/١٥١) والنسائي (٨/٧٠،٧١) وابوداود (٤٣٩٥)).

لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی -ئافرەتێکی تیرەی-

مەخزومی كەلوپەلی بە ئەمانەت دەبرد، ئینجا نكۆڵی لێ دەكرد نەیئەدایەوە، جا پێغەمبەر ﷺ فرمانیدا بەبڕینی دەستی.

٦٩٥- ن /٣١٥٦ ((وَعَنْهُ اَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ تَعَافَوْا الْحُدودَ فِيمَا بَيْنَكُمْ فَمَا بَلَغَنِي مِنْ حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ) رواه النسائي (٨/٧٠) وابوداود(٤٣٧٦))).

هەر لەوەوەﷺ هاتوە، كە بەڕاستی پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: لە سنورەكاندا (الحدود) لەنێوان خۆتان چاوپۆشی بكەن ، -نەیگەیەنن بە من، چونكە -ئەوەی كە گەیشتە لای من ئیتر ئەوە پێویست ئەبێ. واتە حاكم بۆی نییە چاوپۆشی لە سنوورەكانی شەرع بكات، بەڵام خەڵك ئەتوانن لەنێوان خۆیاندا چاوپۆشی لەیەكتر بكەن، ئەم فەرمودەی دادێ، شتەكە باشتر ڕون ئەكاتەوە.

٦٩٦- ن /٣١٥٩ ((عَنْ عَائِشَةَ اَنَّ قُرَيْشاً اَهَمَّتْهُمْ الْمَرْأَةُ الْمخْزُومِيَّةُ الَّتي سَرَقَتْ قَالُوا مَنْ يُكَلِّمْ رَسُولَ اللهِﷺ وَمَنْ يَجْتِريءُ عَلَيْهِ الاّ أُسَامَةُ حِبُّ رَسُولِ اللهِﷺ فَكَلَّمَ رَسُولَ اللهِﷺ فَقَالَ: اَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ؟ثُمَّ قَامَ فَخَطَبَ ، فَقَالَ : (( يَأَيُّها النَّاسُ اِنَّمَا ضَلَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ ، أَنَّهُمْ كَانُوا اِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَاِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحِدَّ، وَايْمُ اللهِ! لَوْ اَنَّ فاطِمَةَ بِنْتَ مُحمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعَ مُحَمَّدٌ يَدَهَا)). رواه الجماعة الاّ ابن ماجة (خ/٦٨٨٧) (م/١٦٨٨) احمد (٦/٦٢) وابوداود (٤٣٧٤) والترمذي (١٤٣٠) النسائي (٨/٧٢،٧٣،٧٤).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە (رضي الله عنها) هاتوە، كە قوڕەیش زۆر بەپەرۆش بوون بۆ ئەو ئافرەتە مەخزومیەی، كە دزی كردبوو - پێیان ناخۆش بوو دەستی ببڕێت چونكە لەتیرەیەكی ناودار بوو -وتیان كێ قسە بكات لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، بێجگەلە ئوسامە كە خۆشەویستی پێغەمبەرە! كەسی دیكە ناتوانێ جا ئوسامە ـ لەوبارەوە- قسەی لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ كرد پێغەمبەر، فەرموی: (تكا بۆ حەدێك لەحەدەكانی خوا دەكەین؟!) لەپاشان هەستاوەو خوتبەیەكی خوێندەوەو فەرموی:

خەڵكینە نەوەكو ئەوانەی پێش ئێوە گومڕابوون ـ تەنها بەهۆی ئەوەوە بووەكـە ـ ئەگـەر یەكێكی نەجیب زادەو دەوڵەمەندو ناودار دزی بكردایە، وازیان لـێ ئەهێناو، ئەگەر بـێ هێزیان دزی بكردایە حەدیان لێ ئەدا، بەخوا قەسەم ئەگەر فاتیمەی كچی موحەممەد ﷺ دزی بكات، موحەممەد دەستی ئەبڕێت.

٦٩٧- ن /٣١٦١ ((عَنْ عُبَادَة بَنْ الصَّامِت: اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَـالَ: (جَاهِـدُوا النَّـاسَ فِي اللهِ الْقَرِيبَ وَالْبَعِيدَ وَلاَتُبَالوُا فِي اللهِ لَوْمَةَ لاَئِمٍ وَاَقِيمُوا حُدُودَ اللهِ فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ) رواه عبدالله بن احمد في مُسْندِ أبيه (٥/٣١٤،٣١٦،٣٢٦)))

له عوبادەی كوڕی سامیتەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویـەتی: لەبـەر خوا غەزای خەڵك بكـەن ، نزیـكو دوور گوێمەدەنـە سەرزەنـشتی سەرزەنـشت كـارانو، حەدەكانی خـوا ئـەنجام بـدەن كـە لەشـارو ماڵـەكانتان ئامـادەنو لەوكاتـەش، كـە لـە سەفەردان. واتە هیچ شتێك نەبێ بەهۆی تەمبەڵیتانو گۆشەنشینیتانو لە هەمو كاتێكا - كە سنووری خودا بەزێنرا - تۆڵەوەرگرتنەوە یەكسان بێـت لاتـان، چ لەسـەفەردابیو بەسـەفەردانەبی، ئـەو فەرمودانـەی، كـە ئـەوە دەگەیـەنن لـەكاتی غـەزاو لەسـەفەردا حدودەكان جێبەجێ ناكرێن، ناگەنە پلەی ئەم فەرمودەیە.

٦٩٨- ن /٣١٦٢ ((عَـنْ اَنَـسٍ اَنَّ النَّبِـيَّﷺ اُتِـيَ بِرَجُـلٍ قَـدْ شَـرِبَ الْخَمْـرَ فَلْيَجْلِـدْ بِجرِيدَتَيْنِ نَحْوَ اَرْبَعِينَ قَالَ: وَفَعَلَهُ اَبوُ بَكْرٍ، فَلَمَّا كَـانَ عُمَـرَ اسْتَـشَارَ النَّـاسَ، فَقَـالَ: عَبْـدُ الـرَّحْمنِ: اَخَـفُّ الْحُـدودِ ثَمَـانِينَ فَـأَمَرَ بِـهِ عُمَـرُ)). رواه الجماعـة الا البخـاري والترمـذي (م/١٧٠٦/٣٥) احمـد(٣/١١٥،١٧٦) وابـوداود(٤٤٧٩) والترمـذي(١٤٤٣) ابـن ماجـه (٢٥٧٠).

له ئەنەسەوەﷺ هـاتوە، كـە پێغەمبـەرﷺ پیـاوێكی هێنرایـە لای، كـە شـەڕابی خواردبوەوە، بەلاسكی هێشوی خورما نزیكەی چل لاسكی لێـدا. وتـی: ئـەبو بـەكریش هەروای كرد، جا لەكاتێكا عومەر بوو بە خەلیفە ـ پرسـی بەخـەڵك كـرد ـــ سـەبارەت

بەچەندییەتی حەدی شەراب خۆر ـ عەبدورەحمان وتی: سوكترین حەد هەشتا دارەیە - بابكرێت بەهەشتا - جا عومەر فرمانی دا بەو هەشتا دار بۆ شەراب خۆر.

٦٩٩-ن/٣١٧٦- ((عَنْ جَابِرٍ عَنِ النبَّيِّﷺ قَالَ: اِنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فَاجْلِدُوه فَانْ عَادَ فِي الرَّابِعَةِ فَاقْتُلُوهُ) قَالَ: ثُمَّ اُوتِيَ النبَّيُّﷺ بَعَدَ ذَلِكَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ فِي الرَّابِعَةِ فَضَرَبَهُ وَلَمْ يَقْتُلْهُ..)). رواه النسائي في الكبرى (٢٥٧/٣) برقم (٥٣٠٣،٥٣،٢) والحاكم (٣٧٣/٤)).

له جابیرەوەﷺ هاتوه لە پێغەمبەرەوەﷺ، كە فەرمویەتی: هەركەسێ شەراب بخواتەوە جەڵدەی لێ بدەن، جا ئەگەر جاری چوارەم خواردییەوە بیكوژن) ئەڵێ: لەپاشان پیاوێك هێنرایە خزمەت، پێغەمبەرﷺ كە جاری چوارەمی بوو، شەرابی خواردبوۆە پێغەمبەریش لێیداو نەیكوشت. واتە فرمانی كوشتن هەڵوەشاوەتەوە. [1]

٧٠٠- ن /٣١٨١ ((عَنْ اَبِي بُرَدَةَ بْنَ نِيَارٍ، اَنَّهُ سَمِعَ النبَّيَّﷺ يَقُولُ: لاَ يُجْلَدُ فَوْقَ عَشْرَةِ اَسْوَاطٍ اِلاّ فِي حَدٍّ مِنَ حُدودِ اللهِ تَعَالَى)). رواه الجماعة (خ/٦٨٤٨،٦٨٥٠) (م/١٧٠٨) والترمذي (١٤٦٣) وابن ماجه (٢٦٠١) واحمد (٤٦٦/٣) وابوداود (٤٤٩١،٤٤٩٢) النسائي (٣٢٠/٤) في الكبرى)).

له باوكی بوردەی كوڕی نییارەوە ﷺ هاتوه، كە گوێبیستی پێغەمبەر بوەﷺ، كە ئەیفەرمو: ((زیاتر لە دە جەلدە زیاتر لە هیچ كەسێك نادرێت - مەگەر لە حەدێك لەحەدەكانی خوای باڵادەست بێت -))، بونی زیندانو بەكارهێنانی توڵ بەشێوەیەكی كەم ڕەوایە، وەكو خەلیفەكان ئەنجامیان داوە.

(١) تەماشای هەمان ژمارە بكە، لە سەرچاوەی پێشوو.

# باسی دژایەتی خواو پێغەمبەروﷺ ڕێگاگرتن

٧٠١- ن /٣١٨٣ (( عَنْ قَتَادَةَ عَنْ اَنَسٍ، اَنَّ نَاساً مِنْ عُكلٍ وَعُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى النبِّيِّ وَتَكَلَّمُوا بِالإِسْلاَمِ فَاسْتَوْخَمُوا الْمَدِينَةَ فَأَمَرَ لَهُمْ النبَّيُّﷺ بِذَوْدٍ وَرَاعٍ ، وَاَمَرهُمْ اَنْ يَخْرُجُوا فَلْيَشرَبُوا مِنْ اَبْوالِهَا وَ أَلْبانِهَا. فانْطَلَقُوا حَتَّى اِذَا كَانُوا بِناحِيَةِ الحرَّةِ كَفَرُوا بَعْدَ اسْلامِهِمْ ، وَقَتَلُوا رَاعِيَ النبَّيِّﷺ وَاسْتَاقُوا الذَّوْدَ. فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّﷺ فَبَعَثَ الطَّلَبَ في آثارِهِمْ ، فَأَمَرَ بِهِمْ فَسَمَّرُوا أَعْيُنَهُمْ وَقَطَّعُوا أَيْدِيَهُمْ، وَتُرِكُوا فِي نَاحِيَةِ الْحَّرةِ حَتَّى مَاتُوا عَلَى حَالِهِمْ. رواه الجماعة وَزَادَ الْبُخَارِيّ قَالَ قَتَادَةُ: بَلَغَنَا اَنَّ النبَّيَّﷺ بَعْدَ ذَلِكَ كَانَ يَحُثُّ عَلَى الصَّدَقَةِ وَيَنْهَى عَنْ الْمُثْلَةَ . واحمد (٣/١٦٣، ١٧٠، ١٧٧، ٢٣٣، ٢٨٧، ٢٩٠) وابوداود (٤٣٦٧، ٤٣٦٨) والترمذي (٧٢، ١٨٤٥، ٢٠٤٢) والنسائي (٧/٩٧) وابن ماجة (٢٥٧٨) وزيادة البخاري (٤١٩٢) (خ/١٥٠١، ٥٦٨٦، ٥٧٢٧) (م/١٦٧١/٣))).

لە قەتادەوە لە ئەنەسەوەرضي الله عنه هاتوە، كە خەڵكێك لەتیرەی عوكلو عورەینە هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ وەكو مسوڵمان قسەیان كرد، شاری مەدینەیان پێ ناخۆش بوو لەبەر نەخۆشیەكەی كە دووچاریان بوو، لەبەر ئەوە پێغەمبەرﷺفەرمانی دا، كە چەند وشترێكو شوانێك بۆ خزمەتی ئەوان لەمەدینە دەربچنو لە میزو شیری ئەو حوشترانە بخۆن - تا چاك ببنەوە - جا ڕۆیشتن، تا گەیشتنە ناوچە بەردەڵانەكەی مەدینە، لەپاش ئیسلام بوون كافر بوونەوەو شوانەكەیان كوشتو وشترەكانیان برد. جا ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەرﷺو خەڵكی نارد بەشوێنیاندا — ئەوانیش گرتنیانو هێنایانەوە خزمەتی پێغەمبەرﷺ- پێغەمبەر فەرمانی كرد چاویان داغ كردنو دەستیان بڕین لە گۆشەیەكی ئەو بەردەڵانەداوازیان لێ هێنرا، تا بەو شێوەیە مردن، چونكە ئەوانە

پاشگەزبوونەوەو کەسێکیان کوشتو وشترەکانیان دزی، کە هەریەك لەوانە خۆی تۆڵەی تایبەتی هەیە.

... ئیمامی بوخاری ئەمەی زیاد کردووە، کە قەتادە وتویەتی: لە پێغەمبەرەوەﷺ پێمان گەیشتووە دوای ئەو ڕوداوە، هەمیشە خەڵکی هەڵئەنا لەسەر چاکەو بەرگری ئەکرد لە ناشرین کردنی کوژراو.

## دەرچووەکان ( الخوارج )

٧٠٢- ن /٣١٨٧ ((عَنْ أَميرِ المؤمنين عَلِيّ بْنِ اَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولَ (سَيَخْرُجُ قُوْمٌ فِي آخِرِ الزَّمَانِ حدَاثُ الأَسْنَانِ سُفَهَاءُ الأَحْلاَم، يَقُولُونَ مِنْ قَوْلِ خَيْرِ الْبَرِيَّة لاَ يُجاوِزُ اِيمَانُهمْ حَنَاجَرهُمْ يَمْرقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ فَأَيْنَمَا لِقِتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ، فَأَنَّ فِي قَتْلِهِمْ اَجْراً لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ رواه الجماعة عن احمد (١/٨١، ١١٣، ١٣١) وابوداود (٤٧٦٧) والنسائي (١١٩/٧) الاّ الترمذي وابن ماجة (خ/٣٦١١، ٥٠٥٧، ٦٩٣٠) (م/١٠٦٦/١٥٤))).

لە گەورەی باوەڕدارانەوە عەلی کوڕی ئەبو تالب رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بوم ﷺ کە ئەیفەرمو: ((بەم زوانە لە کۆتاییەکانی زەماندا گەلێك دێن، کە منالّن و کەم عەقلّن، لەبارەی بەشێك لە قسەکانی چاکترین دروستکراوی خواوە محمد ﷺ قسە ئەکەن، کە باوەڕەکانیان لە قورگیان نەچۆتە خوارەوە، لە ئایین دەرئەچن هەروەکو چۆن تیر لە نێچیر دەرئەچێت، جا لەهەرکوێ پێیان گەیشتن بیانکوژن بەڕاستی لەکوشتنی ئەوانەدا بۆ بکوژانیان لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشت هەیە.

## خۆگرتن سەبارەت بە ستەمی فەرمانڕەوایانی مسوڵمان

٧٠٣- ن /٣١٩٤ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: (مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئاً يَكْرَهُهُ فَلْيَصْبِرْ فأِنَهُ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ شِبْراً فَمَاتَ فَمِيتَتُهُ جَاهِلَيَّةٌ) متفق عليه (خ/٧١٥٤) (م/١٨٤٩/٥٥) واحمد (١/٢٧٥، ٢٩٧، ٣١٠))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: هەرکام لە ئێوە لە ئەمیرەکەی خۆی شتێکی دی، کە پێی ناخۆش بوو، با خۆی بگرێ -و جیا نەبێتەوە - بەڕاستی هەرکەسێ لە کۆمەڵی - مسوڵمانان — بە

ئەندازەی بستێك جیا ببێتەوەو بمرێت، ئەوە مردنەكەی نەزانانەیە. واتە وەكو سەردەمی نەزانیو نەفامی حیسابی بۆ ئەكرێت، والله أعلم.

٧٠٤- ن /٣١٩٥ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النبِّـيِّ ﷺ قَالَ: (كَانَتْ بَنَو اسْرائِيل تَسُوسُهُم الأَنْبِياء كُلَّما هَلَك نَبِّيٌ خَلَفَهُ نَبِـيٌّ وَانَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي وَسَيكُونُ خُلَفَاءُ فَيَكثُـرُونَ) قَالُوا: فَمَا تَـأْمُرُنَا؟ قَالَ: فُوا بِبَيْعَةِ الاَوَّلِ فَالأَوَّلِ ثُمَّ اَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فَأِنّ اللهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ) متفق عليه (خ/٣٤٥٥) (م/١٨٤٢) واحمد (٢/٢٩٧))).

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ هاتوە لە پێغەمبەروە ﷺ ، كە فەرمویەتی: كاروباری كوڕانی یەعقوب (بەنی ئیسرائیل) پێغەمبەران بەڕێوەیان ئەبرد، هەركاتێ پێغەمبەرێك لەدنیا دەرچوایە، پێغەمبەرێكی تر ئەهاتە جێگای، بەڕاستی لەپاش من پێغەمبەر نییە، بەم زوانە جێنشین ئەبن، كە زۆر ئەبن، وتیان: چ فرمانێكت هەیە بۆمان هەیە؟ فەرموی: ئەو پەیمانەی، كە پێیان ئەدەن بیبەنە سەر، یەك لەدوای یەك، لەپاشان مافی خۆیانیان پێ بدەن، بەڕاستی خوا سەبارەت بەوانەی كەلە ژێر دەستەیان بوون پرسیاریان لێ ئەكات.

٧٠٥- ن /٣١٩٨ ((عَنْ عَرْفَجَةَ الأَشْجَعِيِّ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (مَنْ اَتَاكُمْ وَاَمْرُكُمْ جَمِيعٌ عَلَى رَجُلٍ واحِدٍ ، يُرِيدُ اَنْ يَشُقَّ عَصَاكُمْ، اَوْ يُفَرِّقَ جَمَاعَتَكُمْ — فَاقْتُلُوهُ) رواه مسلم (م/١٨٥٢/٦٠) واحمد (٤/٢٦١-٣٤١) وابوداود(٤٧٦٢) والنسائي (٧/٩٢،٩٣))).

لە عەرەفجەوە ﷺ هاتوە كەوتویەتی: گوێبیستی لە پێغەمبەری خوا بووم ﷺ، كە ئەیفەرمو: هەركەسێك هاتە لاتانو ئێوە یەكبوون، بەسەرپەرشتی یەك پیاو، جا ئەو كەسە هێزەكەتان بەشكات - یان كۆمەڵەكەتان لەیەك جیابكاتەوە — بیكوژن. بەڵێ بەش بەشیو جیابوونەوە ئەوەندە پڕ مەترسییە، بێ دوودڵی پێغەمبەری ﷺ داناو دڵسۆز ئەفەرموێت ئەوەی، كە هەوڵی بەش بەشیتان ئەدات بیكوژن، هەركەسێك بێت، جا با بانگەوازكەرانی حیزبایەتی لەناو ئیسلامدا تەماشای خۆیان بكەن، هەروەها تێكدەرانی ریزی مسوڵمانانیش بەناوو ناتۆرەی جیاجیا. لە خوا بترسن، كەشو فشی دنیا ئەوەندە نابات دوایی دێت، پاشەڕۆژسەختو دژوارە.

# باوەڕ كردن بە ســـاحیران

٧٠٦- ن /٣٢٠٨((عَـنْ صَـفِيَّةَ بِنْـتِ أَبِـي عُبَيْـدٍ عَـنْ بَعْـضِ اَزْوَاجِ النبَّــيِّﷺ عَـنِ النبَّـيِّﷺ قَالَ: مَن اَتَى عَرَّافاً فَسَــأَلَهُ عَنْ شَـيْءٍ، لَمْ يَقْبَلِ اللهُ لَهُ صَلاَةَ اَرْبَعِينَ لَيْلَةً) رواه احمد (٦٨/٤)(٣٨٠/٥) ومسلم(٢٢٣٠)))

لەسەفیەی كچی ئەبو عوبەیدەوە — خوا لێی ڕازی بێ- لـە هەنـدێ لـە خێزانــەكانی پێغەمبەرەوەﷺو لە پێغەمبەرەوە هاتوە، كـە فەرمویــەتی: ((هەركەسـێك بـچێتە لای فاڵچیەكو پرسیاری شتێكی لێ بكات، خوا نوێـژی چـل شــەوی لێوەرناگرێـت. ئەگـەر باوەڕی پێبكات كافر ئەبێو وەكو لەفەرمودەی (فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا اُنْزِلَ عَلَـى مُحَمَّدٍ/ رواه احمد ومسلم) هاتوە.

ئەستێرە گێڕانیش بەشێكە لە سیحر وەكـو لـە فـەرمودەی (مَـنِ اقْتَبَسَ عِلْمـاً مِـنَ النُّجُومِ، اقْتَبَسَ شُعْبَةً مِنَ السِّحْرِ، زاد مـا زاد) رواه احمـد وابـوداود وابـن ماجـة)، واتــە هەركەسێك زانینێك لە ئەستێرەوە وەرگرێـت، بەشـێك لـە سـیحری وەرگرتـووە، زۆرتـر ئەبێت هەتا زیاتر بزانێ، ساحیر حەدەكەی كوشتنە، وەكو لە هەندێ ریوایەتدا هــاتوە[1]، بەلاّم ریوایەتەكان زۆر بەهێز نەبوون لێرەدا تۆمارم نەكردن.

٧٠٧- ن /٣٢٠٦ ((عَنْ اَبِي مُوسَى اَنَّ النبَّـيَّﷺ قَالَ: ثَلاَثَةٌ لاَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ: مُدْمِنُ خَمْـرٍ وَقَـاطِعُ رَحِـمٍ وَمُـصَدِّقٌ بِالـسِّحْرِ) رواه احمـد (٣٩٩/٤) وابـن حبـان (١٣٨١-مــوار) وابويعلى(٧٢٤٨) والحاكم (١٤٦/٤))).

لەئەبو موساوە ﷺ هاتوە لە پێغەمبەرەوەﷺ كـە فەرمویــەتی: سـێ كـەس هــەن، ناچنە بەهەشتەوە: ئەوكەسەی هەمیشە شەراب بخواتــەوە، ئــەو كەســەی كـە پەیوەنـدی خزمایەتی ئەپچڕێنێت ئەو كەسەی، كە باوەڕ بەجادو ئەكاتو بەڕاستی ئەزانێ.

(١) تەماشای ژمارە (٣٢٠١-٣٢٠٣)، لە سەرچاوەی پێشوو، بكە.

## كوشتنی ئەو كەسەی جوێن بە پێغەمبەرﷺ بدات

٧٠٨- ن /٣٢١٣ ((عَنِ الشَّعْبِـيّ عَـنْ أَمِـيرِ الْمُـؤْمِنِينَ عَلِـيٍّ رضي الله عنه اَنَّ يَهُودِيَّـةً كَانَـتْ تَشْتُمُ النَّبِيَّﷺ وَتَقَعُ فِيهِ ، فَخَنَقَهَا رَجُلٌ حَتَّى مَاتَتْ فَأَبْطَـلَ رَسُـولُ اللهِﷺ دَمهَـا) رواه ابوداود(٤٣٦٢)).

لە شەعبیەوە، لە گەورەی باوەڕدارانەوە عەلی رضي الله عنه هاتوە، كـە ئـافرەتێكی جولەكـە جوێنیدا بە پێغەمبەر ﷺو قسەی ناشرینی پیَ ئـەوت، پیاوێـك دەسـتینایە بینـی، تـا خنكانی، جا پێغەمبەرﷺ خوێنەكەی بەتاڵ كردەوە. واتە خـوێنی نـەدا. بـەلاَم لەسـەر تانەو تەشەری ڕووت ناكوژرێت، وەكو لەم فەرمودەدا دەرئەكەوێت:

٧٠٩-ن/٣٢١٥ ((عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: مَرَّ يَهَوُدِيٌّ بِرَسُولِ اللهِﷺ فَقَالَ: السَّامُ عَلَيْكَ. فَقَـالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (( وَعَلَيْكَ)) فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: ((اَتَدْرُونَ مَايَقُولُ؟ قَالَ : السام عليـك!)) قَالُوا يَارسُولُ اللهِ، اَلاَ نَقْتُلُهُ؟ قَالَ: لاَ، اِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ اَهْلُ الْكِتَابِ فَقُولُـوا وَعَلَـيْكُمْ) رواه احمد (٣/٢١٠،٢١٨) والبخاري (٦٩٢٦))) .

لە ئەنەسەوەرضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: جوولەكەیەك دای بەلای پێغەمبەرداﷺو وتی - سام‌وعەلەیكم -واتە: بـمریت.

جا پێغەمبەرﷺ فەرموی -تۆیش -.

ئینجا پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ئایا ئەزانن چی ئەڵێ؟

فەرموی: ئەڵێ مردن لەسەر تۆ))، وتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ نەیكوژین؟

فەرموی: ((نەخێر، هەركاتێ خاوەن كتێبـەكان سـەلامیان لێكـردن، ئێـوە بڵـێن (وە عەلەیكوم/ وە لەسەر ئێوەش بێت)، جا ئەگەر چاكیان وتبو بۆخۆیـشیان چـاكە، ئەگـەر خراپیان ووت، بەم شێوە وەڵامتان داونەتەوە.

## پاشگـەز بوونەوە لە ئاییـن

٧١٠- ن /٣٢١٦ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَـاقْتُلُوهُ) رواه الجماعة الاّ مسلماً (خ/٣٠١٧) احمد (١/،٢١٧،٢١٩،٢٢٠،٢٨٢، ٢٨٣) وابوداود (٤٣٥١) والنسائي (١٠٤/٧) والترمذي (١٤٥٨) وابن ماجة (٢٥٣٥))).

لە عەبـدوڵڵای کـوڕی عەباسـەوەﷺ هـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی: ((هەرکەسـێ ئـاینی خـۆی گـۆڕی بیکـوژن. واتـە تـەنها ئـاینی ئیـسلام وەرئەگیرێت، جا هەرکەسێ لەئیسلام پاشگەزبێتەوە، یـان لەئایینەکـەی خـۆیو نەیەتـە سەر ئیسلام جیاوازی نیەو ئەکوژرێت، ئەگـەر چـی لـەبارەی دووهەمـەوە قـسە هەیـە، کەئەگەر بگەڕێتەوە سەر ئایینەکەی خۆیوازی لیَ ئەهێنرێت.

## باسی جیهادو ڕەوشـتی پێغەمبەرمان

٧١١- ن /٣٢٣٥ ((عَن اَبِي عَبْسٍ الْحـارِثِيِّ قَـالَ سَـمِعْتُ رَسـولَ اللهِﷺ يَقُـولُ (مَـنِ اْغبَـرَّتْ قَـدَمَاهُ فِـي سَـبِيلِ اللهِ حَرَّمَـهُ اللهُ عَلَـى النَّـارِ) رواه احمـد (٤٧٩/٣) والبخـاري (٩٠٧، ٢٨١١) والنسائي والترمذي (١٦٣٢))).

لە بـاوکی عەبـسی حاریـسەوەﷺ هـاتوە، کـە وتویـەتی: گوێبیـستی پێغەمبـەری خوابومﷺ، کە ئەیفەرمو: هەرکەسێك لەرێگای خوادا هەر دوو پێی تۆزاوی ببـێ ، خـوا ئەو کەسە لە ئاگر حەڕام دەکات لەمبارەوە دەیـان فـەرمودەی تـر هەیـەو هەنـدێکی- لەگوڵزاری چاکانداو، هەندێکیش لەپەڕاوی (چل فەرمودە قودسیەکاندا نوسراوە)و لێرەدا دوبارەیان ناکەینەوە، بۆسودی زیاتر بچن لەوێدا تەماشایان بکەن.

## پێویستە لە غەزا نیەت پاك بێت

٧١٢- ن /٣٢٥١ ((عَنْ اَبِي مُوسَى قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِﷺ عَنِ الرَّجُلِ يُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً فَأَى ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ فَقَالَ: (مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ) رواه الجماعة وابوداود (٢٥١٧) والترمذي (١٦٤٦) والنسائي (٦/٢٣) وابن ماجة (٢٧٨٥) (خ/١٢٣، ٢٨١٠، ٣١٢٦، ٧٤٥٨) (م/١٩٠٤) احمد (٤/٣٩٢، ٣٩٧، ٤٠٢، ٤٠٥، ١٧))).

لە باوكی موساوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: لە پێغەمبەری خواﷺ پرسیار كرا ئەگەر پیاوێك لەبەر ئازادیەتی شەڕ بكات ، كەسێك لەبەر دەمارگیری شەڕ بكاتو كەسێك لەبەر خۆپیشان دان، شەڕ بكات، كامیان لەڕێگای خوادان؟ فەرمووی: ((هەركەسێك شەڕ بكات بۆ ئەوەی ئاینی خوا سەركەوێت، ئەوە لەڕێگای خوادایە)). جا ئەوانەی لەو ژیانەدا شەڕو ناكۆكی ئەكەن باتەماشای خۆیان بكەن، بزانن كامیان بەندەی ڕاستەقینەی خودانو، بۆ ئەو شەڕ ئەكەن.

## دەسـکەوتی جەنگ پاداشتـی موجاهید کەم ئەکاتەوە

٧١٣- ن /٣٢٥٢ ((عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (مَا مِنْ غَازِيَةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللهِ فَيُصِيبُونَ غَنِيمَةً اِلاّ تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ اَجْرِهِمْ فِي الآخِرَةِ وَيَبْقَى لَهُم الثُّلُثُ وَاِنْ لَمْ يُصِيبُوا غَنِيمَةً تَمَّ لَهُمْ اَجْرُهُمْ) له رواه الجماعة وابوداود (٢٤٩٧) والنسائي (١٧/٦) وابن ماجة (٢٧٨٥) الا البخاري والترمذي (م/١٩٠٦) احمد (١٦٩/٢))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: گوێبستی پێغەمبەری خوا بومﷺ، کە ئەیفەرمو: ((هەر موجاهیدێك لە ڕێگای خوادا جیهاد بکات‌و، دەستکەوتیان دەستکەوێت، ئەوا لەڕۆژی دوایی، بەپەلە دو سێ یەکی پاداشتان دەدرێتێ‌و، یەك بەش لەسێ بەشی بۆ ئەمێنێتەوە، وە ئەگەر هیچ دەستکەوتێکیان دەست نەکەوت، پاداشتەکەیان - لەڕۆژی قیامەتاواتە تەواو ئەبێ. چەند سودی دنیایی دەست کەوێت لە جیهاددا ئەوەندە سودی قیامەتی کەم ئەبێتەوە.

## پـرس کردن بەباوك و دایـك بۆ غـەزا

٧١٤- ن /٣٢٥٩ ((وَعَنْهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ اِلَى النَّبِيِّﷺ فَاسْتَأْذَنَهُ فِي الْجِهَادِ فَقَالَ: اَحَيٌّ والِدَاكَ؟) قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ). رواه الجماعة الا اباداود (وابن ماجة /خ/٣٠٠٤، ٥٩٧٢) والترمذي (١٦٧١) والنسائي (١٠/٦) (م/٢٥٤٩/٥) (احمد ١٦٥/٢، ١٨٨، ١٩٣، ١٩٧، ٢٢١))).

هەرلەوەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ داوای لێکرد، کە بچێ بۆ غەزا، فەرموی (باوکت‌و دایکت ماوە)، وتی: بەڵێ. فەرموی: تۆ بچۆ بۆ خزمەتکردنیان-بەوشێوەیە- غەزا بکە)). بەڵێ، لەوکاتانەی غەزا فەرزی کیفایە بێت، پێویستە دایك‌و باوك‌و خاوەن قەرز ماوەی بدەن، ئەگینا نابێ غەزا بکات، بەلام،

که غەزا بوبه فەرزی عەین، ئـەوه پێویـست بـەئیزنیان ناکـاتو، لەبـەر خـاتری کـەس دژایەتی فرمانی خوا ناکرێت.

٧١٥- ن /٣٢٦٤)- (((وَعَنْهُ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺقَالَ: يَغْفِرُ اللهُ لِلشَّهِيدِ كُلَّ ذَنْبٍ اِلاّ الدَّيْنَ فَأنَّ جِبْرِيلْ - عَلَيْهِ السَّلامُ- قَالَ لِي ذَلِكَ) رواه احمد (٢/٢٢٠) ومسلم (١١٩/١٨٨٦))). هەرلەوەوە، که پێغەمبەری خـواﷺ فەرمویـەتی:خـوا چـاو پۆشـی لەهەمو تاوانێکی شەهید ئەکات بێجگه لەقەرز، بەراستی جبرەئیل ئەوەی پـێ وتم واتـە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دان بەمو لکی تاك دا ئەنێت و، مافی هەموو که سێك ئـەپارێزێت و، نایه لێت مالی کەس لەناو بچێت .

٧١٦- ن /٣٢٦٧)- ((عن خُبَيبْ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمنِ (بْنِ خُبَيْبٍ) عَنْ اَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: اَتَيْتُ النبَّيﷺ وَهُوَ يُرِيد غَزواً، اَنَا وَرَجُلٌ مِنْ قَوْمِيَ وَلَمْ نُسْلِمْ فَقُلْنَا: اِنّا نَسْتحي اَنْ يَشْهَدَ قُوْمُنَا مَشْهَداً لاَ نَشْهَدُهُ مَعَهُمْ فَقَالَ: (اَسْلَمْتُمَا) فَقُلْنَا: لاَ. فَقالَ: (اِنّا لاَ نَسْتَعِينُ بِالْمُشْرِكِينَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ) فَاَسْلَمْنَا وَشَهِدَنا مَعَهُ.. رواه احمد (٣/٤٥٤) والبخاري (٢/١/٢٠٩) في التاريخ.

له خوبەیبی کوڕی عەبدورەحمانی کوڕی خوبەیب له باوکیەوە، لەباپیریەوه هاتوە، که وتویەتی: هاتـمه خزمەتی پێغەمبەرﷺ، ئەو مەبەستی غەزایەك بوو، مـنو پیـاوێکی تیرەکەم، که مسولمان نەبوین.

وتـمان: بەڕاستی شەرم ئەکەین، که تیرەکەمان ئامادەی ڕووداوێـك ببێـت، وه ئێمـه لەگەڵ ئەواندا ئامادە نەبین.

جا فەرموی: ( ئێوه مسولمان بوون؟).

وتمان: نەخێر.

فەرمووی: (بەڕاستی ئێمه داوای یارمەتی لەبت پەرستان ناکەین دژی بت پەرسـتان)) جا ئێمه مسولمان بوینو لەگەڵدا ئامادە بوین. بەڵێ، بەڕاستی ئەمه یەکێکه لـەژیریو

داناییەکەی پێغەمبەرمانەوەﷺ، کە بەم شێوەیە توانیویەتی کاریان تێ بکاتو مسوڵمان بن، وە ئەو کاتەیش بت پەرستی لەگەڵ خۆیدا بردوە، دیسان هەمان مەبەست بووە، ئەوەبوو سەفوانی برد بۆ حونەین، کە هێشتا باوەڕی نەهێنا بوو، بەڵام هەر لەو سەفەرەدا باوەڕی هێناو مسوڵمان بوو، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی ترەوە، مانای نیە کەسێ دوژمنی بیروباوەڕت بێ لەگەڵ خۆتا بیبەیتە سەر دوژمن، بەچی دەزانی خیانەتت لەگەڵدا ناکات؟!

دەی سەلامو ڕەحمەتی خوات لێبێ، ئەی ڕەهبەری دڵسۆزو لێزانو دانا، خودا لە پەیڕەوانی ڕاستەقینەی تۆ حیسابمان بکاتو، شەرمەندەی دیداری تۆمان نەکات - آمین -.

## دەربارەی ڕاگۆڕینەوەی پێشەوا لەگەڵ ژێردەستانیدا

٧١٧- ن /٣٢٧١ ((عَنْ اَنَسٍ اَنَّ النبَّيَّﷺ شَاوَرَ حِينَ بَلَغَهُ اِقْبَالُ اَبِي سُفْيَانَ، فَتَكَلَّم اَبو بَكْرٍ فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ تكلَّمَ عُمَرُ فَاعْرَضَ عَنْهُ فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ فَقَالَ اِيَّانَا تُرِيدُ يَارَسُولَ اللهﷺ؟! والَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ ! لَوْ اَمَرْتَنَا اَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لأَخَضْنَاهَا، وَلَوْ اَمَرْتَنَا اَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا اِلَى بَرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا. قَالَ فَنَدَبَ رَسُولُ اللهﷺ النَّاسَ فَانْطَلَقُوا حَتَّى نَزَلُوا بَدْراً وَوَرَدَتْ عَلَيْهِمْ رَوَايَا قُرَيْشٍ، وَفِيهِمْ غُلاَمٌ اَسْوَدُ لِبَنِي الحَجَّاجِ، فَأَخَذُوهُ ، فَكَانَ أَصْحَابُ رَسُولُ اللهﷺ يَسْأَلُونَهُ عَنْ أَبِي سُفْيَانَ وَاَصْحَابِهِ فيقولُ لَهُمْ: مَالِي عِلْمٌ بِأَبِي سُفْيَانَ وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْل وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ وَأَمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ فِي النّاسِ. فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ ضَرَبُوهُ فَقَالَ : نَعَمْ..اَنَا اُخْبِرُكُمْ، هّذَا أَبُو سُفيان. فَإِذَا تَركُوهُ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ : مَالَي بِأَبِي سُفْيانَ عِلْمٌ وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ وَأَمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ فِي النّاسِ. فَإِذَا قَالَ هَذا ضَرَبُوهُ وَرَسُولُ اللهﷺ قَائمٌ يُصَلِّي، فَلَمَّا رَأى ذَلِكَ انْصَرَفَ فَقَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بَيدِهِ ! إنَّكُمْ لَتَضْرِبُونَهُ اِذَا صَدَقَكُمْ وَتَتْرُكُونَه اِذَا كَذَبَكُمْ)) ثُمَّ قَالَ: ((هَذا مَصْرَعُ فُلاَنٍ)) وَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى الأَرْضِ

هَهُنَا وَهَهُنَا . قَالَ: فَوَاللهِ مَا مَاطَ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ مَوْضِعِهِ. رواه احمد (٣/٢٢٠، ٢٥٧) ومسلم (١٧٧٩))).

لە ئەنەسەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ ڕاگۆڕینەوەی کرد، کاتێ هەواڵی هاتنەوەی ئەبو سوفیانی پێگەیشت، جا ئەبوبەکر قسەی کرد، گوێی پێ نەدا لەپاشان عومەر قسەی کرد، گوێی پێنەدا، جا سەعدی کوڕی عوبادە هەستایەوە ووتی: مەبەستت ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟! سوێند بەو کەسەی، کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر فەرمان بکەیت بچینە ئەو بەحرەوە ئەچین، ئەگەر فەرمانمان بەسەردا بکەیت کە لە وشترەکانمان بخورین بۆ بەرکولغومارـ شوێنێك بوو کە دەمیل لەجیدەوە دوور بوو لەکەناری دەریاداـ وائەکەین، وتی: جا پێغەمبەرﷺ خەڵکی هەڵناو چوون، هەتا گەیشتنە بەدر و ئاوهێنەرانی قورەیش هاتەلایان، لەناو ئەواندا بەندەیەکی ڕەشی تێدا بوو کەهی کوڕانی حەجاج بوو گرتیان. جا یارەکانی پێغەمبەرﷺ دەربارەی ئەبو سوفیانو رەفیقەکانی دەستیان کرد بە لێپرسینی ، پێیووتن سەبارەت بە ئەبو سوفیانو رەفیقەکانی من هیچ نازانم ، بەڵام ئەمە ئەبو جەهلو عوتبەو شەیبەو ئومەییەی کوڕی خەلەفە، ئینجا هەرکاتێ وای ئەوت، لێیان ئەدا، جا وتی: بەڵێ: من هەواڵتان ئەدەمێ ئەوە ئەبو سوفیانە. جا کە هەر وازیان لێ ئەهێناو پرسیاریان لێ ئەکرد، دەیگوت: من دەربارەی ئەبو سوفیان هیچ نازانم، بەڵام ئەمە ئەبو جەهلو عوتبەو شەیبەو ئومەیەی کوڕی خەلەفە، جا هەروای ئەوت، لێیان ئەدا، لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ وەستا بوو نوێژی ئەکرد، جا کاتێ ئەوەی بینیو لای کردەوەو فەرموی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئێوە لێتان ئەدا، کە ڕاستی لەگەڵدا ئەکردن، وازتان لێ ئەهێنا کاتێ کەدرۆی لەگەڵدا ئەکردن) لەپاشان فەرموی: (ئەمە جێگای کەوتنی فلانە)و دەستی ئەخستە سەر زەوییەکە لێرەو لەوێ - چەند کەسێکی ناو برد لەوانە ئەبو جەهل -وتی: بەخوا هیچ کام لەوانە لەوجێگایەدا بەم لاو لادا نەچوونو کەوتنو کوژران.

٧١٨- ن /٣٢٧٣ ((عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللهُ رَعِيَّةً يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ الاّ حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ) متفق عليه. (خ/٧١٥٠، ٧١٥١) (م/١٤٢/٢٢٧) واحمد (٥/٢٥، ٢٧))).

له مەعقیلی كوڕی یەسارەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: گوێبیستی لەپێغەمبەری خوا بوﷺ ئەیفەرمو: هەر بەندەیەكخوا بیكات بەسەرپەرشتی خەڵكێكو، بمرێت ئەو ڕۆژەی، كە ئەمرێت، ئەو لەگەڵ ژێر دەستەكانیدا خیانەتكاربێ ، ئەوا خوا بەهەشتی لیٚ قەدەغە دەكات. هەروا دوعای كردوە لەو كەسەی، لەگەڵ ژێر دەستەكانیدا كەسەختگیری ئەكات.[1]

## گوێرایەڵی ئەمیر پێویستە

٧١٩- ن /٣٢٧٨ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ اَنَّ النَّبِيَّ قَالَ: (مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ اَطَاعَ اللهَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَا اللهَ وَمَنْ يُطِعِ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانَي). رواه الجماعة احمد (٢/٢٤٤، ٢٥٢، ٢٧٠، ٣١٣، ٣٤٢، ٥١١)، (٤/١٧١، ٦/٤١٦، ٤٦٧) والنسائي (٧/١٥٤) وابن ماجة (٣، ٢٨٥٩) الا الترمذي وابا داود (خ/٢٩٥٧). (م/١٨٣٥، ٣٢، ٣٣))).

له ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەركەسێك بەگوێی من بكات بەگوێی خوای كردوە، هەركەسێك سەرپێچی لە فەرمانی من بكات، سەرپێچی لە فەرمانی خوای كردوە، هەركەسێك بەگوێی ئەمیری خۆی بكات بەگوێی منی كردوە، هەركەسێك نافەرمانی ئەمیری خۆی بكات، نا فەرمانی منی كردوە. بەڵێ پێویستە فەرمانی ئەمیری مسوڵمانان جێبەجێ بكرێت، مادام دژی فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ نەبێ، بەڵام ئەگەر دژی فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ بوو، نابێ لەو مەسئەلەدا بەگوێی

(١) تەماشای فەرمودەی (٣٢٧٤-٧٢٧٦) لە سەرچاوەی پێشوو، بكە.

بکرێت، لەبەر فەرمودەی ((لاَ طَاعَةَ لِمَعْصِيَةَ اللهِ إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ))، پەیڕەوی کردن نیە لەگوناهی خواد بەگوێکردنو جێبەجێکردن نییە تاعەتو گوێڕایەڵی لەشتی چاکدایە) رواه الجماعة الا الترمذي وإبن ماجة، ژمارە (٣٢٨٠) لە (نيل الاوطار) دا.

## بانگ کردن بۆ سەر ئایین پێش شەڕکردن، ئەگەر ئایینیان پێ نەگەیشتبێ پێویستە ئەگینا سوننەتە.

٧٢٠- ن /٣٢٨١ ((عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: مَا قَاتَلَ رَسُولُ اللهِﷺ قَوْمَاً قَطُّ اِلاَّ دَعَاهُم) رواه احمد (١/٢٣١، ٢٣٦))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ شەڕی لەگەڵ هەر قەومێك کردبێ، مەگەر دوای ئەوەی بانگی کردون بۆسەر ئایینی خواپەرستی. واتە ئەگەر مسوڵمان نەبون، ئینجا شەڕی لەگەڵ کردون.

٧٢١- ن /٣٢٨٢ ((عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بَرَيْدَةَ عَنْ اَبِيهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ اِذَا اَمَّرَ اَمِيراً عَلَى جَيْشٍ اَوْ سَرِيَّةٍ اَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللهِ، وَمَنْ مَعْهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْراً ثُمَّ قَالَ: اغْزُوا بِاسْمِ اللهِ فِي سَبْيِلِ اللهِ قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللهِ اغْزُوا وَلاَ تَغُلُّوا وَلاَ تَغْدِرُوا وَلاَ تُمَثِّلُوا وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدَةً، وَاِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِن الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ اِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ، (أَوْخِلاَلٍ) فَأَيَّتُهُنَّ مَاأَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ: ادْعُهُمْ اِلَى الإِسْلاَمِ ، فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ. وَكُفَّ عَنْهُمْ. ثُمَّ ادْعُهُمْ اِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ اِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ ، وَاَخْبِرْهُمْ اَنَّهُمْ اِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ فَلَهُمْ مَالِلْمُهَاجِرِينَ، وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ، فَإِنْ اَبَوْا اَنْ يَتَحَوَّلُوا عَنْهَا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمينَ يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللهِ الَّذي يَجْرِي عَلَى الْمُسْلِمِينَ ، وَلا يَكُونُ لَهُمْ فِي الْفَيْءِ وَالْغَنِيمَةِ شَيْءٌ اِلاَّ اَنْ يُجاهِدُوا مَعَ الْمُسلِمِينَ فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَسَلْهُمُ الْجِزْيَةَ ، فَأَنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، وَاِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللهِ عَلَيهِمْ وَقَاتِلْهُمْ ، وَاِذَا حَاصَرْتَ أ هْلَ حِصْنٍ فَأَرادكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اللهِ

وَذِمَّةَ نَبِيِّـهِ، فَـلاَ تَجْعَـلْ لَهُـمْ ذِمَّـةَ اللهِ وَلا ذِمَّـةَ نَبِيِّـهِ، وَلَكِـنْ اجْعَـلْ لَهُـمْ ذِمَّتَـكَ وَذِمَّـةَ أَصْحابِكَ، فَأَنَّكُمْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّتَكُمْ وَذِمَّةَ أَصْحابِكُمْ، أَهْوَنُ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللهِ وَذِمَّـةَ رَسُولِهِ. وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ وَأَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اللهِ فَلاَ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْـمِ اللهِ، وَلَكِنْ اَنْزِلُهُمْ عَلَى حُكْمِكَ فَأَنَّكَ لاَ تَدْرِي اَتُصِيبُ فِـيهِمْ حُكـم اللهِ اَمْ لاَ) رواه الجماعـة الاّ البخاري احمـد (٣٥٢/٥، ٣٥٨) وابـن ماجـة (٢٨٥٨) والنـسائي (م/٢/١٧٣١، ٣). والترمذي (١٤٠٨، ١٦١٧) وابوداود (٢٦١٢، ٢٦١٣))).

لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە لە باوکیـەوەﷺ هـاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خواﷺ هەرکاتێ ئەمیرێکی بەسەر سوپایەکەوەیان دابنابایـە، یـان بەسـەر گرۆهێکـەوە پێشەکی لەبارەی خۆیەوە، ئامۆژگـاری ئـەکرد ، کـە لـەخوا بترسـێو، بەچـاکی لەگـەڵ ڕەفیقەکانیدا ڕەفتار بکات، لەپاشان ئەیفـەرمو: بـەناوی خـواوە لـەڕێگای خـوادا غـەزا بکەن، شەڕ بکەن لەگەڵ بێ باوەڕان بـەخوا، غـەزا بکـەنو دزی لـە غەنیمـەت نەکـەن، خیانەت نەکەن، کوژراو مەشێوەێنن منالْ نەکوژن هەرکاتێ گەیشتنە دوژمن، بانگیـان بۆ سێ شـت بکـەن، کامیانوەڵامدانـەوە لێیـانوەرگرنو خۆتـان بپـارێزن لەدژایـەتیان: بانگیان بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەروەڵامیان دانـەوە، لێیـانوەرگرنو خۆتـان دوور بخەنـەوە لەوەی، کە شەڕیان لەگەڵدا بکەن، لەپاشان بانگیان بکەن، کە لە جێگـاو مـاڵی خۆیـان کۆچبکەنو بێن بۆلای ماڵی کۆچکەرانو پێیان بڵێن، ئەگەر ئەوەتان کرد، ئیتر بـۆ ئێـوە هەیە ئەوەی، کە بۆ کۆچکەران هەیە، پێویستە لەسەرتان ئەوەی، کە لەسـەر کۆچـکەران پێویستە، ئەگەر دەرنەچوون لەو جێگایـەی، کـە تێیـدا بـوون، پێیـان بڵـێن ئـەوانوەکو عەرەبە دەشتەکیە مسوڵمانەکانن، فەرمانی خوا بەسەر ئەوانـدا جێبـەجێ ئـەکرێت بـەو شـێوەیەی، کـە لەسـەر مـسوڵمانەکان ئـەنجام ئـەدرێت، لەدەسـتکەوتەکاندا - فـەیئو غەنیمەتدا - هیچیان پێ نادرێت، مەگەر ئەوانیش لەگەڵ مسوڵمانەکانی تردا ئامـادەی غەزابن، جا ئەگـەر ئەمەشـیانوەرنەگرت، داوای سـەرانەیان لێ بکـەن - بـۆ خزمـەتی سوپای ئیسلامو پارێزگاری لەوانیش - جا ئەگەر ئەمەیان وەڵامدایتـەوە، لێیـانوەرگرەو

خۆت لەئازاردانیان دوور بگرە. ئەگەر ئەمەیشیانوەرنەگرت، داوای یارمەتی لەخوا بکـە دژی ئەوانو، شەڕیان لەگەڵدا بکە، ئەگەر خەڵکی قەڵایەکت گەمارۆ داو ئەوانویـستیان خۆیان بدەن بەدەستەوە لەسەر بەڵێندان بەوەی، کە خواو پێغەمبەرﷺ دەیـەوێ ، خـواو پێغەمبەرﷺ نەکەی بەشایەت بۆیان، بەڵام تۆ بڵێ لەسەر ملی خۆتو یارەکانت خۆیـان بەدەستەوە بدەن چونکە ئەگەر ئەو عەهدو پەیمانەی، لەسەر ملی خۆتو یارەکانت بەوانی ئەدەیت بیشکێنی ئاسانترە لـەوەی، کـەتۆ عەهـدو پـەیمان بـەناوی خـواو پێغەمبـەرەوە بشکێنی. ئەگەر گەمارۆی قەڵایەکتان داو ویستیان خۆیان بەدەستەوە بدەن بەومەرجـەی بەوشێوەیەی خوا دەیەوێ، ئاوا ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن، تۆ دایان نەبەزێنی لەســەر بڕیـارو حوکمی خوا، بەڵکو لەسەر بڕیاری خۆت دایان بەزێنە ، چونکە تۆ نازانی ئـەو بڕیـارەی، کە تۆدەیدەیت ڕێکە لەگەڵ حوکمی خوادا، یان نا. بەڕاستی ئەم فەرمودەیە، کۆگایـەکی گەورەی زانیاری تێدایەو پێویستە بەوردی سەرنجی بدرێت.

٧٢٢- ن /٣٢٨٧ ((عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ عَنْ النبِّيِﷺ أَنَّـهُ كَـانَ اِذَا اَرَادَ غَـزْوَةً وَرَّى بِغَيْرِها) متفـق عليـه (خ/٢٩٤٨) (م/٢٧٦٩) احمـد (٦/٣٩٠) وهـولابي داود (٢٦٣٧): والحرب خُدعة)).

له کەعبی کوڕی مالیکـەوە ﷛ هـاتوە لـە پێغەمبـەرەوەﷺ، کـە ئـەو هـەرکاتێ مەبەستی غەزای ناوچەیەکی بوایە، شوێنێکی تری بێجگە لەوەی باس ئەکرد...وە ئەمە لای ئەبو داودیش هاتوەو ئەمەی لـێ زیاد کردوە، کە (شەڕ فێڵە)، واتە دروستە لەکاتی شەڕدا فەرماندە ڕاستی بەسوپاکەی نەڵێ، نەوەك بکەوێتە گوێی دوژمنو خـۆی ئامـادە بکاتو مسوڵمانان توشی زیان بن.

٧٢٣- ن /٣٢٩٢ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَـالَ رَسُــولُ اللهِ ﷺ: خَيْـرُ الـصَّحَابَةِ اَرْبَعَـةٌ وَخَيْرُ السَّرَايَا اَرْبَعُمِــأَةٍ وَخَيْرُ الْجُيوشِ اَرْبَعَةُ اَلآفٍ وَلاَيُغْلَبُ اثْنَا عَشَرَ اَلْفاً مِـنْ قِلَّـةٍ) احمـد (١/٢٩٤،٢٩٩) وابــوداود (٢٦١١) والترمــذي (١٥٥٥) وقــال حــديث حــسن)).لـــە

عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوە ﷺ هاتوە، كەوتویەتی: پێغەمبەری خـواﷺ فەرمویـەتی: باشترین رەفیقی - كاروانی - چـوار كەسـەو باشـترین گرۆهـی - جیهـادی - چوارسـەد كەسەو باشترین سوپا چوار هەزار كەسە،وە دوانزە هەزار كـەس لەبـەر كـەمی شكـست ناخوات. واتە مەگەر هۆیەكی تریوەكو لاوازی لەبارەی بیروباوەڕەوە، یان چـەك چـۆڵەوە ببێ بەهۆی شكانی دوانزە هەزار، ئەگینا لەبەركەمی ناشكێنو دوانزە هەزار بەسە.

## هاوكاری ئافـرەت لــە غـــەزادا بــۆ بەرژەوەنــدی نەخـــۆش و بریـنــدارو خزمـــەت كردن.

٧٢٤- ن /٣٣٠٢ ((عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأَنـصارِيَّةِ قَالَـتْ: غَـزَوْتُ مَـعَ رَسُـولِ اللهِﷺ سَـبْعَ غَزَوَاتٍ اَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ وَاَصْنَعُ لَهُم الطَّعَامِ وَأُدَاوِي الْجَرْحَـى وَأَقُومُ عَلَـى الزَّمْنَـى) رواه احمد (٨٤/٥)(٤٠٧/٦) ومسلم (١٨١٢) وابن ماجة (٢٨٥٦))).

لە داییكی عەتیەی ئەنسارییەوە — خوا لێی ڕازی بێ- هاتوە، كە وتویەتی: حـەوت غەزام لە فزمەتی پێغەمبەری خواداﷺ كردووە، لەناو كەلوپـەلو بنـەو بارەگاكانیانـدا دائەنیشتمو خواردنم بۆ دروست ئەكردنو، تیماری برینداره‌كانم ئەكردو سەرپەرشتی پـەك كەوتوەكانم ئەكرد.

٧٢٥- ن /٣٣٠٤ ((عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَـا قَالَـتْ: يَـا رَسُـولَ اللهِﷺ نَـرَى الْجِهَـادَ اَفْـضَلُ الأَعْمَـالِ اَفَـلاَ نُجَاهِـدُ؟ قَـالَ: (لَكِـنْ اَفْـضَلُ الْجِهَـادِ حَـجٌّ مَـبْرُورٌ) رواه احمـد والبخـاري (١٥٢٠،١٨٦١،٢٧٨٤،٢٨٧٦))).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە رضي الله عنها هاتوە، كە وتویەتی: ئـەی پێغەمبـەری خواﷺ، ئێمە جیهـاد بەگـەورەترین كـردەوە، ئایـا جیهـاد نەكـەین؟ فـەرموی: (بـەڵام گەورەترین جیهاد، حەجی چاك و تێرو تـەواو ئـەنجام دراوە). واتـە: تـا نـەبێ بەفـەرزی عەین، لەسەر ئافرەتان پێویست نیـە، بـەڵكو سـوننەتە، وەكـو لـە فـەرمودەی دایكـی

عەتیەوە دەرکەوت هەروەها لە خەنجەرەکەی ئومسولەیم لە ڕۆژی حونەین دا، کە وتـی: هێناومە، تا ئەگەر کـافرێکم لــێ نزیـك کەوتــەوە، بیکـەم بەسـکیاو سـکی بـدرێنم، ڕیوایەتی ئیمام موسلیم لە ئەنەسەوە (١٨٠٩- ١٣٤). بەڵام ئەگەر جیهاد بوو بەفـەرزی عەین، ئەوا لەسەر هەموکەس بەبێ جیـاوازیو هەرکـەس بـەگوێرەی توانـای،ژنو پیـاو گەنجو پیر، ناودارو بێ ناو پێویست دەبێ.

٧٢٦- ن /٣٣٠٥ ((عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: اَنَّ النبِّـيَّ ﷺ خَـرَجَ يَـوْمَ الْخَمِـيسِ فِـي غَـزْوَةِ تَبُوكَ وَكَانَ يُحِبُّ اَنْ يَخْرُجَ يَوْمَ الْخَمِيسِ)، متفق عليه خ (٩٢٤٨) م (٢٧٦٩))).

لە کەعبی کوڕی مالیکەوە ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی پێنج شـەممە دەرچـوو بۆ غەزای تەبوك، پێی خۆشبوو لە ڕۆژی پێنج شەمەدا بۆ سەفەر دەرچێ.

٧٢٧- ن /٣٣١١ ((عَنْ الْمُهَلَّبِ بْنِ اَبِي صُفْرَةَ عَمَّنْ سَمِعَ النبَّـيَّ ﷺ يَقُـولَ: اِنْ بَيَّـتَكُمُ الْعَـدُّو فَقُولُـوا (حـم. لاَيُنْـصَرونَ) رواه الخمـسة الاّ ابـن ماجـة. احمـد (٤/٦٥) (٥/٣٧٧) وابوداود (٢٥٩٧) والترمذي (١٦٨٢) والنسائي (٥/٢٧٠) برقم (٨٨٦) في الكبرى)).

لە موهەللەبی کوڕی سوفرەوە لەو کەسەی، کە لە پێغەمبەریوە ﷺ بیـستبوو هـاتوە، کە ئەیفەرمو: ئەگەر شەو دوژمن دای بەسەرتاندا بڵێن (حـا، مـیم، سـەرناکەون). واتـە ئەوە نهێنی شەوتان بێ، لەوانەیشە دوعای شەڕ بێت لەو کافرانە.

٧٢٨- ن /٣٣١٣ ((عَنِ الْحَسنِ عَنْ قَيْسِ بْنِ عَبَّادَةَ قَالَ: كَانَ اَصْحَابُ رَسُـولِ اللّهِ ﷺ يَكْرَهُونَ الصَّوْتَ عِنْدَ القِتَالِ) رواه ابوداود(٢٦٥٦))).

لە حەسەنەوە، لە قەیسی کوڕی عەبادەوە هاتوە، کەوتویەتی: یارەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە غـەزادا دەنگـە دەنگیـان پـێ خۆشـنەبووە ، بێجگـە لـەو شـیعارە، کـە لەفەرمودەی پێشەوە باسکرا،وەکو(حم، لاتنصرون، اَمتْ اَمتْ- لە فەرمودەی(غَزَوْنَا مَـعَ اَبِي بَكْرٍ زَمَنَ رَسُولِ اللّهِ ﷺ فَكَانَ شِعَارُنَا: اَمِتْ اَمِتْ[1] .رواه احمد وابو داود/لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکر غەزایان کرد دروشمان، بمرێنە بمرێنە بوو).

(١) تەماشای شەرحی ئەو دوو فەرمودەیە بکە، لە سەرچاوەی پێشوو.

٧٢٩- ن /٣٣١٧ ((عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ اَصْحَابُ رَسُولِ اللهِﷺ اِذَا غَزَا قَوْماً لَمْ يَغْزُو حَتَّى يُصْبِحَ فَأِذَا سَمِعَ اَذَاناً أَمْسَكَ وَاِذَا لَمْ يَسَمَعْ اَذَناً أَغَارَ بَعْدَمَا يُصْبِحُ) رواه احمد (١٥٩/٣،٢٠٦،٢٣٦،٢٣٧،٢٦٣)))

لە ئەنەسەوە‌ﷺ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەركاتێ غەزای قەومێكی بكردایە شەڕی نەدەكرد، هەتا بەیانی دەكردەوە، جا ئەگەر گوێی لەبانگ بوایە خۆی دەگرتەوە، وە ئەگەر گوێی لەبانگ نەبوایە هێرشی ئەكردە سەریان. ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەو كەسانەی، كە ئەڵێن مادام دەنگو باسی ئایین گەیشت بەگەلێك، ئیتر پێویست ناكات دوبارە تەبلیغ بكرێن، ئەگەر وەڵامیان بەچاكی نەدایەوە شەڕیان لەگەڵدا ئەكرێو، ئاگادار ناكرێنەوە، هەروەها بانگ هێمایەكی گرنگی ئیسلامەتیەو، هەرگەلو گوندو شارێكوازیان لێ هێنا، فەرماندەی مسوڵمانان بۆی هەیە سزایان بدات.

٧٣٠- ن /٣٣١٩ ((عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ، اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ سُئِلَ عَنْ اَهْلِ الدَّارِ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يُبَيَّتُونَ، فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيهِمْ؟ فَقَالَ: (هُمْ مِنْهُمْ) رواه الجماعة الاالنسائي خ(٣٠١٢) م(١٧٤٥/٢٦) احمد (٣٧/٤،٣٨) وابوداود (٢٦٧٢) والترمذي (١٥٧٠) وابن ماجة (٢٨٣٩))).

لە سەعبی كوڕی جەسامەوە‌ﷺ، پێغەمبەری خواﷺ پرسیاری لێكرا، گەر لەوڵاتی موشریكانێك، كە شەو بدرێت بەسەریاندا، ئافرەتو منالّ بەرئەكەون - ئەوە چۆنە؟- فەرموی (ئەوانیش - ژنو منالّەكان - لەوانن - لەكافرەكانن-) ئەبو داود لەپاش ئەم فەرمودەیە ئەوەی زیاد كردووە، كە: زوهریوتویەتی: لەپاشدا پێغەمبەری خواﷺ بەرگری كرد لەكوشتنی ئافرەتو منالاّن. واتە فەرمانی پێشووی هەڵوەشاندوەتەوە، بەڵام ئەم دوو فەرمودەیە تێك ناگیرێن، چونكە ئەوەڵ بۆ ئەو كاتەیە، كەشەو ئەدرێ بەسەركافرانداو، مەبەست كوشتنی ئافرەتو منالّ نییە، بەلاّم شەڕەو بەرئەكەونو مسوڵمان لەوبارەوە تاوانی ناگات، دووهەمیان، نابێ بەدەستیانقەس ئافرەتو منالّ

بکوژرێت، کەواتە دوو ڕوی جیاوازیان هەیەو لەیەك ناگیرێن[١]، والله أعلم.

٧٣١- ن /٣٣٢٩ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِﷺ فِي بَعْثٍ فَقَالَ: اِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَناً وَفُلاَناً (الرَّجُلَينِ) فَأَحْرِقُوهُمَا بِالنَّارِ) ثُمَّ قَالَ: حِينَ اَرَدْنَا الْخُرُوجَ: (اِنِّي كُنْتُ أَمَرْتُكُمْ اَنْ تُحْرِقوا فُلاَناً وَفُلاَناً وَاِنّ النَّارَ لاَيُعذِّبُ بِهَا اِلاَّ اللهُ فَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمَا فَاقْتُلَوهُمَا)، رواه الجماعة الا مسلماً وابن ماجة خ(٣٠١٦) وابوداود (٢٦٧٤) والترمذي (١٥٧١) احمد (٣٠٧/٢) النسائي فى الكبرى (١٨٣/٥) برقم (٨٦١٣))).

له ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوه، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لەناو چەند کەسێکدا ناردینی فەرموی: ئەگەر فلانو فلانتان دی - دوو پیاو بوون - بیانسوتێنن بەئاگر. لەپاشان کاتێ ویستمان دەرچین، فەرموی: بەڕاستی من لەپێشەوە بەئێوەم وت فلانو فلان بسوتێنن، بەڕاستی بێجگە لەخوا کەس بۆی نیە بەئاگر ئازار بدرێت، ئەگەر بەردەستتان کەوتن بیانکوژن. واتە: مەیانسوتێنن. بەڵێ، ئەم زاتە پاش قسەکەی بۆی ڕوون بوویەوە، کە سوتاندن چاك نیە، بەو شێوەیە فرمانەکەی گۆڕی، بەڵام ئیمڕۆ کابرا گەر فتوای دا، هەرچەن بزانێ وایش نیە، هەر داکۆکی لەسەر ئەکات؟!

٧٣٢- ن /٣٣٣١ ((عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِاللهِ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: اَلاَ تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الْخَلَصَةِ؟ قَالَ: فَانْطَلَقْتُ فِي خَمْسِينَ وَمِائَةِ فَارِسٍ مِنْ اَحْمَسَ وَكَانُوا أَصْحَابَ خَيْلٍ وَكَانَ ذُو الْخَلَصَةَ بَيْتاً فِي الْيَمَنِ لِخْثعَمَ وَبجِيلَة فِيهِ نَصَبُ يُعبَدُ يُقَالُ لَهُ: كَعْبَةَ الْيَمَانِيَّةِ قَالَ: فَأَتَاهَا فَحَرَقَهَا بِالنَّارِ وَكَسَرَهَا ثُمَّ بَعَثَ رَجُلاً مِنْ اَحْمَسَ، يُكَنى اَبَا اَرْطَاةٍ، اِلَى النَّبِيِّﷺ يُبَشِّرهُ بِذَلِكَ فَلَمَّا اَتَاهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، مَا جِئْتُ حَتَّى تَرَكْتُهَا كَأَنَّهَا جَمَلٌ اَجْرَبْ، قَالَ فَبَرَّكَ النَّبِيُّﷺ عَلَى خَيْلِ اَحْمَسَ وَرِجَالِهَا خَمْسَ مَرَّاتٍ) متفق عليه (خ/٣٠٢٠) (م/٢٤٧٦-١٣٧) احمد (٣٦٠/٤))).

له جەریری کوڕی عەبدوڵڵاوەﷺ هاتوه، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ پێی وتم:

---

(١) تەماشای فەرمودەی(اَوَلَيْسَ خيارُكُمْ اَوْلاَدَ الْمُشْرِكِينَ؟) ژمارە (٣٣٢٧) لە سەرچاوەی پێشو، بکە.

((ئایا ناتوانی ئاسودەمان بکەیت لە زولخەلسە؟)) جا منیش لەگەڵ (١٥٠) سواری ئەحمەسدا، کە خاوەنی چارەوێ بوون، ڕۆیشتین، زولخەلسەیشماڵێك بوو لە یەمەندا، هی هۆزی خەسعەمو بەجیلە بوو، کە لەناویدا بت هەبوو ئەیان پەرستو پێ ئەوترا کەعبەی یەمانی، وتی: جا هاتە لایو بەئاگر سوتانیو شکاندی، لەپاشدا پیاوێکی ئەحمەسی، کە بەناوی باوکی ئەرتا -دەناسرا- ناردی بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ، کە ئەو مژدەیەی پێبدات، جا کاتێ هاتە لای وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ سوێند بەو کەسەی کە تۆی بەڕاستی ڕەوانە کردووە. بەجێم نەهێشتووە، تاوەکو وشتری کە ڕۆڵی لێ هات -واتە سوتاو پلە پلە بوو -وتی: جا پێغەمبەرﷺ پێنج جار دوعای پیرۆزیو بەرەکەتی کرد بۆ چارەوێکانی ئەحمەسو پیاوەکانی ، واتە شکاندنی بتەکان ئەرکێکی ئایینو پێویستە مادام دەسەڵاتی ئایین هەبێ.

٧٣٣- ن /٣٣٣٢ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ اَنَّ النبَّـِيَّﷺ قَطَعَ نَخْلَ بَنِي النَّضِير وَحَرَقَ) رواه الخمسة الا النسائي خ (٢٣٢٦) م (١٧٤٦/٣٠) وابوداود (٢٦١٥) والترمذي (٣٣٠٢،١٥٥٢) ابن ماجة (٢٨٤٤)))

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوەرضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ (هەندێ) لە خورمای بەنی نەزیری بڕیو سوتاندی، وە هەر لەمبارەوە ئەم ئایەتەی (٥) سورەتی حەشر دابەزی، کە ئەفەرموێت: ((مَا قَطَعۡتُم مِّن لِّينَةٍ أَوۡ تَرَكۡتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيُخۡزِيَ ٱلۡفَٰسِقِينَ)) واتە: هیچ خورمایەکت نەبڕیوەو وازتان لەهیچ نەهێناوە هەموی بە فەرمانی خوا بووە، تا فاسقان سەرشۆر بکات)، واتە ئەگەر پێویست بوو درەخت ئەبڕێت و، ئەمەش ئەبێ بەتایبەتکەری ئەو فەرمودانەی، کە بەرگری ئەکەن لە بڕینی درەختی میوەدار.

## لەكاتی هێرشـی دوژمندا ئەگـەر دوژمن لەدوو بەرامبەر زیاتر نەبوو نابێ پشتی تێ بكرێ.

٧٣٤- ن /٣٣٣٤ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النبِّـيِّﷺ قَـالَ: اجْتَنِبُـوا الـسَّبْعَ الْمُوبِقَـاتَ) قَالُوا وَمَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (الشِّـرْكُ بِاللهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّـتي حَـرَّمَ اللهُ الاَّ بِالْحَقِّ وَاَكْلُ الرِّبا، وَاَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَـوْمَ الزَّحْـفِ، وَقَـذْفُ الْمُحْـصَنَاتِ الغَـافِلاتِ الْمُؤْمِنَـاتِ) رواه البخـاري (٢٧٦٦) مـسلم (٨٩-١٤٥) وابـوداود (٢٨٧٤) والنـسائی (٦/٢٥))).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ، كە فەرمویەتی: (خۆتـان بپـارێزن لە حەوت فەوتێنەرەكان) وتیان: كامانەن ئەی پێغەمبەری خـواﷺ؟! فـەرموی: (هـاوەڵ دانان بۆ خوا، جادوو كردن، كوشتنی ئەو كەسەی، كە خـوا قەدەغـەی كـردووە، مەگـەر لەسەر شـتی ڕەواو ڕاسـت، خـواردنی سـوو، وە خـواردنی مـاڵی هـەتیو،و پـشتكردنە شەڕلەكاتی هێرشی دوژمندا، وە نیسبەت دانی زینا بۆ ئافرەتی پاك دامێنی بـێ ئاگـای باوەڕدار، واتە بۆمان ڕوونبویەوە، كە پشت تێكردنی كافران لەكاتی هێرشـدا مـادام لـە دوو بەرامبەر زیاتر نەبن یەكێكە لە تاوانە گەورەكان، كە مرۆڤ لەناو دەبـات، خـوا لـە هەر حەوتیان بمان پارێزێ ، آمین.

٧٣٥- ن /٣٣٣٥ ((عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ لَمَّـا نَزَلَـتْ (إِن يَكُـن مِّـنكُمْ عِـشْرُونَ صَـبِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ..) فَكَتَبَ عَلَيهِمْ الاّ يَفِرَّ عِشْرُونَ مِـنْ مِـأَتَينِ، ثُـمَّ نَزَلَـتْ (اَلْـئنَ خَفَّـفَ آللهُ عَـنكُمْ... )الآيـة: فَكَتَـبَ اَلاَّ يَفِـرَّ مِـأَةٌ مِـنْ مِـأَتَيْنِ. رواه البخـاري (٤٦٥٢) وابـوداود (٢٦٤٦))).

لە عەبدوڵلای كوڕی عەباسەوەﷺ هاتوە، كە لەكاتێكـدا ئایـەتی (ئەگـــــەر لـەناو ئێوەدا بیست كەسی خـۆگر ببـێ بەسـەر دووسـەد كەسـدا، سـەرئەكەوێ) فـەرزی كـرد

لەسەریان کە (٢٠)کەس لە بەرامبەر (٢٠٠) کەسەوە هەڵنەیەت. لەپاشدا کە دابەزی (ئێستا خوا بۆ ئێوەی سوك کرد...) تا کۆتایی ئایەتەکە، کە لەسەریانی فەرز کرد کە سەد کەس لە بەرانبەری دووسەد کەسەوە هەڵنەیەت‌و پشت نەکاتە کافران، دیارە لەوە زیاتر بوو. ئەگەر مسوڵمان هەڵهات ئەوە ئەو تاوانە گەورەیە لەسەر نانوسرێت،وە ئەگەر شەڕیشی کرد هەتا شەهید بوو زۆر چاکە، والله أعلم.

٧٣٦٠- ن /٣٣٣٧ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِﷺ عَشَرَةَ رَهْطٍ (سَرِيَّةٍ) عَيْناً وَاَمَّرَ عَلَيْهُمْ عَاصِمُ بْنُ ثابت الأَنْصَارِيِّ فَأَنْطَلَقُوا حَتَّى اِذَا كَانُوا بِالْهَدأَة ـ وَهُوَ بَيْنَ عُسْفَانَ وَمَكَّةَ ـ ذُكِرُو لِبَني لِحْيَانَ فَنَفَرُوا لَهُمْ قَرِيباً مِنْ مِأَتَيْ رَجُلٍ كُلُّهُمْ رَامٍ فَاقْتَصُّوا آثَارَهمْ( حَتَّى وَجَدوا مَأْكَلَهُمْ تَمْراً تَزَوَّدُوهُ مِنَ الْمَدِينَة، فَقَالُوا :هَذَا تَمْرُ يَثْرِبَ، فَاقْتَصُّوا آثارهُمْ) فَلَمَّا رَآهُمْ عاصِمُ وَاَصْحابُهُ لَجَئُوا اِلَى فَدْفَدٍ وَأَحَاطَ بِهِمُ الْقَوْمُ ، فَقَالُوا لَهُمْ: انْزِلُوا وَأَعْطُونَا بِأَيْدِيكُمْ، وَلَكُمْ الْعَهْدُ وَالْمِيثَاقُ اَلاَّ نَقْتُلَ مِنْكُمْ أَحَداً، قَالَ عاصِمُ بْنُ ثَابِتٍ أَمِيرُ السَّرِيَّةِ: اَمَّا اَنَا فَوالله، لا أَنْزِلُ الْيَوْمَ في ذِمَّةِ كَافِرٍ، اَللهُمَّ خَبِّرْعَنَّا نَبِيَّكَ. فَرَمَوْهُمْ بِالنَّبْلِ فَقَتَلُوا عَاصِماً فِي سَبْعَةٍ، فَنَزَلَ اِلَيْهِمْ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ بالعَهْدِ وَالْمِيثَاقِ، مِنْهُمْ: خُبَيْبُ الأَنصاريُّ وَابْنُ دَثِنَّةَ، وَرَجَلٌ آخَرُ، فَلَمَّا اسْتَمْكَنُوا مِنْهُمْ اَطْلَقُوا أَوْتَارَ قِسيِّهِمْ فَأَوْثَقُوهُمْ ، فَقَالَ الرَّجُلُ الثَّالِثُ: هَذا أَوَّل الْغَدْرِ وَالله لا أَصْحَبُكُمْ، اِنَّ لِي فِي هَؤُلاءِ لأُسْوَةً- يُرِيدُ القَتْلَى- فَجرَّرُوهُ وَعَالَجُوهُ عَلَى اَنْ يَصْحَبَهُمْ فَأَبى فَقَتلُوهُ ، وانْطَلَقُوا بِخُبَيْبٍ وَابْنِ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلِ ( بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ) ، وَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ قَتَلَ يَوْمَ بَدْرٍ الْحَارِثَ. فَمَكَثَ عِنْدَهُمْ أَسِيراً، حَتَّى أَجْمَعُوا عَلَى قَتْلِه، فاسْتَعَارَ مُوسَى مِنْ بَعْضِ بَنَاتِ الْحَارِثِ لِيَسْتَحِدَّ بِهَا فَأَعَارَتْهُ ، قَالَتْ: فَغَفَلْتُ عَنْ صَبِيٍّ لِي ، فَدَرَجَ اِلَيْهِ، حَتَّى أَتَاهُ فَوَضَعَهُ عَلَى فَخِذه، فَلَمَّا رَأَيْتُهُ فَزِعْتُ فَزْعَةً، حَتَّى عَرَفَ ذَلِكَ مِنيّ، وَفِي يَدِهِ الْمُوسى، فَقَالَ: أَتَخْشَيْنِ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ مَا كُنْتُ لأَفْعَلَ ذَلِكَ اِنْ شاءَ اللهُ تَعالَى. وَكَانَتْ تَقُولُ: مَارَأَيْتُ أَسِيراً قَطُّ خَيْراً مِنْ خُبَيْبٍ، لَقَدْ رَأَيْتُهُ مِنْ قِطْفِ عِنَبٍ، وَما بِمَكَّةَ يَوْمَئِذٍ ثَمَرَةٌ! وَاِنَّهُ لَمُوثَقٌ بِالحَدِيدِ، وَمَا كَانَ اِلاّ رِزْقاً رَزَقَهُ الله خُبَيْباً. فَخَرَجُوا بِهِ مِنَ الْحَرَمِ لِقْتُلُوهُ فَقَالَ: دَعُوني اُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. ثُمَّ انْصَرَفَ

اِلَيْهِمْ فَقَالَ: لَوْلا اَنْ تَروَا اَنّ مابِي جَزَعٌ مِنَ الْمَوْتِ لَزِدْتُ. فَكَانَ اَوَّلُ مَنْ سَنَّ الرَّكْعَتَيْنِ عِنْدَ الْقَتْلِ (هُوَ) . ثُمَّ قَالَ: اَللهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَداً وَقَالَ: وَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ اُقْتَلُ مُسْلماً- عَلَى اَيّ شِقٍّ كَانَ لله مَصْرَعِي. وّذَلِكَ فِي ذَاتِ اْلإلهِ وَاِنْ يَشَأْ- يُبَارِكْ عَلَى أوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعٍ . ثُمَّ قَامَ اِلَيْهِ عُقْبَةُ بُنُ الْحَارِثِ فَقَتَلَهُ. وَبَعَثَ قُرَيْشٌ اِلَى عَاصِمٍ، لِيَأْتُوا بِشيءٍ مِنْ جَسَدِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ وَكَانَ قَتَلَ عَّظِيماً مِنْ عُظَمَائِهِمْ يَوْمَ بَدْرٍ- فَبَعَث اللهُ عَلَيْهِ مِثْلُ الظُّلَّةِ مِنَ الدَّابرِ فَحَمَتْهُ مِنْ رُسُلِهِمْ فَلَمْ يَقْدِرُوا مِنْهُ عَلى شَيءٍ)).

رواه احمد (٢/٢٩٤ـــ ٢٩٥) والبخاري (٣٩٨٩، ٣/٤٥) وابوداود (٢٦٦٠ـــ ٢٦٦١))).

له ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ گروهێكی دە نەفەری نارد بۆ زانینی باس، عاصمی كوڕی سابتی ئەنساری كرد بەئەمیریان، جا ڕۆیشتنو هەتا گەیشتنە هەدئە - كە ئەو ئەكەوێتە نێوان عوسفانو مەكەوە - باسكران بۆ هۆزی لیحیان، جا ئەوانیش نزیكەی دوو سەد كەسیان دەرچوون بۆیان كە هەمویان تیرەندازو نیشانە شكێن بوون، جا بە شوێنیاندا هاتن، تا دییان خواردنیان خورمایەو لەمەدینەوە بەتێشوو هاوردویانە، وتیان ئەمە خورمای مەدینەییە، جا بەشوێنیاندا هاتن جا كاتێ عاسمو یارەكانیان چاویان كەوت پێیان پەنایان برد بۆ چیایەكی نزیكیانو ئەو گەلەیش چواردەوریان دان، وتیان بێنە خوارەوەو ئەوەی پێتانە بماندەنێ بەڵێنتان پێ ئەدەینو سوێنتان بۆ ئەخۆین، كەهیچ كەستان ناكوژین، عاسمی كوڕی سابت ئەمیری گرۆهەكە وتی: بەخوا من ئەمڕۆ دانابەزم لەسەر وەعدو سوێنی كافر، ئەی خوایە ئەم هەواڵەم بدە بە پێغەمبەرەكەت ﷺ، جا تیر بارانیان كردنو حەوتیان شەهید بوون كە عاسمیش یەكێك لەو حەوتانە بوو، سێ نەفەریان لەسەر بەڵێنو سوێندەكانی كافرەكان خۆیان دابەستەوە لەوانە ((خوبەیبی یاریدەدەرو كوڕی دەسنەو پیاوێكی تر، جاوەختێ زاڵ بوون بەسەریاندا، بەنی تیرو كەوانەكانیان كردەوەو دەستیان پێ بەستن، جا پیاوی سێهەم وتی: ئەمە یەكەم خیانەتیانە، بەخوا نایەم لەگەڵتاندا - بەڕاستی ئەوانە -واتە

شەهیدەکان - بۆمن پێشەوان و چاویان لێ بکەم، تا شەهادەت، جا زۆریان کێشاو پاڵیان نا زۆر چاوەڕوانیان لێ کرد نەچوو - شەهیدیان کرد، ئینجا خوبەیبو کوڕی دەسنەیان برد هەتا فرۆشتیان بەمەکە لەپاش غەزای بەدر، جا کوڕانی حاریسی کوڕی عامیری کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدی مەناف کە کاتی خۆی لەبەدردا خوبەیب حارسی کوشتبوو کڕییان. جا لای ئەوان بەدیلی مایەوە، هەتا هەموویان هاتنە سەر ئەوەی کە بیکوژن، جا ئەویش - کەزانی کاتی کوشتنی نزیك بووەتەوە - لەهەندێ لەکچەکانی حاریسی تیغێکی بەئەمانەتوەرگرت تا مووی شەرمگەی پێ لابات ئەویش پێیداو ئەڵێ: لەوکاتەدا بێ ئاگابووم لەمناڵێکم سەرکەوتبو بۆلای تا گەیشتبووە لایو ئەویش خستبوویە سەرڕانی خۆیو کاتێ دیم زۆر ترسام بە شێوەیەکیوا کە ئەویش پێی زانیم وەبەدەستیەوە تیغەکە هەبووتی ئەترسی بیکوژم؟ شتی واناکەم ئینشائەڵلاهو تەعالا. وە ئەو - ئافرەتە - ئەیوت هەرگیز دیلێکی چاکتر لە خوبەیبم نەدیوە، بەڕاستی دیم لە میوەیەکی وای ئەخوارد، کە لەو ڕۆژەدا لەمەکە دەست نەدەکەوت، ئەو بەزرێی بەسترابوو، ئەو بێجگە لە رۆزییەکی خوایی، کە دایبوو بەخوبەیب شتێکی تر نەبوو، جا لە حەرەمی مەکە دەریان کرد تا بیکوژن، وتی: وازم لێ بهێنن بادوو رکایەت نوێژ بکەم لەپاش - نوێژەکە - ڕووی کردەوە لایان، وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە، کە بڵێن لە مردن ئەترسێ زیاترم ئەکرد،وە ئەو یەکەم کەسبوو، کە دوو رکات نوێژی سوونەتی پێش شەهادەتی دانا، لەپاشان فەرمووی: خوایە هەموویان لەناو ببەیتو چەند هۆنراوەیەکی وت لەوانە (ولست ابالي...واتە: من بەلامەوە گرنگ نییە مادام بە مسوڵمانی ئەکوژرێم بەکام لامدا بکەوم بۆخوا، وە ئەوە لەبەر خاتری رەزای خوایە وە ئەگەر ئارەزۆی لێبێ ئەو پارچە ئەندامە بەشبەشانەی لەشم بەفڕو پیرۆز ئەکات. لەپاشان عوقبەی کوڕی حاریس هەستاو شەهیدی کرد،وە قوڕەیش ناردیان بەدوای لاشەی عاسمدا، تا هیچ نەبێ بەشێ لە لەشی ئەویان دەستکەوێت، پاش شەهیدبوونی، چونکە گەورەیەك لە گەورەکانی ئەوانی لەبەدرا کوشتبوو - جا خوا کۆمەڵێك زەردەواڵەی نارده سەر لاشەکەو

نەیان توانی لێی نزیك ببنــەوەو، پاراســتی لەدەســتی ڕەوانــە كراوەكانیــانو نــەیانتوانی هیچی لێ ببەنەوە - ئەڵێن كاتی خۆی عاسم دوعای كردبوو كە - ئەیخوایە نەبەزینــدوی نەبەمردوی لەشم لەلەشی كافر نەكەوێت، جا ئەوە بوو خوا تكاكــەی لێوەرگــرتو پــاش مەرگیش نەیهێشت لەشی لە لەشیان بكەوێت. یا رب لك الحمد كما ینبغی لجلال وجهـك وعظيم سلطانك، چۆن هەركەسێكت ویست بە كەیفی خــۆی دەیپارێزیــت. نِعْـم المــولی و نِعْمَ النصير.

## لەناكاو كوشــتنی دوژمنانی خواو پێغەمبــەرو درۆكــــردن بــۆ ئەم مەبەســتە.

٧٣٧- ن /٣٣٣٨ ((عَنْ جَابِرٍ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: (مَنْ لِكَعَبِ بْنِ الأَشْرَفِ فَأَنَّـهُ قَـدْ آذَى اللهَ وَرَسُولَهُ؟ قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، اَتُحِبّ اَنْ اَقْتُلَهُ يَارَسُـولَ اللهِ؟ قَـالَ: (نَعَـمْ) قَـالَ: فَائـْـذَنْ لِي فَأَقُولُ. قَــالَ: (قَدْ فَعَلْتُ) قَـالَ: فَأَتَـــاهُ فَقَـالَ: انَّ هَـذَا ـ يَعْنـي النبَّــيَّ ـ قَـدْ عَنَّانَا وَسَأَلَنَا الصَّدَقَةَ، قَالَ: وَاَيْضاً وَاللهِ (لَتَمَّلُنَّهُ) قَالَ: فَأَنَّـا قَـدْ اتَّبَعْنَـاهُ فَنَكَـرَهُ اَنْ نَدَعَـهُ حَتَّى نَنْظُرَ اِلَى مَا يَـصِيُر اَمْـرَهُ، قَـالَ: فَلَـمْ يَـزَلْ يُكَلِّمُـهُ حَتَّـى اِسْـتَمْكَنَ مِنْـهُ فَقَتَلَـهُ) رواه البخــــاري (٢٥١٠، ٣٠٣١، ٣٠٣٢، ٤٠٣٧) ومــــــسلم (١١٩/١٨٠) وابــــوداود (٢٧٦٨))).

لە جابیرەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبــەری خــواﷺ فــەرموی: كــێ كــەعبی كــوڕی ئەشرەفم بۆ لەناو ئەبات، بە ڕاستی خواو پێغەمبەری ئازارداوە.

موحەممەدی كوڕی مەسلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێت خۆشە بیكوژم ؟!

فەرموی: (بەڵێ).

وتی: ماوەم پێ بدە، كە هەندێ قسە ـ لە ڕواڵەتا چاك نـین ـ بیكـەم، فـەرموی (بـە ڕاستی ئەوەم كرد)، واتە ماوەم پێدایت بەو قسەی كە خۆت پەسەندی ئەكەیت، ئەڵێ جا

— موحەممەد — هاتە لای، وتی: بە ڕاستی ئەمە — مەبەستی پێغەمبەر بوو — زۆر ئێمەی ئازارداوەو داوای چاکەو زەکاتمان لێ ئەکات، وتی بە خوا، هەروەها منیش نارەحەتم لەو ماوە درێژەی ئێوە لەگەڵ ئەودا.

وتی: چار چیە — ئێمە دوای کەوتوینو پێمان ناخۆشە، کەوازی لێ بهێنین، هەتا نەیبینین بزانین، کە ئیشی بە کوێ ئەگات.

وتی: هەر ئاوەها درێژەیدا بە قسەکردن لەگەڵیا، هەتا فرسەتی لێ هێناو کوشتی.

ئازیزانم ئەم فەرمودەیە بە شێوەی درێژتر هاتوە، بەڵام من لەبەر کورتکردنەوەی نووسینەکەم ئەم ریوایەتە کورتەم هێنا، کە مەبەستەکەی تێدایە بۆ زیاتر شت زانین تەماشای ڕاڤەی هەمان فەرمودە بکەن لە (نیل الاوطار)دا، لە ژیانی پێغەمبەردا بە درێژی باسمان کردووە.

## کەسێ بیەوێ لە جێگای سەرکەوتندا سێ ڕۆژ بمێنێتەوە.

٧٣٨- ن /٣٣٤٣ ((عَنْ اَنَسٍ، عَنْ اَبِي طَلْحَةَ، عَنِ النبَّـيِّﷺ اَنَّهُ كَانَ اَذَا ظَهَـرَ عَلَـى قَوْمٍ، اَقَامَ بِالْعَرْصَةِ ثَلاَثَ لَيَالٍ. متفق عليه. (خ/٣٠٦٥، ٣٩٧٦) (م/٧٨/٢٨٧٥) احمد (٢٩/٤) وابوداود ايضاً (٢٦٩٥))).

لە ئەنەسەوە لە باوکی تەلحەوە‌ رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوەﷺ هاتوە، کە ئەو هەرکاتێ بەسەر گەلێکدا سەربکەوتایە، سێ شەو لەو شوێنەدا ئەمایەوە. ئاشکرایە ئەمە شتێکی پێویستە بۆ هەر فەرماندەیەکی لێزانو دڵسۆز، هەم بۆ هێورکردنەوەی ناوچەکەو، هەم بۆ ناسینی خەڵکەکەو چۆنیەتی ئیش لەگەڵ کردنیاندا.

## چوار بەش لە پێنج بەشی دەستكەوت هی سوپایەكەیە و بۆ پێغەمبەری خوا نەبووە.

٧٣٩- ن /٣٤٤٥ ((عَنْ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامت، اَنَّ رَسُولَ اللهﷺ صَلَّى بِهِمْ فِي غَزْوَتِهِمْ الَى بَعِيرٍ مِنَ الْمَقْسِمِ، فَلَمَّا سَلَّم قَامَ فَتَنَاوَلَ وَبْرَةً بَيْنَ أُنْمُلَتَيهِ فَقَالَ: (انَّ هَذَا مِنْ غَنَائِمكُمْ وَانَّهُ لَيْسَ لِي فِيْهَا الاّ نَصِيبي مَعَكُمْ الاَّ الْخُمْسَ، وَالْخُمْسَ مَرْدُودٌ عَلَيْكُمْ فَأدوُّا الْخَيْطَ وَالْمِخْيَطَ وَاَكْبَرَ مِنَ ذَلِكَ وَاَصْغَرَ)رواه احمد(٣١٩/٥) والنسائي(١٣١/٧) وابن ماجة (٢٨٥٠))).

له عوبادەی كوڕی سامیتەوەرضي الله عنهما هاتوە، كە پێغەمبەری خوا لە غەزاكەیانـدا ڕوو بەوشترێكی دەستكەوت نوێژی بۆ كردن، كاتێ سەلامی دایەوە هەستاو كوركێكی لە نێوان دوو پەنجەیدا گرتو فەرموی: بەڕاستی ئەمە بەشێكە لە دەستكەوتەكەتان، بەڕاستی لەو دەستكەوتەدا بۆ من نیە ، مەگەر ئەو بەشەی من، كە لەگەڵ ئێوەدام‌و بێجگە لە پێنج یەك، كە پێنج یەكیش دێتەوە بۆ خۆتان، كەوابوو هیچ لەو غەنیمەتە نەخەنە لاوە ـ بیدەنەوەـ ئەگەر لاتانە، هەتا دەزگو دەرزیش‌و گەورەتر لەوەیش‌و بچوكتریش.

٧٤٠- ن /٣٣٤٩ ((عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ اَنَّهُ قَالَ لِخَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ: اَمَا عَلِمْتَ اَنَّ النبِّيَّ قَضَى بِالسَّلَبِ لِلْقَاتِلِ؟ قَالَ: بَلَى) رواه احمد(٦/٢٦-٢٧)ومسلم (٤٤/١٧٥٣) وابوداود (٢٧١٩))).

له عەوفی كوڕی مالیكەوەرضي الله عنهما هاتوە، كە بەخالیدی كوڕی وەلید گوت: ئایا نازانی پێغەمبەرﷺ بڕیاریداوە، كە هەرچی بە كوژراوە هەیە بۆ بكوژە؟

وتی ئەرێ ئەزانم، سەلەب: بەو شتانە ئەڵێن، كە بەشەڕەكەرەوە هەیە، مادام كەسێك بە ئاشكرا بۆی دەرچوو ڕووبە ڕوو بوونەوە، ئەوا هەرچی پێیەتی ئەدرێ بەبكوژووە بەر دابەشكردن ناكەوێت.[1]

(١) تەماشای ژمارە (٣٣٥٠) لە سەرچاوەی پێشوو، بكە.

## یەكسـانی لە نێوان بەهێز و بێهێز و شـەڕكـەر و شـەڕنەكەر مادام ئامادەی غەزاكە ببـن.

٧٤١-ن /٣٣٥٧ ((عَنْ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُـولَ اللهِ الرَّجُـلُ يَكُـونَ حَامِيَـةُ الْقُوْمِ اَيَكُونُ سَهْمُهُ وَسَهْمُ غَيْرِهِ سَـوَاءٌ؟ قَـالَ: (ثَكَلَتْـكَ اُمُّـكَ ابْـنَ اُمِّ سَـعْدٍ، وَهَـلْ تُرْزَقُـونَ وَتُنْصَرُونَ اِلاّ بِضُعَفَائِكُمْ) رواه احمد (١٧٣/١))).

لە سەعدی كـوڕی مالیكـەوە ﷺ هـاتوە، كـە وتویـەتی: وتم ئـەی پێغەمبـەری خواﷺ! ئەو پیاوەی، كە پارێزەری گەلەكەیە، ئایـا بەشـی ئـەوو بەشـی بێجگـە لـەو، هەروەكو یەكە؟ واتە بەلایەوە وابو كە جیاوازییان هەبێ، بەڵام پێغەمبەری داناو دڵسۆز فەرموی: ( دایكت سینگت بۆ بكوتێ ئەی كوڕی دایكی سـەعدا، مەگـەر ڕۆزیـدانتانو سەركەوتنتان، بەهۆی لاوازەكانتانەوە نیە؟!)، ئەم ریوایەتە خوا مەیلی بوو بینووسـم لـە سـەنەدەكەیدا كـەمێ لاوازی هەیـە بـەڵام فـەرمودەی ((هَـلْ تُرْزَقُـونَ وَتُنْـصَرُونَ اِلاّ بِـضُعَفَائِكُمْ[1])) كە ئیمـامی بوخـاری (٢٨٩٦)و نەسـائی (٤٥١٦) ڕیوایـەتیان كـردوە ئەبێتە پاڵ پشتێكی چاك بۆیو ئەبێ بە (حسن)، والله اعلم.

٧٤٢- ن /٣٣٦٥ ((عَنِ ابْنِ عُمَـرَ، اَنَّ النبَّـيَّﷺ كَـانَ يُنَفِّـلُ بَعْـضَ مَـنْ يَبْعَـثُ مِـنَ السَّرَايَا لأَنْفُسِهِمْ خَاصَّةً سِوىَ قَسْمَ عَامَّةِ الْجَيْشِ، وَالْخُمْسُ فِـي ذَلِـكَ كُلِّـهِ وَاجِـبٌ) متفـق عليه وابو داود (٢٧٤٦) خ(٣١٣٥) م (٤٠-١٧٥٠) واحمد (١٤٠/٢))).

لە عەبدوڵای كوڕی عومـەرەوە ﷺ هـاتوە، كـە پێغەمبـەرﷺ زیـادەی ئـەدا بـە هەندێ كەس، كـە ئـەیناردن لـەناو گرۆهەكانـدا — لەبـەر ئەنجامـدانی ئیـشی گـرنگو چالاكانە — تایبەت بە خۆیان بێجگە لەو بەشەی، كە بە گشتی لەناو سوپاكەدا دەسـتی ئەكەوت. وە پێنج یەك لە هەمویدا پێوستە، واتە پێشەكی ئەبێ پێنج یـەكی ٥/١ لـێ

---

(١) تەماشای ژمارە (٣٣٥٨– ٣٣٥٩) بكە، لە هەمان سەرچاوە.

دەربكرێت، ئینجا ئەو زیادەی لێ دەربكرێتو، پاشان بەو شێوە دابەش بكرێت، كە هاتوە.

٧٤٣- ن /٣٣٦٨ ((عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَا بِالْمَرْبَدِ، اذْ دَخَلَ رَجُلٌ مَعَهُ قِطْعَةُ اَدِيمٍ فَقَرَأْنَاهَا فَإِذَا فِيْهَا: (مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولَ اللهِ الَى بَنَي زُهَيْرِ بْنِ قَيْسٍ إِنَّكُمْ انْ شَهِدْتُمْ اَنْ لاَ اِلَهَ الاّ اللهَ وَاَنَّ مُحَمّداً رَسُولِ اللهِ وَاقَمْتُمْ الصَّلاَةَ وَآتَيْتُمْ الزَّكَاةَ وَاَدَّيْتُمُ الْخُمْسَ مِنَ الْمَغْنَمِ وَسَهْمَ النبّيِّﷺ وَسَهْمَ الصَّفِيِّ اَنْتُمْ آمِنُونَ بِأَمَانِ اللهِ وَرَسُولِهِ) رواه احمد (٥/٧٧) وابوداود(٢٩٩٩) والنسائي (١٣٤/٧))).

لە یەزیدی كوڕی عەبدولاوە هاتوە، كە وتویەتی: لە (مەربەد)بوین لەوكاتەدا پیاوێك هاتوو پارچەیەك چەرمی پێ بوو، ئێمەش جا خوێندمانەوە، كەچی لەناویا - ئەمەبوو كە - لە موحەممەدﷺ پێغەمبەری خواوە، بۆ كوڕانی زوهەیری كوڕی قەیس، ئەگەر ئێوە شایەتیتاندا، كە بێجگە لە (الله) هیچ پەرستراوێكی تری ڕاستەقینە نییەو موحەممەد پێغەمبەری خوایەو نوێژتان كردو زەكاتتان داو پێنج یەكتان داو، (١/٥) بەشی پێغەمبەرو بەشی تایبەتیتاندا، ئێوە بێ ترسو ئەمینن ـ لەخۆتانوماڵو منالّتان ـ بە ئەمانەتی خواو پێغەبەرەكەی. (الصفی) بەشێكە هەمیشە گرۆهو سوپاكان شتێكیان وەكو وشترێك، بەندەیەك، كەنیزەكێك، شمشێرێك، یان هەر شتێكی تر پێش هەمو شت دایان ئەنا بۆ پێغەمبەر ﷺ. خاتوون عائیشە رضي الله عنها وتویەتی: (صَفِيَّةُ مِنَ الصَّفِيِّ) خاتون سەفیە لەوبەشەیە، ژمارە (٣٣٧١) نیل الاوطار. رواه أبو داود (٢٩٩٤).

٧٤٤- ن /٣٣٧٥ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: (كَانَ النَّبِيُّ يُعْطِي الْمَرْأَةَ وَالْمَمْلُوكَ مِنَ الْغَنَائِمِ دُونَ مَا يُصِيبُ الْجَيْشَ) رواه احمد (٣١٩/١،٣٥٢،٣٥٣))).

لە عەبدولّلای كوڕی عەباسەوە رضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەرﷺ لە دەستكەوتی غەزادا، بەشی ئافرەتو بەندەیانی ئەدا، بەشێوەیەكی كەمتر لە بەشی سوپا، هەندێك ئەڵێن لە بەشە تایبەتییەكەی خۆی لە پێنج یەك ١/٥ ئەیدا بەوان. (ئەمە بەشێكە، هەمیشە كەمتر بوە لە دەستكەوتەكان، كە پێی ئەوترێت (رَضْخٌ).

# بەشی سـوارو پیـادە

٧٤٥- ن /٣٣٨٠ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ، اَنَّ النبَّـيَّ ﷺ (اَسْـهَمَ لِلْفَرَسِ سَـهْمَيْنِ وَلِلرَّجُـلِ سَـهْماً))، متفـق عليـه خ (٢٨٦٣) م (٥٧/١٧٦٢) احمـد (٢/٢) كـذا، رواه التـرمذي (١٥٥٤).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ (دوو بەشی داناوە — لە دەستکەوت - بۆ ئەسپو بەشێکی بۆ پیاو). واتە ئەو کەسەی، کە پیادە بووە بەشـێکی پـێ ئـەدرێ وە ئەوکەسـەش کـە بەسـواری هـاتوە بـۆ غـەزاو چـارەوێکەی لەغـەزادا بەکارئەهێنێ، سێ بەشی پێ ئەدرێ، بەشێکی خۆیو دوو بەشی ئەسپەکەی.

## کەسـێ بەهۆی بەرژەوەندیـیەکی مسـوڵمانانەوە ئامادەی غەزا نەبێ و بەشـی بۆ دانرێت.

٧٤٦- ن /٣٣٨٩ ((وَعَنْهُ قَالَ: لَـمَّا تَغَيَّبَ عُثْمَانُ عَنْ بَدْرٍ فَاَنَّهُ كَانَتْ تَحْتَهُ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَكَانَـتْ مَرِيـضَةٌ فَقَـالَ لَـهُ النبَّـيُّ ﷺ: اِنَّ لَـكَ اَجْـرَ رَجُـلٍ وَسَـهْمَهُ) رواه احمـد (١٠١/٢-١٠٢) والبخاري (٣١٣٠) والترمذي (٣٧٠٦))).

هەر لەوەوە ﷺ هاتوە، کە وتویەتی لەکاتێکا عوسمان لەبەدرا ئامـادە نـەبوو، لەبـەر ئەوە بوو، کە کچی پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانی بوو نـەخۆش بـوو، پێغەمبـەر ﷺ پێـی فەرموو ﷺ پاداتی پیاوێکی پیادەو بەشێکی ئەویشت بۆ هەیە - لەدەستکەوتدا -.

٧٤٧- ن /٣٣٩٢ ((عَنْ اَبِي مُوسَى قَالَ: بَلَغَنَـا مَخْـرَجَ رَسُـولِ اللهِ ﷺ وَنَحْـنُ بـالْيَمِنَ فَخَرَجْنَا مُهَاجِرِينَ اِلَيْهِ اَنَا وَاَخَوانِ لِي (اَنَا اَصْغَرُهُمْ) اَحدُهُمَا اَبوُ بُرَيْدَةَ وَالآخَـرُ اَبـوُ رُهْـمٍ — اِمَّا قَالَ فِي بِضْعَةٍ وَاِمَّا قَالَ: فِي ثَلاَثَةٍ وَخَمْسِينَ أوَ اثْنَتَيْنِ وَخَمْسِينَ رَجُلاً مِنْ قَوْمِي- قَالَ: فَرَكِبْنَا سَفِينَةً فَاَلْقَتْنَا سَفِينَتُنَا اِلَى النَّجَاشِيِّ بالْحَبَشَةِ، فَوَافَقْنَـا جَعْفَـر بْـنَ أَبِـي طالِـبٍ وَ

أَصْحَابَهُ عِنْدَهُ، فَقَالَ جَعْفَرُ: انَّ رَسُولَ اللهِﷺ بَعَثَنَا هَهُنا، وَأَمَرَنَا بِالإِقَامةِ. قَالَ : فَاقَمْنَا مَعَهُ حَتَّى قَدِمْنَا جَمِيعاً، فَوافَقْنَا رَسُولَ اللهِﷺ حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ فَأَسْهَمَ لَنَا ( اَوْ قَالَ اَعْطَانَا مِنْهَا) وَمَا قَسَمَ لأَحَدٍ غَابَ عَنْ فَتْحِ خَيْبَرَ مِنهَا شَيْئاً الاّ لِمَنْ شَهِدَ مَعَهُ، الاَّ لأَصْحَابِ سَفِينَتِنَا مَعَ جَعْفَرٍ وَاَصْحَابِهِ، قَسَمَ لَهُمْ مَعَهُمْ)، رواه الجماعة الاّ النسائي وابن ماجة خ (٣١٣٦) م (١٦٩/٢٥٠٢) واحمد (٤١٢،٣٩٤/٤) وابوداود (٢٧٢٥) والترمذي (١٥٥٩))).

له باوکی موساوهﷺ هاتوه، کـه وتویـهتی: هـهواڵی دهرچـوونی پێغهمبـهرمانﷺ پێگهیشتو ئێمه له یهمهندا بووین، جا ئێمهیش دهرچووین کۆچهریانه بۆلای ئهو، مـنو دوو برای ترم ـ من بچووکترییینیان بووم ـ یهکێکیان ئهبو بورهیدهو ئهویتریان ئـهبو روهـم – یان فهرموی لهناو ئهوهنده، یان وتی: لهناو (٥٣) کهس یان (٥٢) کهس لهگهڵهکـهی خۆم ـ

وتی: سواری کهشتیهك بووین کهشـتیهکهمان بردنـی بـۆلای نهجاشـی لهحهبهشـهدا، ئهوسا لهوێ ڕێمان کهوت له جهعفهر کوڕی ئهبو تالبو ڕهفیقهکانی لهلای ئهو.

جا جهعفهر وتی: بهڕاستی پێغهمبـهری خـواﷺ نـاردوینی بـۆ ئێـرهو فرمـانی پـێ کردوین، که لێره بمێنینهوه.

وتی: ئیتر ئێمه لهگهڵ ئهودا ماینهوه، تا ههمومان هاتین، گهیشتین به پێغهمبهرﷺ کاتێ، که فهتحی خهیبهری کردو بهشی بۆ دانایین، (یان وتی: لهوه بهشی داین)، بۆ هـیچ کهسێکی دانهنا، که لهخهیبهردا ئاماده نهبوو، مهگـهر بـۆ ئـهو کهسـهی، کـه لهگـهڵی ئاماده بـوو ، بێجگـه لـه یـارانی کهشـتی کهلهگـهڵ جهعفـهرو یارانیـدا بـوون بهشـی ئهوانهیدا، که لهگهڵ ئهواندا بون، لهڕاستیدا پێغهمبهری ئازیزﷺ ئـهو ڕێگـه دوورهی، که ئهوان بڕیبویان بۆ خزمهت پێغهمبهر، بهم بهشه بهسهری کردنهوهو دڵخۆشی کردن.

هـهروهکو فـهرموی: نـازانم بـهکام دڵخۆشـبم، بهفـهتحی خهیبـهر، یـان بههاتنـهوهی جهعفهر، ئهبو موساو ڕهفیقهکانیشی ئهوکهسانه بوون، که پێغهمبهرﷺ لـه غهزایهکـدا له باسێکی درێژدا کهلهپهڕاوی (ئابووری له ئیسلامدا) نوسـیوهمه فـهرموی (هُمْ مِنِّي

وَاَنَا مِنْهُمْ/ ئەوان لە منن‌و منیش لـەوانم) وصـلی الله علیـه وعلـی آلـه واصـحابه وسـلّم تسليما كثيراً.

## بەخشـین بەندو مسـوڵمان.

٧٤٨- ن /٣٣٩٥ ((عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ لَمَّا آثَرَ النبَّـيُّ أُنَاساً فِي الْقِسْمَةِ فَأَعْطَى الأَقْـرَعَ بْنَ حَابِسٍ مِاءَةً مِنَ الأبِلِ وَاَعْطَى عُيَيْنَةَ مِثْـلَ ذَلِـكَ وَأَعْطَـى أُنَاسـاً مِـنْ أَشْـرَافِ الْعَـرَبِ وَآثَرَهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْقِسْمَةِ- قَـالَ رَجُـلٌ : وَاللهِ ! انَّ هـذه لَقِـسمَةٌ مَاعُـدِلَ فِيهَـا وَجْـهَ اللهِ ! فَقُلْتُ: وَاللهِ لأُخْبِرَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ.فَأَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: ((فَمَـنْ يَعْدِلُ اِذَا لَـمْ يَعْـدِ اللهِ وَرَسُولُهُ؟)) ثُمَّ قَالَ: (( رَحِمَ اللهُ مُوسَى فَقَـدْ أُذِيَ اَكْثَـرَ مِـنْ هَـذَا فَـصَبَرَ))، متفـق عليـه خ (٣٤٠٥) م (١٠٦٢-١٤٠) احمد (١-٣٨٠-٤٣٥))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: لـەکاتێکا پێغەمبـەرﷺ چەند کەسێکی بە بەخشینێکی زۆر جیاکردەوە و، سەدوشتری بەخشی ئـەقرەعی کـوڕی حابیس، هەروەکو ئەویشی دا بە عویەینەوەو بە هەندێك لە پیاوە ناودارەکـانی عـەرەبی بەخشی، ئەو ڕۆژە ئەوانی جیاکردەوە لەبەشدا —

پیاوێك وتی: بەخوا! ئەمە بەشکردنێك بوو، کە دپەروەری تێدا نـەکرابوو، مەبەسـتی لەمەدا خوا نەبووە.

جا وتم: بەخوا: ئەم هەواڵە ئەدەم بە پێغەمبەری خواﷺو هاتم‌و هەواڵەکەم پێدا.

ئینجا فەرموی: ئـەی کـێ دادپـەروەری ئـەکات، ئەگـەر خـواو پێغەمبەرەکـەیﷺ نەیکەن؟ ((لە پاشان فەرموی: ڕەحمەتی خوا لە موسا بێت بەڕاستی لەمە زیاتر ئازاردراو خۆی گرت)). واتە دروستە پێـشەوای مـسوڵمانان لـە بـەر بەرژەوەندییـەکی ئـایین لـە دەستکەوتا شتێکی زیاد، بەکەسێك یـان چـەند کەسـانێك بـدات، بەتایبـەت بـۆ تـازە مسوڵمانان، تا دڵیان ئارامتر ببێ.[1]

(١) تەماشای ژمارە (٣٣٩٦) لە سەرچاوەی پێشو، بکە.

## ماڵی مسـوڵمانان ئەگەر کافر گرتیان لە پاشدا کەوتەوە دەست مسـوڵمانان چۆنی لێ بکەن؟

٧٤٩- ن /٣٣٩٧ ((عَنْ عِمْرَانِ بْنِ الْحُصَيْنِ قَالَ: أُسِرَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ وَأُصِيبَتِ الْعَضْبَاءُ فَكَانَتِ الْمَرْأَةُ فِي الْوِثَاقِ وَكَانَ الْقَوْمُ يُرِيحُونَ نَعَمَهُمْ بَيْنَ يَدَيْ بُيُوتِهِمْ فَانفَلَتَتْ ذَاتَ لَيْلَةٍ مِنَ الْوِثَاقِ فَأَتَتِ الْإِبِلَ فَجَعَلَتْ اذَا دَنَتْ مِنَ الْبَعِيرِ رَغَا فَتَتْرُكُهُ حَتَّى تَنْتَهِي اِلَى الْعَضْبَاءِ فَلَمْ تَرْغُ. قَالَ: وَهِي نَاقَةٌ مُنَوَّقَةٌ (وَفِي رِوَايَةٍ مُدَرَّبَةٌ) فَقَعَدَتْ فِي عجُزِهَا ثُمَّ زَجضرَتْهَا فَانْطَلَقَتْ، وَنُذِرُوابِهَا (فَطَلَبُوهَا) فَأَعْجَزَتْهُمْ قَالَ: وَنَذَرَتْ للهِ: انْ نَجَّاهَا اللهُ عَلَيْهَا لَتَنْحرَنَّهَا. فَلَمَّا قَدِمَتِ الْمَدِينَةَ رَآهَا اَلنَّاسُ. فَقَالُوا : الْعَضْبَاءُ ! نَاقَةُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالْ: إِنَّهَا نَّذَرَتْ لِله: انْ نَجَّاهَا اللهُ عَلَيْهَا لَتَنْحَرَنَّهَا ؟! فَأَتَوْا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ. فَقَالَ: ((سُبْحَانَ اللهِ ! بِئْسَمَا جَزَتْهَا ، نَذَرَتْ انْ نَجَّاهَا اللهُ عَلَيْهَا لَتَنْحَرَنَّها ؟! لا وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةٍ وَلا فِيمَا لا يْمْلِكُ) رواه احمد (٤/٤٣٠) ومسلم (١٦٤١/٨) وابوداود (٣٣١٦))).

لە عیمرانی کوڕی حوسەینەوە‌ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: ئافرەتێکی یاریدەدەرەکان بەدیل گیرا،وە عەزبا -وشتری پێغەمبەرﷺ بوو گیرا -وە ئەو ئافرەتە زنجیر کرا بوو، ئەو گەلەیش ئێواران مەڕو ماڵاتیان لەپێش دەم ماڵەکانیاندا مۆڵ ئەدا، شەوێك خۆی دەرهێنا لەزنجیرو هاتە لایوشترەکان، جا نزیکی هەر وشترێك ئەبوەوە ئەیقیڕان ـ ئەویش -وازی لێ ئەهێنا، تا گەیشتە لای (غەزبا) ئەو ئەیقیڕان، ئەڵێ: ئەو وشترێکی مۆچێنراو بوو (لە ڕیوایەتێکی تردا - تەمێ کراو بوو) جا سواری بوو لێی خوڕی هەستاو ڕۆیی، ئەوگەلەی لێ ئاگادار کرایەوەو، چون بە شوێنیاو لە دەستی خستنو ـ پێی نەگەیشتن، ئەڵێ: نەزری کرد بۆ خوا ئەگەر خوا، بەسواری ئەم وشترە رزگاری بکات، سەری ببڕێت. جا کاتێ گەیشتە مەدینە، خەڵك دیسانوتیان: عەزبا! وشترەکەی

پێغەمبەری خواﷺ وتی: من نەزرم كردوە بۆ خوا: ئەگەر رزگارم بكات بەڕاستی سەری ببڕم؟! هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خواوﷺ باسیان بۆی كرد فەرمووی: پاكو بێ عەیبی بۆ خوا! خراپ پاداشتی داوەتەوە، نەزری كردووە لەسەر ئەو، ئەگەر خوا رزگاری بكات، سەری ببڕێت؟! نەزر لە تاواندا جێبەجێ ناكرێتو لەشتێكدا، كە مولْكی كابرا نەبێ - جێبەجێ ناكرێت -.

لێرەدا ئەوە دەركەوت، كە ماڵی مسولْمانان هەرچەند كافر بیبات، هەركاتێ كەوتەوە بەردەستی مسولْمانان، هەر هی ئەو كابرا مسولْمانەیە، دابەشكرابێ، یان نەكرابێ، بەو مەرجە شتەكە وەكو خۆی مابێتەوە. لێرەدا ئەوە دەرئەكەوێ، كە نەزر لە ناڕەواو لەشتێكدا، كە مولْكی خۆی نەبێ جێبەجێ ناكرێت. ئەوەش وەرئەگیرێ ئەگەر حەیوانێك بوو بەسەبەبی خێرێك بۆ كابرا، ئێشو ئازاری بۆ دروست نەكات، والله أعلم.

## ئەوەی كە دروستە هەڵگرتنی بەبێ بەشكردن وەكو خواردن و ئالفی حەیوان.

٧٥٠- ن /٣٤٠١ ((عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ الْمُغَفَّلِ قَالَ: اَصَبْتُ جَرَاباً مِنْ شَحْمٍ يَوْمَ خَيْبَرَ فَالْتَزَمْتُهُ: فَقُلْتُ لاَ اُعْطِي الْيَوْمَ اَحَداً مِنْ هَذَا شَيْئاً. فَالْتَفَت فَاِذَا رَسُولُ اللهِ ﷺ مُتَبَسِّمٌ)) رواه احمد (٨٦/٤) ومسلم (٧٢/١٧٧٢) وابوداود (٢٧٠٢) والنسائي (٢٣٦/٧) بهذا اللفظ. وبنحوه متفق عليه)).

لە عەبدوڵڵای كوڕی موغەفەلەوەرضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: ڕۆژی خەیبەرپێستەیەك بەزم دەستكەوت جا بەچاكی هەڵم گرت وتم: ئەمڕۆ هیچ شتێ لەمە نادەم بەكەس، لام كردەوە، كەچی پێغەمبەری خواﷺ بزەی پێكەنینیەتی...وە هەر لەم مانایەدا هاتوە بە ئیتفاقی ئیمامی أحمدو بوخاریو موسلیم.

## تاوانی خیانەت لە دەستکەوتی غەزاو سوتانی کەل و پەلی خیانەتکار.

٧٥١- ن /٣٤١٢ ((عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: كَانَ عَلَى ثَقَلِ النَّبِيِّ ﷺ رَجُلٌ يُقَالُ كَرْكَرَةَ فَمَاتَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (هُوَ فِي النَّارِ) فَذَهَبُوا يَنْظُرُونَ اِلَيْهِ فَوَجَدُوا عَبَاءَةً قَدْ غَلَّهَا) رواه احمد (٢/١٦٠) والبخاري (٣٠٧٤)))

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: سەرپەرشتکاری کەلوپەلی پێغەمبەر ﷺ پیاوێك بوو، کە پێیان ئەوت (کەرکەرە)و مرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی (ئەو لەناو ئاگردایە)). چوون تەماشایان کرد عەبایەکیان دزیوە، کە لە غەنیمەت - بێ پرس هەڵی گرتبو -. واتە خیانەت لەغەنیمەت تاوانێکی گەورەیە، هەندێ بەلایانەوەوایە، ئەگەر کەسێك خیانەتی کرد پێویستە کەلو پەلەکەیشی بسوتێنرێو بەشی خۆیشی لەو غەزایەدا پێ نەدرێت [1]، بەڵام ئەو فەرمودانە، کە باسی سوتانی کەلو پەل ئەکات لاوازە.

## باسی بەرەڵاکردنی دیلی کافر بێ تۆڵە وەرگرتن.

٧٥٢- ن /٣٤١٧ ((عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، اَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي اسَارَى بَدْرٍ: (لَوْ كَانَ الْمُطْعِمُ بْنُ عَدِيِّ حَياً ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هَؤُلَاءِ النَّتْنَى لَتَرَكْتُهُمْ لَهُ) رواه احمد (٤/٨٠) والبخاري (٣١٣٩) وابوداود (٢٦٨٩))).

لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە دیلەکانی بەدر فەرموی: ((ئەگەر ئێستا موتعیمی کوڕی عەدی زیندوو بوایەو، لەپاشان لەبارەی

(١) تەماشای ژمارە (٣٤٣١٤ و ٣٤١٥ ) لە سەرچاوەی پێشوو، بکە.

ئەم بۆگەنانەوە، قسەی لەگەڵما بکردایە هەموویانم واز لێ ئەهێنا بۆی. واتــە: بــێ تۆڵــە وەرگرتن ئازادم ئــەکردن، بــەڵێ پێغەمبــەری ئازیزمــانﷺ ســەفەری تــایفو پــەنادانی موتعیمی لەبیر نەچووەتەوەو، هەروەکو فەرمویەتی: پێی خۆشبوو، کە پاداشــتی چــاکەی موتعیمی بدایەتەوە.

(٧٥٣/ ن /٣٤٢٤ ((عَنْ عِمْرَانِ بْنِ الْحُصَيْنِ قَـالَ: كَانَـتْ ثَقِيـفٌ حُلَفَـاءَ لِبَنِـي عُقَيْـلٍ فَاسَرَتْ ثَقِيفٌ رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِﷺ وَاَسَرَ اَصْحَابُ رَسُـولِ اللهِﷺ رَجُـلاً مِـنْ بَنِي عُقَيْلٍ وَاَصَابوُا مَعَهُ الْعَضْبَاءَ فَأَتَى عَلَيْـهِ رَسُـولُ اللهِﷺ وَهُـوَ فِـي الوِثَـاقِ فَقَـالَ: يَـا مُحَمَّدُ. فَأَتَـاهُ فَقَـالَ: (مَـا شَـأْنُكَ؟) فَقَـالَ: بِمَـا اَخَذْتَنِي وَأَخَـذْتَ سَـابِقَةَ الحَـاجِّ ( يَعـني الْعَضْبَاءَ) ، فَقَالَ: ((أَخَذْتُكَ بِجَرِيرَةِ حُلَفَائِكَ ثَقِيفٌ)) ثُـمَّ انْـصَرفَ عَنْـهُ فَنَـادَاهُ فَقَـالَ: يَـا مُحَمَّدُ ، يَامُحَمَّدُ . فَقَالَ((مَا شَأْنُكَ)) قَالَ: إِنّي مُسْلِمٌ قَالَ: ((لَوْ قُلْتَهَا وَاَنْتَ تَمْلِكُ أَمْـرَكَ اَفْلَحْتَ كُلَّ الْفَلاَحِ))، ثُمَّ انْصَرفَ عَنْهُ فَنَادَاهُ يَا مُحَمَّدُ ، يَامُحَمَّدُ فَأَتَاهُ، فَقَالَ((مَا شَأْنُكَ)) فَقَـالَ إِنّـي جـائِعٌ فَـأَطْعِمنِي ، وظَمْـآنٌ فَاسْـقِنِي، قَـالَ: ((هَـذِهِ حَاجَتُـكَ )) فَفُـدِيَ بَعْـدُ بِالرَّجَلَيْنِ)رواه احمد(٤/٤٣٠) ومسلم (٨/١٦٤١) وابوداود (٣٣١٦))).

لە عیمرانی کوڕی حوسەینەوەﷺ هاتوە، کــە وتویــەتی: ســەقیف ســوێنخۆری بــەنو عوقەیل بوون، جا سەقیف دوو پیاو لــەیارانی پێغەمبــەری خوایــانﷺ بــەدیلی گــرت، یارانی پێغەمبەریشﷺ پیاوێکیان لە بەنو عوقەیل گرت (عــەزبا) ــ نــاوی وشــترێکی پێغەمبەرە ــ کە بەو بوو گرتیــان، جــا پێغەمبــەری خــواﷺ هــات بەســەریا، کــە ئــەو بەسترابۆوە، جا ئەویش بانگی کردو وتــی: ئــەی موحەمــەد! تەشــریفی هاتــە لای وتــی: ((چیتە؟)) وتی بۆچی منت گرتووەو ئەوەی، کە پــێش حاجیــەکان ئەکــەوت (مەبەســتی ئــەو وشــترە بــوو، کــە نــاوی عــەزبا بــوو) فــەرموی: تــۆم گرتــووە بەتۆڵــەی تــاوانی هاوسوێنخوارەکانتانەوە، سەقیف)) لەپاشان پشتی تێکرد، جا بانگی کــردو وتــی: ئــەی موحەمەدﷺئەی موحەمەدﷺ، فەرموی: چیت دەوێ؟ وتی: من مسوڵمانم، فــەرموی: ((ئەگەر ئەوەت بووتایەو دەسەڵاتت بەدەست خۆت بوایە بەتەواوی ڕزگار ئەبویت. مانای

رزگاری)) لەپاشان پشتی تێکرد، جا ـ هەم ـ بانگی کردەوە، ئەی موحەمەدﷺئەی موحەمەدﷺ، جا هاتەوە بۆلایو فەرموی: ((چیت ئەوێ؟)) وتی: برسیمە خواردنم بدەرێ، تینوومە ئاوم بدەرێ، فەرموی (ئەوە پێوستیتن)). واتە ئەبێ پێت بدرێت، جا لەباتی ئەو دوو پیاوەدا ئازادی کرد. بەڕاستی ئەم فەرمودە شتی زۆری تێدایە لەوانە: دروستە دیل ببەسترێتەوە، ئەگەر دوتیرە هاوپەیمان بوون تاوانی هەرکام لەسەر ئەویتریان حیساب ئەکرێت، کافر کە گیرا، هەرچی پێیەو هی مسوڵمانانەو، مسوڵمان بوون پاش بەدیل گیران نابێ بەهۆی گەڕاندنەوەی ماڵ سامانیو دەتوانرێ بە بارمتەی مسوڵمان ئازاد بکرێت، ئازادکردنی دیلی کافر لەبەرانبەری ئازادی مسوڵمانانەوە رەوایە، دیل ئەگەر کافریش بێ، ئەبێ خواردنو ئاوی پێ بدرێت، ئەبێ ماوەی پێ بدرێت، کە قسەی خۆی بکاتو گوێ لەداواکارییەکانی بگیرێت، قسەی دیل وەرئەگیرێ، کە بڵێ بەر لەدیلیم باوەرم هێناوە[١]، ئەگەر شایەتی هەبێ سودی بۆی هەیەو ماڵو سامانی پێ ئەدرێتەوە، ئەگەر بەردەست کەوتبێ.[٢]

## دروستە عەرەب بکرێ بە بەندە؟

٧٥٤- ن /٣٤٢٧ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: ثَلاَثَ خِصَالٍ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللهِﷺ فِي بَنِي تَمِيمٍ، لاَ اَزَالُ اُحِبُّهُمْ بَعْدَهُ: كَانَ عَلَى عَائِشَةَ مُحَرَّرٌ، فَقَالَ: (اَعْتِقِي مِنْ هَؤُلاَءِ) وَجَاءَتْ صَدَقَاتُهُمْ فَقَالَ هَذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِي) قَالَ: (وَهُمْ اَشَدُّ النَّاسِ قِتَالاً فِي الْمَلاَحِمِ) رواه مسلم (١٩٨/٢٥٢٥))).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: لەپێغەمبەری خواوەﷺ سێ سیفەتی بەنی تەمیمم بیستووە لە لەبەر ئەوە ئیتر خۆشم دەوون - لەپێشەوە لەسەر تیرەگەری ئەبو هورەیرە خۆش نەدەویستن - ((عائیشەﷺ بەندەیەکی لەسەر بوو، کە ئازادی

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٤٢٥) لە سەرچاوەی پێشوو، بکە.

(٢) تەماشای ژمارە (٣٤٣٦) لە سەرچاوەی پێشوو، بکە.

بكات پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لەوانە -واتە بەنی تـەمیمی، كـە عـەرەب بـوونو لـە ئیلیاسی كوڕی موزەردا ئەگەیشتنەوە بە پێغەمبەرﷺ و هێنانی ئـەم فـەرمودەیش بـۆ ئەو مەبەستەیە - ئـازاد بكـە)) وە زەكـاتی ئـەوان هـات فـەرموی: ((ئەمـە زەكـاتی خزمەكانمە))و فەرموی: بەهێزترین كەسن لە جەنگو تێڕژاندا)).

## كوشـــتنی جاسـوس

٧٥٥- ن /٣٤٣٠)- ((عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ قَالَ: اَتَى النَّبِيَّ عَيْنٌ وَهُوَ فِي سَفَر، فَجَلَسَ عِنْدَ بَعْضِ اَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُ ثُمَّ انْسَلَّ فَقَالَ النبِيُّﷺ (اُطْلُبُوهُ فَاقْتُلُوهُ) فَسَبَقْتُهُمْ اِلَيْهِ فَقَتَلْتُهُ فَنَفَّلَنِي سلبَه) رواه احمد (٤/٥٠) والبخاري (٣٠٥١) وابوداود (٢٦٥٣))).

لە سەلەمەی كوڕی ئەكوەعەوە ﷺ هاتوە، كەوتویەتی: جاسوسێك (سـیخور) هاتـە لای پێغەمبەروﷺو لەسەفەر بوو، جا لای هەندێ لەیارەكان دانیـشتو قـسەی ئـەكرد، لەپاشان خۆی دزییەوە، پێغەمبەرﷺفـەرموی: بگـەڕێن بەشـوێنیاو بیكـوژن، جـا مـن لەپێش ئەوانەوە كوشتم، لەبەر ئەوە هەرچی پێ بوو دای بەمن.

## بەندەی كافر كاتێ بە مسـوڵمانی بێتە لای ئێمە ئازادە

٧٥٦- ن /٣٤٣٤ ((عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ رَجُلٌ مِنْ ثَقِيفٍ، قَالَ: سَأَلْنَا رَسُولَ اللهِﷺاَنْ يَرُدَّ اِلَيْنَا اَبَا بَكْرَةَ وَكَانَ مَمْلُوكُنَا فَاَسْلَمَ قَبْلَنَا، فَقَالَ: لاَ، هُوَ طَلِيقُ اللهِ، ثُمَّ طَلِيقُ رَسُولِهِ) رواه احمد (٤/١٦٨ـ ٣١٠))).

لـە شـەعبیەوە لـە پیـاوێكی سـەقیفەوە هـاتوە، كـە وتویـەتی: داوامـان كـرد لـە پێغەمبەری خواﷺ كرد، ئەبوبەكرە كە بەندەمان بوو پێش ئێمە مـسوڵمان ببـوو، بـەر لـەوان لـە قـەڵای تـایف بەگوریـسێك خـۆی بەردایـەوە خـوارەوەو، هاتـە خزمـەتی پێغەمبەرﷺ-و مسوڵمان بوو - فەرموی: (نەخێر ئـەوە ئـازادكراوی خوایـەو لەپاشـان ئازادكراوی پێغەمبەرەكەیەتی ﷺ). واتە نەیدانەوە ولە بەندەییش رزگاری بو.

# یاسـای زەوی دەسـتكەوت

٧٥٧- ن /٣٤٣٨ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: اَيُّمَا قَرْيَةٍ أَتَيْتُمُوهَا فَأَقَمْتُمْ فِيْهَا فَسَهْمُكُمْ فِيْهَا وَاَيُّمَا قَرْيَةٍ عَصَتِ اللهَ وَرَسُولَهَ فَأَنَّ خُمْسَهَا للهِ وَرَسُولِهِ، ثُمَّ هِيَ لَكُمْ) رواه احمد (٣١٧/٢) ومسلم (١٧٥٦ـ ٤٧) وابوداود (٣٠٣٦))).

لە ئەبو هورەیرەوەرضي الله عنه هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەر دێیەك، كە چوونە ناویەوەو تیێدا مانەوە، ئەوە بەشی ئێوەی تێدایە، واتە مافی بەشتان هەیە لەو دێیەدا هەر دێیەك - یان شارێك - كە دژایەتی خواو پێغەمبەرەكەیﷺ كرد، ئەوە پێنج یەكی (١/٥) هی خواو پێغەمبەرەكەیەتی، لەپاشان ئەو دێیە هی ئێوەیە. واتە زەوی‌و باخ‌و ئاوی ئەو گوندە هی سوپای مسوڵمانانە، شێوەی یەكەمیان پێی ئەوترێ (الفیء) شێوەی دووهەم (الغنیمة)، والله أعلم.

# سەركەوتنی مەككە، بەزۆر یان بەئاشتی و كوشتنی تاوانبار لەهەر كوێدا بێ.

٧٥٨-ن/٣٤٤٨ ((عَنْ سَعْدٍ قَالَ: (لَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ اَمَّنَ رَسُولُ اللهِﷺ النَّاسَ اِلاَّ اَرْبَعَةَ نَفَرٍوَ امْرَأَتَينِ وَسَمَّاهُمْ) رواه النسائي (١٠٥/٧ـ ١٠٦) وابوداود (٢٦٨٣ـ ٤٣٥٢))).

لە سەعدەوەرضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: لەرۆژی سەركەوتنی مەككەدا پێغەمبەری خواﷺ دڵنیایی‌و بێ ترسی دا بە هەمو خەڵك، جگە لە چوار پیاوو دوو ئافرەت، كەناوی بردن. ئەمە زۆرتر لەوە دەچێ، كە بەزۆر گیراوەو هەندێ ریوایەتی تر ئەمە روونتر ئەكەنەوە لەوانە، ئەوەی كە شەڕی خالیدی كوڕی‌وەلید باس ئەكات‌و لەهەندێكیان

دا هاتوە پێغەمبەریﷺ فەرمویەتی: (( مەککە بۆمن یەك سەعات حەڵاڵ کراوەو، تارۆژی قیامەت بۆ کەس حەلاڵ نیە وحەڕامە شەڕتێدا کردنی هەند ێکیش بەلایانەوە وایە، کە بەئاشتی، سەرکەوتن بە دەست هاتوە. بۆ ئەوەیش چەند بەڵگە باس ئەکەن لەوانە، دابەش نەکردنی زەوی‌و زاری مەککە بەسەر سوپای ئیسلام و نەهێنانی دەست کەوت. ئەگونجێ ئەمەیان شتێکی تایبەت بێ بەمەککەوە، یان فەرمانـدەی مسوڵمانان بەدەست خۆیەتی، کە جێگایەکی گرت، زەوی‌و زارەکەی بدات بەسوپاکە، یان بیداتەوە بەخۆیان، یان بیدات بە کەسانێکی تر، والله أعلم.

## کۆچکردن هەیە لە وڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام، بەلام کۆچکردن نیە لە جێگایەکدا، کە خەڵکەکەی مسوڵمان بێ.

٧٥٩- ن /٣٤٥٥ ((عَـنْ عَبْـدِ اللهِ بْـنِ الـسَّعْدِيِّ، اَنَّ رَسُـولَ اللهِﷺقَـالَ: (لاَ تَنْقَطِـعُ الْهِجْرَةُ مَا قُوتِلَ الْعَدُوُّ) رواه احمد (٥/٢٧٠) والنسائي (٧/١٤٦، ١٤٧))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی سەعدییەوە‌رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: کۆچکردن نابڕێتەوە، مادام شەڕ لەگەڵ دوژمندا بکرێت. بەڵێ، تاجیهاد هەبێ، کۆچکردنیش هەیەو، جیهادیش ئەمێنێتەوە، تا ڕۆژی قیامەت. ئەم فەرمودەیەی ئیبنو عەباس، کەدێت بۆ شوێنێکە، کە خەڵکەکەی مسوڵمان ببێ‌و بتوانن بێ ترس دروشمەکانی ئاینی ئەنجام بدەن‌و دووچاری کێشەو سزای قورس نەکرێن، سزای بچووك هەر ئەبێ، والله أعلم.

٧٦٠- ن /٣٤٥٦ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النبَّـِيِّﷺ قَـالَ: لاَ هِجْـرَةَ بَعْـدَ الْفَـتْحِ وَلَكِـنْ جِهَـادٌ وَنِيَّـةٌ وَاِذَا اسْتُنْفِرْ ثُـمَّ فـانْفِرُوا)، رواه الجماعـة الا ابـن ماجـة، لكـن لـه منـه (اِذَا اسْـتُنْفِرْتم فَـانْفِرُوا) وروَت عائـشَة مِثَلَـه، متفـق عليـه. (خ/١٨٣٤، ٢٨٢٥ ٢٧٨٣،) (م/١٣٥٣-٤٤٥) ابـوداود (٢٤٨٠) احمـد (١/٢٢٦، ٣١٥، ٣١٦، ٣٥٥) الترمـذي (١٥٩٠) النسائي (٧/١٤٦) ابن ماجة (٢٧٧٣))). لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوەرضي الله عنه

لە پێغەمبەرەوەﷺ هاتوە، کە فەرمویەتی: پاش سەرکەوتنی مەککە کۆچکردن نییە، بەڵام جیهادو نیەتی جیهاد - ئەمێنێ —و، هەرکاتێ فەرمانتان پێدرا، کە دەرچن بۆ جیهاد، دەرچن.

## نێرراوی کـــافر دە پـــارێزرێت

٧٦١- ن /٣٤٦٣)- ((عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: جَاءَ ابْنُ النَّوَاحَةِ وَابْنُ أُثَالٍ — رَسُولا مُسَيْلَمَةَ — اِلَى النبّيِﷺ فَقَالَ لَهُمَا اَتَشْهَدَانِ أنيّ رَسُولُ اللهِ؟) قَالاَ: نَشْهَدُ اَنَّ مُسَيْلَمَة رَسُولُ اللهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (آمَنْتُ بِاللهِ وَرَسُولِهِ لَوْ كُنْتُ قَاتِلاً رَسُولاً لَقَتَلْتُكُمَا) قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَمَضَتِ السُّنَّةُ اَنَّ الرُّسُلَ لاَتُقْتَلُ) رواه احمد (١/٣٩٦، ٤٠٦، ٣٩٠) والنسائي في السنن الكبرى كما في التحفة (٩٢٨٠) وابوداود (٢٧٦٢))).

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ هاتوە، کە وتی: کوڕی نەواحەو کوڕی ئوسال دوو نێراوی موسەیلەمە بوون، هاتنە خزمەتی پێغەمبەرﷺ بەوانی فەرموی ((ئایا شایەتی ئەدەن، کە من پێغەمبەری خوامﷺ؟)).

وتیان شایەتی ئەدەین، کە موسەیلەمە پێغەمبەری خوایە.

پێغەمبەریشﷺ فەرموی: باوەڕم هەیە بەخواو بە پێغەمبەرەکەی، ئەگەر نێرراوم بکوشتبایە ئێوەم ئەکوشت.

عەبدوڵا ئەڵێ: ئیترئەمە بوە ڕێو شوێنو دەستور، کە نێرراو نەکوژرێت.

## ئەو مەرجەی کە دروستە لەگەڵ کافردا بکرێت

٧٦٢- ن /٣٤٦٧)- ((عَنْ اَنَسٍ اَنَّ قُرَيْشاً صَالَحُوا النبّيَﷺ فَاشْتَرطُوا عَلَيْهِ: اَنَّ مَنْ جَاءَ مِنْكُمْ لاَ نَرُدُّهُ عَلَيْكُمْ وَمَنْ جَاءَ مِنَّا رَدَدْتُمُوهُ عَلَيْنَا، فَقَالوُا: يَا رَسُولَ اللهِﷺ اَنَكْتُبَ هَذَا ؟! قَالَ: نَعَمْ، اِنَّهُ مَنْ ذَهَبَ مِنَّا اِلَيْهِمْ فَأَبْعَدَهُ اللهُ وَمَنْ جَاءَ مِنْهُمْ سَيَجْعَلُ اللهُ

لَهُ فَرَجاً وَمَخْرَجاً) رواه احمد (٢٦٨/٣) م (١٧٨٤))).

لە ئەنەسەوەﷺ هاتوە، کە قورەیش لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ڕێککەوتن: چەند مەرجیان لەسەر دانا لەوانە، هەرکەسێك لە ئێوە هات، بۆ لای ئێمەو هات، بێ باوەڕ بوو، ئێمە نایدەینەوە بە ئێوە، ئەگەرکەسێك لە ئێمە هاتە لای ئێوەو موسڵمان بوو، بیگەڕێننەوە بۆمان. وتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئا ئەمە بنوسین؟! فەرموی (بەڵێ)، هەرکەسێك لە ئێمە چوو بۆ ناو ئەوان، خوا دورتری بخاتەوە، هەرکەسێکیش لەوان بێت، با نەیەتو خۆی بگرێت، بەم زوانە خوا تەنگانەی لەسەر لائەباتو دەروی خێری لێ ئەکاتەوە. بەڵێ، دوو ساڵی بەسەرا چوو، سەرکەوتنی مەککە ڕویدا، ئەوانەی لەوێ بوون دەروی خێریان لێکرایەوە، ئەوانەی پاشگەزبوونەوە چەند کەسێکی کەم بوونو، بە سزای تاوانی خۆیان گەیشتن، تەواوی بەندەکانی ئەم پەیمانەم لە ژیانی پێغەمبەرداﷺ بەشریت باس کردوە، لێرەدا دوبارەی ناکەمەوە.

## ڕازی بوونی گەمارۆدراوان بە بڕیاری مسوڵمانێك

٧٦٣- ن /٣٤٧٤ ((عَنْ اَبِي سَعِيدٍ، اَنَّ اَهْلَ قُرَيْظَةَ نَزَلوُا عَلَى حُكْمِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فَأَرْسَلَ رَسُولُ الله ﷺ الَى سَعْدٍ فَأَتَاهُ عَلَى حِمَار ، فَلَمَّا دَنَا قَرِيباً مِنَ الْمَسْجِدِ، قَالَ رَسُولُ اللهﷺ (قُومُوا الَى سَيِّدكِمْ) اَوْ (خَيْرِكُمْ) فَقَعَدَ عِنْ النبِّيِّ ﷺ فَقَالَ: انَّ هَؤُلاَءِ نَزَلوُا عَلَى حُكْمِكَ) قَالَ: فَأنِي اَحْكُمُ اَنْ تُقْتَلَ مُقَاتِلَتُهُمْ وَتُسْبِي زَرَارِيهِمْ، فَقَالَ: (لَقَدْ حَكَمْتَ بِمَا حَكَمَ بِهِ الْمَلِكُ) وَفِي لَفْظٍ: قَضَيْتَ بِحُكْمِ اللهِ عَزَّ وَجَلّ) أخرجاه. البخاري (٤١٢١) ومسلم (٦٤-١٧٦٨))).

لە باوکی سەعیدەوەﷺ هاتوە، کە ئەهلی قورەیزە پاش گەمارۆدانیان بە بڕیاری سەعدی کوڕی موعاز ڕازی بوون، جا پێغەمبەری خواﷺ ناردی بەشوێن سەعددا، بە سواری کەرێك، هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ جا کاتێ لە مزگەوت نزیك کەوتەوە،

پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: هەستن بەدەم گەورەکەتانەوە، یان چاکترینتانەوە، جا لای پێغەمبەری خواﷺ دانیشتو فەرموی: (ئا ئەمانە ڕازی بون بە بڕیاری تۆ)، وتی: بەڕاستی من بڕیارم ئەوەیە، کە شەڕکەرەکانیان بکوژرێن، ژنو منداڵەکانیان بدرێنە مسوڵمانان، فەرموی (بەڕاستی بڕیارتدا بەو شێوەی، کە خودای خاوەن دەسەڵاتو بڕیاری دابوو)وە لە بێژەیەکی تردا هاتوە، کە (بڕیارتدا بە بڕیاری خوای بە دەسەڵاتو بەشکۆ).

## بەستنی پەیمان و سەندنی سەرانە(الجزية)

(٧٦٤/ ٣٤٧٦ ((عَنِ الْمُغيْرَةَ بْنِ شُعْبَةَ: اَنَّهُ قَالَ لِعَامِلِ كِسْرىَ: اَمَرَنَا نَبِيُّنَاﷺ اَنْ نُقَاتِلَكُمْ حَتَّى تَعْبُدُوا اللهَ وَحْدَهُ اَوْ تُؤَدُّوا الْجِزْيَةَ) رواه البخاري (٣١٥٩))).

لە موغەیرەی کوڕی شوعەیبەوە هاتوە، کە ئەو وتی بە ئیشکەری کیسرا، پێغەمبەرمانﷺ (فەرمانی پێداوین، شەڕتان لە گەڵ بکەین، تا خوا بەتاك و تەنهایی خودا بپەرستن، یان تا سەرانە ئەدەن. واتە ئەگەر موسڵمان بوون، ئەوە نێوانمان برایەتیەو چی بۆ ئێمەیە بۆ ئێوەیشە، چی بە زیانی ئێمە بێت، بە زیانی ئێوەیشە، ئەگەر وا نەکەن، بۆ پارێزگاری خۆتان ئەبێ سەرانە بە ئێمەبدەن، تا سنورتان پارێزراوبێ، ئەگەر ئەمەش نەکەن، لە یەکتری ئەدەین، تا یەکێکمان سەر دەکەوین.

# ڕێگریکردن لە نیشــتەجێبونی کافران لە حیجازدا

٧٦٥- ن/ ٣٤٨٩ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللهِ وَجَعُهُ يَوْمَ الْخَمِيسِ وَأَوْصَى عِنْدَ مَوْتِهِ بِثَلاثٍ (اَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَاَجِيزُوا الْوَفْدَ بِنَحْوِ مَاكُنْتُ أُجِيزُهُمْ وَنَسِيتُ الثَّالِثَةَ) اخرجاه ، البخاري (٣٠٥٣)ومسلم (١٦٣٧))).

لە عەبدولاَی کوڕی عەباسەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ ڕۆژی پێنج شەممە ئێشی زۆر توندبووە، لە کاتی سەرەمەرگدا بە سێ شت وەسیەتی کرد: ((بت پەرستان لە جەزیرەتولعەرەب دەرکەون، دیاری بدەن بە نوێنەران، وەکو من چۆن دیاریم پێداون، سێیەمیانم لە بیر چوەتەوە.

# دەست پێکردنی سەلام لە کافران و سەرەخۆشی کردنیان

٧٦٦- ن /٣٤٩٤ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (لاَ تَبْدَؤُا الْيَهُودَ وَالنَّصَارىَ بِالسَّلاَمِ وَاِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فِي طَرِيقٍ فَاضْطَرُّوهُمْ اِلَى اَضْيَقِهَا) رواه الجماعة الا النسائي وابن ماجة. خ في الادب المفرد(١١٠٣) م (٢١٦٧) احمد (٢/٢٢٥، ٢٢٦، ٤٣٦، ٤٤٤) والترمذي (١٦٠٢،١٧٠٠) وابوداود (٥٢٠٢))).

لە ئەبوهورەیرەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (پێشەکی سەلام لە جولەکەو گاور نەکەن، ئەگەر لە ڕێگادا پێیان گەیشتن، ناچاریان بکەن، کە لە تەنگترین جێگایەوە بڕوات. لە ڕاستیدا ئەمە هەمو بۆ ئەوەیە، تا چەند ڕۆژێ لە تەمەنی ماوە بیر لە بیروباوەڕی ڕاستەقینە بکاتەوە، بۆ هەمیشە خۆی لە سزا ڕزگار بکات، مەسئەلەی سەلامیش لە پێشەوە باسمان کرد، کە ئەوان دوعای خراپ ئەکەن، نیەتیان چاك نیەو موسڵمانیش مافی خۆیەتی دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانە نەکاتو، سەلامی لێ نەکات.

٧٦٧- ن /٣٤٩٩ ((عَنْ اَنَسٍ قَالَ: كَانَ غُلاَمٌ يَهُودِيٌّ يَخْدُمُ رَسُولَ اللهِﷺفَمَرِضَ فَأَتَاهُ النَّبِيُّﷺيَعُودُهُ فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِه، فَقَالَ لَهُ: (اَسْلِمْ) فَنَظَرَ اِلَى اَبِيهِ وَهُوَ عِنْدَهُ فَقَالَ لَهُ: اَطِعْ اَبَا الْقَاسِمِ. فَأَسْلَمَ، فَخَرَجَ النبِّيُّﷺوَهُوَ يَقُولُ: (الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي اَنْقَذَهُ بِي مِنَ النَّارِ) رواه احمد (٣/٢٨٠) والبخاري (١٣٥٦) وابوداود (٣٠٩٥))).

له ئەنەسەوە ﷺ هاتوه، كە وتویەتی: كوڕێكی جولەكە خزمەتی پێغەمبەری خوایﷺ ئەكرد، نەخۆش كەوت، جا پێغەمبەری خواﷺ هاتە دیدەنیو، لای سەری دانیشتو فەرموی: (موسڵمان بە)، ئەویش تەماشای باوكی كرد، كە ئەو كات لەلای بوو، باوكی گوتی: بەگوێی باوكی قاسم بكە، ئەویش موسڵمان بوو، جا پێغەمبەری خواﷺ دەرچوو و ئەو ئەیفەرمو: سوپاس بۆ ئەو خوایەی، كە بەهۆی منەوە لە ئاگر رزگاری كرد واتە سەردانی نەخۆشی جولەكەو گاور، سوننەتەو باشوایە بەرەو ئایین بانگ بكرێت، بەڵكو باوەڕ بهێنێو خۆشبەخت ببێ.

## لەدەسكەوتی مسوڵمانان تەنها بە بەرەی كوڕانی موتەلیب و كوڕانی بەنی هاشم ئەدرێ لە خزمان.

٧٦٨- ن /٣٥٠٠ ((عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ قَالَ: مَشَيْتُ اَنَا وَعُثْمَانُ اِلَى النبِّيِّﷺ فَقُلْنَا: اَعْطَيْتُ بَنِي الْمُطَّلِبِ مِنْ خُمْسِ خَيْبَر وَتَرَكْتَنَا؟! فَقَالَ: (اِنَّما بَنُو الْمُطَّلِبِ وَبَنُو هَاشِمٍ شَيْءٌ وَاحِدٌ) قَالَ جُبَيْرٌ: وَلَمْ يُقْسِمِ النبِّيُّﷺ لِبَنَي عَبْدَ شَمْسٍ وَلاَ بَنِي نَوْفَلٍ شَيْئاً) رواه احمد (٤/٨٥) والبخاري (٤٢٢٩) والنسائي (٧/١٣٠) وابن ماجة (٢٨٨١))).

له جوبەیری كوڕی موتعیمەوەﷺ هاتوە، كەوتویەتی: منو عوسمان چوین بۆلای پێغەمبەرﷺو، وتمان لە پێنج یەكی (٥/١) خەیبەر، بەشی كوڕانی موتەلیبت داوەو وازت لە ئێمە هێناوە؟! عوسمان لە كوڕانی عەبدی شەمسەو جوبەیرش لە كوڕانی نەوفەلە، عەبدو شەمسو نەوفەلو هاشمو موتەلیب، هەمویان كوڕی عەبدو مەنافن،

فەرموی: كوڕانی موتەلیبو كوڕانی هاشم یەك شتن، جوبەیر ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە كوڕانی عەبدو شەمس وكوڕی نەفەل هیچی نەدا. بەڵێ، كاتی خۆی كوڕانی موتەلیب پاڵ پشتو یارمەتی دەری كوڕانی هاشم بوون، تەنانەت كاتێ قوڕەیش پەیوەندی خۆیان لەگەڵ بەرەی هاشم دا پچڕاندوگەمارۆیان (حەساریان) خستە سەریان، بەرەی موتەلیبیش بوون بە هاوبەشی بەرەی هاشم، بەڵام بەرەی نەوفەلو بەرەی عەبدو شەمس نەهاتنە ریزیانەوە.

## دابەشكردنی بەشەكانی فەیئ بە گوێرەی خێزاندارو بێ خێزان.

٧٦٩- ن /٣٥٠٥ ((عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ، اَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ: كَانَ اِذَا اَتَاهُ الْفَيْءُ قَسَمَهُ فِي يَوْمِهِ فَأَعْطَى الأهِلَ حَظَّيْنِ وَاَعْطَى الْعَزَبَ حَظّاً) رواه احمد (٢٥/٦,٢٩) وابوداود (٢٩٥٣))).

لە عەوفی كوڕی مالیكەوە ﷺ، هاتوە كە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەركاتێ دەسكەوتی گەڕاوەی (الفیىء) بۆ بهاتایە هەر ئەو ڕۆژە دابەشی ئەكردو، بە ژندار دوو بەشو، بێ ژن یەك بەشی ئەدا. (الفیىء)، واتە ئەو ماڵەی، كە بەبێ شەڕ لەكافرانەوە دەست مسولمانان ئەكەوێت، ئایەتی (٦،٥) سوڕەتی حەشر باسی بەشبەرەكانی كردوە. (الغنیمة) ئەو ماڵەیە، كە بەشەڕ لە كافرەكانەوە دەست ئەكەوێت، كە چوار بەش لە پێنج بەش ئەدرێ بە شەڕكەرانو، بەشەكەی تری ئەدرێت بە پێنج تاقمەكەی (فەیئ)و سورەتی (الانفال) ئایەتی (٤١) مەبەستی ئەوەیە لە پاش بردنی چوار بەشەكەی، (والله اعلم).

٧٧٠- ن /٣٥١٣ ((عَنْ نَافِعٍ مَوْلَى ابْنِ عُمَرَ اَنَّ عُمَرَ كَانَ فَرَضَ لِلْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ اَرْبَعَةُ آلاف وفَرَضَ لابْنِ عُمَرَ ثَلاَثَةَ آلافٍ وَخَمْسُمائَةٍ، فَقِيلَ لَهُ: هُوَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ، فَلِمَ نَقَصْتَهُ مِنْ اَرْبَعَةِ آلافٍ؟ قَالَ: اِنَّمَا هَاجَرَ بِهِ اَبُوُهُ. يَقُولُ: لَيْسِ هُوَ كَمَنْ هَاجَرَ بِنَفْسِهِ) رواه

البخاري (٣٩١٢))). لە نافیعەوە خزمەتكاری عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە‌ﷺ هاتوە، كە: عومەر‌ﷺ لە غەنیمەت بەشی كۆچەرە پێشوەكانی، چوار هەزار ئەداو بەشی عەبدوڵای كوڕی، سێ هەزارو پێنج سەدی ئەدا

پێی وترا: ئەویش لە كۆچەرییە پێشووەكانە، بۆ بەشەكەیت كەم كردۆتەوە!؟

وتی: ئەو باوكی كۆچی پێكردوە. ئەیوت: وەكو ئەو كەسە نییە، كە خۆی كۆچی كردبێ. هەروەها لە ریوایەتێكی تری ئیمامی بوخاریدا، لە قەیسی كوڕی حازیمەوە هاتوە (٤٠٢٢) كە بەشی بەدرییەكان، واتە ئەوانەی، كە لە غەزای بەدرا بەشداریان كردبوو، پێنج هەزاری ئەداو، ئەیوت ئەوانە بەسەر پاش خۆیاندا بەرزتر ئەكەمەوە (لأُفَضِّلَنَّهُمْ عَلَى مَنْ بَعْدِهُمْ) ن/٣٥١٢.

٧٧١- ن /٣٥١٦ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (لاَسَبَقَ اِلاَّ فِي خُفٍّ اَوْ نَصْلٍ اَوْ حَافِرٍ) رواه الخمسة. رواه احمد (٤٧٤/٢) وابوداود (٢٥٧٤) والترمذي (١٧٠٠) وابن ماجة (٢٨٧٨) والنسائي (٣٥٨٧،٤٥٨٨))).

لە ئەبوهورەیرەوە‌ﷺ هاتوە، كە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا‌ﷺ فەرمویەتی: كێبەركێ لەسەر دۆڕانو بردنەوە دروست نیە، مەگەر لە سواری وشترو تیرهاویشتنو چارەویدا، لەم سێ شتانەدا بەم مەرجانەی خوارەوە دۆڕاندنو بردنەوە دروستە، چونكە شتانێكن پێویستن بۆ جیهاد لە ریگای خودا. مەرجەكان:

١- ئەو شتەی دائەنرێ ببرێتەوە، دیار بێ، (العوض المعلوم).

٢- بۆ سواری، ئەوەڵو كۆتایی شوێنەكە بزانرێت. (الابتداء والانتهاء معلومة).

٣- بە چەند پێشكەوتن دەبیاتەوەوە ئەبێ ئەوەش بزانرێت، جارێ یان دوو یان زیاتر...

٤- ئەو وڵاخەیش، كە مسابەقەی پێ ئەكەن ئەبێ، پێشەكی دیاری كرابێ.

٥- پێشكەوتن هەردوو بەسەر یەكتردا چاوەڕێ بكرێت، ئەگینا دروست نییە.

چونکە مەبەست تاقیکردنەوەیە، جا ئەگەر بزانرێت بەیەقین پـێش ئەکـەوێت، ئـەوە قومارەو، نابێ ئەنجام بدرێت.[1]

**تێبینی:** یانسیبو گۆلێنو باقی یاریەکانی تر کـە ئـەمڕۆ ئـەکرێن، بەشـێکن لـە قومارو پێویستە مسوڵمانان خۆیان لێ دور بگرن، مسوڵمان! شـەیتان دوژمنتـە وریـای خۆتبە بەفتوای بێ بنەماولاسایی کردنەوەی خەڵکانی بێ باوەڕفریو نەخوێت.

## هەڵـنان بۆ نیشـــانە شکاندن

٧٧٢- ن /٣٥٢٩ ((عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: ((وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا آسْتَطَعْتُم مِنْ قُوَّةٍ))(الانفال-٦٠)، اَلاَ اِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ اَلاَ اِنَّ الْقُوَّة الرَّمْيُ، اَلاَ اِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ) رواه احمد (١٥٦/٤،١٥٧) ومسلم (١٩١٧))).

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: گوێبیستی لە پێغەمبەری خـوا بومﷺ، ئەیفەرمو: (ئەوەی لە تواناتاندا هەیە، لەدژیان ئامادەی بکەن) سورەتی ئـەنفال ئایەتی (٦٠)، ئاگاداربن هێز لە تیر هاوێشتن دایـە، ئاگـاربن هێـز لـە تـیر هاوێـشتنە، ئاگاداربن هێز لەتیر هاوێشتنە. هەر لەمبارەوە بەهەمان دوو راویەکە ئیمـامی ئەحمـەد (١٤٦/٤،١٤٤)وە موسلم (١٩١٩) هاتوە، کە (مَنْ عُلِّمَ الرَّمْيَ ثُمَّ تَرَكَهُ فَلَيْسَ مِنَّا) هەرکەسێ فێری تیر هاویشتن بێو، پاشان وازی لێبهێنـێ، لـە ئێمـە نییـە. بـە ڕاسـتی لەمبارەیەوە دەیان فەرمودەی راستو جـوان هەیـە، ئێمـە لەبـەر کورتکردنـەوە نـەمان نوسین.[2]

٧٧٣- ن /٣٥٣٦ ((عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ اَنَّ النبَّيَّ ﷺ قَالَ: (لاَ تَتَّخِذُوا شَيْئاً فِيهِ الرُّوحُ غَرَضاً) رواه الجماعة الاّ البخاري واباداود احمد (٢٨٠/١،٢٨٥) م(١٩٥٧/٥٨) والنسائي

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٥٢٢) لە سەرچاوەی پێشوو، بکە..
(٢) تەماشای ژمارە (٣٥٢٨ تا٣٥٣٣) لە هەمان سەرچاوە، بکە.

(٢٣٩،٢٣٨/٧) والترمذي (١٤٧٥) وابن ماجة (٣١٧٨))).

له عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوەرضي الله عنه هاتوه، كه پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (ئەوەی كه گیانی تێدا بێ نەیكەن به نیشانه) له ریوایەتی تردا، نەفرەتی لەو كەسانه كردوه، كه گیاندار بكەن به نیشانه[1]، نابێ شەڕیان پێ بكرێ نابێ بخەسێنرێنو نابێ دەمو چاویان داخ بكرێت، یان بدرێت له دەمو چاویان، نابێ كەر بنرێت له ماین[2]، كه ئەبێ بەهۆی پەیدابوونی ئێستر، دروسته كێبڕكێ به پێو زۆرانبازیو یاری بەسەره نێزه بەمەرجێك له سەر بردنەوه نەبێ[3]، یاری به كۆتر چاك نییه، لەبەر فەرمودەی (شَيْطَانٌ يَتْبَعُ شَيْطَانَةً) ن/٣٥٥٣.

## قومارو یاری بەتاوڵه قەدەغەیه

٧٧٤-ن/٣٥٥٤ (( عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النبَّيِّﷺ قَالَ: (مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِه: بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى فَلْيَقُلْ: لاَ اِلَهَ اِلاّ اللهُ وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: قَالَ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ، فَلْيَتَصَدَّقْ) رواه الجماعة. احمد (٣٠٩/٢) والبخاري (٤٨٦٠) ومسلم (١٦٤٧) وابوداود (٣٢٤٧) والترمذي (١٥٤٥) والنسائي (٧/٧) وابن ماجة (٢٠٩٦))).

له ئەبوهورەیرەوەرضي الله عنه هاتوه، كه پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەركەسێك به لاتو عوزا سوێندی خوارد بازو بڵێت: هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینه نیه، جگه له خواوه، هەركەسێك به رەفیقەكەی:وەره قومارت لەگەڵدا بكەم، با چاكەیەك بكات. واته تاوانێكی كردوه بەو قسەیه، كه كردویەتی، با چاكەیەك بكات، چونكه چاكه خراپه لا ئەبات، هەر شتێك بردنەوەو دۆڕانی تێدا بێت قوماره وشەی (مَيْسِر) هەمویان ئەگرێتەوه، كەواته ئەم یاریانەی كه ئەمڕۆ ئەنجام ئەدرێن، هەر له تۆپانەوه بگره، هەتا كۆتاییان هەمویان قومارن، به داخەوه ئەمڕۆ هەزاران بەچكەی مسوڵمانان سەرگەرمی

(١) تەماشای ژماره (٣٥٣٤ تا ٣٥٣٩) بكه، له سەرچاوەی پێشوو.
(٢) تەماشای ژماره (٣٥٤٥ تا ٣٥٤٧) له هەمان سەرچاوه، بكه.
(٣) تەماشای ژماره (٣٥٤٨) له هەمان سەرچاوه، بكه.

ئەو قومارانەن، ئێمە لەسەر ئایەتی (اَعُـوذُ بِـاللهِ اَنْ اَكُـونَ مِـنَ الْجَـاهِلِينَ) لـە سـورەتی بەقەرەدا ئەو یاریانەمان باس كردون، كە دروستەو لێرە لە فەرمودەی (٧٧١) دوبـارەیی باسكراونو، لەوێش باسی یاری پیاو لەگەڵ خێزانی خۆیدا باسـكراوە هیـوادارم بەسـوود بیٚ.

٧٧٥- ن /٣٥٥٥ ((عَنْ بُرَيْدَةَ اَنَّ النبَّـيَّ ﷺ قَالَ: (مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدْشِـيرِ فَكَأَنَّمَـا صَـبَغَ يَدَهُ فِي لَحِمْ خَنْزِيـرٍ وَدَمِـهِ) رواه احمـد (٣٥٢/٥،٣٥٧،٣٦١) والبخـارى فى الادب المفـرد (١٢٧١) وابوداود (٤٩٣٩) ومسلم (٢٢٦٠) وابن ماجه (٣٧٦٣))).

لەبوریـــدەوە ﷺ هــاتوە، كــە بەڕاســــتی پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرمویەتـــی: هــەركەسێ یاری بە(نەردەشیر)بكات،وەكو ئەوەوایە، دەستی خـۆی بـە گۆشـتی بـەرازو خوێنەكەی رەنگ كردبێ واتە چۆن دەست خستنە گۆشتو خوێنی بـەراز حەڕامـە، ئـەو یارییەش قەدەغەوحەڕامە.نەرد،مورویەكە چەندنقێمی هەیە،تاوڵەش قەدەغەیەو چەندین فەرمودەی لەسەر هاتوە لەشەرحی ئەم فەرمودەو چەندین فەرمودەی تری ئەم باسە.

٧٧٦- ن /٣٥٥٩ ((عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غُنْمٍ قَالَ: حَـدَّثَنِي أَبـوُ عَـامِرٍ اَوْ اَبـوُ مَالِـكٍ الأَشْعَرِيِّ سَمِعَ النبَّـيَّ ﷺ يَقُولُ: (لِيَكُونُنَّ مِنْ أُمتِي قَوْمٌ يَسْتَحِلُّون الحِرَ وَالْحَرِيـرِ وَالْخَمْـرَ وَالْمَعَـازِفَ) رواه البخـاري (٥٥٩٠) و وصـله ابـوداود (٤٠٣٩) وابـن حبـان (٦٧٥٤) والطبراني (٣٤١٧) والبيهقي (٢٧٢/٣))).

لە عەبدورەحمانی كوڕی غونمەوە ﷺ هـاتوە، كـە وتویـەتی ئـەبو عـامر، یـان ئـەبو مالیكی ئەشعەری قسەی بۆ كردوم، كـە لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ بیـستویەتی ئەیفـەرمو: ((بەڕاستی لەناو گەلی مندا هی وا ئەبن، كە: زیناو پۆشینی هەوریشمو ئارەقو مۆسیقا حەڵاڵ ئەكەن. ڕاستت فەرمو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وا هەمویان حـەڵاڵ كـران، یـان ڕاستەوخۆ یان بەناوی ڕەنگاورەنگەوە.

يَاإِلهِي اَشْكُو اِلَيْكَ بَثِّي وَحُزْنِي مِمَا وَقَعَ لَنَا فِي هَذَا الزَّمَانِ وَافْتَحْ بَيْنَنَـا وَبَـيْنَ قَوْمِنَـا بِالْحَقِّ وَاَنْتَ خُيْرُ الْفَاتِحِينَ.

# دەف لێدانی ئافرەتان بۆ هاتنەوەی كەسێك یان لە جەژندا

٧٧٧- ن /٣٥٦٧ ((عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ فَلَمَّا انْصَرَفَ جَاءَتْ جَارِيَةٌ سَوَاءُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ إِنيِّ كُنْتُ نَذَرْتُ اِنْ رَدَّكَ اللهُ صَالِحاً اَنْ اَضْرِبَ بَيْنَ يَدَيْكَ بِالدُّفِّ وَاَتَغَنَّى. قَالَ لَهَا: (اِنْ كُنْتِ نَذَرْتِ فَاضْرِبِي وَاِلاّ فَلاَ) فَجَعَلَتْ تَضرِبُ، فَدَخَلَ أَبوُ بَكْرٍ وَهَيَ تَضرِبُ، ثُمَّ دَخَلَ عَلِيٌّ وَهَيَ تَضْرِبُ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ وَهَي تَضْرِبُ ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ، فَأَلْقَتِ الدُّفَّ تَحْتَ اسْتِهَا، ثُمَّ قَعَدَتْ عَلَيْهِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : ((اِنَّ الَّشيْطَانَ لَيَخَافُ مِنْكَ يَاعُمَرُ إِنّي كُنْتُ جَالِساً وَهَيَ تَضْرِبُ فَدَخَلَ أَبوُ بَكْرٍ وَهَيَ تَضْرِبُ، ثُمَّ دَخَلَ عَلِيٌّ وَهَيَ تَضرِبُ ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ وَهَي تَضْرِبُ ، فَلَمَّا دَخَلْتَ أَنْتَ يَاعُمَرُ اَلْقَتِ الدُّفَّ)) رواه احمد (٥/٣٥٣) والترمذي(٣٦٩٠))) .

لە بورەیدەوە ﷺ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ بۆ هەندێ لە غەزاكانی دەرچوو، كاتێ گەڕایەوە، كەنیزەكێكی ڕەش پێست هات‌و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! من لەسەر خۆمم نەزر كردوە ئەگەر خوا تۆی بەسەلامەتی گەڕاندەوە، كە لەبەردەم تۆدا دەف لێبدەم‌و گۆرانی بڵێم، فەرموی: (ئەگەر نەزرت كردوە لێیدە، ئەگینا نەخێر) ئەویش دەستی كرد بەدەف لێدان، جا ئەبوبەكر هاتە ژورەوە، ئەو هەر لێی دەدا، لەپاشان عەلی هاتە ژورەوە، ئەو هەر لێی دەدا، پاشان عوسمان هاتە ژورەوە، ئەو هەر لێی دەدا، پاشان عومەر هاتە ژورەوە دەفەكەی خستە ژێر خۆیەوە، پاشان لەسەری دانیشت پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: (ئەی عومەر! شەیتان لەتۆ دەترسێ ، ئەوانە هەرسێیان هاتن دانیشتن، ئەو هەر دەفی خۆی لێدەدا، كەچی كە تۆ هاتیت دەفەكەی فڕێدا. جا ئەمە ئەكەن بەبەڵگە لەسەر ئەوەی، كە دەف لێدان بۆشایی‌و خۆشی‌و هاتنەوەی سەفەری‌و ژن گواستنەوە دروستە، چونكە ئەگەر حەرام بوایە، پێغەمبەرﷺ ماوەی بەو ئافرەتە نەدەدا، بەڵام نەك وەكو ئەمڕۆ، كە هەرچی رادیۆو تەلەفزیۆن ئەكەیتەوە دهۆڵ‌و زوڕنایەو، بەداخەوە بێشەرمانەیش پاش قورئان، بەڵكو لەگەڵ هەندێ

زیكریشدا دەف لێدان، كە ئالێتێكی گاڵتەو گەمەیە بەكار ئەهێنرێت؟! جێگای داخە مسوڵمان ئەوەندە بێئاگابێ لە ڕەوشتی پێغەمبەرەكەیو، خۆیشی بە شوێنكەوتوی ئەو دابنێت.

## ئەو ئاژەڵە ماڵیانەی حەڵاڵن

٧٧٨- ن /٣٥٧٢ ((عَنْ جَابِرٍ: (اَنَّ النبَّـيَّﷺ نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهلِيَّـةِ وَأَذِنَ فِـي لُحُـومِ الْخِيْـلِ) رواه الجماعـة الا الترمـذی وابـن ماجـة. احمـد (٣/٣٦١،٣٨٥) البخاري (٤٢١٩) م (١٩٤١/٣٦) ابوداود (٣٧٨٨) والنسائي (٢٠١/٧))).

لە جابیرەوە ﵁ هاتوە، كە: پێغەمبەری خواﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا بەرێگری كرد لە خواردنی گۆشتی كەری ماڵی، مۆڵەتی پێدان بۆ خواردنی گۆشتی ئەسپ.

٧٧٩- ن /٣٥٧٤ ((عَنْ اَبِي مُوسَى قَالَ: (رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَأْكُلُ لَحْمَ دَجَاجٍ) رواه الجماعـة الاّ ابـاداود وابـن ماجـة. احمـد (٦/٣٤٥،٣٤٦،٣٥٣)، خ (٥٥١٠، ٥٥١٩)، م (١٦٤٩-٩) الترمذي (١٨٢٧) النسائي (٢٠٦/٧))).

لە ئەبو موساوە﵁ هاتوە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوام بینـی ﷺ گۆشـتی مریشكی ئەخوارد.

٧٨٠- ن /٣٥٨٤ ((عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: (نَهَى رَسُـولُ اللهِﷺ عَـنْ كُـلِّ ذِي نَـابٍ مِـنَ السَباعَ وَكُلِّ ذِي مَخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ)، رواه الجماعة الاّ البخاري والترمذي. احمـد (٢٨٩/١) م (١٩٣٤-١٦) ابوداود (٣٨٠٥) النسائي (٢٠٦/٧)وابن ماجه (٣٢٣٤))).

لە عەبدوڵای كوڕی عەباسەوە ﵁ هـاتوە، كـە ووتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەرگری كردوە لە خواردنی گۆشتی هـەمو دڕندەیـەك، كـە خـاوەنی كەڵبـە بـێ، -بـەو كەڵبەیەی نێچری خۆی پەك بخات-، وە هـەمو خـاوەن چـڕنوقێك لـە باڵنـدە، كـە بـەو چڕنوقانەی نێچیری خۆی پەك بخات.

## بزن مــژە حــەڵاڵە

٧٨١- ن /٣٥٩٠ ((عَنْ ابْنِ عُمَرَ: اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ سُئِلَ عَنِ الضَّبِّ؟ فَقَالَ: (لاَ آكُلُ وَلاَ أُحَرِّمُهُ) رواه الجماعة الاّ اباداود. احمد (٩/٢) م (١٩٤٣-٣٩) خ (٥٥٣٦) النسائي (١٩٧/٧) وابن ماجه (٣٢٤٢) والترمذي (١٧٩٠))).

له عەبدوڵای کوڕی عومەرەوەﷺ هاتوه، کە پێغەمبەری خواﷺ لەبارەی بزن مژەوە پرسیاری لێکرا؟

فەرموی: ((نە ئەیخۆمو، نە حەرامی ئەکەم)).

## لە بارەی کـەمـتیارو کەروێشــکەوە

٧٨٢- ن /٣٥٩٤ ((عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْـنِ اَبِـي عِمَـارَةَ قَـالَ قُلْـتُ لِجَـابِرٍ: الضَّبُعُ ، اَصَيْدُ هِيَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: آكُلُهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: اَقَالَـهُ رَسُـولُ اللهِﷺ؟ قَـالَ: نَعَمْ) رواه الخمسة. احمد (٢٩٧/٣، ٣١٨، ٣٢٢) وابوداود (٣٨٠١) النسائي (١٩١/٥)، (٢٠٠/٧) الترمذي (٨٥١) وابن ماجة (٣٠٨٥، ٣٢٣٨))).

له عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عیمارەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: بە جابیرم گوت: کەمتیار نێچیرەو راو دەکرێ؟

وتی: بەڵێ. وتم: بیخۆم؟!

وتی بەڵێ.

وتم: ئایا پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی؟!

وتی: بەڵێ.

٧٨٣- ن /٣٥٩٥)- ((عَـنْ أَنَـسٍ قَـالَ: (اَنْفَجْنَـا أَرْنَبـاً بِـمَرِّ الظَّهْـرَانِ، فَـسَعَى الْقَـوْمُ فَلَغِبُوا، وَاَدْرَكْتُها وَأَخَذْتُهَا، فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا وَبَعَثَ اِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِوَرِكِهَا

وَفَخِـذِهَا فَقَبِلَـهُ) رواه الجماعــة احمــد (١١٨/٣، ١٧١) و (خ/٢٥٧٢) و(م/٥٣/١٩٥٣) وابوداود (٣٧٩١) والترمذي (١٧٨٩) والنسائي (١٩٧/٧) وابن ماجة (٣٢٤٣))).

له ئه‌نه‌ســه‌وه‌ﷺ هــاتوه، كــه وتویــه‌تی لــه ڕێگــا لــه (مــه‌ڕو زه‌هــران) گه‌یــشتینه كه‌روێشكێك، ئه‌و كۆمه‌ڵه ، به شوێنیا ڕایكردو ماندوبوون، من پێــی گه‌یــشتمو گــرتمو هێنام بۆ باوكی ته‌لحه، ئه‌ویش سه‌ری بڕیو ڕانێكی بــه كلۆكــه‌وه نــارد بــۆ پێغه‌مبــه‌ری خواﷺ وه ئه‌ویش وه‌ریگرت.

٧٨٤- ن /٣٥٩٨ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: (نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ شُرْبِ لَبَنِ الْجَلاَلَةِ) رواه الخمــسة الا ابــن ماجــة (احمــد/٢٢٦/١، ٢٤١، ٢٩٣) ابــوداود (٣٧٨٦) والترمــذي وصححهُ (١٨٢٥) والنسائي (٢٤٠/٧))).

له عه‌بدوڵای كوڕی عه‌باسه‌وه‌ﷺ هاتوه، كه وتویه‌تی: (پێغه‌مبه‌ری خواﷺ به‌رگری كردوه، له خواردنه‌وه‌ی شیری جه‌لاله. جه‌لاله به‌و حه‌یوانه ئه‌ڵێن، كه شتی پیس بخــوات، ئه‌مه شیری ناخورێت، وه‌كو لێره‌وتراوه‌و گۆشتیشی ناخورێ[1]. سوار بونیشی خراپه، تــا پاك ئه‌بێته‌وه، ئه‌ویش به‌ئه‌وه ئه‌بێت، كه چه‌ند ڕۆژێك ببه‌سترێته‌وه، ئالفو ئــاوی پــاكی پێ بدرێت، مریشكو قازو مراویش هه‌روایه، وتراوه ماوه‌ی وشــترو مانگــا (٤٠) ڕۆژه‌و مه‌ڕو ماڵات (٧) ڕۆژه‌و مریشك سێ ڕۆژه، ئینجــا پــاك ئه‌بنــه‌وه‌و ســود لێوه‌رگرتنیــان دروسته.

---

(١) ته‌ماشای فه‌رموده‌ی (٣٥٩٩ تا ٣٦٠٠) بكه، له سه‌رچاوه‌ی پێشوو.

# هەندێك ئەزانرێت قەدەغەیە بەهۆی فرماندان بە كوشـتنیان یان قەدەغە كردنی كوشـتنیان

٧٨٥- ن /٣٦٠١ ((عَنْ عَائشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: (خَمْسٌ فَوَاسِقُ يُقْتَلْنَ فِي الحِلِّ وَالْحَرمِ: الْحَيَةُ، وَالْغُرَابُ الأَبقَعُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ، وَالْحُدَبّا) رواه احمد (٩٧/٦، ٢٠٣) و (م/١١٩٨ـ ٦٧) والنسائي (١٨٨/٥، ٢٠٨))).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشەوە ﵂ هاتوە، كـه وتویـەتی: پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((پێنج فاسق ئەكوژرێن لـه حـەرامو حەلاڵـدا، واتـه لـه دەرەوەی مەككەو لە مەككە داو ئیحرامی حەجی پۆشـیبێ یـان نـا: ئەوانـەش ئەمانـەن: مـارو قەلەباچكەو مشكو سەگی نەێن گروهـار، كـۆلارە (كۆركـۆرە). ئەمانـە هیـچكامیان گۆشتیان ناخورێت.

٧٨٦- ن /٣٦٠٥ ((عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: (نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ اَرْبَعٍ مِنَ الدَّوَابِّ: النَّمْلَةِ، وَالنَّحْلَةِ وَالْهُدْهُدِ، وَالصُّرَدِ) رواه احمد (٣٣٢/١) وابوداود (٥٢٦٧) وابن ماجة (٣٢٢٤))).

لە عەبدوڵای كوڕی عەباسەوە ﵁ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا ﷺ ڕێگـری كردوە لە كوشـتنی چـوار گیـان لەبـەر ئەوانـەش ئەمانـەن: مێرووڵـە، مـێش هـەنگ، پەپوسلێمانەو سورەد،كە چۆلەكەیەكی سەر گەورەیە. لە ریوایەتی تردا ڕێگری كـراوە لـە كوشتنی بۆقو شەم شەمەكوێرە، كـە بەیهـەقی ئـەڵێ ئـەوە قـەویترین شـتە لـە بـارەی ڕێگریەوە، كە هاتبێ، واتە فەرمودەی: (نَهَى رَسُولُ الله عَنْ قَتْلِ الضِّفْدَعِ، پێغەمبـەری خوا ﷺ ڕێگری كردوە لە كوشـتنی بـۆق.) ژمـارە (٣٦٠٦)، لـە (نیـل الاوطـار)دا.كـە ئیمـامی ئەحمـەدو ئـەبو داودو نەسـائی ریوایـەتیان كـردوە. فـەرمودەی بـۆقو شەمشەمەكوێرە، بـەیهقی بـە ژمـارەی (٣١٨/٩) هێناویـەتیو، ریوایەتەكـەی ڕاسـتە (صحیح) تەماشای شەرحی ئەو دوو فەرمودەیەی سەرەوە لە (نیل الاوطار) دا بكە.

٧٨٧- ن /٣٦٠٧ ((عَنْ اَبِي لَبَابَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَنْهَي عَنْ قَتْلِ الجِنَّانِ الَّتِي تَكُونُ فِي البُيُوتِ اِلاَّ الأَبْتَرَ وَذَا الطُّفْيَتَيْنِ فَأَنَّهُمَا اللَّذانِ يَخْطَفَانِ البَصَرَ وَيَتْبَعَانِ مَا فِي بُطُونِ النِسَاءِ) متفق عليه، وابوداود احمد (٣/٤٣٠) (خ/٣٣١١ـ ٣٣١٢) (م/٢٢٣٣ـ ١٣٦) ابوداود (٥٢٥٣، ٥٢٥٥))).

له باوکی له بابەوەﷺ هاتوه، که وتویەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوابومﷺ، کە ڕێگری ئەکرد، لە کوشتنی ئەو مارە بچکۆلانەی، کە لەناو ماڵەکاندان، بێجگە لە کوڵە مارە شینەکانو ئەو مارەی، کە دوو هێڵی سپی ڕەنگ بە سەریاندا، تا خوارەوەیان کێشراوە، کە بە تەماشا کردنیان چاو کوێر ئەکەنو، ئافرەتی حامیلە تەماشایان بکات، سکەکەی لەبار دەچێ، لە بەر ئەو دوو سیفەتەی، کە خوا بەوانی داوە. چاكوایە ماری ماڵی، تا سێ جار لەسێ ڕۆژدا تێخوڕێن، ئەگەر نەرۆیشتن جا بکوژرێن[1].

## باســـی بونی ســەگ

٧٨٨- ن /٣٦٠٩ ((عَنْ اَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (مَنِ اتَّخَذَ كَلْباً اِلاَّ كَلْبَ صَيْدٍ اَوْ زَرْعٍ اَوْ مَاشِيَةٍ انْتَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ) رواه الجماعة الا ابوداود. احمد (٢/٢٦٧) (خ/٢٣٢٢، ٣٣٢٤) (م/١٥٧٥ــ ٥٧، ٥٨). الترمذي (١٤٩٠) والنسائي (٧/١٨٩) وابن ماجة (٣٢٠٤))).

لە ئەبوهریرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (هەر کەسێ سەگێك ڕاگیر بکات، مەگەر سەگی ڕاو، یان بۆ پاسی زەراعەت، یان هی حەیوان بێت، ئەگینا هەمو ڕۆژێك، قیراتێك لە خێرو چاکەی کەم ئەکرێتەوە). قیرات بە ئەندازەی چیایەکی مام ناوەندیە.

---

(١ ) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٦٠٨) لە سەرچاوەی پێشو بکە.

٧٨٩- ن /٣٦١٣ ((عَنْ جَابِرٍ قَالَ: اَمَرَنَا رَسُولَ اللهِﷺ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ حَتَّى إِنَّ الْمَرأَةَ تَقْدِم مِنَ الْبَادِيَةِ بِكَلْبِهَا فَنَقْتُلُهُ، ثُمَّ نَهَى رَسُولُ اللهِﷺ عَنْ قَتْلِهَا، وَقَالَ: (عَلَيْكُمْ بِالأَسْوَدِ الْبَهِيمِ ذِي النُّقْطَتَيْنِ، فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ) رواه احمد (٣٣٣/٣) ومسلم (١٥٧٢ـ ٤٧) وابوداود (٢٨٤٦))).

لە جابیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێ کردین بە کوشتنی سەگەکان - تەنانەت ئافرەت لە لادێوە ئەهات سەگی لەگەڵدا بو ئەمان کوشت، لە پاشان پێغەمبەری خواﷺ رێگری، لە کوشتنیان کردو فەرموی: (پێویستە لەسەرتان سەگی زۆر رەش، کە دوو خاڵ لەسەری چاوەکانیانەوە هەیە بکوژن - چونکە بەڕاستی ئەوە شەیتانە. بەڵێ بونی سەگ، وەکو لە فەرمودەی پێشودا باسکرا، خراپەو ئەبێ بەهۆی ترسانی خەڵكو بەرگری فریشتە لە هاتنە ماڵەوە، کە چەندجار، لەچل فەرمودە قودسیەکانو گولزاری چاکان، ئاماژەمان پێکردو هەرچەندە یەکەمیان هەر لەبەر ئەو جۆرە فەرمودانە هێشتا لە چاپخانەکاندا چاوی بە ژیان نەکەوتوە؟!

٧٩٠- ن /٣٦١٥ ((عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتَمٍ قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِﷺ انّي أُرْسِلُ الْكِلاَبَ الْمُعَلَّمَةَ فَيُمْسِكْنَ عَلَيَّ، وَأذْكُرُ اسْمَ اللهِ؟ قَالَ: اذَا اَرسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُعَلَّمَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ فَكُلْ مَا أَمسَكَ عَلَيْكَ) قُلْتُ: وَانْ قَتَلْنَ؟. قَالَ: (وَانْ قَتَلْنَ، مَالَمْ يُشْرِكْهَا كَلْبٌ لَيْسَ مَعَهَا). قُلْتُ لَهُ: فإِنِّي ارْمي بِالْمعْرَاضِ الصَّيْدَ فَأَصِيدُ، قَالَ: (اذَا رَمَيْتَ بِالْمعْرَاضِ فَخَزَقَ فَكُلْهُ وَانْ اَصَابَهُ بِعَرْضِه فَلاَ تَأْكُلْهُ) وَفِي رِوَايَة: انَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: اذَا اَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَأذْكُرِ اسْمَ الله عَلَيْهِ، فَإِذَا اَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهَ حَيّاً فَاذْبَحْهُ وَانْ اَدْرَكْتَه قَدْ قُتِلَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ فَكُلْهُ فَإِنَّ اَخْذَ الْكَلْبِ ذَكَاةٌ) مُتَّفَقٌ عليه. احمد (٢٥٦/٤) (خ/٤٥٧٥) (م/١٩٢٩ـ ٢) وكذلك باللفظ الاوّل رواه ابوداود (٢٨٤٨) والترمذي (١٧٩/٧) والنسائي (١٧٩/٧) وباللفظ الثاني: ابوداود (٢٨٤٧) والنسائي (١٨٠/٧))).

لە عەدی کوڕی حاتەمەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی:وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من سەگانی ڕاوەکی ئەنێرم بە شوێن نێچیرداوبۆم ئەیگرن و ناوی خوای لە سەر ئەبەم؟

فەرموی: هەركاتێ سەگی ڕاوەكیت ڕەوانەكردو ناوی خوات لەسەر برد، ئـەوەی بـۆت ئەگرێ بیخۆ.

وتم: ئەگەر بیشی كوژن؟

فەرموی: ئەگەر بیشی كوژن بە مەرجێك، سەگێكی تـر هاوبەشـی نـەكردبن، -واتـە ئەگەر سەگێكی تر هاوبەشی كردبن و كوژرابێ مەیخۆ نەوەك ئەو سەگە كوشتبێتی.

وتم بەو: ئەگەر بڕكێك بگرمە نێچرو بیگرم؟

فەرموی: ئەگەر شتێكت بۆ نێچر فڕێداوە برینداری كرد، تا گەیشتی نێـچیرەكە مـرد — بیخۆ، ئەگەر بەپانابیدا لێیداو كوشتی، مەیخۆن، چونكە بەر (موقـوذة) ئەكـەوێت.لـە ریوایەتێكی تری ئەم فەرمودەدا هاتوە، كە ((پێغەمبـەری خـواﷺ فـەرموی هـەركاتێ سەگەكەی خۆتت نارد، ناوی خوای لەسەر ببە، جا ئەگەر شـتێكی حـەڵاڵی بـۆ گرتیـتو پێی گەیشتی بە زیندویی، سەری ببڕە، ئەگەر بە مردویی پێـی گەیـشتیت، كوشـتبوی و هیچی لێ نەخوارد بوو، ئەوە بیخۆ، چونكە گرتنی سەگەكە بە سەربڕین دائەنرێت. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، كە چ برینداری كردبێ، یان خنكانـدبێتی حەڵاڵـە ، بەمـە وشـەی (وَالْمُنْخنِقَةَ) تایبەت ئەبێ، دەركـەوت (بـسم الله) كـردن لـە كـاتی نـاردنی سـەگەكەدا پێویستە.

## ئەگـەر تیر لە نێچیر دراو گوم بوو، پاش ماوەیەك دۆزرایەوە

٧٩١- ن /٣٦٢٥ ((وَعَنْهُ اَیضاً عَنْ النبَّـيِّﷺ قَالَ: اذَا رَمَیْـتَ الـصَّیْدَ فَوَجَدْتَـهُ بَعْـدَ یَوْمِ اَوْ یَوْمَیْنِ لَیْسَ بِهِ الاّ اَثرُ سَـهْمِكَ ـ فَكُـلْ وَانْ وَقَـعَ فِـي الْمَـاءِ فَـلاَ تَأْكُـلْ) رواه احمـد (٣٧٩/٢) والبخاري (٤٥٨٤))).

هەر لەوەوە دوبارەرضي الله عنه هاتوە لە پێغەمبەرەوەﷺ، كە فەرمویەتی: هەركاتێ تیرت لە نێچرداو دوای ڕۆژێك، یان دوو ڕۆژ دیتتەوە، بێجگـە لـە جێگـە تیرەكـەی خـۆت، هـیچ

شوێنەوارێکی تری پێوە نەبو بیخۆ، ئەگەر بۆگەن نەبوبوو[١]. - ئەگەر کەوتبووە ناو ئـاو مەیخۆ. چونکە لەوانەیە بە ئاوەکە خنکابێ، هەروەها ئەگـەر لـە شـاخ کـەوتبووە خـوار ناخورێت، نەوەك بەهۆی کەوتنە خوارەوەکەی کوژرابێ‌و، بەر (وَالْمُتَرَدَّيَةُ) ئەکەوێ.

## ســەر بڕین ئەبێ تەنها بەناوی خواوە بێ، بە هەر شـتێ خوێن بڕژێنی دروسـتە.

٧٩٢- ن /٣٦٣١ ((عَنِ الأمَامِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ اَنَّهُ سَـمِعَ النبَّـيَّ ﷺ يَقُـولُ: (لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ آوى مُحْدِثاً، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَيْـهِ، وَلَعَـنَ اللهُ مَـنْ غَيَّــر تُخُـومَ الأَرْضِ) رواه احمــد(١٥٢/١-١٨٨) ومــسلم (١٩٧٨-٤٣-٤٥) والبخاري في الادب (١٧) والنسائي (٢٣٢/٧))).

له پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە ﷺ هاتوە، لە پێغەمبـەرەوە ﷺ بیـستویەتی، کە ئەیفەرمو (نەفرینی خوا لەوکەسەی کە بۆ بێجگـە لـە خـوا حـەیوان سـەر ئـەبڕێت، نەفرینی خوا لەو کەسەی، کە دەبێتە دالّدەی داهێنەر لـە ئـایین دا، نـەفرینی خـوا لـەو کەسەی، کە نەفرین ئەکات لە باوك‌و دایکی، نەفرینی خوا لە کەسەی، کە سـنوری زەوی ئەگۆڕێ.

## ئەگەر گۆشـتیان بۆت هێنا لێی مەپرسـەوە خـۆت بـسـم الله، بکـە و بیخـۆ.

٧٩٣-ن/٣٦٣٢ ((عَنْ عَائِـشَةَ، اَنَّ قَوْمـاً قَـالُوا: يَـا رَسُـولَ اللهِ ﷺ اِنَّ قَوْمـاً يَأْتُونَنَـا بِاللَّحْمِ لاَنَدْرِي اَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ اَمْ لاَ؟ فَقَـالَ (سَـمُّوا عَلَيْـهِ اَنْـتُمْ وَكلُـوا) قَالَـتْ: وَكَـانُوا

(١) تەماشای ژمارە (٣٦٢٣) لە سەرچاوەی پێشو بکە.

حَـدِيثِي عَهْـدٍ بِـالْكُفْرِ) رواه البخـاري (٢٠٥٧،٥٥٠٧) وابـوداود(٢٨٢٩) وابـن ماجـة (٣١٧٤) والنسائي (٢٣٧/٧))).

له دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە ﵄ هاتوە، كە بەڕاستی قەومێك وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! قەومێك هەن، كە گۆشتمان بۆ دێنن، نازانین ناوی خـوای لەسـەر هێنراوە، یان نەء؟

فەرموی (ئێوە ناوی خوای لەسەر ببەن‌و بیخۆن).

خاتون عائیشە ﵄ ئەڵێ ئەوانە: نزیك بوون لە كافریەتیـەوە، واتـە تـازە مـسوڵمان بوون. ئەم فەرمودەیە ئەوە ئەگەیەنێ، لە وڵاتی ئیسلامیداو لەناو گـەلێك، بـا تـازەیش مسوڵمان بوبن، لێپرسینەوە پێویـستە لەسـەر كوشـتنەوەیان‌و، چـاكوایە كـابرای بخـۆر خۆیشی (بسم الله)ی لەسەر بكات، بەم (بسم الله)ی خۆتە خـواردنی گۆشـتەكە بێترسـە. (والله اعلم).

## سـەر بڕین بە هەرچی ببێ بێجگە لە ئێسقان و ددان دروستە مادام ببێ بەهـۆی خوێن ڕژان.

٧٩٤- ن /٣٦٣٤ ((عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ: (اَنَّ ذِئْباً نَيَّبَ فِي شَاةٍ فَذَبَحُوهَا بِمرْوَةٍ، فَـرَخَّصَ لَهُمْ رَسُولُ اللّهِ ﷺ فِي أَكْلِهَا) رواه احمد(١٨٣/٥) والنسائي (٢٢٥/٧،٢٢٧) وابـن ماجـة (٣١٧٦) واخرج معناه البـذار والطبرانـي (في الاوسـط) عـن ابـن عمـر باسـناد صـحيح. البذار (كشف الاستار-١٢٢٣))).

لە زەیدی كوڕی سابتەوە ﵁ هاتوە، كە: گورگێك كەڵبەیەكیـدا لـە حـەیوانێك‌و، بـە بەردە چەخماخ سەریان بڕی‌و، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی دان بیخۆن.

٧٩٥- ن /٣٦٣٦ ((عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: قُلْتُ يَارَسُولُ الله ﷺ انَّا نَلْقِي الْعَدُوَّ غَداً وَلَيْسَ مَعْنَا مُدىً؟ فَقَالَ النبَّـيُّ ﷺ: (مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ الله عَلَيْهِ فَكُلُوا مَا لَمْ يَكُنْ سِنّاً اَوْ ظُفُراً، وَسَأَحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ، اَمَّـا الـسّنُّ فَعَظْـمٌ وَاَمَّـا الظُّفُـرُ فَمُـدىَ الْحَبَـشَةِ) رواه

الجماعة احمد (٤/١٤٠) (خ/٢٥٠٧،٥٥٠٦،٥٥٠٩) (م/١٩٦٨-٢٠-٢١) وابوداود (٢٨٢١) والترمذي (١٤١٩) والنسائي (٢٢١/٧) وابن ماجة (٣١٣٧))).

له نافيعی كوڕی خەدیجەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ! ئێمە بەیانی بە دوژمن ئەگەینو كێردمان (چەقۆ) پێ نیە ؟

پێغەمبەریﷺ فەرموی: هەر شتێ خوێن ڕەوان بكاو ناوی خوای لەسەر ببرێت، بیخۆن، جگە لە ددانو نینۆك. وا قسەی ئەویشتان بۆ ئەكەم، -ددانو نینۆك- دان چونكە ئێسقانە، -واتە نابێ بە ئێسقان حەیوان سەر ببڕێتو ددانیش هەر ئێسقانە، وە نینۆكیش -چونكە- چەقۆی حەبەشییەكانە، كافرەكانی مەبەستە، واتە لە ڕەوشتی ئەوان سود وەرنەگرن.

٧٩٦- ن /٣٦٤٤ ((عَنْ أَبِي سَعَيدٍ عَنِ النبَّـيِّﷺ أَنَّهُ قَالَ فِي الْجَـنِينِ: (ذَكَاتُـهُ ذَكَـاةُ أُمِّهِ) رواه الخمسة الاّ النسائي احمد (٣١/٣،٥٣) وابوداود (٢٧٢٧) والترمذي (١٤٧٦) وابن ماجة (٣١٩٩) حسن لغيره)).

له باوكی سەعیدەوە ﷺ هاتوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ، كە فەرمویەتی: سەبارەت بە بەچكەی ناوسكی حەیوان: سەربڕینی سەربڕینی دایكێتی. واتە ئەگەر حەیوانێكی ئاووس، سەربڕاو بەچكەكەی، تا دەرهێنانی گیانی تێدابو، ئەوە پێویستە سەر ببڕێت، ئەگەر گیانیشی تێدا نەبوو حەڵاڵە، چونكە سەربڕینی دایكی، بە سەربڕینی ئەویش دائەنرێت.

٧٩٧- ن /٣٦٤٥)- ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ، اَنَّ النبَّـيَّﷺ قَالَ: (مَا قُطِـعَ مِـنْ بَهِيمَـةٍ وَهِـيَ حَيَّةٌ ، فَمَا قُطِعَ مِنْهَا فَهُوَ مَيْتَةٌ) رواه ابن ماجة (٣٢١٦) حسن لغيره)).

له عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ئەوەی لە حەیوانێكی زیندو بكرێتەوە، بێجگە لە خوریو موو كورك، ئەوەی لێی لەحەیوانە زیندوە دەكرێتەوە، بەمردو دادەنرێت واتە ناخورێتو حەرامە، جگەلەماسی .

# دەربارەی ماسی و کوللە و گیانلەبەری ئاوی

٧٩٨- ن /٣٦٤٧ ((عَنِ ابْنِ اَوْفَى قَالَ: (غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ سَبعْ غَزْوَاتٍ نَأْكُلُ مَعَهُ الْجَرَادَ) احمد (٤/٣٨٠) (خ/٥٤٩٥) (م/١٩٥٢-٥٢) وابوداود (٣٨١٢) والترمذي (١٨٢١-١٨٢٢) رواه النسائي (٧/٢١٠))).

لە کوڕی ئەبو ئەوفاوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: حەوت غەزامان لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ کرد، کوللەمان ئەخوارد. واتە خواردنی کوللە حەلاڵە.

٧٩٩- ن /٣٦٤٨ ((عَنْ جَابِرٍ قَالَ: غَزَوْنَا جَيْش الْخَبْطِ وَاَمِيرُنَا أَبُو عُبَيْدَةَ فَجُعْنَا جُوعاً شَدِيداً، فَأَلْقَى الْبَحْرُ حُوتاً مَيِّتاً لَمْ نَرَ مِثْلَهُ يُقَالُ لَهُ: الْعَنْبَرُ، فَأَكَلْنَا مِنْهُ نِصْفَ شَهْرٍ، فَأَخَذَ أبُو عُبَيْدَةَ عَظَماً مِنْ عِظَامِه فَمَرَّ الرَّاكِبُ تَحْتَهُ، قال : فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ ذَكَرْنَا ذَلِكَ للنَّبِيِّﷺ فَقَالَ: ((كُلوُا رِزْقاً أَخْرَجَهُ اللهُ -عزّ وَجَلَّ- لَكُمْ، أَطعِمُونَا إِنْ كَانَ مَعَكُمْ)) فَأَتَاهُ بَعْضُهُمْ بِشَيْءٍ فَأَكَلَهُ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، احمد (٣/٣٠٨) (خ/٤٣٦٢،٥٤٩٣،٥٤٩٤،٤٣٦١) (م/١٩٣٥-١٨) وكذلك رواه النسائي (٧/٢٠٧))).

لە جابیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: ئێمە، کە سوپای خەبت بوین غەزامان کرد. خەبت هەڵوەریوی پەڵکی دارو درەختە، چونکە ئەوان لەو غەزادا لەبرسا ئەوانەیان ئەخوارد -وە ئەمیرمان ئەبو عوبەیدە بوو، برسیمان بوو برسیەکی زۆر، جا دەریا نەهەنگێکی فڕێدایە دەرەوە، کە وێنەی ئەوەمان - لە گەورەییدا- نەدیبوو، پێی ئەوترا (عەنبەر) جا نیومانگ لێمان خوارد ـ سێسەد کەس بووین[1]ـ ئەوەندە گەورە بو، کە ئەبو عوبەیدە ئێسقانێکی لە ئێسقانەکانی- کە پەراسویەکی بوو -دانا سوار بەژێریا هاتوچۆی دەکرد، وتی کاتێ هاتینەوە مەدینە باسی ئەومان بۆ پێغەمبەر ﷺ کرد فەرموی: ((بخۆن ڕۆزییەکە خوای بەدەسەڵاتو بەشکۆ بۆی ناردوون، ئەگەر پێتانە بەشی

---

(١) لە ژیانی پێغەمبەرداﷺ ئەمەم بە شریت باسکردوە گوێ لێگرتنی بەسودە.

ئێمەیش بدەن ، جا هەندێكیان بۆ هێناو خواردی.

٨٠٠- ن /٣٦٤٩ ((عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ اَسْلَمَ عَنْ أَبِيهِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (أُحِلَّ لَنَا مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ: فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ: فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ، وَأَمَّا الدَّمَانِ: فَالكَبِدُ وَالطِّحَالُ) رواه احمد (٩٧/٢) وابن ماجة (٣٢١٨، ٣٣١٤) والدار قطني (٢٧١/٤ـ ٢٧٢) والشافعي (٦٠٨/٢) والبهقي (٢٥٧/٩) وكذلك رواه دار قطني من رواية عبدالله بن زيد، وثقه الامام احمد، وقد صح وقفه وَهُوَ بِمَثَابَةِ الرَّفْع. لأَنَّ قَوْلَ الصَّحَابِيِّ (أُحِلَّ لَنَا كَذَا) وَ (حُرِّمَ عَلَيْنَا كَذَا) مِثْلُ قَوْلِهِ (أُمِرْنَا بِكَذَا) وَ(نُهِينَا عَنْ كَذَا))).

لە عەبدورەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەمەوە لە باوكییەوە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوەؓ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: دوو مردارەوە بوو دو خوێن بۆمان حەڵاڵكراوە بیخۆین، مرداربووەكان: ماسیو كوللەن، خوێنەكانیش، جەرگو سپڵ (فاتە ڕەش)ە.

ئەم فەرمودەیە جێگای ڕەزامەندی زۆرێك لە زانایانەو وە كاریان پێكردوە، تا ئەصحاب ریوایەتەكەی راستەو، قسەی ئەصحابەیش هەركاتێ وتی: شتمان لێ حەڵاڵ - یان حەرام كراوە - حیسابی گەیشتن بە پێغەمبەریﷺ بۆ ئەكرێت. (والله اعلم).

## مرداره‌وه‌ بوو بۆ ناچاری ڕه‌وایه‌

٨٠١- ن /٣٦٥٢ ((عَنْ أَبِي وَاقِدِ اللَّيْثِي قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ اِنَّا بِأَرْضٍ تُصِيبُنَا مَخْمَصَةٌ، فَمَا يَحِلُّ لَنَا مِنَ الْمَيْتَةَ؟ فَقَالَ: (اِذَا لَمْ تَصْطَبِحُوا وَلَمْ تَغْتَبِقُوا وَلَمْ تَحْتَفِؤوُا بِهَا بَقْلاً ـ فَشَأْنُكُمْ بِهَا) رواه احمد (٢١٨/٥) قال الهيثمي رواه الطبراني ورجاله الثقاة. وفي رواية احمد ـ انقطاع)). لە باوكی واقیدی لەیسیەوەؓ هاتوە، كە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ! ئێمە لە ناوچەیەكداین، دوچاری برسێتی ئەبین، لەمرداربوچی ئێمە

حەڵاڵە؟ فـەرموی: گـەر خـواردنی بـەیانیتان نـەبو، خـواردنی ئێوارەتـان نـەبوو، هـیچ دانەوێڵەیەکتان پێ نەبو،- بیخۆن‌و، خۆتـان لـە برسـێتی ڕزگـار بکـەن -ئـیتر خۆتـان‌و مردارۆبوو واتە حەڵاڵە بۆتان لەو کاتەدا.

## نابێ کەسـێك شـتی کەسـێك بخـوات مەگـەر خاوەنەکـەی مۆڵەتی پێ بدات.

٨٠٢- ن /٣٦٥٤ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ، اَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: (لاَ يَحْلِبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةُ أَحَدٍ الاَّ بِأذْنِـهِ اَيُحِـبُّ اَحَـدُكُمْ اَنْ تُـؤْتَى مَـشْرَبَتُهَ فَيُنْتَـشَلَ طَعَامُـهُ، وَانّمـا تُخْـزِنُ لَهُـمْ ضُـرُوعَ مَوَاشِيهِمْ اَطْعِمَتَهُمْ فَـلاَ يَحْلِـبَنَّ اَحَدٌ مَاشِـيَةَ أَحَـدٍ الاَّ بِأذْنِـهِ). رواه الجماعـة الا الترمـذي والنسائي. احمد (٢/٤، ٦) (خ/٢٤٣٥) (م/١٧٢٦ــ ١٣) ابـوداود (٢٦٢٣) وابـن ماجـة (٢٣٠٢))).

لە عـەبدوڵڵای کوڕی عـومـەرەوەرضي الله عنه هاتوە، لە پێغەمبەری خواوەﷺ کە فەرمویەتی: هیچ کەسێك حەیوانی کەسێك نەدۆشێت، مەگەر خاوەنەکەی ڕێی پێبدات، ئایا هیچکام لـە ئێـوە پێـی خۆشـە بـچنە ژووری کەلوپەلیـەوەو خواردنەکـەی ببرێـت؟ دەی گـوانی حەیوانەکانیان، بێجگە لە ژوری خواردنەکەیان شتێکی تر نیە، کەوابو بـا هـیچ کەسـێك حەیوانی کەس بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی نەدۆشێ.

## ئەوەی کە ڕێی پێدراوە بۆ ڕێبوار لە بەروبوم

٨٠٣-ن/٣٦٥٧((عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَـنِ النَّبِـيِّﷺ قَـالَ: مَـنْ دَخَـلَ حَائِطـاً، فَلْيَأكُـلْ وَلاَ يَتَّخِذْ خُبْنَةْ) رواه ابن ماجة(٢٣٠١) والترمذي(١٢٨٧) وقال: غريب لا نعرفه الا من هـذا الوجه)).لە عـەبدوڵڵای کوڕی عـومـەرەوەرضي الله عنه لەپێغەمبەرەوەﷺ هاتوە،کـە فەرمویـەتی: هەرکەسێك چووە ناو باخێکەوە بالێی بخوات، بەڵام هیچ لەگەڵ خۆیدا نەبات.

٨٠٤- ن /٣٦٥٩ ((عَنِ الْحَسنِ عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ اَنَّ النبَّيَّﷺ قَالَ: اذَا اَتَى اَحَدُكُمْ عَلَى مَاشِيَةٍ فَأنْ كَانَ فِيْهَا صَاحِبُهَا فَلَيَسْتَأْذِنَهُ، فَأنْ أذنَ لَهُ فَلْيَحْتَلبْ وَلِيَشْرَبْ وَانْ لَمْ يَكُنْ فِيْهَا اَحَدٌ فَلْيُصَوِّتْ ثَلاَثاً فَإنْ اَجَابَهُ اَحَدٌ فَلْيَسْتَأْذِنَهُ، فَأنْ لَمْ يُجِبْهُ اَحَدٌ فَلَيَحْتَلِبْ وَلْيَشْرَبْ وَلاَ يَحْمِلْ). رواه ابوداود (٢٦١٩) والترمذي (١٢٩٦) وصححه وقال ابن المديني سماع الحسن من سمرة صحيحٌ)).

لە حەسەنەوە لە سەمورەی كوڕی جوندوبەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەركاتێ هەركام لە ئێوە چووە ناو مەڕو ماڵاتێكەوە، ئەگەر خاوەنەكەی تێیدابوو، با داوای ئیزنی لێ بكات، - بۆ دۆشینیان - جا ئەگەر ڕێی دان بابیدۆشێتو بیخواتەوە، ئەگەر خاوەنەكەی تێیدا نەبوو، با سێ جار بانگی خاوەن ماڵاتەكە بكات، ئەگەر وەڵامی دایەوە، با داوای ئیزنی لێ بكات، ئەگەر هیچ كەس وەڵامی نەدایەوە، با بیدۆشێو بیخواتەوەو هەڵی نەگرێ، واتە هەر ئەوەندەی، كە لەوێ ئەیخوات بدۆشێ، ئەم دوو فەرمودەیە ئەبن بە تایبەتكەری فەرمودەی پێش خۆیان، واتە ژمارە (٨٠٢). والله اعلم.

# سـەبارەت بە میوانداری

٨٠٥- ن /٣٦٦٢ ((عَنْ أَبِي شُرَيحِ الْخُزَاعِيّ، عَنْ رَسُولِ اللهِﷺ قَالَ: مَنْ كَـانَ يُـؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفِهِ جَائِزَتَهُ) قَالوُا: وَمَا جَائِزَتُـهُ يَـا رَسُـولَ اللهِﷺ؟ قَـالَ: يَـوْمٌ وَلَيْلَةٌ وَالضِّيافَةُ ثَلاَثَةُ اَيَّامٍ، فَمَا كَانَ وَرَاء ذَلِكَ فَهُـوَ صَـدَقَةٌ، وَلاَ يَحِـلُّ لَـهُ اَنْ يَثْـوِيَ عِنْـدَهُ حَتَّى يُحْرِجَـهُ) مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ. احمـد (٣١/٤) (خ/٦٠١٩، ٦١٣٥، ٦٤٧٦) (م/٤٨ـ ١٤) وكذا رواه ابوداود (٣٧٤٨، ٣٦٧٥) والترمذي (١٩٦٧، ١٩٦٨))).

لە باوکی شورەیحی خوزاعیەوەﷺ لە پێغەمبەری خواوەﷺ هاتوە، کە فەرمویـەتی: هەرکەسێك باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێناوە، با ڕێـزی میوانەکـەیو خەڵاتەکـەی بگرێت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ خەڵاتەکەی کامەیە ؟ فەرموی: (ڕێزی تایبەتـە ڕۆژو شەوێك، میوانداری سێ ڕۆژە، پاش ئەوە چاکەیە، ڕەوانیە بۆی ئەوەندە بمێنێتـەوە، تا گوناهباری بکات، واتە ئەوەندە بمـێنێ کـابرا توانـای ڕێـز لێگـرتنی نـەبێ، چـونکە میوانەو مافی ڕێز لێگرتنی هەیە، کابرا کە نـەتوانێ توشـی گوناهــ ئـەبێتو سـەخڵەت ئەبێ.

٨٠٦- ن /٣٦٦٤ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولِ اللهِﷺ أَيُّمَـا ضَـيْفٍ نَـزَلَ بِقَـوْمٍ فَأَصْبَحَ الضَّيْفُ مَحْرُوماً فَلَهُ اَنْ يَأْخُذَ بِقَدَرِ قِرَاهُ وَلاَ حَرَجَ عَلَيْهِ) رواه احمد (٣٨٠/٢))).

لە ئەبوهریرەوەﷺ هاتوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی: هـەر میوانێك دابەزێتە لای قەومێكو ڕۆژ بکاتەوەو لە مافی میوانداری بێبـەش کرابـێ بـۆی هەیە بەئەندازەی مافی میوانداری وەرگرێت، ئەگەر بەزۆریش بـێ، لەسـەر ئـەو ئیـشەی هیچ تاوانێك نییە.

# ڕۆن ئەگـــەر شـــتی پیســی تێكــەوت

٨٠٧- ن /٣٦٦٥ ((عَنْ مَيْمُونَةَ: اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ سُئِلَ عَـنْ فَـأرَةٍ وَقَعَـتْ فِـي سَـمْن فَمَاتَتْ؟ فَقَالَ: اَلْقُوهَا وَمَاحَوْلَهَا وَكُلُوا سَمْنَكُمْ) رواه الجماعة الا مسلما وابن ماجة. احمـد (٦/٣٢٩-٣٣٠) (خ/٢٣٥-٢٣٦) وابــوداود (٣٨٤١) والترمــذي (١٧٩٨) والنــسائي (١٧٨/٧))).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون مەیمونەوە ﵂ هاتوە، لە پێغەمبەری خواوەﷺ، كـە لەبارەی مشكەوە پرسیاری لێكرا ،كە بكەوێتە ناوڕۆنەوەو بتۆپێ؟

فەرموی: مشكەكە فڕێی بدەنو چواردەوری جێگاكەیشی -فڕێ بـدەن- ڕۆنەكەشـتان بخۆن. بەڵێ ئەمــە وەختێـك ئـەبێ وای لـێ بكرێـت، كـە ڕۆنەكـە شـل نـەبو ، ئینجـا مشكەكەی تێكەوتبێ، ئەگینا ئەگەر شل بو، نابێ بخـورێ لەبـەر فـەرمودەی (وَاِنْ كَـانَ مَائِعاً فَلاَ تَقْرَبُوهُ) ئەگەر شل بوو نزیكـی نەكەونــەوە) رواه ابـوداود (٣٨٤٢) والنـسائي (١٧٨,٧).

## بەرنامــەی خواردن

٨٠٨- ن /٣٦٦٧ ((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُـولُ اللهِﷺ: (اِذَا اَكَـلَ اَحَـدُكُمْ طَعَامَـاً فَلْيَقُلْ: (بِسْمِ الله). فَأِن نَسِيَ فِي أَوَّلِه، فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللهِ اَوَّلِـهِ وَآخِـرِهِ) رواه احمـد (٢٠٧/٦، ٢٤٦، ٢٦٥) وابوداود (٣٧٦٧) والترمذي (١٨٥٨) والنـسائي في الكـبرى (٧٨/٦) رقـم (١٠١١٢))).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیـشە(﵂) هـاتوە، كـە وتویـەتی: پێغەمبــەری خواﷺ فەرمویەتی: هەر كاتێ یەكێك لـە ئێـوە خـواردنێكی خـوارد، ـ خواردنــەوەیش

هەربەم شێوەیە ـ با بڵێت (بسم الله/ بەناوی خوا)، ئەگەر لە ئەوەڵەوە لە بیری چوو، - هەر كاتێ كەوتەوە بیری - با بڵێت (بِسْمِ اللهِ اَوَّلِهِ وَآخِرِهِ / بەناوی خوا لە ئەوەڵو ئاخری).

٨٠٩- ن/ش /٣٦٦٧ ((عَنْ جَابِرٍ أَنَّهُ سَمِعَ النَبِّيَّ ﷺ يَقُولُ: (اِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ الشَّيْطَانَ لاَمَبِيتَ لَكُمْ وَلاَعَشَاءَ وَاِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ، قَالَ: الشَّيْطَانَ اَدْرَكْتُمْ الْمَبِيتَ. فَاِذَا لَمْ يَذْكُرِاللهَ عِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ: اَدْرَكْتُمْ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ) رواه الجماعة الا الترمذي. احمد(٣٨٣/٣) في الادب(١٠٩٦) (م/٢٠١٨) وابوداود (٣٧٦٥) وابن ماجة (٣٨٨٧) والنسائي في عمل اليوم والليلة (١٨٧))).

لە جابیرەوە‌ﷺ هاتوە، كە لە پێغەمبەرەوەﷺ بیستویەتی، كە ئەیفەرمو: (هەركاتێ پیاوێ، - ئافرەتیش هەروایە - چووە ماڵەوەو یادی خوای كرد، كاتی چونەوە ژورەوەو كاتی خواردن، شەیتان بە بەچكەكانی خۆی ئەڵێ: نە جێگای شەو مانەوەتان بۆ هەیەو، نە خواردن، واتە بڕۆن لێرە بێ سودە بۆتان. هەركاتێ چونە ژورەوە (بسم الله)ی نەكرد، شەیتان ئەڵێ: جێگای شەوتان دەستكەوت، ئەگەر یادی خوایشی نەكرد، واتە: (بسم الله) لە كاتی خواردن دا، ئەڵێ هەم جێگای شەوو هەم جێگای خواردنتان دەست كەوت. جا بڕواداران تەماشا بكەن چۆن پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بەم وشە بچوكو پیرۆزە، كە بە ئێمەی وتوە ــ بسم الله ــ چ تاوانبارێكمان لێ دور ئەخاتەوە. فەرمودەی دەستی ڕاستو لە لای خۆتەوە خواردنمان لە (گوڵزاری چاكان)دا باسكردوە.

٨١٠- ن /٣٦٧٢ ((عَنْ أَنَسٍ اَنَّ النَبِّيَّ ﷺ كَانَ اذَا طَعِمَ طَعَاماً لَعِقَ اَصَابِعَهُ الثَّلاثَ وَقَالَ: (اِذَا وَقَعَتْ لُقمَةُ أَحَدِكُمْ فَلْيُمِطْ عَنْهَا الأَذىَ وَلَيَأْكُلْهَا وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ) وَأَمَرَنا اَنْ نَسْلُتَ القَصْعَةَ، وَقَالَ: (إِنَّكُمْ لاَتَدْرُونَ فِي أَيِّ طَعَامِكُمْ الْبَرَكَةَ) رواه احمد (٢٩٠/١٧٧/٣) ومسلم (٢٠٣٤-١٣٦) وابوداود (٣٨٤٥) الترمذي (١٨٠٣) وصححه)). لە ئەنەسەوە‌ﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ هەركاتێ خواردنی بخواردایە سێ

پەنجەکەی ـ کە خـواردنی پـێ ئـەخوارد ــ ئەلێـسایەوەو ئەیفـەرمو (هـەرکاتێ پـاروی یەکێکتان کەوت، با هەرچی پێوەیە لای باتو بیخواتو، وازی لێنـەهێنێ بـۆ شـەیتان. هەروا فەرمانی پێ ئەکردین، کە قاپ بلێسینەوەو فەرموی: قاپ ئێـوە نـازانن لـە کـام خواردنتاندا فەڕو بەرەکەت هەیە. لەبەرئەوە فەرموی هیچی بەفیڕۆ مەدەن، نـەوەك لـەو بەشەدا فەڕو بەرەکەت هەبێت، بەم شێوەیە لە زیادە ڕەویو خۆ بەگـەورە گـرتن دورمـان ئەخاتەوە، بە داخەوە ئێستا شەربەتو شتیوایش تەواو نـاخۆنو پێیـان عەیبـە تـەواوی بکەن هەرچەندە ئەزانن، کە ئەو شـتە تـازە لـە خاوەنەکـەی چـوە بیخـۆن، یـا نـەیخۆن، جابۆچی؟!.

## دروســتە لە ماڵی خۆتدا شـت ئەگەر کەم بوو بەســـەر خـۆت و میوان دا دابەش بکەیت.

٨١١- ن /٣٦٧٤ ((عَنْ جَابِرٍ اَنَّ رَسُولَ اللّهِﷺ اَتَى بَعْضَ حُجَرِ نِسَائِه، فَدَخَلَ، ثُمَّ أَذِنَ لِي فَدَخَلْتُ، فَقَالَ: (هَلْ مِنْ غَدَاءٍ؟) فَقَالُوا نَعَمْ، فَأُتِىَ بِثَلاثَة أَقْرِصَةٍ فَأَخَذَ رَسُولُ اللّهِﷺ قُرْصاً فَوَضَعَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَخَذَ قُرْصاً آخَرَ فَوَضَعَهُ بَيْنَ يَدَيَّ، ثُمَّ أَخَذَ الثَّالِثَ فَكَسَر بِاثْنَتَيْنِ فَجَعَلَ نِصْفَهُ بَيْنَ يَدَيْه وَنِصْفَهُ بَيْنَ يَدَيَّ،ثُمَّ قَالَ: (هَلْ مِنْ أُدْمٍ؟)قَالُوا: لاَ،اِلاَّ شَيْءٌ مِنْ خَلٍّ ، قَالَ:(هَاتُوهُ) فَنِعْمَ الأُدْمُ هُوَ) رواه احمد(٣٧٩/٣) ومسلم(٢٠٥٢-١٦٩))).

لە جابیرەوەؓ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ هاتە ژوری یەکێ لە خێزانەکانیـەوەو چووە ژورەوە، لـە پاشـان مـاوەی پێـدام منـیش چـوەمە ژورەوە، فـەرموی: (خـواردنی بەیانیمان هیچ هەیە؟).

وتیان: بەڵێ.

جا سێ کولێرەیان هێناو پێغەمبەری خواﷺ دەسـتی بـرد یـەکێکیانی خـستە بـەر دەستی خۆیو یەکێکیانی تری خستە بەر دەستی منو لە پاشان سێیەمیانی لەت کـرد، نیوەی لەبەردەستی خۆی داناوو نیوەکەی تری خستە بەر دەستی من، لە پاشان فەرموی:

ئایا پێخۆر هه‌یه‌؟

وتیان: نه‌خێر، ته‌نها كه‌مێك سركه‌.

فه‌رموی: (بیهێنن) جا فه‌رموی ئه‌وه‌ پێخۆرێكی چاكه‌.

## شــه‌و پێش خه‌وتن ئه‌گه‌ر ده‌ست چه‌وربو بشــۆرێت

٨١٢- ن /٣٦٨٠ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَـالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (مَنْ بَاتَ وَفِي يَدِهِ (رِيحُ) غَمَـرٍ وَلَـمْ يَغْـسِلْهُ فَأَصَـابَهُ شَـيءٌ فَـلاَ يَلُـومَنَّ الاَّ نَفْـسَهُ) رواه الجماعــة الا مــسلماً. احمد(٢/٢٣٦،٥٣٧) في الادب (١٢٢٠) وابوداود(٣٨٥٢) والترمذی (١٨٥٩) والنـسائي (٢/٣٤٤) وابن ماجة (٣٢٩٧))).

له‌ ئه‌بوهوره‌یره‌وه‌ﷺ هاتوه‌، كه‌ وتویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خواﷺ فه‌رمویــه‌تی: كه‌ســێ شه‌و بخه‌وێت‌و به‌ده‌ستییه‌وه‌ چه‌وری نان خواردن هــه‌بێت‌و نه‌یــشۆردبێ، جـا هه‌رچـی بــه‌ سه‌رهات، با ته‌نها سه‌رزه‌نشتی خۆی بكات.

## دوعای پاش نان خــواردن

٨١٣- ن /٣٦٨١ ((عَنْ أَبِي اَمَامَةَ اَنَّ النبَّـيَّﷺ كَانَ اذَا رَفَعَ مَائدَتَـهُ قَـالَ: (الْحَمْـدُ للهِ كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ غَيْرَ مَكفِّيٍّ وَلاَمُوَدَّعٍ وَلاَمُسْتَغْنىً عَنْهُ رَبَّنَا) رواه الجماعــة الا مسلماًو النـسائي. احمـد (٥/٢٥٢) (خ/٥٤٥٨) وابــوداود (٣٨٤٩) والترمـذي (٣٤٥٨) وابن ماجة (٣٢٨٤))).

له‌ ئه‌بو ئه‌مامه‌وه‌ﷺ هاتوه‌، كــه‌ پێغه‌مبــه‌رﷺ هــه‌ركاتێ ســفره‌كه‌ی هه‌ڵئــه‌گرت، ئه‌یفه‌رمو: سوپاس بۆ خوا، سوپاسێكی زۆرو پاك‌و به‌رێز، ئه‌مــه‌ بــه‌س نــه‌بێ، - بــه‌ڵكو هه‌م بۆمان بێت — كۆتایی نه‌بێ، بێ‌نیاز نه‌بین لێی، - ئــه‌ی پــه‌روه‌ردگارمان. وه‌ چــه‌ند دوعایه‌كی تریش له‌مباره‌وه‌ هاتون[1].

---

(١)بۆ زیاتر شاره‌زابون، ته‌ماشای ژماره‌(٣٦٨١ تا٣٦٨٤)و شه‌رحه‌كانیان له‌سه‌رچاوه‌ی پێشو بكه‌.

# باسـی مەی

٨١٤- ن /٣٦٨٥ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: (مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا حُرِمَهَا فِي الآخَرِةِ) رواه الجماعة الاّ ان الترمذي روى بنحوه. احمد (٢٨،٢١،١٩/٢) (خ/٥٥٧٥) م (٣-٢٠٠٣-٧٨،٧٧،٧٦) وابوداود (٣٦٧٩) والترمذي (١٨٦١) والنسائي (٣١٧/٨) وابن ماجة (٣٣٧٣))).

لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: هەركەسێك لەدنیا ئارەق بخواتەوەو لە پاشان تەوبە نەكات ، - لەڕۆژی دوایی لێی بێ بەش ئەكرێت. جا یان نایخاتە بەهەشتەوە، ئەگەر بە حەڵاڵی دانابێ - یان لە بەهەشتدا پێی نادرێت والله اعلم.

٨١٥- ن /٣٦٩٨ ((وَعَنْهُ اَنَّ النبَّيَّﷺ قَالَ: (كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ) رواه الجماعة الاّ البخاري وابن ماجة احمد (١٦/٢) م(٣-٢٠٠٣-٧٤) وابوداود (٣٦٧٩) والترمذي (١٨٦١) والنسائي (٢٩٦/٨))).

هەر لەوەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەمو سەرخۆشكەرێك عارەقە،وە هەمو سەرخۆشكەریش حەڕامە، لەبارەی عارەقەوە فەرمودە زۆرە، بەمەی خوارەوە كۆتایی پێ دێنین.

٨١٦- ن /٣٧٠٤ ((عَنْ عَائشَةَ قَالَتْ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ وَمَا أَسْكَرَ الْفَرَقُ مِنْهُ فَمِلْءُ الْكَفِّ مِنْهُ حَرَامٌ) رواه احمد (١٣١،٧٢،٧١/٦) وابوداود (٣٦٨٧) والترمذي (١٨٦٦) وقال حديث حسن)).

لە دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە (رضي الله عنها) هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەرشتێك سەرخۆشكەر بێ حەڕامە، ئەوەی، كە گۆزەیەكی سەرخۆش بكات،واتە ئەگەر كابرایەك گۆزەیەكی لێ بخوات، ئینجا سەرخۆشی بكات، پڕی گولمێكیش حەڕامە.

# ناوه‌ڕۆك حســابه‌ نه‌ك ناو

٨١٧- ن /٣٧١٢ ((عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ عَنْ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِـيِّ ﷺ قَـالَ: (يَـشْرَبُ طَائِفَـةٌ مِـنْ أُمَّتِـي الْخَمْـرَ وَيُـسَمُّونَهَا بِغَيْـرِ اسْـمِهَا) رواه احمـد (٢٣٧/٤) والنـسائي (٣١٢/٨))).

له‌ كـوڕی موحـه‌یریزه‌وه‌ رضي الله عنه لـه‌ پیاوێـك لـه‌ یـارانی پێغه‌مبـه‌ره‌وه‌ ﷺ هـاتوه‌، كـه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمویه‌تی: به‌شێك له‌ گه‌له‌كه‌ی من عاره‌ق ئه‌خواتـه‌وه‌و به‌غـه‌یری نـاوی خۆی ناوی ئه‌به‌ن. ڕاستت فه‌رموو ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری ئازیز ﷺ ئێستا ئه‌یخۆنه‌وه‌و خۆیان به‌ موسوڵمان ئه‌زانن‌و ناویان ناوه‌ (مه‌شروباتی رۆحی، ئاو جۆی ئیسلامیو...هتد).

# ئاو خواردنه‌وه‌ له‌ هه‌مو كاسه‌یه‌ك دروسته‌ بێجگه‌ له‌ زێڕو زیو

٨١٨- ن /٣٧٢٤ ((عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنِ الأشْرِبَةِ اِلاَّ فِـي ظُـرُوفِ الأَدَمِ فَاشْـرِبُوهُ فِـي كُـلِّ وِعَـاءٍ، غَيْـرَ اَلاَّ تَـشْرَبُوا مُـسْكِراً) رواه احمـد (٣٥٠/٥، ٣٥٥، ٣٥٦) ومسلم (٩٧٧-٦٥) والنسائي (٣/٨) وابوداود (٣٦٩٨))).

له‌ بوره‌یده‌وه‌ رضي الله عنه هاتوه‌، كه‌ وتویه‌تی، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمویه‌تی: مـن ڕێگـریم له‌ ئێوه‌ كردبو، كه‌ ئاو بخۆنه‌وه‌ مه‌گه‌ر له‌ كاسه‌ی چـه‌رمدا، ئێـستا -بـخۆن لـه‌ هـه‌مو كاسه‌یه‌كدا - بێجگه‌ له‌ كاسه‌ی زێڕوزیو[1] -به‌ڵام- سه‌رخۆشكه‌ر نه‌خۆنه‌وه‌.

---

١) وه‌كو له‌ فه‌رموده‌ی به‌رائی كوڕی عازبدا هاتوه‌ (... وَعَنِ الشُّرْبِ بالفضة- وه‌ له‌ خواردنه‌وه‌ی كاسه‌ی زیو )، كه‌ ئیمامی موسلیم ریوایه‌تی كردوه‌.

# تێكەڵاو كردنی خورما و مێوژ هەر جۆرێكی تر

٨١٩- ن /٣٧٢٤ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللهِﷺ: (لاَ تَنْبِذُوا التَّمْرَ وَالزَّبِيبَ جَمِيعاً وَلاَ تَنْبِذُوا التَّمْرَ وَالْبُسْرَ جَمِيعاً، وَانْبِذوُا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُنَّ وَحْدَهُ) رواه احمد (٢/٤٤٥/٥٢٦) ومسلم (١٩٨٩-٢٦) والنسائي (٨/٢٩٣) وابن ماجة (٣٣٩٦))).

له ئەبوهورەیرەوە‌ﷺ هاتوه، كه وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: ئاوی خورماو مێووژ بەیەكەوە نەگرن، ئاوی خورماو خورمای كاڵ بەیەكەوە نەگرن -(بوسر) پێش ئەوەیە كە ببێ بە روتەبو لە پاش روتەب خورمایە - هەمو یەكێك لەوانە بەتەنها ئاوی بگرن، لەمبارەیەوە دەیان فەرمودەی تر هەیە، كە زۆر ڕاست یان جوانن، چونكە زوو ئەبن بە (شەراب)، بەلاٌم ئەگەر زیاتر لە دوو ڕۆژی نەخایەند ئەخورا قەیناكە بەیەكەوە ئاویان بگیرێت، لەبەر ئەم فەرمودەی خوارەوە.

٨٢٠- ن /٣٧٣٥ ((عَنْ عَائشَةَ قَالَتْ: كُنَا نَنْبُذُ لِرَسُولِ اللهِﷺ فِي سِقَاءٍ فَنَأْخُذُ قَبْضَةً مِنْ تَمْرٍ وَقَبْضَةً مِنْ زَبِيبٍ فَنَطْرَحُهُمَا، ثُمَّ نَصُبُّ عَلَيْهِ الْمَاءَ فَنَنْبُذُهُ غُدْوَةً فَيَشْرُبُهُ عَشِيَّةً وَنَنْبُذُهُ عَشِيَّةَ فَيَشْرُبُهُ غُدْوَةَ) رواه ابن ماجة ورجاله صحيح (٣٣٩٨) كذا رواه الامام احمد (٦/٤٦))).

له دایكی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە(ﷺ) هاتوه، كه وتویەتی: (ئێمە ئاومان لە كوندەدا ئەگرت ، مشتێ خورماو مشتێ مێوژمان فڕێ ئەدایە ناویەوە، لەپاشدا ئاومان ئەكرد بەسەریاو بەیانی -بەوشێوەیە- ئاومان ئەگرت، ئێوارە ئەیخوارد،وە ئێوارە - بەهەمان شێوە- ئاومان ئەگرتو بەیانیان ئەیخوارد، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە تێكەڵاوەكە خۆی قەدەغە نییە، مانەوەو بوونی بەسەرخۆشكەر خراپە[1].والله اعلم.

(١)بۆزیاتر شارەزابونی ئەم باسە تەماشەی ژمارەی(٣٧٤٠ تا ٣٧٤٣) لەسەرچاوەی پێشو، بكە.

# شێوازی ئاو خواردنەوە

٨٢١- ن /٣٧٤٥ ((عَنْ أَبي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (إذَا شَرِبَ اَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ) (م/٢٦٧-٦٣،٦٥) والنسائي (٤٣/١) والترمذي (١٨٨٩))).

لە باوکی قەتادەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺفەرمویەتی: (هەرکاتێ هەر یەك لە ئێوە ئاوی خواردەوە، با هەناسەی نەکاتەوە ناو ئاوەکە. خواردنەوە بەسێ جار سونەتە.

لەبەر فەرمودەی (كَانَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ ثَلاَثاً) متفق عليه. پێغەمبەرﷺ بە سێ جار ئاوی ئەخواردەوە، هەناسەی ئەدا پاش هەمو بەشێك لە خواردنەوەکە.وە فەرمودەی تر لەمبارەوە زۆرە.

٨٢٢- ن /٣٧٥٠ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لاَيَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِماً، فَمَنْ نَسِي فَلْيَسْتَقِئْ)). رواه مسلم.

لە ئەبوهورەیرەوەرضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: با هیچکام لە ئێوە بە پێوە ئاو نەخواتەوە، جا ئەگەر لە بیری چوو، واتە بە پێوە ئاوی خواردەوە، با بڕشێتەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر خراپی ئاو خواردن بە پێوە، بەڵام حەرام نییە، چونکە پێغەمبەرﷺ بە پێوە ئاوی زەمزەمی خواردوەتەوە، ئیمامی عەلیشرضي الله عنه بە پێوە ئاوی خواردوەو وتویەتی: پێغەمبەرمﷺ بینی وەکو منی کردوە،واتە بە پێوە ئاوی خواردۆتەوە. والله اعلم.

٨٢٣- ن /٣٧٥٥ ((وَعَنْهُ اَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ: (نَهَى اَنْ يُشْرَبَ مِنْ فِي السِّقَاءِ) رواه احمد (٣٢٧،٢٤٧،٣٥٣/٢) والبخاري (٥٦٢٨،٥٢٥٧) وابن ماجة (٣٤٢٠))).

هەر لەوەوە هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ بەرگری کردوە لە ئاو خواردنەوە لە دەمی کوندەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەرنادروستی ئەو جۆرە ئاوخواردنەوە، چونکە لەوانەیە

شتی تێدابێ‌و دوچاری ئازاری بکات، من بە چاوی خۆم ئەمەم دیوە، کە بەهۆی ئەو جۆرە ئاو خواردنانەوە، زەرو (زالو) چووەتە قورگی دوو کەسەوە، پاش ئێش‌و ئازاری زۆر، من هەستم پێ کردوە، سوپاس بۆ خوا رزگارم کردن، کە یەکێکیان دایکی خۆم بوو، خوا لێی خۆش بێت‌و گەردنیشی لە هەمو شت بەو هۆیەوە ئازاد کردم، ئەویتریان خزمێکی تری خۆم بو بەناوی عوسمان قادر، کە نەماوە خوا لێی خۆشبێ. بەلاّم ئەو جۆرەیش حەرام نییە، چونکە پێغەمبەری خواﷺ لە مالّی ئومو سولەیم دا لە دەمی کونەوە بە پێوە ئاوی خواردوەتەوە، جا بۆ شارەزایی زیاتر تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٧٤٨ تا ٣٧٥٨) بکە لە (نیل الاوطار)دا.

## دەم شۆردن لە پاش شیر خواردن

٨٢٤- ن /٣٧٥٩ ((عَنْ ابْنِ عَبَاسٍ، اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ شَرِبَ لَبَناً فَمَضْمَضَ وَقَالَ: (إِنَّ لَهُ دَسَماً) رواه الجماعة احمد (٢٢٣/١، ٢٢٧، ٣٢٩) (خ/٢١١، ٥٦٠٩) (م/٣٥٨-٩٥) وابوداود(١٩٦)والترمذي (٨٩) والنسائي (١٠٩/١) وابن ماجة (٤٩٨))).

لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوەؓ هاتوە، کە پێغەمبەری خواﷺ شیرێکی خواردەوەو ئاوی گێڕا بەدەمیاو فەرموی: (بە ڕاستی ئەو چەورایی هەیە). هەر بەم شێوەیە چاك وایە، مرۆڤ هەر شتێکی چەوری خوارد، دەمی بشۆرێت.

## دروستە لە ناو کۆڕێکدا خواردنەوەیەك بدرێ بە کەسێك و بیخواتەوە و پاشان بۆ لای ڕاست.

٨٢٥- ن /٣٧٦٠ ((عَنْ أَنَسٍ اَنَّ النَبَّيَّﷺ أُتِيَ بِلَبَنٍ قَدْ شِيبَ بِمَاءٍ وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ وَعَنْ يَسَارِهِ اَبُو بَكْرٍ فَشَرِبَ ثُمَّ اَعْطَى الأَعْرَابِيَّ وَقَالَ: (الأَيْمَنُ فالأَيْمَنُ فالأَيْمَنُ) رواه الجماعة الا النسائي. احمد (١١٣/٣) (خ/٥٦١٩) (م/٢٠٢٩-١٢٥، ١٢٤) وابوداود (٣٧٢٦) والترمذي (١٨٩٣) وابن ماجة (٣٤٢٥))). لە ئەنەسەوە ؓ هاتوە، کە

شیرێك ئاوی تێکرا بوو بۆ پێغەمبەر هێنرابو، کە لە لای ڕاستی عەرەبێکی دەشتەکی دانیشت بوو، لای چەپیەوەش ئەبوبەکر بو ﷺ جا پێغەمبەری خوا ﷺ - شیرەکەی خواردەوە- ئەوەی، کە لێی مایەوە دای بە عەرەبەکەو فەرموی: لە ڕاستەوە لە ڕاستەوە دەست پێبکەن. باش وایە ئەو کەسەی ئاو ئەدات بە خەڵك، خۆی پاش ئەوان بخوات. فەرمودەش لەمبارەوە هەیە لەوانە: (اِنَّ سَاقِي الْقَوْمِ آخِرُهُمْ) رواه مسلم (٦٨١)، ئەو کەسەی ئاوی خواردنەوە دەداتە چەند کەسێك، خۆی لەدوای ئەوانەوە دەیخواتەوە.

## سەبارەت بە نەخۆشی و چارەسەر کردنی

٨٢٦- ن /٣٧٦٣ ((عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ رَسُولُ الله، اَنَتَدَاوَى؟ قَالَ: نَعَمْ، فَإِنّ اللهَ لَمْ يُنْزِلْ دَاءً الاّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً، عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ) رواه احمد(٤/٢٧٨))).

لە ئوسامەی کوڕی شەریکەوە ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئێمە تیماری خۆمان بکەین؟

فەرموی: بەڵێ، بە ڕاستی خوا هیچ نەخۆشییەك ڕەوانە ناکات، هەتا چارەسەرەکەیشی بۆ ڕەوانە نەکات، لەبێژی تردا هاتوە، کە فەرمویەتی (تَدَاوَوْا عِبادَ الله/ ئەی بەندەکانی خوا تیماری خۆتان بکەن). تورمزی (٢٠٣٨).

واتە: فەرمانی داوە بە تیمارکردنو چارەسەری نەخۆشی، بەڵام ئەبێ بزانێ ئەو چارەسەرەیانە هۆو کەرەسەن بۆ لابردنی نەخۆشی، تەنها خوا خۆی شیفا ئەدات. لێرەیش فەرموی: هەندێ ئەیزانن هەم نەخۆشییەکەو، هەم چارەسەرەکەیو، هەندێکی نایزانێ، جا ئەوەی زانی بەیارمەتی خوا شیفای بۆ دێتو، ئەوەش نەیزانی ئاشکرایە ئارەزوی خوا لە سەر ئەوەیەو نەخۆشییەکەی چارەسەر نابێ، فەرمودەی (٧٠) هەزار بەبێ حیساب ئەچنە بەهەشتەوە، کە دژی چارەسەر نییە بە شتی ڕەوا، ئاشکرایە پشت بەستنی تەواو وا لە مرۆڤ ئەکات، کە چارەسەر پشت گوێ بخات، هەر چاوەڕوانی شیفا لە خوا بکات.

# چارەسەر بە شتی حەڕام دروست نییە

٨٢٧- ن /٣٧٧٠ ((عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ، اَنَّ طَارِقَ بْنِ سُوَيَدَ الْجعْفِيِّ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْخَمْرِ؟ فَنَهَاهُ عَنْهَا فَقَالَ: إِنَّمَا أَصْنَعُهَا لِلدَّوَاءِ؟ قَالَ: (إِنَّهُ لَيْسِ بِدَوَاءٍ وَلَكِنَّه دَاءٌ) احمد (٣١٧،٣١١/٤) ومسلم (١٩٨٤-١٢) والترمذي(٢٠٤٦) وابوداود(٣٨٧٣))).

له وائیلی کوڕی حوجرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە تاریقی کوڕی سوەیدی جەعفی لەبارەی عارەقەوە پرسیاری لە پێغەمبەرکرد ﷺ، ئەویش بەرێگری کرد، وتی: دروستکردنەکەم تەنها بۆ دەرمانە؟

فەرموی: (ئەوە دەرمان نیە، بەڵکو ئەوە دەردە). واتە نابێ بە عارەق چارەسەری نەخۆشی بکرێت، چونکە هەر خۆی نەخۆشییەو لە هەمو نەخۆشییەکانی تر خراپترە، یاخوا تەنها لە بەهەشتدا بیخۆین. لە دنیا دەمو سکمان لێی پاك بێ.

٨٢٨- ن /٣٧٧٢ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الدَّوَاءِ الْخَبِيثِ يَعْنِي السُّمَّ) رواه الخمسة الا النسائي. احمد (٤٧٨،٤٤٦،٣٠٥/٢) وابوداود (٣٨٧٠) والترمذي (٢٠٤٥) وابن ماجة (٣٤٥٩))).

له ئەبو هورەیرە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرێگری کردوە لە دەرمانی پیس مەبەستی ژهرە بەڵێ، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ ڕێی داوە، کە میزی وشتر بۆ دەرمان بخورێت، ئەگەر بڵێین پاکە وەکو رای هێندێ زانایان ئەوە بەڵگەیە لەسەرئەوەی، کە میزو ڕیخ و قشپلی حەیوانی گۆشت حەڵاڵ پاکە، ئەگەر بڵێین پیسە، ئەوە ئەبێ بەتایبەتکەری ئەم فەرمودەیە، کە مانامان کرد، والله أعلم.

٨٢٩- ن /٣٧٧٩ ((عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ خَيْرٌ، فَفِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ اَوْ شَرْبَةِ عَسَلٍ أَوْ لَذْعَةٍ بِنَارٍ تُوافِقُ الدَّاءَ وَمَا أُحِبّ اَنْ أَكْتَوِي) متفق عليه. احمد (٣٤٣/٣) (خ/ ٥٦٨٣، ٥٧٠٢، ٥٧٠٤)، (م/٢٢٠٥/٧١))).

له جابیرەوەﷺ هاتوه، كه وتویەتی: له پێغەمبەری خواوه بیستم ﷺ كه ئەیفەرمو: ئەگەر له شتێ له دەرمانەكانتاندا فەرو بەرەكەت هەبێ، ئەوه له كەڵـه شـاخگرتنو لـه خواردنەوەیەكی هەنگوینو داخكردنێكی ئاگردا هەیە، كه هەڵكـەوێ لـه نەخۆشـیەكەوه من پێم خۆش نیه خۆم داخ بكەم، له ڕیوایەتی تـردا بـەرگری لـه داخ كـردن كـردوه[1]، هەندێ كەسو له هەندێ كاتدا ڕێی پێداوه وەكو نـاردنی دكتـۆر بـۆلای ئوبـەیی كـوڕی كەعب پارچه ڕەگێكی لـێ بڕیو له پاشان داخی كرد[2]، سـەعیدی كـوڕی مەعازیـشی ئەو دەمارەی كه بڕا بوو دوجار داخ كرد[3]. واته ئەگەر پێویـستی كـرد لەسـەر بڕیـاری دكتۆری شارەزاو مسولمان داخ كردن قەیناكه.

## دەربارەی نوشـتەو مورووی سـەوز و شـتی تر.

٨٣٠- ن /٣٧٨٦ ((عَنِ ابْـنِ مَـسْعُودٍ قَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللهِﷺ يَقُـولُ: (اِنَّ الرُّقَـى وَالَّتمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ) رواه احمد (١/٣٨١) وابوداود (٣٨٨٣) وابن ماجة (٣٥٣٠))).

له عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودەوەﷺ هاتوه، كه وتویەتی: نوشته، هەڵواسینی مـروی - سەوز بۆ چاوەزار -وه بەكارهێنانی شێوەی جادوی بۆ خۆشەویستكردنی ئافرەت لەلای مێردی، شیركنو هەڵگریان تاوانباره.

٨٣١- ن /٣٧٩١ ((عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا نَرْقَى فِي الْجَاهِلِيَّـةِ، فَقُلْنَـا يَارَسُـولَ اللهِ ﷺ، كَيْفَ تَرىَ فِي ذَلِكَ؟ فَقَالَ: (اعْرِضُوا عَلَيَّ رُقاكُمْ، لاَ بَأْسَ بِالرُّقَى مَا لَمْ يَكُنْ فِيْهِ شِرْكٌ) رواه مسلم (٢٢٠٠ـ ٦٤) وابوداود (٣٨٨٦))). له عـەوفی كـوڕی مالیكـەوه ﷺ هاتوه، كه وتویەتی: ئێمه له سەردەمی نەفامیدا نوشـتەمان ئـەكرد، لەبەرئـەوه وتمـان:

(١) تەماشای ژماره (٣٧٧٧ تا ٣٧٧٨) له سەرچاوەی پێشوو، بكه.
(٢)تەماشەی ژماره (٣٧٧٣) له سەرچاوەی پێشو، بكه.
(٣) تەماشای ژماره (٣٧٧٤) له سەرچاوەی پێشو، بكه.

ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوە چۆن تەماشا ئەکەیت؟

فەرموی: نوشتەکانتانم پیشاندەن، نوشتە ئەگەر شیرکی تێدا نەبێ قەیناکات واتە داواو پاڕانەوەی لە خوا زیاتری تێدا نەبێ، چونکە هەر خۆی ئەتوانێ شیفای نەخۆش بدات، ئەگەر داواکردنی بێجگە لە خوای تێدا بوو، یان بە وشەیەك بو، کە مانای نەئەزانرا دروست نیە، پێویستە ئەوەش بزانین ڕێگای چارەسەری نەخۆش بە دوو جۆر ئەبێ، یان بە ڕۆحی، کە تەنها بە قورئانو فەرمودە بە نرخەکانی پێغەمبەروﷺ پاڕانەوەی مرۆڤە زیندوەکان بۆ یەکتر، ئەو قورئانو نزایانەی پێغەمبەرﷺ بەسەر نەخۆشەکەدا، یان شتێ کە نەخۆشەکە بە خواردنی سودی لێوەرگرێت، ئەخوێنرێت ئیتر بۆ نوسین لە کاغەزو هەڵگرتنی هیچ بەڵگەیەکی ڕاستو دروستمان نیە، بەڵام ئەگەر بۆ کەسێکی منداڵ یان کەسێ نەتوانێ فێری ببێ، ئەگەر بنوسرێت بۆی، چونکە زەرورەتە دروستە، بەڵام هەرکەسێ هەستێ هەندێ ئایەت بۆ بابای نەخۆش، کە خۆی ئەتوانێ بیانخوێنێ، بنوسێتو بڵێ بە خۆتیەوە هەڵواسە، شتێکی خراپەو بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە بردنی ئایەتی قورئان بۆ سەر پێشاو بە لەشی پیسەوە نەوەك دروست نیە، بەڵکو جێگای مەترسیە بۆ ئیمان. چارەسەری دووهەم بە شتە مادەکانە، ئەمانە هەر پیسو قەدەغە نەبن بەکارهێنانیان بەو مەرجە، کە لە کەسێکەوە وەری گرن، کە جێگای باوەڕەیان بێو سودو زیانی شتەکە بزانی هیچ قەیناکە[1].والله اعلم.

## خوێندنی سورەتی ئیخلاس و فەلەق و ناس بۆ نەخۆش باشە

٨٣٢- ن /٣٧٩٣ ((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: (كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ اذَا مَرِضَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِهِ نَفَثَ عَلَيْهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ. فَلَمَّا مَرِضَ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيْهِ جَعَلْتُ أَنْفُثُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُهُ بِيَدِ نَفْسِهِ، لأَنَّهَا أَعْظَمُ بَرَكَةً مِنْ يَدِي) رواه الجماعة الا النسائي والترمذي. احمد

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٧٨٧ تا ٣٧٩٢) لە سەرچاوەی پێشو، بکە.

(٦/١١٤،١٠٤) و (خ/٤٤٣٩، ٥٠١٦، ٥٧٣٥، ٥٧٥١) و (م/٢١٩٢ــــ ٥٠ ــــ ٥١) وابوداود (٣٩٠٢) وابن ماجة (٣٥٢٩))).

له دایكی باوەڕدارانــەوه خــاتون عائیــشه ﵂ هــاتوه، كــه وتویــەتی: پێغەمبــەری خوا ﷺ هەركاتێ یەكێك لــه بنەماڵەكــەی نــەخۆش بكەوتایــه، ئــەو - ســێ ســورەتەی سەرەوەی - بەسەر نەخۆشەكەو ئەخوێند فوی لێ ئەكرد، جا كاتێ خۆی نــەخۆش كــەوت ئەو نەخۆشییەی، كه لەودا كۆچی دوایی كرد، من به هەناسەوه ئەم خوێنــد بــه ســەریاو دەستی خۆیم ئەهێنا بەسەر لەشیدا، چونكه دەستی ئەو بەرێزتر بوو - له دەستی مــن - له فەڕو بەرەكەتدا، به ڕاســتی ئــەم ســێ ســوڕەته، چــەكێكی زۆر پــیرۆزو بڕنــدەن، بــۆ لەناوبردنی دوژمنانی لەشی خواناس، پێویسته ئەوەش بزانین، كه بــاوەڕبونی نەخۆشــەكه بــەو ســودەی ئــەوانو ڕاســتیو دروســتیو پــڕ هێزكــاری خوێنەرەكــە، زۆر كاریگــەرن لەوەرگرتنی نزاكەو شیفای نەخۆشەكەدا.

## چاو كار ئەكات و داوای خۆشـۆردن له چاوپیس

٨٣٣- ن /٣٧٩٦ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النبِّـيِّ ﷺ قَالَ: (الْعَيْنُ حَقٌّ، وَلَـوْ كَـانَ شَـيْءٌ سَابِقٌ الْقَدَرَ لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ، وَاِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ فَاغْسِلُوا). رواه احمد (١/٢٧٤، ٢٩٤) ومــسلم (٢١٨٨ــ ٤٢) الترمــذي (٢٠٦٢) وصــححه والنــسائي في الكــبرى (٤/٣٨١) رقــم (٧٦٢٠))).

له عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوه ﵁ هــاتوه، لــه پێغەمبــەرەوه ﷺ فەرمویــەتی: چــاو ڕاســته -بەفــەرمانی خــوا لەســەر مــرۆڤ وەكــو چــەك كاریگــەره-، ئەگــەر شــتێك لــه ئەندازەگیریو تەقدیری خوا پێش بكەوتایه، چاو پێش ئەكــەوت. واتــه هــیچ شــتێك لــه تەقدیرێ، كه خوا دایناوه پێش ناكەوێت، -جا ئەفەرموێت-وه هەركاتێك چــاوتان كــاری كرده كەسێكو — پێتان وترا خۆتان بشۆرن -با هەرچی زوتره- خۆتان بشۆرن.

بەڵێ شێوەی ئەم خۆشۆردنەیش باسکراوە[1]، بەم شێوەی خوارەوە، بە کابرای چاو پیس -وەختێ زانرا بە ڕاستی نەك بەگومان- ئەوترێت، کە دەست نوێژێ بگرێو ئەژنۆکانیو شەرمگەیشی بشۆرێو ئاوەکەی نەرێژێتو، لە پشتەوە کە کابرای چاو لێدراو نەزانێ، ئاوەکە بە ملو پشتیا بکرێت، ئینشائەڵلا شیفای بۆ دێت، وەکو روداوی (سەهلی کوڕی حەنیفی -چاو لێدراو- عامیری کوڕی رەبیعەی خاوەن چاو).

## باسی سوێن خواردن و کەفارەتەکەی

٨٣٤- ن /٣٨٠١ ((عَـنِ أَبِـي هُرَيْـرَةَ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِﷺ: اَلْـيَمينُ عَلَـى نِيَّـةِ الْمُسْتَحْلِفِ) رواه مسلم (١٦٥٣ـ ١٢) وابن ماجة (٢١٢٠)))..

لە ئەبوهورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: سوێند لەسەر نیەتی سوێندەرە. واتە ئەو مەبەستی چۆنە، سوێندەکە بەو شێوەیە، نەك بەنیەتی سوێند خۆر، چونکە ئەگەر وابێ، هەرکەسێ بۆخۆی لە کاتی سوێندا مەبەستێك لە دڵی خۆیدا دائەنێو بە شێوەیەك سوێند ئەخوات ، کە سودی خۆی بێو، مافی کابرای سوێند بۆ خوراو لە ناو ئەچێتو، سود لە سوێند خوارندا نامێنێت.

## کەسێ سوێند بخوات و إن شاء الله بکات، سوێند کەوتنی تێدا نیە.

٨٣٥-٣٨٠٣ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (مَن حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ: إنْ شَاءَ اللهُ ـ فلا حِنْثَ عَلَيْهِ) رواه الخمسة. احمد (٦/٢، ١٠، ٤٨، ٤٩، ٦٨، ١٢٦، ١٢٧، ١٥٣) ابوداود (٣٢٦١، ٣٢٦٢) والترمذي (١٥٣١) والنسائي (١٢/٧، ٢٥) وابن ماجة (٢١٠٥))).لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری

---

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٧٩٨) لە سەرچاوەی پێشوو، بکە.

خواﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێ سوێند لەسەر شتێك بخوات‌و بلێ (إِنْ شاءالله/ ئەگەر خوا ئارەزوی لێبێ) ئەوە سوێندەکەی ناکەوێ، ئەگەر ئەنجامیدا ئەوە هیچ، ئەگەر ئەنجامیشی نەدا، مانای وایە خوا ئارەزوی لێ نەبووەو سوێندی ناکەوێ.

## کەسێ وتی خەڵات نادەم بەزەکاتدان سوێندی ناکەوێ

٨٣٦- ن /٣٨٠٥ ((عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ سَأَلَ عَنْهُ اَهَدِيَّةٌ اَمْ صَدَقَةٌ؟) فَإِنْ قِيلَ: صَدَقَةٌ. قَالَ لأَصْحَابِهِ: (كُلُوا) وَلَمْ يَأْكُلْ. وَاِنْ قِيلَ هَدِيَّةٌ ضَرَبَ بِيَدِهِ وَاَكَلَ مَعَهُمْ) اخرجاه. خ(٢٥٧٦) (م/١٠٧٧))).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هەرکاتێ خواردنێکی بۆ بهێنرایە، لەبارەیەوە پرسیاری ئەکرد ئەیفەرمو خەڵاتە یان زەکات؟ ئەگەر بوترایە زەکاتە ئەیفەرمو بەیارەکانی (بخۆن) و خۆی نەیئەخوارد. ئەگەر بوترایە خەڵاتە، ئەویش دەستی بۆ ئەبرد -و ئەیخوارد- لەگەڵ یارەکانیا واتە سوێند لەسەر شتێکی دیاریکراو خورا لەسەر شێوەو جۆری تری ناکەوێت.

## کەسێ سوێندی خوارد کە پێخۆر ناخۆم بەچی سوێندی ئەکەوێت.

٨٣٧- ن /٣٨٠٧ ((عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النبِّيِّﷺ قَالَ: (نِعْمَ الأُدْمُ الخَلُّ) رواه الجماعة الاّ البخاري. (م/٢٠٥٢/١٦٦،١٦٧) وابوداود (٣٨٢١) والنسائي (١٤/٧) والترمذي (١٨٣٩/١٨٤٢) وابن ماجة (٣٣١٧) احمد (٣٠١،٣٠٤/٣، ٣٦٤، ٣٨٩، ٣٩٠، ٤٠٠))).

لە جابیرەوەﷺ هاتوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ کە فەرمویەتی (باشترین پێخۆرە) هەروەها لەبارەی رۆنی زەیتونو خورماو گۆشت، فەرمودەی راست هاتوون، کە پێخۆرن،

واتە کەسێ وتی پێخۆر ناخۆم، نابێ ئەوانەو هەرشتێکی تر لە جۆری ئەوان بێ و بەعادەت نانی پێوە بخورێت بیخوات، ئێمە لەبەر کورتکردنەوەی، فەرمودەکانمان نەنووسی.[1]

## کەسێ سەرەمانگی ئیسلامی سوێندی خوارد تا مانگێك فلان شت ناکەم دەگونجێ چەند ڕۆژ بێت؟

٨٣٨- ن /٣٨١٥ ((عَنْ أُمِّ سَلَمَة، اَنَّ النبَّـيَّ ﷺ حَلَفَ: (لاَيَدْخُلُ عَلَى بَعْضِ أَهْلِهِ شَهْراً. وَفِي لَفْظٍ: اِلَى مِنْ نِسَائِهِ شَهْراً — فَلَمَّا مَضَى تِسعَةٌ وَعِشْرونَ يَوْماً غَدا عَلَيْهِمْ اَوْ رَاحَ. فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ الله حَلَفْتَ اَلاَّ تَدْخُلَ عَلَيْهِنَّ شَهْراً؟ فَقَالَ: (اِنَّ الشَهْرَ يَكُونُ تِسْعاً وَعِشْرِين) مُتَّفَقٌ عليه. احمد (٣١٥/٦) (خ/٥٢٠٢) (م/١٠٨٥-٢٥) وكذا رواه النسائي (١٨٢٠١) في الكبرى وابن ماجة (٢٠٦١))).

لە دایکی باوەڕدارانەوە خاتون ئوموسەلەمە -خوا لێی ڕازی بێ- هاتوە کە پێغەمبەرﷺ سوێندی خوارد مانگێك نەچێتە لای هەندێ لە خێزانەکانی. لەبێژەیەکی تردا، سوێندی خوارد لەبارەی هەندێ لە ژنەکانیەوە تامانگێك نەچێتە لایان، جا کاتێ (٢٩) بیستو نۆ ڕۆژ ڕۆیی، بەیانی، یان ئێوارە چووە لایان پێی بێژرا: - ئەی پێغەمبەری خواﷺ سوێندت خوارد، کە مانگێك نەچیتە لایان؟ فەرموی: (بەڕاستی مانگ (٢٩) بیستو نۆیە). بەڵێ هەر لەبەر ئەو ڕۆژە کەمەیە، کە مانگی ئاسمان ئەسوڕێتەوە.

---

(١) بۆ شارەزایی زیاتر با تەماشای ژمارە (٣٨٠٨ تا ٣٨١٢) لە سەرچاوەی پێشوو، بکە.

## سـوێند بە زات و سـیفەتی خوا دروسـتەو نابێ بەغەیری خوا سـوێند بخوڕێت.

٨٣٩- ن /٣٨١٧ ((عَنِ ابْـنِ عُمَـرَ قَـالَ: كَـانَ اَكْثَـرُ مَـا كَـانَ النبَّـيُّ ﷺ يَحْلِـفُ: (لاَ وَمُقَلِّـبِ الْقلُـوبِ) رواه الجماعـة الاّ مـسلماً واحمـد (خ/٦٦١٧،٦٦٢٨،٧٣٩١) وابـوداود (٣٢٦٣) والترمذي (١٥٤٠) والنسائي (٧/٢-٣) وابن ماجة (٢٠٩٢))).

لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ هاتوە، كە وتویەتی: زۆرتر لـەو سـوێندانەی كـە پێغەمبەر ﷺ ئەیخوارد –ئەوەبوو، كە ئەیفەرمو: نەءٍ، بەو كەسەی، كە دڵەكان ئەم دیـو ئەم دیو ئەكات. واتە سوێند بە سیفەتەكانی خوا دروستە.

٨٤٠- ن /٣٨٢٢ ((وَعَنْهُ اَنَّ النبَّـيَّ ﷺ سَمِعَ عُمَرَ وَهُوَ يَحْلِفُ بِأَبِيـهِ، فَقَـالَ: (إِنَّ اللّهَ يَنْهَاكُمْ اَنْ تَحْلِفُوا اِبآبائِكُمْ فَمْنَ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِـاللهِ أَوْ لِيَـصْمُتْ) متفـق عليـه احمـد (٢/١٢٤،١٧،١١) (م/١٦٤٦)، (خ/ ٣٨٣٦، ٦١٠٨، ٦٦٤٦، ٦٦٤٨، ٢٦٧٩))).

هەر لەوەوە ﷺ هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە عومەر بـوو سـوێندی بـە بـاوكی ئەخوارد ، جا فەرموی: (خوا ڕێگری كردون لەوەی، كە سوێند بە باوكانتـان بخـۆن ، جـا هەركەسێك ئەیەوێ سوێند بخوات با –تەنها- بەناوی خواوە سوێند بخوات، یان بێ دەنگ بێت.وە لەمبارەوە فـەرمودەی زۆر هەیـە، بـەڵام جێگـای داخـە ئـەمیش وەكـو بـاقی ڕەوشتو ئاكارە ئیسلامیەكانی تر، بەر لافاوی نەفامی كەوتووەو، سوێند بە هەمو شـت ئەخۆنو خۆیشیان بە مسوڵمان ئەزانن، كە فـەرمودەی ڕاسـت هەیـەو ئەفـەرموێ (مَـنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَـرَ/ هەركەسێ بەغەیری خوا سوێند بخوات كافر ئەبێ) ئیمامی ئەبو داود (٣٢٥١)و تورمزی (١٥٣٥) باسیان كردووەو بەجوانی داناوەو حاكم بـە سـەحیحی داناوە هەروەها ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی كردوە (٢/٣٤، ٥٨، ٦٩، ٨٦، ١٢٥).

# سوێندی سوێند خۆر ئه نجام بدرێ مەگەر بەهانە هەبێ

٨٤١- ن /٣٨٢٩ ((عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: اَمَرَنَا رَسُولُ اللهِﷺ بِسَبْعٍ: (اَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ وَاِبْرَارِ الْقَسَمِ (اَوِ الْمُقْسِمْ) وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ وَإِجَابَةِ الدَّاعِي وَإِفْشَاءِ السَّلامِ) رواه الجماعة الا ابـاداود احمد (٢٩٩،٢٨٧،٢٨٤/٤) (م/٢٠٦٦) والترمذي (١٧٦٠) وابن ماجة (٣٥٨٩، ٢١١٥)، (خ/ ٦٦٥٤، ١٢٣٩، ٢٤٤٥، ٥١٧٥، ٥٦٣٥، ٥٨٣٨، ٥٨٤٩، ٥٨٦٣، ٦٢٢٢، ٦٢٣٥) والنسائي (٧/٤،٨/٥٤،٢٠١/٨)))

لە بەرائی کوڕی عازیبەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فرمانی پێداین بە ئەنجامدانی حەوت شت: فرمانی پێداین بەسەردانی نەخۆش بکەین‌و، مردوکە دەبرێتە قەبر، دوای کەوین مردو، دوعای خێر بۆ ئەو کەسەی کە بپژمێت -و سوپاسی خوا بکات - هێنانەدی قسەی سوێند خۆر، واتە ئەگەر سوێندێکی لەسەر خواردیت کە ئەبێ فلأنە شت بکەیت، یان نەیکەیت بەگوێی بکەیت. یارمەتیدانی ستەم لێکراو، چوون بەدەم دەعوت کردنەوە، بڵاوکردنەوەی سەلام. واتە بەکارهێنانی وشەی سەلام لەگەڵ خەڵکا. پێویستە ئەمانە ئەنجام بدرێن، مەگەر بەهانەیەکی شەرعی هەبێ، وەك ئەوەی کە کاتێ پێغەمبەرﷺ خەوەکەی خۆی بۆ گێڕایەوەو وتی ماوەم پێ بدە، من خەو پەرژێنی بکەم، لە پاش خەو پەرژینەکەی وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ دایك‌و باوکم بە قوربانت بن، پێکام یان بەهەڵە داچوم فەرموی: (أَصَبْتَ بَعْضاً وَأَخْطَأْتَ بَعْضاً/ هەندێکت پێکاو هەندێکت نە پێکا[1]) وتی: بەخوا قسەم بۆ ئەکەیت لەوەی، کە نەم پێکاوە؟ فەرموی: (سوێند مەخۆ)، واتە سوێندەکەی بۆ جێبەجێ نەکرد.

---

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٨٣٠) لە سەرچاوەی پێشوو، بکە.

## ئەو كەسەی بڵێ جولەكە بم یان گاور گەر ئەو شتە بكەم

٨٤٢- ن /٣٨٣١ ((عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: (مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ بِمِلَّةٍ غَيْرِ اْلأَسْلاَمِ كَاذِباً — فَهُوَ كَمَا قَالَ) رواه الجماعة. احمد (٤/٣٣،٣٤) (م/١١٠) وابوداود(٣٢٥٧) والنسائي وابن ماجة(٢٠٩٨) ( خ/ ١٣٦٣،١٤٧١ ، ٤٨٤٣،٦٠٤٧،٦١٠٥،٦٦٢٥))).

لە سابتی كوڕی زەحاكەوە ﷺ هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: هەركەسێك سوێند بخوات لەسەر شتێ بە ئایینێ بێجگە لە ئیسلام بە درۆوەوە —واتە وانەبێ، ئەوە وایە، كە ئەیڵێ واتە: بەو قسەیە كە ئەیكات ئەچێتە سەر ئەو ئایینە كەوتی جولەكە بم، ئەگەر فلان ئیش ئەكەم، ئەگەر لە بنەڕەتا جوولەكە نەبوبێ ئێستا ئەبێ بە جوولەكە لەسەر ئەو قسەیە.

جا پارێزگاری ئایینو پێویستەو، نابێ بەسادە تەماشا بكرێ، هەموكەس بەندەی خوایە، بەندایەتی ئەوەیە لە قسەو فرمانی سەرپێچی نەكەیت، ئەگینا لە بەندایەتی دەر ئەچیتو پاشە ڕۆژی خۆت خراپ ئەكەیت، خوا منو ئێوەیش لە كردارو وتارو نیەتی خراپ بپارێزێ - ئامین.

## ئەو سوێندەی كابرالە تاواندا نقوم دەكات و سوێندی لۆمە لەسەر نەكراو.

٨٤٣- ن /٣٨٣٣ ((عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ (خَمْسٌ لَيْسَ لَهُنَّ كَفَّارَةٌ: الشِّرْكُ بِاللهِ وَقَتْلُ النَّفْسِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبهْتُ مُؤْمِنٍ ، وَالْفِرَارُ يَوْمَ الزَّحْفِ، وَيَمِينٌ صَابِرَةٌ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالاً بِغَيْرِ حَقٍّ) رواه الخمسة الاّ الترمذي. احمد(٥/٣٥٥) وابوداود (٣٢٥٨) والنسائي (٦/٧) وابن ماجة (٢١٠٠))). لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، كە وتویەتی:

پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: پێنج شت هەیە، کە فارەتیان نییە، واتــە هــیچ شــتێك لە تۆڵەیان نادرێتو چاوپۆشی لە کابرا ناکرێت - مەگەر تەوبــە بکــاتو مــافی خــاوەن مافەکان بدات — لەوانە: هاوبەش دانانە بۆ خوا، کوشتنی خەڵك بە نارەوا، بوختان کردن بە باوەڕدار، راکردن لە هێرشی دوژمن -ئەگەر زیاتر نەبێ لــە دوو بەرامبــەر- ســوێندی خۆگر واتە بە ئیسراحەت بێو ئامۆژگاری بکرێ، کەچی ئەو هەر ئامادەبێ، کــە ســوێند بخوات، کە بەو سوێندە ماڵێك ببچڕێت بە ناحەق، واتە ماڵی مسوڵمانێك بە نارەوا بــەو سوێندە بۆخۆی ببات.

٨٤٤- ن /٣٨٣٦ ((عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآَيَةُ: ((لاَّ يُؤَاخِذُكُمُ آللهُ بِآللَّغْوِ فِـي أَيْمَـنِكُمْ....))(البقـرة- ٢٢٥) فِـي قَـوْلِ الرَّجُـلِ: لاَ وَاللهِ. وَبَلَـىَ وَاللهِ) رواه البخـاري (٤٦١٣))).

لە دایکی باوەڕدارانەوە خاتون عائیشە رضي الله عنها هاتوە، کە وتویەتی: ئـەم ئایەتـە (خـوا سەرزەنشتان ناکـات لەســەر ســوێندی زیـادە خواردنتـان...) ســورەتی بەقــەرە-٢٢٥، لەبارەی قسەی پیاو -یان ئافرەت دابەزی ،کە کاتی قــسە کــردن بــێ ئاگایانــە ئــەڵێ - ئەرێ بەخوا، نەبەخوا. واتە ئەمانە سوێند نین‌و کــەفارەتیان نیــە. چــونکە بــەدڵ بڕیــاری سوێند خواردنی نەداوە. ئەوە سوێندە، کە کــابرا لــە دڵــەوە بڕیــاری ســوێند خواردنەکــە بدات، ئینجا بەدەم ئاشکرای بکات،والله أعلم.

## سـوێند لەسـەر شـتی ئایندەو كـەفارەتی پـێش شـكانی سوێندەكە، یان پاش شـكانی.

٨٤٥- ن /٣٨٣٩ ((عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ اَنَّ النبَّـيَّ ﷺ قَالَ: (مَنْ حَلَـفَ عَلَـى يَمِـينٍ فَـرَأَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا فَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ وَلْيَفْعَلِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ) رواه احمـد (٢/٣٦١) ومـسلم (١٦٥٠/١٧) والترمذي(١٥٣٠) وصححه)).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویـەتی: هـەر كەسـێك سـوێند لەسەر شتێك بخوات كەچی، بینی بێجگـە لـەوە- ی كـە سـوێندی لەسـەر خـواردوە — چاكترە، با كەفارەتی سوێندەكەی بداتو، ئەوەی چاكە بیكات. لەبێژەیەكی تردا هـاتوە، كە: با ئەو ئیشەی، كە چاكترە ئەنجامی بدات، ئینجا كەفارەتی سوێندەكەی بـدات، كـە بریتیە لە ئازاد كردنی بەندەیەك، یان خـواردنی (دە) فـەقیر، یـان پۆشـاك بـۆ كردنیـان لەپۆشاكو خواردنێكی مام ناوەندی - هەر كام لەوانـە بكـات باشـەو خـۆی سەرپـشكە كامیان هەڵ ئەبژێرێت، ئەگەر توانای ئەوانـەی نـەبوو، ئینجـا پێویـستە سـێ ڕۆژ ڕۆژو بگرێت. ئەمە لە سورەتی (المائدة، ئایەتی ٨٩)دا هاتوە، كە لەوێ: بە تەرتیب خـواردنو پۆشاك بەندە, كە نەبوون - سێ ڕۆژ ڕۆژویەك لە پاش یەك بن ڕۆژەكان باشترە.

# باسـی نەزر کـــردن

٨٤٦- ن/٣٨٤٤ ((عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النبَّـيِّﷺ قَالَ: (مَـنْ نَـذَرَ اَنْ يُطِيـعِ الله فَلْيَطِعْـهُ، وَمَنْ نَذَرَ اَنْ يَعْصِيَهُ فَلاَ يَعْصِهِ) رواه الجماعة الاّ مـسلماً. احمـد (٦/٣٦،٤١،٢٢٤،٢٤٧) (خ/٦٦٩٦/٦٧٠٠) وابـــــوداود (٣٢٨٩، ٣٢٩٠، ٣٢٩١، ٣٢٩٢) والترمـــــــذي (١٥٢٤،٢٥٢٥،١٦٢٦) والنسائي (٧/١٧،٢٦،٢٧) وابن ماجة (٢١٢٥،٢١٢٦))).

له دایکی باوەڕدارانەوە خاتوون عائیشە (رضي الله عنهـا) هاتوە، کە پێغەمبـەرﷺ فەرمویە: هەرکەسێ نەزری کرد، کـە شـتی بـاش بکـاتو پەسـەندی شـەرع بێـت، بـا نەزرەکەی جێبەجێ بکات، هەرکەسێك نەزری کـردوە، کـە ئیـشێکی ناشـەرعی ئـەنجام بدات، با ئەنجامی نەدات، کەفارەتی سوێندێك بدات وەکو لە فـەرمودەی: (كَفَّـارَةُ النَّـذْرِ كَفَّارَةُ يَمِـينٍ/ کەفارەتی نەزر،کەفارەتی سوێندە)دا هـاتوە، (رواە مـسلم (١٦٤٥) وأحمـد وغيرها). بەڵام جمهور لەسەر ئەوەن، کە نەزری تاوان ناکرێو کەفارەتیشی نیە.

# نەزری حەڵاڵ و نەزری حەرام

٨٤٧- ن /٣٨٤٦ ((عَنِ ابَنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بَيْنا النبَّـيُّﷺ يَخْطُبُ اذْ هُـوَ بِرَجُـلٍ قَـائِمٍ فَسَأَلَ عَنْهُ فَقَالوُا: (أَبوُ إِسْرَائِيلَ نَذَرَ اَنْ يَقُومَ فِي الـشَّمْسِ وَلاَيَقْعُـدَ وَلاَيَـسْتَظِلَّ وَلاَ يَـتَكَلَّمَ وَاَنْ يَـصُومَ فَقَـالَ النبَّـيُّ ﷺ: (مُـروُهُ فَلْيَـتَكَلَّمْ، ولْيَـسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُـدْ وَلْيُـتِمَّ صَـوْمَهُ) رواه البخاري (٦٧٠٤) وابوداود(٣٣٠٠) وابن ماجة (٢١٣٦))).

له عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوەؓ هاتوە، کە وتویـەتی لـە کاتێکـا پێغەمبـەرﷺ خوتبەی ئەخوێندەوە، پیاوێك هەستایە سەر پێ، جا لەبارەیـەوە پرسـیاری کـرد وتیـان: ئەبو ئیسرائیلە نەزری کردووە، کە لەبەر ڕۆژ بوەستێتو دانەنیشێو نەیەتـە بەرسـێبەرو قسە نەکاتو بەڕۆژوبێ. پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((پێی بلێن، با قـسە بکـاتو بـچێتە

سـێبەرو دانیـشێو ڕۆژووەکـەی تـەواو بکـات، واتـە نـەزری شـتە حەڵاڵـەکانی لێ هەڵوەشاندەوەو، نەزری خێرو چاکەو عیبـادەتی بـۆ هێـشتەوەو، فـەرموی: بـا تـەواوی بکات، وەکو لە فەرمودەی پێشەوە باسمان کرد، لە هەڵوەشـاندنەوەدا کـەفارەتیش نیـە، والله أعلم.

## شـتێ کە موڵکی کابرا نەبێت ناکـرێ بەنەزر

٨٤٨- ن /٣٨٤٧ ((عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَاكِ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: (لَـيْسَ عَلَـى الرَّجُـلِ نَذْرٌ فِيْمَا لاَيَمْلِكُ) رواه البخـاري (٦٠٤٧) ومـسلم (١١٠) وابـوداود (٣٢٥٧) والترمـذي (٢٦٣٦/١٥٢٧))).

لە سابتی کوڕی زەحاکەوەرضي الله عنه هاتوە، کـە پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمویـەتی: نـەزر لەسەر کابرا نیە لە شتێکا، کە خۆی خاوەنی نەبێ.

٨٤٩- ن /٣٨٥٥ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النبَّـيِّﷺ قَـالَ: (مَـنْ نَـذَرَ نَـذْراً لَـمْ يَـسُمِّهِ فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ وَمَنْ نَذَرَ نَذْراً لَمْ يُطِقْـهُ فَكَفَّارَتُـهُ كَفَّـارَةُ يَمِـينٍ) رواه ابـوداود (٣٣٢٢) وابن ماجة (٢١٢٨))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوەرضي الله عنه هـاتوە، لـە پێغەمبـەرەوەﷺ، کـە فەرمویـەتی: هەرکەسێك نەزرێ بکاتو ناوی نەبردبێت، واتە وتبێتی نەزرێك لەسەرم بـێ، بـۆ فلانـە شتو ناوی شتە نەزرییەکەی نەبردبێ، ئەوە کەفارەتی سوێندێکی ئەکەوێت. هەرکەسـێك نەزرێ بکاتو لەتوانایدا نەبێ، ئەویش هەر کەفارەتی سوێندی ئەکەوێت.

٨٥٠- ن /٣٨٥٨ ((عَنْ كُرَيْبٍ عَنِ ابْنِ عَبَّـاسٍ قَـالَ: (جَـاءَتْ امْـرَأَةٌ الَـى النبَّـيِّﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ الله انَّ أُخْتِي نَذَرَتْ اَنْ تَحُجَّ مَاشِيَةً فَقَالَ: (إنَّ اللهَ لاَيَصْنَعُ بِشَقَاءِ أُخْتِـكِ شَيْئاً لِتَخْرُجْ رَاكِبَةً وَلْتُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِها) رواه احمد (٣١٠/١، ٣١٥) وابوداود (٣٢٥٩))).

لە کورەیبەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە وتویـەتی: ((ئافرەتێـك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ وتی: ئـەی پێغەمبـەری خـواﷺ خوشـکم نـەزری کـردووە

لەسەرخۆی كە بە پیادە حەج بكات، فەرموی: خوا بەو زەحمەتەی خوشكی تۆ، هیچ شتێك ناكات، واتە: زەحمەتی خوشكی تۆی ناوێ، جا كەوابوو پێی بڵێ: با بەسواری بچێتو كەفارەتی سوێنەكەی بدات.

## كافرێ شتێ نەزر بكات و لە پاشان مسوڵمان بێ مادام بۆ شتی حەرام نەبێ ئەبێ جێبەجێی بكات.

٨٥١- ن /٣٨٦٠ ((عَنْ عُمَرَ قَالَ: (نَذَرْتُ نَذْراً فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَسَأَلْتُ النبَّيَّﷺ بَعْدَمَا أَسْلَمْتُ، فَأَمَرَنِي اَنْ أُفِي بِنَذْرِي) رواه ابن ماجه (٢١٢٩) وهو احد روايات الحديث المتفق عليه)).

لە عومەرەوەرضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: ((لەسەردەمی نەفامییدا نەزرێكم لەسەر خۆم دانابوو-كە شەوێك لە مزگەوتی حەرام (مسجد الحرام)دا بمێنمەوە- جا دوای ئەوەی مسوڵمان بووم پرسیارم لە پێغەمبەركردﷺ، ئەویش فرمانی پێكردم، كە نەزرەكەم بەجێ بهێنم.

## كەسێ تەواوی ماڵی خۆی نەزر بكات

٨٥٢- ن /٣٨٦٥ ((عَنِ الْحُسَيْنِ بْنِ السَّائِبِ بِنِ أَبِي لُبَابَةَ، أَنَّ أَبَا لُبَابَةَ بْنِ عَبْدِالْمُنْذِرِ، لَمَّا تَابَ اللهُ عَلَيْهِ قَالَ: (يَا رَسُولُ اللهِ ، إِنْ مِنْ تَوْبَتِي اَنْ أَهْجُرَ دَارَ قَوْمِي وَأُسَاكِنَكَ، وَاَنْ اَنْخلعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً للهِ -عزوجل- وَلِرَسُولِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ (يُجْزِي عَنْكَ الثُّلُثُ) رواه احمد (٤٥٣،٤٥٢/٣) وابوداود (٣٣١٩) عن الزهری عن ابن كعب بن مالك عن ابيه)).

لە حوسەینی كوڕی سائیبی كوڕی ئەبو لوبابەوە هاتوە، كە بە ئەبو لوبابەی كوڕی عەبدولمونزیر، كاتێ خوا تەوبەی لێوەرگرت وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، بەڕاستی

بەشێك لەوەی، كە دامناوە بۆ خـوا ئەگـەر تەوبـەم لــێوەرگرێت ئەوەیـە كـە - لـەناو خزمانی خۆم كۆچ بكـەم بێمـە لات و، هـەمو مـاڵم خێـرو سـەدەقە بـێ بـۆ خـوای - بەدەسەلاتو بۆ پێغەمبەرەكەی، فەرموی: (بەخـشینی سـێیەكی ماڵـت بەسـە بـۆت). واتە: هەموی مەبەخشەو بەم ئەندازەیە نەزرەكەت لەسەر لا ئەچێت.

## كەسێ شایەتی بدات لەسەر تـەنهایی خـواو پێغەمبەرایـەتی پێغەمبەرو بزانێ زیندو ئەكرێتـەوە باوەڕدارە.

٨٥٣- ن /٣٨٦٦ ((عَنْ عُبَيْدِاللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ عَنْ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ: أَنَّهُ جَاءَ بِأَمَةٍ سَوْدَاءَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ انَّ عَلَيَّ عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ، فَأَنْ كُنْتَ تَرىَ هَذِهِ مُؤْمِنَةً أَعْتِقُهَا، فَقَالَ: لَهَا رَسُولُ اللهِﷺ (اَتَشْهَدِينَ اَنْ لاَ الَهَ الاَّ اللهُ) قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: (اَتَشْهَدِينَ أَنِي رَسُولُ اللهِ) قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (اَتُؤْمِنُونَ بِالَبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ) قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَعْتِقْهَا)). رواه احمد(٤٥١/٣) قَالَ الْهَيْثَمِيُّ رِجَالُهُ مُوثَقُون.

لـە عوبەیـدوڵلای كـوڕی عەبـدوڵلاوە لـە پیـاوێكی ئەنـسارییەوەﷺ هـاتوە، كـە كەنیزەكێكی ڕەش پێستی هێناو، وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـواﷺ. مـن ئـازادكردنی بەندەیەكی باوەڕدارم لەسەرە، ئەگەر تۆ ئەمە بە باوەڕدار ئەزانی ئازادی ئەكەم.

پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: ئایـا شـایەتی ئـەدەیت، كـە هـیچ پەرسـتراوێكی ڕاستەقینە نیە بێجگە لە (الله)؟

وتی: بەڵێ. فەرموی: (ئایاشایەتی ئەدەیت، كە من پێغەمبەری خوامﷺ.

وتی : بەڵێ

فەرموی: (ئایا باوەڕت هەیە بە زیندوبوونەوە لەپاش مردن.

وتی: بەڵێ. فەرموی: كەواتە ئازادی بكە -باوەڕدارە-.

# کەسێ نەزر بکات لەسەر خۆی کە لە (مسجد الاقصى) نوێژ بکات.

٨٥٤- ن /٣٨٦٩ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ امْرَأَةً شَكَتْ شَكْوَى، فَقَالَتْ: إِنْ شَفَانِي اللهُ فَلأَخْرُجَنَّ فَلأُصَلِّيَنَّ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ. فَبَرَئَتْ، ثُمَّ تَجَهَّزَتْ تُرِيدُ الْخُرُوجَ فَجَائَتْ مَيْمُونَةَ تُسَلِّمُ عَلَيْهَا فَأَخْبَرَتْهَا بِذَلِكَ، فَقَالَتْ: اجْلِسي فَكُلي مَا صَنَعْتَ، وَصَلِّي فِي مَسْجِدِ الرَّسُولِ ﷺ فَأَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (صَلاَةٌ فِيهِ اَفْضَلُ مِنْ اَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ الاَّمَسْجِدَ الْكَعْبَةِ) رواه احمد (٣٣٤/٦) ومسلم (١٣٩٦/٥١٠) والنسائي (٢١٣/٥))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە رضي الله عنه هاتوە، کە ئافرەتێك نەخۆش کەوت، وتی: ئەگەر خوا شیفام بدات بەڕاستی دەرئەچمو لە مزگەوتی قودس دا (بيت المقدس) نوێژ ئەکەم. جا چاك بوویەوە، لەپاشان خۆی ئامادەکردو ویستی بچێت، چووە لای دایکی باوەڕداران خاتون مەیمونەو سەلامی لێکردو ئەو هەواڵەی پێدا، فەرموی: دانیشەو ئەوەی کردوتە بیخۆو نوێژ لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دا بکە، بەڕاستی من لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستم ،کە ئەیفەرمو نوێژێك لەم مزگەوتەدا بەڕێزترە لە هەزار نوێژ، کە لەم مزگەوتەدا نەکرێت، جگە لە مزگەوتی مەککە، واتە: ئەگەر کەسێك عیبادەتێکی لەسەر خۆی نەزر کرد لە جێگایەکدا، ئەگەر جێگایەکی چاکتر هەبوو، ئەتوانێ بیگۆڕێت بۆچاکترەکەیان. فەرمودەی (صلِّ هَهُنَا نوێژ ئالێرەدا بکە) زیاتر ئەم قسەیەمان بەهێز ئەکات. [1]

٨٥٥- ن /٣٨٧١ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لاَ تُشدُّ الرِّحَالُ اِلاّ اِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ : الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَسْجِدِي هَذَا وَالْمَسْجِدِ الأَقْصَى) رواه الجماعة الا احمد والترمذي (خ/١١٨٩) (م/١٣٩٧) وابوداود (٢٠٣٣) النسائي (٣٧/٢) وابن ماجة (١٤٠٩))).

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٨٦٨) لە سەرچاوەی پێشوو، بکە.

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کەوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: سەفەری دور نەکەن، مەگەر بۆ یەکێك لە سێ مزگەوت. مزگەوتی مەککەو مزگەوتی منو مزگەوتی ئەقسا (بیت المقدس)، بەهەمان شێوە ئەم فەرمودەیە لەئەبو سەعیدی خدریشەوە هێنراوەوە لە ریوایەتێکی ئیمامی موسلم دا (إِنَّمَا يُسَافِرُ اِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ) هاتوە. واتە: سەفەری شایستەو چاکە هەر ئەوەیە، کە بۆلای ئەو سێ مزگەوتە بکرێت.

## نــەزری مردو پاش خۆی ئە نجام ئەدرێت.

٨٥٦- ن /٣٨٧٢ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ اَنَّ سَعْدَ بْنِ عُبَادَةَ اسْتَفْتَى رَسُولَ اللهِﷺ فَقَالَ: (إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ لَمْ تَقْضِهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ (اقْضِهِ عَنْهَا) رواه ابوداود (٣٣٠٧) والنسائي (٧/٦،٢٥٤،٢٥٣،٢١/٢٥٣،٢٠))).

له عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ هاتوە، کە سەعدی کوڕی عوبادە داوای فتـوای لە پێغەمبەری خواکردﷺو وتی: دایکـم مـردوەو نـەزرێکی لەسـەر بـوو، نـەیکردووە؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرموی ( لەباتی ئەو جێبەجێ بکە).

## باسی ئەمارەت و قەزاوەت و بڕیارەکان

٨٥٧- ن/ش /٣٨٧٣ ((عَنْ عُمَرَ بْنِ الخطَّابِ: (إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فِي سَفَرٍ فَأَمِّرُوا اَحَدَكُمْ، ذَاكَ أَمِيرٌ اَمَّرَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ) رواه البزار (٢٦٦/٢،٢٦٧) برقم (١٦٧٢- كشف))).

له عومەری کوڕی خەتابەوەﷺ هاتوە، کە هەرکاتێ لە سەفەردا سێ کەس بـوون بـا یەکێکتان بکەن بە ئەمیر. ئـەوە ئەمیرێکـە، پێغەمبـەری خـواﷺ فرمـانی پێکـردوە. بەهەمان مانا ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداود[1] هێناویانە. لەبەر ڕاستری ئەم ڕیوایەتـە بۆیـە ئێمە لە بەزارەوە هێنامان.

---

(١) تەماشای ژمارە (٣٨٧٣- ٣٨٧٤) لەسەرچاوەی پێشوو بکە.

## داواكردنی بەرپرسیو مەسئولیەت چاك نیە.

٨٥٨- ن /٣٨٧٦ ((عَنْ عَبْدالرَّحْمن بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله ﷺ: (يَا عَبْدالرَّحْمنِ لاَ تَسْأَلِ الأمَارَةَ فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا، وَإِنْ أُعْطِيَتَها عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا) رواه الجماعة الا ابن ماجة. احمد (٥/٦١،٦٢،٦٣) (خ/ ٦٦٢٢،٦٧٢٢،٧١٤٦،٧١٤٧) (م/١٦٥٢) ابوداود (٢٩٢٩،٣٢٧٧) والترمذي (١٥٢٩) والنسائي (٧/١٠،١٢)(٨/٢٢٥))).

لە عەبدورەحمانی كوڕی سەمورەوە ﵁ هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ئەی عەبدورەحمانی كوڕی سەمورە! داوای ئەمیرایەتی مەككە، چونكە ئەگەر بەبێ داواكردن پێت بدرێ یارمەتی ئەدرێیت، ئەگەر لەسەر داخوازی خۆت پێت بدرێ بەخۆت دەسپێررێتو یارمەتی نادرێیت، ئایا هەر هۆی ئەم داوا كردنە نیە، كە هیچ كەس نایباتە سەر؟! والله أعلم.

## ئەگەر كەسێ نەبوو بۆ ئەمیرایەتی و كەسێ وای ئەزانێ دەتوانێ بەمافو ئەركی ئەمیرایەتی هەڵبستێ گەر داوا بكات قەیناكە.

٨٥٩- ن /٣٨٧٩ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النبَّيِّ ﷺ قَالَ: (مَنْ طَلَبَ قَضَاءَ الْمُسْلمِينَ حَتَّى يَنَالَهُ ثُمَّ غَلَبَ عَدْلُهُ جَوْرَهُ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَمَنْ غَلَبَ جَوْرُهُ عَدْلَهُ فَلَهُ النَّارُ) رواه ابو داود(٣٥٧٥))).

لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ هاتوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ، كە فەرمویەتی: هەر كەسێ داوای قەزاوەتی مسوڵمانان بكات - پاش ئەوەی كەسی شایستە تر نەبێ - هەتا پێی ئەدرێ، لەپاشان ئەگەر دادپەروەری بەسەر ستەمیدا زاڵ بوو، ئەوە بەهەشت بۆ ئەوە. ئەگەر ستەمی زاڵ بوو بەسەر دادپەروەریدا، ئەوە ئاگر بۆ ئەوە ،وە لەم بارەوە دەیان فەرمودەی تر هەیە.

## ترساندن لە سەرپەرشتی و ئەمیرایەتی.

٨٦٠- ن /٣٨٨٢ ((وَعَنْهُ عَنِ النبِّيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: (وَيْلٌ للأُمَرَاءِ، وَيْلٌ لِلْعُرَفَاءِ، وَيْلٌ للأُمَنَاءِ لَيَتَمَنَّيَنَّ أَقْوَامٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَّ ذَوَائِبَهُمْ كَانَتْ مُتَعَلِّقَةً بِالثُّرَيَّا، يَتَدَبْذَبُونَ بَيْنَ السَّمَاءِ، وَالأَرْضِ وَلَمْ يَكُونُوا عَمِلُوا عَلَى شَيْءٍ) رواه احمد(٥٢١،٣٥٢/٢) وصححه الحاكم ووافقه الذهبي)).

هەر لەوەوەو لە پێغەمبەری خواوەﷺ هاتوە، کە فەرمویەتی: هاوار بۆ ئەمیرەکان، هاوار بۆ عەریفەکان، هاوار بۆ ئەمیندارەکان، بەڕاستی گەلێکی زۆرن، کە لە ڕۆژی قیامەتا ئاوات ئەخوازن -ئەڵێن- خۆزگە پرچمان بە سورەیاوە ببەسترایەو لەنێوان ئاسمانو زەویدا بشەکابایەوەو لە هیچ جۆرە -لێپرسراوییەکدا- ئیشمان نەکردایە. هەر لەمبارەوە هاتوە، کە ئەفەرموێت:

٨٦١- ن /٣٨٨٤)- ((عَنْ أَبِي أُمَامَةَ عَنِ النبِّيِّ ﷺ قَالَ: (مَامِنَ رَجُلٍ يَلِي أَمْرَ عَشَرَةٍ ـ فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ ـ الاَّ أَتَى اللّهَ (عَزَّ وَ جَلَّ) يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَدُهُ عَلَى عُنُقِهِ، فَكَّهُ بِرُّهُ اَوْ أَوْبَقَهُ اِثْمُهُ، أَوَّ لَهَا مَلاَمَةٌ وَأَوْسَطُهَا نَدَامَةٌ، وَآخِرُها خِزْيٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) رواه احمد(٢٦٧/٥) حَسَّنَهُ السُّيُوطِيّ)).

لە ئەبو ئومامەوەرضي الله عنه لە پێغەمبەرەوەﷺ هاتوە، کە فەرمویەتی: هیچ پیاوێك نیە کە سەرپەرشتی دە ـ زیاتر لەوە بکات - مەگەر کاتێ هاتە لای خوای ــ بەدەسەڵات- لە ڕۆژی قیامەتا دەستی بەملیەوە بەستراوە ، جا ـ یان ـ چاکەکەی ئەیکاتەوە، یان گوناهەکەی، بەهیلاکی ئەبات ئەوەڵی سەرپەرشتی وئەمارەت مایەی سەرزەنشتی کردنە، ناوەڕاستەکەی پەشیمانیەو، ئاخرەکەیشی لە ڕۆژی قیامەتا سەر شۆڕییە. ئەوەیە سەرئەنجامی ئەو شتەی، کە ئەمڕۆ ئەوەندە سەرو ماڵو گیانی بێ تاوانی فیدا ئەکرێتو هەرکەس وا دەزانێ، دنیا هەر بۆ ئەوەو هەمو هەوڵو کۆششی هەر بۆ ئەو دونیایە، کە بۆ کەسیش نەبوەو نابێ.

## داد پــەروەران خۆش بەختــن.

٨٦٢- ن /٣٨٨٧ ((عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (اِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ – وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ – الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ اَوْ أَهْلِيهِمْ وَمَا وَلُّوا) رواه احمد (٢/١٦٠) ومسلم (١٨٢٧) والنسائي (٨/٢٢١))).

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە رضي الله عنه هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: داد پەروەران لەلای خوا، لەسەر مینبەرەکانی نورن لەلای ڕاستی ڕەحمانەوە - هەردوو دەستی هەر ڕاستە -واتە هەردوو دەستی خاوەنی فەڕو خێرن - چۆنیەتی ئەو دەستە، تەنها خوا خۆی ئەزانێ - ئەوانە کێن ئەوەندە بەڕێزن؟ ئەوانەن، کە لەحوکمڕانیان داد پەروەر بوون یان لەناو بنەماڵەیان داو لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە بەسەرپەرشتیان کردون.

## سەرپەرشتی ئافرەت و منالّ و کەسانیّ کە قەزاوەت نەزانن یان لە قەزاوەتدا کەمتەرخەم بن.

٨٦٣- ن /٣٨٨٨ ((عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنَّ اَهْلَ فَارِسَ مَلَّكُوا عَلَيْهِمْ بِنْتَ كِسْرَىَ قَالَ: (لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً) رواه احمد (٥/٤٣،٤٧،٥١) والبخاري (٤٤٢٥،٧٠٩٩) والترمذي (٢٢٦٢) والنسائي (٨/٢٢٧))).

لە ئەبو بەکرەوە ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: کاتیّ هەوالّ گەیشتە پیّغەمبەری خوا ﷺ، کە ئەهلی فارس کچی کسرایان کردووە بە پاشای خۆیان، پیّغەمبەر ﷺ فەرموی: ((هەرگیز گەلیّك ئافرەت کاروباریان بەڕیّوە ببات و سەرپەرشتیان بیّ سەرکەوتوو نابیّت)).

٨٦٤- ن /٣٨٨٩ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (تَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنْ رَأْسِ السَّبَعِينَ وَاِمَارَةِ الصِّبْيَانِ) رواه احمد (٢/٣٢٦،٣٥٥،٤٤٨))).

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پیّغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: پەنا بگرن بەخوا، لەسەری حەفتا، - لەو کارەسات و ناڕیّکیەی، کە لەوکاتەدا ڕوئەدات و، پەنا بگرن بەخوا لەسەرپەرشتی و ئەمیرایەتی منالاّن.

بەداخەوە ئەمڕۆ جیهان بەو نەخۆشیە کوشندەیە گرفتارە، اللَّهُمَّ اَصْلِحْ حَالَنَا.

٨٦٥- ن /٣٨٩٠ ((عَنْ بُرَيْدَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (الْقُضَاةُ ثَلاَثَةٌ، وَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ وَاثْنَانِ فِي النَّارِ، فَأَمَّا الَّذِي فِي الْجَنَّةِ: فَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ فَقَضَى بِهِ، وَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ وَجَارَ فِي الْحُكْمِ فَهُوَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ فَهُوَ فِي النَّارِ) رواه الخمسة الا احمد. ابوداود (٣٥٧٣) والترمذي (١٣٢٢) والنسائي (٢٠٠٩) في الكبرى (٢٣١٥) وابن ماجه)). لە بورەیدەوە ﷺ هاتوە، لە پیّغەمبەرەوە ﷺ، کە فەرمویەتی: قازییەکان سیّ جۆرن: یەکیّکیان لە بەهەشت دایەو، دوانیان لەناو ئاگردان، ئەوەیان، کە لە

بەهەشت دایە پیاوێكە ڕاستی ئەزانێو بڕیاریشی پێ ئەدات، پیاوێك ڕاستی بزانێو لە حوكم دا ستەم بكات، لەئاگردایە، پیاوێك حەقیقەتو ڕاستی نەزانێو نەزانانە حوكم بەسەر خەڵكا بدا ئەمەش لە ئاگردایە.

٨٦٦- ن /٣٨٩٤ ((عَنْ أُمِّ الْحُصَيْنِ الأَحْمَسِيَّةِ أَنَّهَا سَمِعَتِ النبِّيَّ ﷺ يَقُولُ: (اسْمَعُوا وَاَطِيعوُا وَإِنْ اَمَّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبِشِيٌّ، مَا أَقَامَ فِيكُمْ كِتَابَ اللهِ عَزَّوَجَلَّ) رواه الجماعة الاّ البخاري وابوداود. احمد (٣٨١/٦٩،٥/٤) (م/١٨٣٨) والترمذي (١٧٠٦) والنسائي (١٥٤/٧) وابن ماجة (٢٨٦١))).

لە ئومو حوسەینی ئەحمەسییەوە -خوا لێی ڕازی بێ- هاتوە، كە ئەو لە پێغەمبەرەوەﷺ بیستوویەتی ، كە ئەیفەرمو: ((گوێبگرنو پەیڕەوی بكەن، ئەگەرچی بەندەیەكی حەبەشی ڕەش پێست ـ سەری وەكو مێوژ وابێ ـ بكرێ بە ئەمیرتان، هەتا ئەوكاتەی بە كیتابەكەی خوای ـ بەدەسەڵات- لە نێوانتان دا ئیش ئەكات. واتە پەیڕەویو گوێڕایەڵی ئەمیری مسوڵمان پێویستە، بەو مەرجەی بە قورئان كار بكات، ئەگەر بەقورئان كاری نەكرد، ئیشەكانی تاوانەو نابێ بەگوێی بكرێت، بەڵكو ئەبێ لابرێتو كەسێكی تر، كە بە قورئان ئیش بكات بخرێتە جێگای، ئەگینا هەمو تاوانبارن.

## دروستە ئەمیرایەتی بەمەرجەوە ببەسترێت

٨٦٧- ن /٣٨٩٦ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: اَمرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ مُؤْتَةَ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ وَقَالَ: ان قُتِلَ زَيْدٌ فَجَعْفَرٌ وِانْ قُتِلَ جَعْفَرٌ فَعَبْدُاللهِ بْنِ رَوَاحَةَ) رواه البخاري (٤٢٦١))).

لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوەرضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ لە غەزای موئتەدا، زەیدی كوڕی حاریسەی كرد بە ئەمیرو فەرموی: ئەگەر زەید كوژرا، جەعفەر دێتە جێی ئەو، ئەگەر جەعفەر كوژرا، عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحە دێتەجێی ئەو.

بەڵێ ئەم سێ پاڵەوانە خواناسە یەك لەدوای یەك بە فرمانی پێغەمبەرﷺ لەو غەزایە بوون بە ئەمیر هەرسێکیان یەك لەدوای یەك شەهیدکران، خوا لە هەمویان خۆش بێت، پاش ئەوان خالیدی کوڕی وەلید پەلاماری ئالآکەی داو نەیهێشت بکەوێتو، بو بە ئەمیری موسوڵمانان، پاش فڕوفێڵێك، کە لەگەڵ دوژمندا ئەنجامیدا، شەو گەڕایەوە بۆ مەدینە. ئەم باسەم بە درێژی لە ژیانی پێغەمبەردا باسکردووە، بۆ سودی زیاتر، با گوێی لێ بگرن.

## فەرمانڕەوایان و حاکمان نابێ بەرتیل بخۆن.

٨٦٨- ن /٣٨٩٧ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (لَعْنَةُ اللهِ عَلَى الرَّاشِي وَالْمُرْتَشِي فِي الْحُكْمِ) رواه احمد (٣٨٧/٢) والترمذي (١٣٣٦))).

لە ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: نەفرینی خوا لەبەرتیل دەرو، بەرتیلوەرگر لە حوکمکردندا.

٨٦٩- ن /٣٩٠٠ ((عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: (مَا مِنْ امَامٍ اَوْ وَالٍ يَغْلِقُ بَابَهُ دوُنَ ذَوِي الْحَاجَةِ وَالْخَلَّةِ وَالْمَسْكَنَةِ — الاَّ أَغْلَقَ اللهُ أَبْوَابَ السَّمَاء دُونَ خلتِهِ وَحَاجَتِهِ ومَسْكَنَتِهِ) رواه احمد (٢٣١/٤) والترمذي (١٣٣٢))).

لە عەمری کوڕی مورەوە ﷺ هاتوە، کە وتویەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بومﷺ، کە ئەیفەرمو: هەر پێشەواو والیەك دەرگای خۆی لەرووی خاوەن نیازانو فەقیرانو بێ نەوایان دابخات ئەوا خوا دەرگاکانی ئاسمان دادەخات لەسەرنیازو فەقیرو بێ نەوایی ئەو. واتە چۆن ڕەفتار بکات لەگەڵ مەخلوقی خودا، خوایش وای لەگەڵدا دەکات، وەکو لەم فەرمودە داهاتو: (كَمَا تُدِينُ تُدَانُ وَبِالْكَيْلِ الَّذِي تُكِيلُ تُكَالُ/ چۆن ڕەفتار بکەیت وات ڕەفتار لەگەڵدا ئەکرێت وە بەو پێوانەی، دەپێویت وات بۆ دەپێون) بەڕاستی ئەمە توندترین هەڕەشەیە لە فەرمانڕەوایانو کاربەدەستان، تا ئێستا بەچاوی خۆم زۆرم لەو شێوە دیوە -خوا بمانپارێزێ.

## لەسەر كێشـەی نارەوا داكۆكی كردن تـاوانە

٨٧٠- ن /٣٩٠١ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (مَنْ خَاصَمَ فِي بَاطِلٍ وَهُوَ يَعْلَمُ، لَمْ يَزَلْ فِي سَخَطِ اللهِ حَتَّى يَنْزِعَ) رواه احمد (٢/٧٠) وابوداود (٣٥٩٧))).

لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە رضي الله عنه هاتوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ، كە فەرمویەتی: هەركەسێ لەسەر شتێكی نارەواو خۆیشی بزانێ كە نارەوایە، كێشە بكات، ئەوە هەر لەناوخەشمو تورەیی خوادایە، هەتاوازی لێ ئەهێنێ واتە مرۆڤی موسوڵمان نابێ لەسەر شتی نادروستو نارەوا، بێتە جواب، بەڵكو ئەبێ لایەنگری حەقو راستی بێ ئەگەرچی بەزیانی خۆیشی بێ.

## حاكم نابێ لەكاتی تورەییدا فەرمان دەركات

٨٧١- ن /٣٩٠٣ ((عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: (لاَ يَقْضِيَنَّ حَاكِمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ) رواه الجماعة. احمد (٥/٣٦،٣٨،٤٦،٥٢) (خ/١٧٥٨) (م/١٧١٧) وابوداود (٣٥٨٩) والترمذي (١٣٣٤) والنسائي (٨/٢٣٧،٢٣٨) وابن ماجة (٢٣١٦))).

لە ئەبوبەكرەوە رضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا بوم ﷺ، كە ئەیفەرمو: (با هیچ فەرمانڕەوایەك لە نێوان دوو كەس - یان زیاتر - دا بڕیار نەدا لەو كاتەدا، كە تورەیەو رقی هەستاوە)، نەوەك لە بڕیارەكەیدا بەهەڵەدا بچێتو پاشان هەم مافی هەندێ بەزایە بڕواتو، هەم هەندێ كەس شتێكی بەنارەوا بەركەوێتو، هەم خۆیشی دوچاری سزای پاشە ڕۆژ بێت، هەرئاوهایە هەر شتێ،كە بیری مرۆڤ نارێك بكات وەكو ئیحتیاجی زۆر بۆدەست گەیاندن بەئاوو ترسو سەرماو گەرمای زۆر،والله أعلم.

٨٧٢- ن /٣٩٠٦ ((عَـنْ عَلِـيٍّ أَنَّ رَسُـولَ اللهِﷺ قَـالَ: (يَـا عَلِـيُّ؟، إِذَا جَلَسَ اِلَيْـكَ الْخَصْمَانِ، فَلاَ تَقْضِ بَيْنَهُمَا حَتَّى تَسْمَعَ مِنَ الآخَرِ كَمَا سَمِعْتَ مِنَ الأَوَّلِ، فَإِنَّكَ اِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ تَبَيَّنَ لَكَ الْقَضَاءُ) رواه احمد (١/٩١،٩٦،١١١) وعبـدالله ابنـه (١/١٤٩) وابـوداود (٣٥٨٢) والترمذي (١٣٣١) والنسائي فِي خَصَائِصِ عَلِيٍّ(٣٤))).

له ئیمامی عه‌لیه‌وه‌ﷺ هاتوه، كه پێغه‌مبه‌ری خـواﷺ فه‌رمویـه‌تی: ئـه‌ی عـه‌لی! هه‌ركاتێ دوو نه‌یاری یه‌ك، له‌لات دانیشتن. بڕیار نه‌ده‌یت قسه‌ی دووهه‌م ئه‌بیستی بڕیـار له‌نێوانیان نه‌ده‌یت، وه‌كو چۆن قسه‌ی یه‌كه‌مت بیستووه، چونكه ئه‌گه‌ر به‌ڕاستی تۆ هـه‌ر كاتێ ئاوه‌ها بكه‌یت، بڕیاردانت بۆ ڕۆشن ئه‌بێته‌وه.

لێره‌دا ئه‌وه ده‌رئه‌كه‌وێت، كه دانیشتنی نـه‌یارو ناحـه‌زه‌كان لـه‌لای حـاكم دروسـته‌و وایش باشه چاك وایه حاكم هیچ فه‌رقیان نه‌كات لـه ته‌ماشـاكردن‌و قـسه لێ‌وه‌رگـرتن‌و دانیشتن‌و قسه له‌گه‌ڵ كردنیانـدا، مه‌گـه‌ر لایـه‌نێكی كێـشه‌كه مـسوڵمان نـه‌بێ، ئه‌مـه دروسته له جێگادا -به‌ڵكو پێویسته، جێگای مـسوڵمانه كـه بـه‌رزتر بـێ، له‌بـه‌ر ئـه‌و ڕیوایه‌تانه‌ی، كه هاتوون[1]، ئه‌مه جگه له‌وه‌یش گه‌وره‌یی‌و ڕێزی باوه‌ڕدار پیشان ئه‌دات، وانه‌یه‌كه بۆ بێباوه‌ڕانیش، تا به‌خۆیاندا بێنه‌وه‌و باوه‌ڕ بهێنن، كه گه‌وره‌ترین ده‌سـكه‌وته بۆیان‌و، پاش مه‌رگ به چاكی ئه‌مه ئه‌زانن.

(١) بۆ زیاتر ڕوونبوونه‌وه ته‌ماشای ڕاڤه‌ی فه‌رموده‌ی ژماره (٣٩٠٥-٣٩٠٦)، لـه سه‌رچـاوه‌ی پێشوو بكه.

## حاکم بۆی هەیە کاتێ کێشـەکە نەهاتبێتە لای تکـا بکـا بـۆ کێشـەچی و داوای کەم کردنەوەی بۆ بکات.

٨٧٣- ن /٣٩١٠ ((عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أبي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ عَلَيْهِ فِـي الْمَسْجِدِ فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللهِﷺ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ اِلَيهِمَا حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِه فَنَادَى: (يَا كَعْبُ) فَقَالَ: لَبَّيْكَ، يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: (ضَعْ مِـنْ دَيْنِـكَ هَذَا) وَأَوْمَاءَ اِلَيْهِ اَيْ : الـشَّطْرَ قَـالَ: قَـدْ فَعَلْـتُ، يَـا رَسُـولَ اللهِ. قَـالَ: (قُـمْ فَاقْـضِهِ) رواه الجماعـــة الاّ الترمـــذي. احمـــد(٦/٣٩٠) (م/١٥٥٨) (خ/ ٢٧١٠،٢٤١٨،٤٧١،٤٥٧، ٢٧٠٦ ) وابوداود (٣٥٩٥) والنسائي (٨/٢٣٩،٢٤٤) وابن ماجة (٢٤٢٩))).

لە کەعبی کوڕی مالیکەوە هاتوە، کە ئـەو داوای قـەرزی لـە کـوڕی ئـەبو حـەدرەد کردوە لە مزگەوتا چـونکە قـەرزی بەلایـەوە بـووە، جـا دەنگیـان بـەرز بووەتـەوە، تـا پێغەمبەری خواﷺ لەماڵی خۆیدا ــ کە دەرگای لەسەر مزگەوت بـووە ـ گـوێی لێیـان بووە، جا دەرچووە بۆ لایانو پەردەی حوجرەکەی لاداوەو بـانگی کـردوە ((هـۆ کـەعب)) وتی: وڵامم دایتەوە ئەی پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ((ئەوەندە لە قەرزەکـەت لابـە)) هێمای بۆ کرد، واتە بۆ نیوەی، وتـی: وام کـرد، ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ. واتـە وا لەسەر قسەی جەنابت نیوەم لـێ کەم کردەوە. جـا فـەرموی ـ بـەکوڕی ئـەبو حەدرەدـــ (هەڵسە جێبەجێی بکە). لێرەدا ئەوە وەرئەگرین، کە بڕیاردان لە مزگەوتدا دروستە، بە هەرکەسێك وترا ئەو شتە بکە، یان مەیکە بە هێما،کە وتی وام کرد بەشـتێکی راسـتو دان پێدانان دائەنرێت. هێمای دەرککراو وەکـو قـسە وایـە سـەرەرای تکـای حـاکم بـۆ مەحکوم.

## بڕیاری حـاكم هەر لە ڕواڵەتا پەسـەند ئەكرێت

٨٧٤/ ن /٣٩١١ ((عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّ النبَّـيَّ ﷺ قَالَ: (إِنَّما أَنَا بَشَرٌ وإِنَّكُـمْ تَخْتَـصِمُونَ اِلَيَّ وَلَعَلَ بَعْضُكُمْ اَنْ يَكُونَ اَلْحَنَ بِحُجَّته مِنْ بَعْضٍ، فَأَقْضِي بِنَحْوِ مِمَّا اَسْمَعُ فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئاً فَلاَ يَأْخُذْهُ فَاَنَّمـا اَقطَعُ لَـهُ قِطْعَـةً مِـنَ النَّـارِ) رواه الجماعـة. احمـد (٢٠٣/٦، ٢٩٠، ٣٠٧) (م/١٧١٣) ابــــوداود (٣٥٨٣) (خ/٧١٨٥/٦، ٦٩٦٧، ٧١٨١، ٢٦٨٠، ٢٤٥٨) والترمــــذي (١٣٣٩) والنــــسائي (٢٣٣/٨، ٢٤٧) وابــــن ماجــــة (٢٣١٧))).

لـە دایكـی باوەڕدارانـەوە خـاتون ئومەسـەلەمە ﵂ هـاتوە، كـە پێغەمبـەر ﷺ فەرمویەتی: منیش هەر بەمرۆڤم، ئێوە كێشەی خۆتان دێننە لام‌و لەوانەیـە هەنـدێكتان لێزانتـر بن لە قسەكردن‌و هێنانەوەی بەڵگە لەسەر قسەی خۆی لە هەندێكی ترتان‌و، من بەوشێوەیەی، كە ئەیبیستم بڕیار ئەدەم، جا هەركەسێك من بڕیارم بـۆدا بـە شـتێ، كـە حەقی براكەی تری بوو، با نەیبات، چونكە بەڕاستی من پارچـەیەك ئـاگرم بـۆ پـچڕیوە. واتە فرمانی حاكم حەڕام حەڵاڵ ناكات، جا هەركەس بێ.

## تەرجـەمـەی تـاكێك بـاوەڕی پێ ئەكرێت

٨٧٥- ن /٣٩١٢ ((فِي حَـديث زَيْـد بْـنِ ثَابِـت، اَنَّ النبَّـيَّ ﵁ أَمَـرَهُ، فَـتَعَلَّمَ كِتَـابَ الْيَهُودِ وَقَالَ: حَتَّى كَتَبْتُ لِلنبَّـيِّ ﵁ كُتُبَهُ وَاَقْرَأْتُهُ كتبُهُمْ اِذَا كَتَبـوُا اِلَيْـهِ) رواه البخـاري (٧١٩٥) وابوداود (٣٦٤٥) والترمذي (٢٧١٥))).

لە حەدیسی زەیدی كوڕی سابت دا هاتوە، كـە پێغەمبـەر ﷺ فـەرمانی پێـدا فێـری خوێندنەوە‌و نووسینی جوولەكە ببێ، ئەڵێ: نامـەكانی پێغەمبـەرم بـەزمانی جولەكـە- دەنوسی‌و، گەر جولەكەكان نامەیان بۆ بنوسیبایە، من بۆیم دەخوێندەوە واتە: بـاوەڕ بـە تەرجەمەی كەسێكی لێزان ئەكرێت‌و بڕیاری لەسەر ئەدرێت.

# بڕیار بە شـایەتێك و سـوێندێكی خاوەن حـەق

٨٧٦- ن /٣٩١٣ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: (اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَضَى بِيَمِينٍ وَشَاهِدٍ) رواه الجماعة الاّ البخاري والترمذي. احمد(١/٢٤٨،٣١٥،٣٢٣) (م/١٧١٢) وابوداود(٣٦٠٨،٣٦٠٩) والنسائي كما في التحفة (٦٢٩٩٩) في الكبرى وابن ماجة (٢٣٧٠))).

لە عەبدوڵڵای كوڕی عەباسەوەرضي الله عنه هاتوە، كە پێغەمبەری خواﷺ بە شایەتێكو سوێندێك بڕیاریداوە)).

## ئەوانەی كە شـایەتیان لـێ وەرناگیـرێ

٨٧٧- ن /٣٩٢٠ ((عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ خَائِنٍ وَلاَخَائِنَةٍ وَلاَذِي غَمْرٍ عَلَى أَخِيهِ، وَلاَتَجُوزُ شَهَادَةُ الْقَانِعِ لأَهْلِ الْبَيْتِ) الْقَانِعُ: الَّذِي يُنْفِقُ عَلَيْهِ اَهْلُ الْبَيْتِ. رواه احمد (٢/٢٠٤، ٢٠٨، ٢٢٥، ١٨١) وابوداود (٣٦٠٠) وابن ماجة (٢٣٦٦) وَلأَبِي دَاوُدَ (٣٦٠١): لاَ تَجُوزُ شَهَادَةُ خَائِنٍ وَلاَ خَائِنَةٍ وَلاَ زَانٍ وَلاَ زَانِيَةٍ وَلاَذِي غَمْرٍ عَلَى أَخِيهِ)).

لە عەمرِی كوڕی شوعەیبەوە لە باوكیەوە لە باپیریەوەرضي الله عنه هاتوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: شایەتی هیچ پیاوو ئافرەتێكی تاوانبار دروست نیەو، -شایەتی- هیچ خاوەن ڕقێك لە براكەی دروست نیە، وە شایەتی نـمەك خۆری ماڵێك - بۆ ئەو ماڵە- دروست نیە.. لە ڕیوایەتی تری ئەم فەرمودەدا، كە ئەبو داوود هێناویەتی بەم شێوەیە ((.... شایەتی هیچ پیاوێكی زینا كارو ئافرەتێكی زیناكار وەرناگیرێت...))- ئەوەی بۆشاییەكان لە ڕیوایەتی سەرەوەدا باسكراون.

(ذو غمر)، واتە ڕق لە دڵ، قین لە دڵ.

(قانع): بەو کەسە ئەڵێن کە بەسەر کەسێکەوە بژێیت، ماڵێك، یان کەسێك ژیانی دابین بکات، چونکە لەوانەیە بەسودی ئەوان قسە بکات.

هەر لەوانەی کە شایەتیان لــیوەرناگیرێت، گومان لێکراوو خزم. بەڵام شایەتی مسوڵمان لەسەر کافر وەرئەگیرێ، چونکە دوژمنایەتی مسوڵمان لەبەر ئایینە، ئایین ماوەی پێ نادات، کە ناحەق بڵێ، بەڵام دوژمنایەتیەکەی تر لەسەر دنیایە، ئەگونجێ هەوڵی زیاندان لە یەکتر بدەن، والله أعلم.

هەر لەو بابەتەیە، کە شایەتی کوڕ بۆ باوك‌و ژن‌و مێرد لەسەر یەکتر وەرناگیرێت چونکە جێگای گومانن. بەڵام لە دەشتەکییەکدا ئەگەر بە پیاوێکی دادپەروەر ئەناسرا ، ئەوە شەهادەتی لیٚوەرئەگیرێ، چونکە لە ڕیوایەتدا هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ سەبارەت بە مانگ شایەتی دەشتەکیوەرگرتووە.[1]

## شایەتی ئەهلی زیمە بۆ وەسییەت

٨٧٨- ن /٣٩٢٢ ((عَنِ الشَّعْبِـيِّ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ حَضَرَتْهُ الوَفَاةُ بِـدَقُوقَا هَـذِهِ وَلَمْ يَجِدْ اَحَداً مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَشْهَدُهُ عَلَى وَصِيَّتِهِ فَأَشْهَدَ رَجُلَيْنِ مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ فَقَدِمَا الْكُوفَةَ فَأَتَيَا الأَشْعَرِيَّ. يَعْنِي اَبَا مُوسَى – فَأَخْبَرَاهُ وَقَدِمَا بِتَرِكَتِهِ وَوَصِيَّتِهِ، فَقَالَ الأَشْعَرِيُّ: هَذَا اَمْرٌ لَمْ يَكُنْ بَعْدَ الَّذِي كَانَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِﷺ فَأَحْلَفَهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ: مَا خَانَا، وَلاَكَذِبَا ولابَدَّ لا، وَلاَكَتَمَا، وَلاَغَيَّرا، وَإِنَّهَا لَوَصِيَّةُ الرَّجُلِ وَتَرِكَتُهُ فَأَمْضَى شَهَادَتَهُمَا) رواه ابوداود (٣٦٠٥) قال الحافظ: ان رجال اسناده ثقاة)).

لە شەعبییەوە هاتوە، کە پیاوێك لە مسوڵمانان لە (دەقوقا)دا نزیکی گیان دەرچوونی بوو، لەوێش هیچ مسوڵمانێکی دەست نەکەوت، کە بیکات بە شایەت لەسەر وەسییەتەکەی، لەبەر ئەوە دوو پیاوی ئەهلی کیتابی کرد بە شایەت، جا ئەو دوانەش

(١)بۆزیاتر ڕوونبوونەوە تەماشای راڤەی هەمان ژمارە(٣٩٢٠-٣٩٢١) لەسەرچاوەی پێشوو،بکە.

هاتنه كوفەو چوونه لای ئەشعەری، مەبەستی ئەبوو موسابوو، ئەو هەواڵەیان پێداو ئـەو میراتەی لیّ بەجێمابو وەسیەتەكەیان بـۆ هێنـا، ئەشـعەری وتـی: ئەمـە شـتێكە دوای ئەوەی، كە لە زەمـانی پێغەمبـەردا ڕووینـەداوە، نـەبوە - مەبەسـتی مردنـی كـابرای سەهمیو تەمیمی داریو عەدی كوڕی بەدایە.[1]

جا لەپاش نوێژی عەسر سوێندی دان كە: خیانەتمان نـەكردوە، درۆناكـەینو هیـچمان نەشاردۆتەوەو، هیچمان نەگۆڕیوە بەشتی ترو هیچمان تێكنەداوە، ئەمە وەسـیەتی ئـەو پیاوەیەو میراتەكەیەتی. جا ئەویش -بەم شێوەیە- شایەتیەكەی لـیّوەرگرتن.

بـەڵێ لـەمبارەوە قـسە زۆر كـراوە، هەنـدێك ئـەڵێن مەنـسوخەو هەنـدێك ئـەڵێن پێچەوانەی قیاسە... بەڵام ئەوەی من لەمبارەوە بەڕاست تری ئـەزانم ئەوەیـە، كـە ئـەم شـێوەیە، شـێوەیەكی تایبەتـە، وەكـو مامەڵـەی— عـەرایا وەكـو مامەڵـەی سـەلەمو سەوزخری خۆی بۆ خۆی ئەم بریارەی هەیـەو رواڵـەتی قورئـانیش[2] ئەمـە ئەگەیـەنیّو، پێویست بەو دورو درێژە پێدانە ناكات، خۆی بڕیارێكی جیاكراوەیە، بەر قیاس ناكـەویّو قیاسی شتی تریشی ناكرێتە سەر،والله أعلم.

## چەند جوانە كەسیّ شایەتی ڕاستی لابیّ خاوەنەكـەی ئاگـادار بكاتەوەو چەند ناشیرینە هەر لە خۆیەوە شایەتی بدات

٨٧٩- ن /٣٩٢٥ ((عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدِ الْجُهَنِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: (اَلاَ أُخبرُكُم بِخَيْرِ الشُّهَدَاءِ الَّذي يَأْتِي بِشَهَادَتِهِ قَبْلَ اَنْ يُسْأَلُهَا) رواه الجماعة الاّ البخاري. احمد (١١٥/٤، ١٩٣/٥) (م/١٧١٩) ابوداود (٣٥٩٦) والترمذي (٢٢٩٥، ٢٢٩٦، ٢٢٩٧) والنسائي في الكبرى (٤٩٤/٣، ٦٠٢٩))).

لـە زەیـدی كـوڕی خالیـدی جوهەنیـەوەرضي الله عنه هـاتوە، كـە بـە پێغەمبـەری خـواﷺ

(١) تەماشای فەرمودەی ژمارە (٣٩٢٤) لە سەرچاوەی پێشوو، بكە.

(٢) تەماشای ئایەتی (١٠٦) المائدة بكە.

فەرمویەتی: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە چاکترین شایەت: ئەو کەسەیە، کە شایەتیەکەی ئەدات -بۆ خاوەنەکەی- پێش ئەوەی، داوای شایەتی لێ بکرێت.

## خراپی لەخۆوە شایەتی دان بێ ئەوەی پێویست بێ و کەس داوای لێ بکات و خراپی خیانەت و قەڵەوی.

٨٨٠- ن /٣٩٢٦ ((عَنْ عِمْرانِ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنِ النبِّيِﷺ قَالَ: (خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ،، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، (قَالَ عِمْرانُ: فَلاَ أَدْرِي: اَذَكَرَ بَعْدَ قَرْنِهِ قَرْنَيْنِ اَوْ ثَلاَثَةً؟) ثمَّ اِنَّ مِنْ بَعْدِهِمْ قَوْماً يَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ وَيَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ، وَيُنْذِرُونَ وَلاَ يُوفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمْ السِّمنُ) لِلْحَدِيثِ ثَلاَثَ طُرُقٍ اِلَى عِمْرَانَ، رواه البخاري (٢٦٥١، ٣٦٥٠، ٦٤٢٨، ٦٦٩٥) و (م/٢٥٣٥/ ٢١٤) والنسائي (١٧/٧-١٨) وغيرهم)).

لە عیمرانی کوڕی حوسەینەوە ﷺ هاتوە، لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە فەرمویەتی: باشترینی ئۆممەتم زەمانی خۆمە. لەپاشان ئەوەی، کە بەدوای ئەواندا دێ، لە پاشان ئەوەی، کە بەدوای ئەوانیشدا دێت (عیمران وتی: نازانم لەپاش زەمانی خۆی دوو چەرخی باسکرد یان سیان) بەڕاستی لەپاش ئەوان گەلێك ئەبێ، شایەتی ئەدەن بێئەوەی داوای شایەتیان لێ بکرێت -کە ئەبنە هۆی ئاشووبو زیندو کردنەوەی بەلاو موسیبەتی لەناوچوو مردو. وتراوە: (اَلْفِتْنَةُ نَائِمَةٌ لَعَنَ اللهُ مَنْ اَيْقَظَهَا) فیتنەو ئاشوب خەوتوە، نەفرینی خوا لەو کەسەی زیندوی ئەکاتەوە، بەڵێ ئەو جۆرە شایەتانەن، کە پێغەمبەری خواﷺ سەرزەنیشتیان ئەکات و خیانەت ئەکەنو خەڵك باوەڕیان پێ ناکات نەزر ئەکەنو جێبەجێی ناکەن، لەناو ئەواندا بەهۆی ئیسراحەتو چەوری خواردن قەڵەوی پەیدا ئەبێ ، کە ئەمە ئەبێ بەهۆی تەمبەڵی لە کاروباری خواپەرستیدا، ئەم فەرمودە لەگەڵ فەرمودەی پێش خۆیدا تێك ئەگیرێن، بەڵام بەو سەر باسەی، کە بۆم دانراون یەك ئەخرێنەوە، والله أعلم.

## شایەتی درۆ تاوانێکی زۆر گەورەیە

٨٨١- ن /٣٩٢٨ ((عَنْ أَنَسٍ قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ الْكَبَائِرَ - اَوْ سُئِلَ عَنِ الْكَبَائِرِ- فَقَالَ: (الشِّرْكُ بِاللهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَعُقُوقُ الوالِدَيْن) وقال: (اَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ قَوْلُ الزور) اَوْ قَالَ (شَهَادَةُ الزُّورِ) رواه الجماعة الا ابادواد وابن ماجة. احمد (١٣١/٣، ١٣٤) و (خ/(٦٥٣، ٥٩٧٧، ٦٨٧١) و م(٨٨) والترمذي (١٢٠٧، ٣٠١٨) والنسائي (٨٨/٧، ٦٣/٨))).

له ئەنەسەوەﷺ هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ باسی تاوانە گەورەکانی کرد (یان پرسیاری تاوانە گەورەکانی لێکرا) فەرموی: هاوبەش دانان بۆ خوا، وە کوشتنی خەڵك بەناحەقو نا فرمانی دایك و باوك)، فەرموی: ئایا گەورەترین گوناهەکانتان پێ ڕابگەیەنم؟ قسەی درۆ - یان فەرموی شایەتی درۆ. بەڕاستی لەمبارەوە چەندین فەرمودەی تر هەیە.

## ئەگەر دووکەس لەبارەی شتێکەوە کێشەیان بوو، هیچکامیان بەڵگەیان نەبوو.

٨٨٢- ن /٣٩٣٢ ((عَنْ أَبِي مُوسَى: (إِنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا اِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي دَابَّةٍ لَيْسَ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا بَيِّنَةٌ فَجَعَلَهَا بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ) رواه الخمسة الاّ الترمذي. احمد (٤٠٢/٤) ابوداود (٣٦١٥/٣٦١٤) والنسائي (٢٤٨/٨) وابن ماجة (٢٣٣٠))).

له ئەبو موساوەﷺ هاتوە، کە دوو پیاو کێشەیان هێنایە خزمەتی پێغەمبەرﷺ لەبارەی وڵاخێکەوە کە هیچکامیان شایەتیان نەبوو، جا لە نێوانیاندا کردی بە دوو بەشەوە - هەر یەکەیان هەڵیگرێتەوە، نیوەی قیمەتی بۆ ئەویتریان بگەڕێنێتەوە، جا ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوون، تیرو پشك ئەکرێ، کە کامیان سوێند بخۆن بۆ هەرکامیان

دەرچوو، ئەوە سوێند ئەخواتو ئەیبات، وەكو لەم فەرمودەی دێت دەرئەكەوێت.

٨٨٣- ن /٣٩٣٣ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النبَّـِيَّ ﷺ عَرَضَ عَلَى قَوْمٍ الْـيَمِينَ فأَسْـرَعـوا، فَأَمَرَ اَنْ يُسْهَمَ بَيْنَهُمْ فِي الْيَمِينِ أَيُّهُمْ تِحْلِفُ؟) رواه البخاري (٢٦٧٤))).

له ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوه، كه پێغەمبەرﷺ پێشنیاری سوێندی كرد بـۆ گـەلێك، ئەوان -هەركام- بۆ خۆی پەلەی ئەكرد، كه سوێند بخـوات، لەبـەر ئـەوە فرمانیـدا بـۆ سوێند خواردنەكه، تیرو پشك له نێوانیاندا بكرێت چـونكه نـاكرێ هـەروا لـه خـۆڕا بـه یەكێكیان بلێت سوێند بخۆ، چ پێیان خۆشبێ بۆ سوێند خواردن، یان پێیان نـاخۆش بـێ، ئەوە ڕێگای چارەسەریەتیو بەس.

# ئەگـەر شـــایەت نـەبوو ئینكاركـەر ســوێند ئـەدرێت و بـۆ دەعواچـی نیه هەردووكیان بكات.

٨٨٤- ن /٣٩٣٤ ((عَنِ الأَشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: كَانَ بَيْنِي وَبَيْـنَ رَجُلٍ خُصُومَةٌ فِي بِئْرٍ فَاخْتَـصمْنَا اِلَـى رَسُـولِ اللهﷺ فَقَـالَ: (شَـاهِدَاكَ أَوْ يَـمِينُهُ)، فَقُلْتُ: إِنَّـهُ اِذَنْ يَحْلِفُ وَلاَ يُبَالِي. فَقَالَ: (مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِءٍ مُـسْلِمٍ هُـوَ فِيهَـا فَـاجِرٌ لَقَـى اللهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ)). مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

له ئەشعەسی كوڕی قەیسەوەﷺ هاتوه، كه وتویەتی: له نێـوان مـنو پیـاوێكی تـر كێشەیەك هەبوو لەسەر بیرێـك، جـا كێـشەكەمان گەیانـده لای پێغەمبـەری خـواﷺو فەرموی: (دوو شایەت بهێنن یان سوێندی ئەو).

وتم: بەڕاستی ئەو سوێند ئەخواتو هیچ گوێی پێ نادات.

فەرموی: هەر كەسێك سوێند بخوات لەسەر شتێكو، بەو سوێندەی بـه نـاڕەوا مـالّی مسولّمانێك بۆخۆی ببچڕێت، كاتێ بەخوا ئەگات، كه لێی توڕەیه. واته ئیدعاكەر داوای سـوێندی لێ ناكرێـتو مـونكیر سـوێند ئـەدرێتو پێـچەوانەی نابـێ، مەگـەر مـونكیر سوێندەكه بداتەوه بۆ مودەعی، تەماشای ئەم فەرمودەی بەردەم بكه.

٨٨٥- ن /٣٩٣٦ ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (اَنَّ النبَّـيَّﷺ قَضَى بِالْيَمِينِ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْـهِ) وَفِي رِوَايَةٍ (اَنَّ النَّبِـيَّﷺ قَـالَ: (لَـوْ يُعْطِـى النَّـاسَ بِـدَعْوَاهُمْ لاَدّعَـى نَـاسٌ دِمَـاءَ رِجَـالٍ وَأَمْوالِهِمْ ولَكِنَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعى عليه)). رواه احمـد (١/٣٤٢، ٣٥١، ٣٥٦) ومـسلمٌ (١٧١١) وابن ماجة (٢٣٢١).

له عەبدوڵڵای كـوڕی عەباسـەوەﷺ هـاتوه، كـە: پێغەمبـەرﷺ فرمـانی كـردووه بەسوێند لەسەر ئەو كەسەی، كە داوای شتێكی لیّ ئەكەن.. لە ڕیوایەتێكی تردا هـاتوه، كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((ئەگەر خەڵكی بـەداوای خۆیـان شـتیان پـێ بـدرێ ـــ هەندێ ـــ لە خەڵك داوای خوێنی پیاوانو ماڵەكانیان دەكرد، بـەڵام سـوێند لەسـەر داوا لێكراوە.

لەبارەی داواكەر (المـدَّعی)و داوا لێكـراو (المدَّعی علیـه) زانایـان لـە پێناسـەیاندا ناڕێكیان هەیەو دوو پێناسەیان بەناو بانگە:

یەكەم: داواكەر ئەو كەسەیە كە قسەكەی پێچەوانەی ڕواڵەتە، داوا لێكراو پێچەوانەی ئەوە.

دووهەم: داواكەر ئەو كەسەیە، كـە ئەگـەر بـێدەنگ بـوو، هـیچ شـتێك لـە ئـارادا نەمێنێ، داوا لێكراو ئەو كەسەیە هەرچەن ئەو بێدەنگ بێ، وازی لـێ نەهێنرێت.

٨٨٦- ن /٣٩٤٠ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النبَّـيِّﷺ قَالَ: (مَنْ حَلَفَ بِاللهِ فليَصْدُقْ وَمَنْ حُلفَ لَهُ بالله فَلْيَـرْضَ وَمَـنْ لَـمْ يَـرْضَ فَلَـيْسَ مِـنَ اللهِ)). رواه ابـن ماجـه (٢١٠١) قَـالَ الَبْوصِيرِيُّ فِي الزَّوَائِد (٢/١٤٣) هَذَا اِسْنَادٌ صَحِيحٌ، رِجاِلُهُ ثِقَاتٌ.

له عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوەﷺ هاتوه، لـە پێغەمبـەرەوەﷺ، كـە فەرمویـەتی: (هەركەس سوێند ئـەخوات بـەخوا، بـا ڕاسـت بكـات -بـەدرۆوە سـوێند نـەخوات -وە هەركەسێك بەخوا سوێندی خوارد باڕازی ببێ، هەركەسێك ڕازی نەبێ، ئەوە بـە بەنـدەی ڕاستەقینەی خوا حیساب ناكرێت، یان هیچ بەڵگەیـەكی تـری بەدەسـتەوە نیـە لەلایـەن خوداوەو ئەبێ ڕازی ببێ، والله أعلم.

٨٨٧-ن/٣٩٤٣ ((عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ اَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: (لاَ يَحْلِفُ عِنْدَ هَذَا الْمِنْبَرَ عَبْدٌ وَلاَ أَمَةٌ عَلَى يَمِينٍ آثِمَةٍ ـ وَلَوْ عَلَى سِوَاكٍ رَطْبٍ ـ الاَّ اَوْجَبَ اللهُ لَهُ النَّارَ) رواه احمد (٣٢٩/٢، ٥١٨) وابن ماجه (٢٣٢٦))).

له ئەبو هورەیرەوەﷺ هاتوه، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: لەلای ئەم مینبەرە هیچ پیاوو ئافرەتێك سوێندێکی ناحەقو ناڕەوا ناخۆن، لەسەری کە تاوانبار بن لەسەری - ئەگەر لەسەر سیواکی تەریش بووە — ئەوا خوا ئاگری دۆزەخی لەسەر پێویست کردوە. واتە بەو سوێندە ناڕەوایە چونە ناو ئاگر لەسەریان فەرز ئەکرێت. ئەمانەو دەیان فەرمودەی تر هەن سەبارەت بە سوێنی ناحەق.

٨٨٨- ن /٣٩٤٦ ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: خَطَبَنَا عُمَرُ بِالْجَابِيَةِ فَقَالَ: يَأَيُّهَا النَّاسُ اِنِّي قُمْتُ فِيْكُمْ كَقِيامِ رَسُولِ اللهِﷺ فِينَا، قَالَ: اُصِيكُمْ بِاَصْحَابِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ يَفْشُوا الْكَذِبَ حَتَّى يَحْلِفَ الرَّجُلُ وَلا يُسْتَحْلَفُ وَيَشْهَدُ الشَّاهِدُ وَلا يُسْتَشْهَدُ. اَلاَ لا يَخْلُوَنَّ رجُلٌ بامْرَأةٍ الاَّ كَانَ ثَالِثُهُمَا الشَّيْطانُ، عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ، وإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ، فَأَنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الوَاحِدِ وَهُوَ مِنَ الْاَثْنَيْنِ اَبْعَدُ. مَنْ اَرَاد بُحْبُوحَةَ الَجنَّةِ فلْيَلْزَمِ الْجَمَاعَةَ. مَنْ سَرَّتْهُ حَسَنَتُهُ وساءَتْهُ سَيِّئَتُهُ فَذَلِكَ الْمُوءْمِنُ) رواه احمد (١٨/١) والترمذي (٢١٦٥))).

له عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوەﷺ هاتوه، کە وتویەتی: عومەرﷺ لە جابیە خوتبەیەکی بۆ خوێندینەوەو وتی: ئەی خەڵکینە، من لەناو ئێوەدا هەستاوم وەکو پێغەمبەرﷺ لەناو ئێمەدا هەستا بو، فەرموی: ئامۆژگاریتان ئەکەم لەبارەی یارەکانمەوە -واتە بێ ئەدەب نەبنو قسەی خراپیان پێ نەڵێن- لە پاشان- چاك بن لەگەڵ ئەوانەی پاش ئەوان دێن لەپاشان چاك بن لەگەڵ ئەوانەی پاش ئەوانیش دێن. واتە ڕێزی ئەو سێ بەشە بگرن، لەپاشان درۆ ڕەواج پەیدا ئەکاتو بڵاوئەبێتەوە، تاوای لێدێت پیاو سوێند ئەخوات، بێ ئەوەی سوێند بدرێت، شایەت شایەتی ئەدات، بێئەوەی داوای شایەتی لێ بکرێت.

ئاگادار بن، با هیچ پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکی -نامەحرەم- تەنیا نەبێت دا، ئەگەروای کرد -شەیتان سێیەمیانە-، واتە شەیتان دێتە نێوانیانو هەوڵی ئەوە ئەدات، کە دوچاری تاوانیان بکات. پێویستە (لەسەرتان کە یەك بنو دووربکەونەوە لە بەش بەشی) بەڕاستی شەیتان لەگەڵ یەك کەس دایەو لەگەڵ دوان دوورترە. هەرکەسێك ناوەڕاستی بەهەشتی دەوێ، با لەگەڵ کۆمەڵ دابێ. هەرکەسێك چاکەکەی شادمانی کردو، خراپەکەی غەمناکی کرد ئەوە باوەڕ دارە.

بەم شێوەیە هاتینە کۆتایی نووسینی ئەم فەرمودە بەنرخانە، پاش نیوەڕۆی ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ١٧/ رجب/ ١٤٢٤ ك. ق. هەولێر.

وصلى الله على قائدنا وحبيبنا وشفيعنا محمد وعلى آله وأصحابه، يا الهى صلّ وسلّم عليه وعليهم عدد ما أَحاط به علمك وخطَّ به قلمك وأحصاه كتابك.

**وآخر دَعوانا أنِ الحمد لله ربِّ العالمين.**

# ناوەڕۆك